# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

ژمارە (١) شوباتی ١٩٩٩ – ساڵی یەکەم



**خاوەنی ئیمتیاز : شێرکۆ بێکەس**

**سەرنووسەر : ڕەووف بێگەرد**

**بەڕێوەبەری نووسین : ئازاد بەرزنجی**

**دەرهێنانی هونەری : قادر میرخان**

ناونیشان:
سلێمانی – فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفون : ٢٩٨٣٩

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە:
نوسینگەی ساحێبقران
Tel : 00873 761 477 268 - 00873 682 040 391
Fax : 00873 682 040 392 - 00873 761 477 269

# سەردەم

ژمارە (١) شوباتی ١٩٩٩ ساڵی یەکەم



ئاسۆیەك بۆ وەرگێڕان (سەرنووسەر) ٣

**● فیکرو فەلسەفە ٥**

دیالەکتیکی رۆشنگەری (و/ لەفارسی‌یەوە: رێبین هەردی) ٦

دەربارەی ئاستەنگی هەنووکەیی (و/ لە ئینگلیزی‌یەوە: چنور محەمەد) ٣٨

پۆست مۆدێرنیتی (ئازاد حەمە) ٤١

شۆڕشی دەستە سپییەکان (و/ لە ئینگلیزی‌یەوە: ئاوات ئەحمەد) ٥١

**● رەخنەو تۆژینەوە ٥٩**

میتۆدو تۆژینگەکان (و/ لە فەرەنسی‌یەوە: ئەحمەد موفتی) ٦٠

قسەبکەو بمرە (سەبارەت ئەدەبی جەزائیریی هاوچەرخ) (و/ لە سویدی‌یەوە: زۆراب) ٦٨

یۆلیسیس (و/ لە ئینگلیزی‌یەوە: پێشواز سعدالله) ٨٠

**● لەئەدەبی گەلانەوە ٨٢**

شیعری یۆنانیی هاوچەرخ (و/ لەئینگلیزی‌یەوە: شێرزاد حەسەن) ٨٤

شیعری فارسیی هاوچەرخ (و/ لەفارسی‌یەوە: نەجیبە ئەحمەد) ٩٦

نابەزن (چیرۆکی سۆمەرست مۆم) (و/ لە ئینگلیزی‌یەوە: ئەکرەم قەرەداغی) ١٠٦

**● گفتوگۆ ١٢٥**

گفتوگۆ لەگەڵ کارل پۆپەردا (و/ لەفارسی‌یەوە: ئازاد بەرزنجی) ١٢٦

**● فایلی ژمارە (رۆمانی نوێی فەرەنسایی) ١٢٩**

رۆمانی نوێ بۆ؟ (سەردەم) ١٣٠

رۆمانی نوێ (و: م خالید) ١٣٢

کەسێتی لەرۆمانی نوێی فەرەنسی‌دا (سیامەند هادی) ١٣٩

ناتالی ساروت (و: سەمەند) ١٤٥

ئالان رۆب گریێ (و: سەردەم) ١٤٩

میشیل بۆتۆر (و: رەووف بێگەرد) ١٥٩

کلۆد سیمۆن (و: فاروق هۆمەر) ١٦٨

**● سینەما ١٧٣**

قەیرانی سینەمای ئەورووپی (و/ لە ئینگلیزی‌یەوە: کەریم عومەر) ١٧٤

**● ویستگەکانی سەردەم ١٨٥**

ساراماگۆ: پەیوەندیی نێوان خەیاڵ و واقع

ئۆکتاڤیۆپاز

بەبۆنەی کۆچی دوایی (سادق چوبەك)ەوە

هەڵبژاردەی شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس بەئینگلیزی

وەك ئەوەی دواجاربێت (ئیریش ماریا ریمارك)

مەکتوب (پاولۆ کۆیلۆ)

چاپکراوی نوێ (پیکاسۆ)

# ئاسۆیەك بۆ وەرگێڕان

ئەشێ ئەوەی بەهۆی وەرگێڕانەوە – لەزانستو فەلسەفەو ئەدەبو فیکرو هونەرو پەروەردەو فەرهەنگەوە- گەیشتبێتە میللەتانی جیاوازو، روناکی خستبێتەنێودرزو کەلەبەری هزری تاریکیخەڵکانێکەوە کە دەبوو زۆر درەنگتر بگەنە کاروانی خۆ دۆزینەوەو شارستانیەتەوە، هیچ فاکتەرێکی دی ئەوکاریگەریەقووڵەی نەبووبێتونەی توانیبێت هەمان دەوری وەرگێڕان ببینێت. بێگومان تازیاترلەم سەدە- بەتایبەت لەنیوەی دووەمی-ەوە بەرەودوا ئاوڕ بدەینەوە بایەخی وەرگێڕان فرەو فراوانتر دەبێت. کە دەچینە سەر مێژووی ئاڵو گۆڕە فیکریو بزوتنەوە روناکبیریەکانو بەتایبەت رێنیسانسی ئەورووپا ئاشکرا ئەم راستیەمان بۆ دەردەکەوێت کە وەرگێڕان خاڵی وەرچەرخانی گۆڕینی بیری خەڵکی بووە بەرەو بالآبوونو دروستکردنیکۆمەڵگای شارستانی، دەستێك بووە بۆ راتەکاندنو لەسەر وەستان، گومانو پرسیار کردن، سڵەمینەوەو بەراورد، گەڕانو سووسەکردنو دیسان هەنگاوهەڵهێنان. هەریۆیەگەلانی هوشیار زووتر هەستیان بەو راستیە کردووەو پەرژی بوارەکەیان پاکژو پاکژتر کردۆتەوە. بۆ نموونە لەسێ سەدە لەمەوبەرەوەوڵاتانی ئەورووپا، بەتایبەتی فەرەنساو ئینگلتەرە بایەخی زۆریان بەبزاوتی گۆڕین داوەو فەرەنساییەکان زوریەی هەرە زۆری بەرهەمی کلاسیکی یۆنانیان گۆڕیوەتە سەر زمانەکەیانو چ میللەتێکی ئەورووپایی نەماوە شارەزاییلەسەرانی فەلسەفەی کۆنی یۆنانو شانۆنامەکانیان نەبووبێت. پەرەنەسەندنی وەرگێڕان لەهەر زمانێکدا بەمانای دەرگا داخستنە لەسەر ئەوخەڵکەی لەهەرشوێنو سەردەمێکدا پێویستی بەپەیوەندیو زانیاری هەیە لەکەسانی ترەوە، ئیتر چ لەسەر ئاستی تاکەکەس بێت یان کۆمەڵ. چونکە گۆڕین بەیەك گەیشتنی هەموو زمانەکانەو گوێزانەوەی تایبەتمەندیو چالاکی فیکریو ئەزمونە زیندوەکانی هەر گەلێکە بۆ ئەوی دی. کەلەم روانگەیەوە دەتوانرێت بەراوردێکی هۆشیارانە بکرێت لەنێوان سەرجەم ئەوچالاکیەفیکریو ئینسانیانەی بەدرێژایی مێژووی هەرمیللەتێك ئەنجام دراون یان بەر هەر کۆسپو تەگەرەیەك کەوتوون.

بەداخەوە ئێمەی کورد لەبواری گۆڕینو ئاشنابوون بەبزاوتە فیکریوئەدەبیو مێژووییو زانستیەکانی دنیا هەمیشە لەدواوە بووین، کتێبخانەکەمان تائێستایش لەو شاکارانەخاڵیە کەدەیانو سەدان ساڵە بوونەتە فاکتەری دامێنانە هەرە جوانەکانی گەلانی ترو، لاپەڕەیەکی درەوشاوە لەمێژووی فەرهەنگو ئەدەبیاتیان. ئەم خەڵك نەناسینە وای کردووە کە ئێمە دنیامان فرێ دابێتە دەرەوەو تەنیا لەخۆمان رامابین، رامانێکی نێرجسیانەی بێ ئاگا لەمانای جوانی، ئەوەی لەجوانی نەزانێت ناتوانێت نرخی بۆ دابنێت، کە ئەمەی نەزانی لەخۆشەویستی ناگات، کە هونەری خۆشەویستیشی نەزانی ئیتر بێجگە لە قاڵبە بەردینەکەی خۆی هەست

بەشتی تر ناکات، ئەمەیش ئەوپەڕی گۆشەگیری‌و تێ نەگەیشتنە لەژیان. خۆ مت کردنە لەقۆزاخەی ترسێکدا کەنەوێریت چاوی هەڵزنان‌و سەرکەوتنی بکەیتەوە.

دەرکردنی گۆڤاری –سەردەم– هەست کردنەبەو دیاردە سەخت‌و پڕ لەمەترسیە، ئاوڕدانەوەیەکە خۆی لەخۆیدا سامێك‌و سڵەمینەوەیەکی تیایە، چونکە بەشارەزایی ڕێگای تەخت‌و دووربڕین چاکترە لەناشارەزایی سەر ڕێگایەکی نزیکی پڕ لەڕکەو هەڵەت، بەڵام سام‌و سڵەمینەوە مانای بەچۆکدا هاتن‌و کەنارەگیری نیە، بەڵکو چنگاوش بوون‌و شەڕە لەگەڵ واقیعێکدا کە ناکرێت هەروا بەدەق کراوەیی بمێنێتەوە. بەتایبەت لەم سەردەمەدا کەوەستان یان بێلایەنی لەڕووی کارەسات‌و دیاردە دزێوەکاندا دەبێتە خەوشی خۆ دزینەوەو بێ دەسەڵاتی، توانای مرۆڤیشی لەوە مەزنترە کە دەستەوەستان بێت. بۆیە لەم هەستەوە شانی توانای کەمی خۆمان دایە بەر ئەم کارە. بێگومانین کەلەدەرکردنی گۆڤارێکی وادا کە تایبەتە بەوەرگێڕان‌و کلتوری بێگانە تووشی ساتمەو کێشە دێین، کێشەی کەمی پسپۆڕی زمانە زیندووەکانی جیهان لە بوارە جیا جیاکانی وەرگێڕانداوبەتایبەت لایەنە فیکری‌و مەعریفییەکان. کەمی ئەزموون‌و پێشینەیەکی دەوڵەمەند کەرابەریمان بکات. گیروگرفتی خودی پرۆسەی وەرگێڕان‌و سیحرە شاراوەکانی، هەژاریی زمانی کوردی لەبواری زانستی‌و فەلسەفی‌و زاراوەییدا، بەڵام لەوە دڵنیاین کە زۆرن ئەو نووسەرو ڕووناکبیرانەی لەم ڕاستیانە گەیشتوون‌و هەستیان بەو کەلێنە گەورەیە کردووە کە سستی بزاوتی وەرگێڕان خستویەتە نێو فەرهەنگ‌و کلتوری کۆن‌و نوێی ئێمەوە. بۆیە چاوی (سەردەم) لەو قەڵەمە بەهرەمەندانەیە کە بێگومانە لەبەخشین‌و هەستی پڕ لە دڵسۆزانەی ڕووناکبیری‌و ئەدەبیان، ئەوانەی بەرپرسیارانە چاویان لەو خوێنەرە کوردەیە کە زمانە ئەسڵیەکان نازانێت‌و تەنیا لەڕێگای زمانی زگماکیەوە دەیەوێت لەپەیامە جوانەکانی دنیا بگات‌و مرۆڤە ناوازەکان بناسێت، بۆ ئەوەی چاکتر لەژیان بگات‌و لە ئێستای زیاتر خۆشی بوێت.

■ سەرنووسەر

# فیکرو فەلسەفە



دیالەکتیکی ڕۆشنگەری



دەربارەی ئاستەنگی هەنووکەیی

پۆست مۆدێرنیتی



شۆڕشی دەستە سپییەکان

# دیالەکتیکی ڕۆشنگەری

■ بابەك ئەحمەدی

● و: ڕێبین هەردی

<u>پێشەکی وەرگێڕ</u>

ئەمەی دەیخوێننەوە فەسڵی چوارەمی کتێبی "مدرنیتەو اندیشە ء انتقادی" ە کە نوسینی ڕۆشنبیری ئێرانی بابەکی ئەحمەدیە. بابەك ئەم کتێبەی تەرخان کردوە بۆ باسکردنی مۆدێرنیتی لە دیدی گرنگترین‌و بەناوبانگترین بیریارانی سەدەی بیستەوە (لەهۆسێرل‌و هایدگەرەوە بۆ قوتابخانەی فرانکفۆرت‌و میشیل فۆکۆو بیریارانی پۆستمۆدێرنیزم). کتێبەکە سنوورەکانی ئامادەکردنێکی ئاسایی تێدەپەڕێنێ‌و دەگۆڕێت بۆ شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی جومگە سەرەکییەکانی تێڕوانینی ئەو بیریارانە. لە ڕاستیدا هەر فەسڵێکی ئەم کتێبە شایانی وەرگێڕان‌و خوێندنەوەیەکی وردە، بە تایبەتی بۆ ڕۆشنبیرییەکی وەك ئێمە کە تا دوا سنوور بێ ئاگایە لەو تەوژمە گرنگانەی لە پاش سەدەی بیستەوە ئاسۆکانی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوا داگیر دەکەن. ئەگەر وەرگێڕی کوردیش کە بەسەر فەسڵەکانی کتێبەکەدا تێپەڕیوەو ڕووی کردۆتە فەسڵی چوارەم تەنها لەبەر ئەوەیە کە تا ئێستاش لە زمانی کوردی‌و (ڕەنگە بتوانم بڵێم لە زمانی عەرەبیشدا) باسێکی وردبینی وەك ئەوەی بابەکیمان لەسەر بیریارانی قوتابخانەی فرانفۆرت دەست ناکەوێت. ڕەنگە ئەم فەسڵە شتێك یارمەتی خوێنەری کورد بدات بۆ ئەوەی زیاتر شارەزای قوتابخانەیەکی فیکریی بەناوبانگ بێت کە کاریگەرییەکی بێ ئەندازەی کردۆتە سەر نەخشەی فیکریی سەدەی بیستەم‌و ڕەنگە لە داهاتووشدا زیاترو زیاتر گرنگیی ئەو قوتابخانەیە ئاشکرا بێت.

سەبارەت بە وەرگێڕانی ئەم فەسڵەش دەبێت هەر لە سەرەتاوە دان بەوەدا بنێم کە نەمتوانیوە شێوازە ڕەوان‌و ئەدەبییەی بابەك لەوەرگێڕانە کوردی‌یەکەدا بپارێزم‌و پتر سەرنجم لەسەر وەرگێڕانی مانای دەقەکە بووەو تا ئەوپەڕی توانا هەوڵم داوە هەڵەی تێدا نەکەم. چونکە هەمیشە ڕێژەی ئەگەری هەڵەکردن لەباسە فیکریەکانی قوتابخانەیەکی ئاڵۆزو تەمو مژاوی وەك قوتابخانەی فرانکفۆرتدا زۆر زیاترە لەهەر باسێکی ئاسایی دی. دواجار ئەوەی پێویستە لێرەدا بیڵێم ئەوەیە کە هەموو ئەو وشانەی لە کەوانەیەکی لەم شێوەیە [....]دا نووسراون لەوەرگێڕی کوردییەوەن‌و تەنها بۆ ئاسانکردنی مانای ڕستەکان بەکارهاتوون.

سەرچاوەی وەرگێڕانەکەش ئەگەر چی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەیە بەڵام بەراستکردنەوەی ئەو هەڵانە دەوڵەمەند کراوە کە لە چاپی سێهەمدا ئاماژەیان بۆ کراوە. ناونیشانی کتێبەکە بەم شێوەیەیە: مدرنیتەو اندیشە انتقادی- بابك احمدی- نشر مرکز- چاپ اول ۱۳۷۳

# زانست پێویستی بەکەسانێکە کە سەرپێچیی لێ بکەن

تیۆدۆر ئادۆرنۆ

ئێستا نزیکەی دوو سەدو بیست ساڵ بەسەر نووسینی کتێبی ((وتارێك سەبارەت بەسەرچاوەکانی نایەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا)) ی" ژان ژاك رۆسۆ" دا تێدەپەڕێت.. وتارێك کە لەگەڵ "پەیمانی کۆمەڵایەتی" ١٧٦٢) "رۆسۆ" بە گرنگترین دەستکەوتەکانی فەلسەفەی سیاسی رۆنشگەری دادەنرێت. لەم ماوەیەدا چەمکی وەك: عەقڵ، زانست، پێشکەوتن، ئازادیی تاکانەیی (فردی)، تەکنەلۆژیاو یاسا کە دەتوانین بە چەمکی مۆدێرنیان لە قەڵەم بدەین چونکە رۆشنگەری تەفسیرێکی نوێی بۆ کردبوون، کەوتوونەتە ژێر رەخنەی ژمارەیەك لە گەورەترین بیریارو فەیلەسووفەکانو تا ئێستاش بابەتێکی گرنگی وتووێژە فکریەکانی سەردەمیان داگیرکردووە. هەموو دەزانن (رۆسۆ) بیری لە دۆخێکی (تەندروستو سروشتی) دەکردەوە کە تیایدا بەختیاری مرۆڤ لەڕێی هاوئاهەنگی لەگەڵ غەریزە مرۆییەکانیدا دێتەدی. بیرۆکەی (دڕندەی نەجیب) ی ئەو [واتە: رۆسۆ] لەبەرامبەر دۆخی نارەسەنی (سەردەمانی تازەدا) هەر لە سەرەتاوە رۆشنگەریی وەك سەردەمی رەخنە دەناساند. هەر لەیەکەم رستەی (پەیمانی کۆمەڵایەتی) یەوە، رازی نەبوون بە جیهان بەو شێوەیەی کە هەیە، بەشێوازێکی راچڵەکێنەر ئاشکرا دەبێت: مرۆڤەکان ئازاد لە دایك دەبن بەڵام لە هەموو شوێنێکدا دیلن. لەسەدەی نۆزدەدا کە دەرەنجامەکانی (مۆدێرنیتی) ئاشکرا دەبوو، ژمارەیەکی زۆر لە بیریاران بە هەمان شێوازی ڕەخنەگرانە مۆدیرنیتیان هەڵدەسەنگاند. بەڵام جگە لە (نیتچە) هیچ کەس ئاستی ئەم رەخنەیەی نەگەیاندە رەخنەگرتن لە خودی (عەقڵانیەت). مارکس کە رادیکاڵترین رەخنەی لەسەرمایەداریی مۆدێرن ئامادە دەکرد، بەتوندی بڕوای بەوە هەبوو کەسەرچاوەی کارەساتی مرۆڤی مۆدێرن دەگەڕێتەوە بۆ (رەگەزی ناعەقڵانیی



تیۆدۆر ئادۆرنۆ

بەرهەمهێنانی سەرمایەداری) و پێشبینی ئەوەی دەکرد کە لە ئەنجامی دژایەتی ناوخۆی ئەم سیستمەدا، شێوازێکی دی لە ژیانی بەرهەمهێنانو کۆمەڵایەتی پەیدا دەبێت کە لە سەر دوو بنەما {ی سەرەکی} دا دەمەزرێت: رێکخستنی عەقڵانیی بەرهەمهێنانو پەیوەندیی بەرهەمهێنەرە راستەوخۆکان کە خاوەنی ئامرازی کۆمەڵایەتیی بەرهەمهێنانن. مارکس زۆر زیاتر لە بیریارانی سەردەمی خۆی بڕوای بە عەقڵانیەتی رۆشنگەری هێنابوو. خەونی ئەو (ئەوەی کە نەیارانی بەوەهمێك بۆ بونیادنانی یۆتۆپیا لەقەڵەمیانداو لایەنگرانیش دەرکەوتنیان بەناچاریو حەتمی دادەنا) دروستبوونی کۆمەڵگایەك بوو کە تیایدا عەقڵی مرۆڤ حوکمڕانی دەکات. بەبڕوای مارکس سودخوازی

سەرمایەدارو باڵادەستیی کاری مردوو بەسەر کاری زیندوودا، عەقڵانی نیەو باشترین بەڵگەش بۆ دەرخستنی دژایەتی [نێوان] ناعەقڵانی پەیوەندیەکانی سەرمایەداریو ئایدۆلۆژیای عەقڵانیەتی، ئەوەیە کە یەکێك لە شکڵە ئاشکراکانی بریتیيە لە (نامۆ بوونی مرۆڤ) لە جەوهەری (کۆمەڵایەتیو عەقڵانی) بوونی خۆی. بەڵام رەخنەی سەدەی بیستەم لە (مۆدێرنیتی) لە گرنگترین لقەکانیدا، بەرێگای ئەم بەرگریکردنە لە عەقڵانیەتو عەقڵ باوەڕیەدا نەڕۆیشت. بەڵکو وەك نەریتی (نتیچە) هێرشی خۆی ئاراستەی عەقڵی مرۆیی کرد یان باشترە بڵێین ئاراستەی شێوەیەکی تایبەت لەباوەڕو ئیمان بەکارایی پراکتیکیو تەکنیکیو ئامێری عەقڵ کرد. لەم بەشەدا باس لە کتێبێکی تایبەتو بێهاوتا دەکەین کە نوسەرەکانی توندترین رەخنەکانیان ئاراستەی عەقڵ باوەڕیو بە تایبەتی ئەوەی ناویاننا (عەقڵ ئامێری) کرد.. بەڵام نەك بە پشت بەستن بە نیتچە، بەڵکو بە گەڕانەوە بۆ تەفسیرێکی تایبەت لە بڕواکانی مارکسو بەهاوکاری تیورەو دیدی رەخنەگرانە بۆ فەلسەفەو زانستو کۆمەڵناسی سەردەم.

## کتێبێك بێ هاوتا

لەناو ئەو بیریارانەی لەسەرەتای سەدەی بیستدا رەخنەیان لە (عەقڵ باوەڕی) دەگرت، کۆمەڵێك بیریاری ئەڵمانی هەبوون کە زۆربەی کارە فکریو زانکۆییو شیکردنەوەکانیان پێکەوە ئەنجام دەداو تارادەیەك پێکەوە هەنگاویان دەنا. ئەمانە لەکاتێکدا سودیان لەو نەریتە رەخنەگرانەیەی مارکس وەردەگرت کە ئاراستەی ئایدۆلۆژیاو کۆمەڵگای بورژوازی دەکران بەڵام رەخنەشیان لە (عەقڵ باوەڕی) مارکس دەگرتو هەرچەندە جیاوازی خۆیان لەگەڵ باوەڕە فەلسەفیو کۆمەڵناسیەکانی سەردەمی خۆیاندا، دەپاراست، بەڵام سودیان لەزۆر لە دەستکەوتەکانی فکری مۆدێرن وەردەگرت. ئەمڕۆ ئەم نوسەرانە بەناوی نوسەرانی (قوتابخانەی فرانکفۆرت) ەوە دەناسرێن. چونکە لەسەرەتاکانی (١٩٣٠) دا یان لە زانکۆی (فرانکفۆرت) وانەیان دەگوتەوە یان لە بڵاوکراوەیەکدا دەیانووسی کە ئەم زانکۆیە لە بواری فەلسەفەو کۆمەڵناسیدا بڵاوی دەکردەوە. سەرنوسەری ئەم بڵاوکراوەیە (مارکس هورکهایمەر) بوو کە یەکێك بوو لە بەتواناترین بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرتو دانەری تیورەی سەرەکی ئەم قوتابخانەیە کە ئەمڕۆ بە (تیورەی رەخنەیی) بەناوبانگە. ناوی بڵاوکراوەکە (بڵاوکراوەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی) بوو کە ژمارەیەك لە بەناوبانگترین وتارەکانی (هورکهایمەر) ی تیادا بڵاو بۆتەوە.(١)

هورکهایمەر لە بواری فەلسەفەو تیوەری کۆمەڵایەتی (کۆمەڵناسی) و فەلسەفەی سیاسیدا دەینووسی. هاوکارەکەی (کەتا کۆتایی ژیانی پەیوەندیان پێکەوە نەپچراو چەند نوسینێکی گرنگیان پێکەوە نووسی کە دەرەنجامی هاوسۆزیو هاوبیری بوو) ناوی (تۆئۆدورۆ. و. ئادرنۆ) بوو کە یەکێکە لە بەرجەستەترین بیریارانی سەدەی بیستەم. ئادرنۆش سەرەرای ئەو بوارانەی لەسەرەوە ناومان هێنا، لە بواری دەروونناسیو دەروونشیکاریو لەمانەش گرنگتر لە بواری جوانناسیدا، دەینووسی. هەردوو بیریار پاش دەسەڵاتگرتنە دەستی نازیەکان لە ئەڵمانیاوە کۆچیان کرد بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو لەوێ لەهاوکاریکردنی یەکتردا بەردەوام بوون. لە ساڵی (١٩٤٤) دا لە گفتوگۆکانی نێوان خۆیان دەقێکیان ئامادەکرد کە بووە بناغەی رەخنەیەکی رادیکاڵ لە رۆشنگەریو مۆدێرنێتیو بناغەی یەکێك لە گرنگترین کتێبە فەلسەفیەکانی سەدەی ئێمە.

کتێبی (دیالەکتیکی رۆشنگەری) بەشێوازێکی تایبەت دارێژراوە[٢]. بەشی زۆری لەیاداشتەکانی (گرتل ئادرنۆ) پێکهاتووە کە گفتوگۆکانی هاوسەرەکەی لەگەڵ (هورکهایمەر) دا تۆمار دەکرد. ئەوان کاتێك لەکۆتایی (١٩٤٤) دا کتێبەکەیان ئامادە دەکرد، لە باشووری کالیفۆرنیا (سانتامونیکا) دەژیان. سێ ساڵ دوای ئەوە دەزگای بڵاوکردنەوەی (کیوریدۆ) لە ئەمستردام دەقی سەرەکی کتێبەکەی بەزمانی ئەڵمانی لە سێ هەزار ژمارەدا چاپ کردو نزیکەی (١٥) ساڵی خایاند بۆ ئەوەی هەموو ژمارەکانی تەواو ببن. لە کۆتایی دەیەکانی (١٩٦٠) دا بوو ناوبانگی (دیالەکتیکی رۆشنگەری) دەستی پێکرد. پاش ئەمە کتێبەکە کاریگەریەکی قوڵی کردە سەر فکری سەردەمی ئەمڕۆو بۆ زۆر زمانی دنیا وەرگێڕاوەو نرخێکی تایبەتی پەیدا کردووە. بونیادی کتێبەکەش زۆر سەرسوڕهێنەرو نائاساییە. وتارێکی سەرەکی تێدایە نزیکەی چل لاپەڕە لەگەڵ دوو وتاری ترو سێ پاشکۆی درێژ کەزیاد لە دوو سەدو بیست پەڕەی کتێبەکە داگیر دەکەن. شێوازی

سەرەکی نووسینی کتێبەکە (پارچە نووسینە)) (لەدەقە ئەڵمانیی‌و فەرەنسی‌یەکەدا ناونیشانێکی بچوك هاتووە: ((پارچە فەلسەفیەکان)) ). تەنانەت لەوتارو پاشکۆکانیشدا باسەکان بەشێوەیەکی ڕێکخراو پێشکەش ناکرێن بەڵکو لەسەر بناغەی پارچەنووسین‌و هەڵبژاردن، ئامادەکراون.

بابەتی کتێبەکە ڕەخنەگرتنە لە (عەقڵ- ئامێری ڕۆشنگەری) و لەدەروازەی جیاوازەوە ڕەخنە لەو کۆمەڵگا عەقڵانیە دەگرێت کە ڕۆشنگەری لەگەڵ خۆیدا هێنای‌و بانگهێشت‌و پروپاگەندەی بۆ دەکرد. کتێبەکە سنوری ئەو ڕەخنە ئایدۆلۆژیە دەبەزێنێ کە مارکس ئامادەی کردبوو. تەنانەت دەتوانین بڵێین ئەو ڕەخنە ئایدۆلۆژیەش بەجی دێڵێ کە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە نوسینەکانی هورکهایمەرو ئادرنۆ لە دەیەکانی _١٩٣٠) دا دەبینرا..

لە پێشەکی کتێبەکەدا هاتووە زمان هەم ئاشکرا کەرەو هەم رای گشتی پێشدەخات، بەڵام لەدەسەڵاتی (عەقڵ- ئامێریدا) کە هەوو شتێ وەك کاڵاو نرخی ئاڵوگۆڕ تەماشا دەکرێت، زمان چی دی تواناو ڕۆڵی پێویست بۆ کەشف کردنی راستی (حەقیقەت) نادۆزێتەوە. وەك ئادرنۆ دەڵێت زمان بەردەوام مەزەنەیەکی {تصور} هەڵە لە سیستمی مانایی بەدەستەوە دەدات. لێرەوە تێدەگەین بۆچی ئادرنۆ لە زۆریەی نوسینەکانیدا شێوازی پارچە نووسین بەکار دەهێنێت، بەتایبەتی لە (دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا). ڕۆحیەتی گشتی کتێبەکە جگە لە دوابەشی کە ڕاستەوخۆ لە پارچەی کەم تازۆر کورت پێکهاتووە، لەسەر بناغەی ئەم شێوە تێفکرین‌و نوسینە دامەزراوە. شێوەیەکی ئەوتۆ کە ئادرنۆ وەك مامۆستایەکی بێ وێنە لە هەندێك نوسینی تردا (وەك: ئەخلاقی بچوك) بەکاری هێناوە [٣]. لای ئادرنۆ بەکارهێنانی شێوازی پارچە نووسین بۆ دەرخستنی شێوەیەك لەبەرگری کردنە لەبەرامبەر سیستمدا.. بەرگریەك کە دواتر لەکتێبی (دیالەکتیکی نێگەتیفدا) بووە هۆی دژایەتی لەگەڵ سیستمی فەلسەفی هیگڵ). ئەم شێوازەی نووسین هەم بیری نەریتی ڕۆمانسیەکان‌و هەم بیری نوسینەکانی (نیتچە) مان دەخاتەوە. لەلایەکی تریشەوە نوسینەکانی ئادرنۆ لە نوسینەکانی (بارت) و (جاك دێریدا) نزیك دەکاتەوە. بەڵام باسکردنی ئادرنۆ نابێت مامۆستای (هورکهایمەر) مان لەم شێوازە نوسینەدا لەبیر بباتەوە. لە کتێبێکدا کە دەقە سەرکیەکەی لەساڵی ١٩٧٤ دا بڵاوکرایەوەو پێش چەند مانگێك بۆ زمانی فەرەنسی وەرگێڕا (کۆتایی بەهاری ١٩٩٣) دەتوانین توانای هورکهایمەر لە (پارچە نوسیندا) ببینین. ئەم کتێبە ناوی ·یاداشتە ڕەخنەگرەکانە( کە پێکهاتووە لەو پارچە کورتانەی هورکهایمەر لەماوەی ساڵەکانی ١٩٤٦و ١٩٦٦ دا نوسیویێتی‌و ناونیشانی دووهەمیشی (دەربارەی ڕۆژگاری ئێستایە) [٤] لەم کتێبەدا نزیکی هورکهایمەر لەو شێوازی (پارچە نوسینە) وە دەبینین کە ڕەخنەگرانی ئەمڕۆ بەکاری دەهێنن. شێوازی (پارچە نووسین) ڕێژەی لوژیکی‌و عەقڵانی نێوان (رستەکان) و قسە تیۆریەکان لەناو دەبات.. ڕێژەیەك کە بەپێی یاسا تەقلیدیەکانی نوسین دادەڕێژری‌و وادادەنرێت کە ڕێژەکی لوژیکیە. بە سڕینەوە یان لابردنی ئەم (پەیوەندیە لۆژیکیە) و دەتوانین بڵێین (لەڕێی سڕینەوەی) مەجازەکانی وتەوە (بۆ نموونە وەك: (ئەم شێوەیە..)، (لەم رووەوە..)، (لەبەر ئەم هۆیە...)، ·ئینکار ناکرێت کە.. )) هەر پارچەیەك نرخی تایبەتی خۆی وەردەگرێت‌و دەبێت بە واقعێك بۆ خۆی... پارچەکان بەنرخە تایبەتیەکانی خۆیانەوە لەناو گشتێکدا جێگەیان دەبێتەوە، و ئەمەش لەبونیادی خۆیدا شێوازێکی مۆسیقاییە. پارچەکان ئیتر بڕیار نیە ڕۆشن کەرەوەبن بەڵکو پیشاندەرن. لەناو هەناوی ئەم شێوە دەرخستن‌و نمایش کردنەشدا یاسایەك خۆی حەشار داوە: {کە ئەویش ئەوەیە} هەمەکی (کلی)، ناراستەو (کۆ [مجموع] درۆزنە)، بەو مانایەی ئەوەی بە حەقیقەتی کلی و کۆتایی کۆ (مجموعە) دەزانرێت تەنها واقعێکی ئایدۆلۆژیە.

کتێبی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری، کتێبێکی نائومێدو ڕەشبینە. کتێبەکە سەبارەت بە پرۆسەی خۆوێرانکردنی ڕۆشنگەریە کە هیچ جێگایەك بۆ ئومێد ناهێڵێتەوە. هەردوو بیریار شەیدای (شوپنهاوەر) بوون و کاتێکیش باسی لایەنە تاریك‌و ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگای مۆدێرنیان دەکرد، بیری ئاوازی نائومێدی ئەو بیریارەیان دەخستینەوە. ئەم پێداگرتنە لەسەر کارەسات‌و دەست شتن لە ئومێد، کتێبەکە لە ئێستا نزیك دەکاتەوە {چونکە} ئاوازی کتێبەکە لە نوسینی بیریارانی (پۆست مودێرنیزم) نزیك دەکاتەوە. ئادرنۆو هورکهایمەر لە پێشەکی کتێبەکەدا دەنوسن (ئەو ئامانجەی دەمانەوێت

پێی بگەین زانینی ئەو خاڵەیە کە بۆچی مرۆڤایەتی لەجێی ئەوەی بگاتە هەلومەرجێکی بەراستی مرۆڤانە، لەشێوەیەکی تازەی بەربەریەتدا غەرق بووە)[٥]. بیرۆکەی کتێبەکە بەرهەمی ساڵە تاریکەکانی جەنگی جیهانی دووهەمە واتە پاش قەیرانەکانی سەرمایەداریو پاش (دادگایی کردنەکانی مۆسکۆ)و پاش ئاشکرا بوونی بەشێك (نەك هەموو) لە تاوانەکانی نازیزمو فاشیزم. ئاوازی نائومێدی کتێبەکە لێرەوە سەرچاوەی گرتووە. هێشتا ساڵێك بەسەر نوسینی کتێبەکەدا تێنەپەڕی بوو کارەساتی هیرۆشیماو ناکازاکی روویداو کاتێکیش کتێبەکە بڵاو بۆوە هەواڵو بەڵگەو وێنەیەکی زۆر لە ئۆردوگاکانی سوتاندنی مرۆڤ لەلایەن نازیەکانەوە، بڵاوکرابۆوە. ئێستا کە نیو سەدە بەسەر نوسینی کتێبەکەدا تێدەپەڕێت ئایا دەتوانین بپرسین ئەم دوو فەیلەسووفە حەقیان بوو ئەوەندە پێ‌لەسەر نائومێدی دابگرن یان نا؟

## تیورەی رەخنەگرانە

دیالەکتیکی رۆشنگەری پابەندە بەو تیورە رەخنەگرەی هورکهایمەرو ئادرنۆ لەدەیەکانی ١٩٣٠دا دایانڕشتبوو. لێرەوە بێ باسکردنی ئەم تیورەیەو هەوڵدان بۆ ناسینی، ناتوانین لە کتێبەکە تی بگەین. هورکهایمەر لە وتاری (کۆتایی عەقڵ) دا (١٩٤١) کە جێگەیەکی تایبەتی لە نویسنەکانیدا هەیە[٦] گوتبووی چەمکی عەقڵ هەر لەسەرەتای گوتاری مودێرینەوە هاوکات بوو لەگەڵ چەمکی رەخنەدا. لە بنەڕەتدا عەقڵ باوەڕی بێ ئامادەبوونی بیرۆکەیەك لە رەخنە، مومکین نەبوو.. چونکە کاری عەقڵ هەڵسەنگاندنە لەنێوان شتەکانداو جیاکاریکردنە بەپێی یاسایەك. [دیارە] ئەمە شتێکی تازە نیە. (جۆن لۆك) لە (وتارێك دەربارەی تێگەیشتنی مرۆڤ) دا (١٦٩٠) لە کتێبی چوارهەمو فەسڵی ((١٧)) دا چوار قۆناغی کاری عەقڵی بەم شێوەیە دانابوو: کەشفی راستیەکان، رێکخستنی دیاردەکان، کەشفی پەیوەندی نێوانیانو دواجار بەدەستهێنانی ئەنجامەکان[٧]. هیچ یەك لەم قۆناغانەش بێ دیدگایەکی رەخنەیی ناچنە پێشێ. لە ئەسکی یەکەمی ئەم کتێبەدا بینیمان کە بناغەی تیورەی کۆمەڵایەتی مۆدێرن: رەخنەیە. ئەوەی کەوتاری (کۆتایی عەقڵ) یش لە نوسینەکانی دەیەکانی ١٩٣٠ ی هوپهایمەر جیادەکاتەوە هەڵوێستی رادیکاڵانەیتی دژی (عەقڵ باوەڕی) .. هەڵوێستسێك کە رێگەی بۆ دیالەکتیکی رۆشنگەری کردەوە. بەڵام ئەم هەڵوێستە بێ نوسینەکانی پێشتری هورکهایمەرو بیریارانی دی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەدەست نەدەهات.

هورکهایمەر هەر لە سەرەتای بەڕێوەبردنی (بڵاوکراوەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیدا) لە زنجیرەیەك وتاردا کە بابەتی سەرەکیان ئەبەستمولوجیابوو لەبواری کۆمەڵناسیدا، تیورەی رەخنەگرانەی بەشێوەیەك پەرەپێدا کە بووە چوارچێوەیەك بۆ ئیشەکانی دوایی خۆیو سەرجەم بیریارانی دی قوتابخانەی فرانکفۆرت. یەکێك لە گرنگترین ئەم وتارانە ناوی (تیورەی کلاسیکیو تیورەی رەخنەگراه) بوو(٨) لەم وتارەدا هورکهایمەر جیاوازی نێوان ئەبەستمولۆژیای کلاسیکیو ئەبەتسمولۆژیای رەخنەگرانەی هێنایە ئاراوە. بەبڕوای ئەو ئەوەی عەقڵانیەتی دیکارتیو ئەریتی فەلسەفەی ئەزموونگەری ئینگلیزیو فینومولوژیای [دیاردەگەری] هوسرل بەیەکەوە گرێدەدات (یان هێڵێکی هاوبەشیان لەنێواندا دروست دەکات) ئاراساتەی هەریەکێکیانە بۆ جیاکردنەوەی زانست لە دەرەنجامە عەمەلیەکانی. گرنگتر لەمەش سەقامگیر کردنی رێژەی (خود/ بابەت) و رێژەی (حەقیقەت/ تیورە) یە. واتە ئەم تێڕوانینانە رێژەی (خود/ بابەت) بەشتێکی نەگۆڕو هەمیشەییو نەمر دەزانن. (خود) هیچ نیە جگە لەزیهنێك کە بەرەو بابەت ئاراستە وەردەگرێت. تیورەی کلاسیکی هیچ سەیرکدنێکی رەخنەگرانەی بۆ پێشنیارە سەرەکیەکانی باسەکەی خۆی نیە. واتە مەرجە کۆمەڵایەتیەکانی زانست پشت گوێ دەخاتو بەردەوام دروشمی (رزگاربوونی لێکۆڵینەوە لەبەهاکان) دووبارە دەکاتەوە کە لە سەردەمی (هیوم) بەدواوە بۆتە هۆی دیدگایەکی گشتگیر لە زانستو زانستگەریی.. دیدگایەك کە رەخنەگرانی ئەمڕۆ پێی دەڵێن (یۆنیڤێرسال Unaversal). بەڵام پەیامی تیورەی رەخنەگرانە، بیرکردنەوەیە لەهەمان ئەو خاڵە فەرامۆشکراوە سەرەکیە: واتە (هەلومەرجی بەدەستهێنانو ئەگەرەکانی زانین). ئەمانە [لەهەما کاتیشدا] هەلومەرجی کۆمەڵایەتین. هەر لەبەرە ئەوەش ناتوانن لەدەرەوەی سیستمی بەهاکان بن. (کانت) یش هەر ئەم

ئامانجەی هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو هەلومەرجانەی بەدەرئەنجامی کاری جۆرۆڤ نەدەزانی (یان بەلایەنی کەمەوە لە گرنگترین لایەنەکانیدا، بڕوای پێ نەبوو) لێرەوە گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتیو لەئەنجامدا پەیوەست بوونی بەو بەهایانەوە، لەچاو دووریوو. ناسینی سەرچاوەی کۆمەڵایەتی کێشەکان واتە ئەو هەلومەرجە واقعیو باڵادەستەی کەتیایدا (زانست بەکاردێت) هاوکاتە لەگەڵ هۆشیاربوون بەو ئامانجانەی زانست بەدوایدا دەگەڕێتو هەموو ئەمانەش نابێت لە پانتایی فەلسەفەی زانست دووربن. زانستی رووت بوونی نیە. هەر ئەوەندەی یەکێك بڕوای بەزانستێکی وەهابێت کاری خۆی بەدەرنیە لە نرخاندنو بەهادانان.. بەمانایەکی دی بیرۆکەی (رزگاربوون لە نرخو بەهاکان) خۆی جۆرێکە لە نرخو بەها لەناو هەمەکیەکی ئایدۆلۆژیدا.

هەر ئەوەندەی ئێمە کۆمەڵگامان وەك هەمەکەیەك [کلیت] (و لە ئەنجامدا وەك کۆیەکی ئایدۆلۆژی) خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە، ئیدی لەو بەلگەنەویستانە رزگارمان دەبێت کە دەبێتە هۆی بیرۆکەی (رزگاربوون لە نرخو بەهاکان). [لە راستیدا] ناتوانین راستیەکان بەشێوەیەکی یەك لایەنەو تەنیا، بناسین. بەڵام هەمان ئەو هۆکارانەی راستیەکان پێکەوە دەبەستێتەوە دەبێتەوە هۆی نرخو بەهادانانیش بەشێوەیەك کە ناچارمان دەکات لەکاتی لێکۆڵینەوەدا سەرنج لەو نرخو بەهادانانە بدەین. (هیگڵ) راستی دەکرد کاتێ دەیگوت تەنانەت هۆشیاری درۆینەش ساتەوەختێکی حەقیقەتە. ئەمەش دروست ئەو خاڵەیە کە ئەو رەخنەگرەی بڕوای بە (رزگاربوون لە نرخو بەهاکان) هەیە، فەرامۆشی دەکات. هورکهایمەر لەوتارەکەیدا ئەو شێوازەی واقیعەتەکان لەیەك جیادەکاتەوەو سەیری گشت وەك تایبەت دەکاتو بەبانگەشەی رزگاربوون لە نرخەکان، لە راستیدا نرخە باڵادەستەکان دەسەلمێنێ، [ئەو شێوازەی] ناونا (پۆزتفیسم) و پێی لەسەر ئەوە داگرت کە ئەم زاراوەیە بەهەمان ئەو مانایە بەکاربهێنین کە لەسەدەی نۆزدەوە بۆ کارەکانی (ئۆگوست کۆنت) و ئەوانی دیەوە بەکار هاتووە. ئادرنۆش کە چەندان جار ناوی پۆزتفیزمی هێناوە هەر ئەم مانایەی مەبەست بوو. لە وتووێژێکی فکری گرنگدا کە لەنێوان ئادرنۆو هابرماس لەلایەکو کارل پوپەرو هاوبیرەکەی (هانز ئالبرت) لەلایەکی دیەوە، درووست بوو (٩)، ئادرنۆ وتی بیرۆکەی (رزگاربوون لە نرخو بەهاکان) (خاڵێك کە پوپەریش رەخنەی توندی ئاراستە دەکرد) گرفتی بۆ پۆزتفیزم دروست کردووە. بەڵام ئەوەی گرفتی سەرەکیانە [واتە گرفتی پۆزەتفیزم] گوێ نەدانە بەوەی واقع وەك هەمەکیەك (تارادەیەك وەك ئەوە لوکاش ناوینا ((گشتی دیاریکراو)) بوونی هەیە. لەبەر ئەوە ئادرنۆو هاوبیرانی، پوپەریشیان کە دژی پۆزتفیسم قسەی دەکرد، هەر بە پۆزتفیزم تاوانبار دەکرد. دیارە پوپەر ئەم لەزگەیەی قبوڵ نەکرد و پێناسە دروست کراوەکەی ئادرنۆی رەد کردەوە.

پۆزتفیسم ئەم ناونیشانەیە کە (ئۆگست کۆنت) بەکارەکەی دابوو. مەبەستیشی زۆر رۆشنو سادەبوو: لەلێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکاندا دەبێ لەو راستیانەوە دەست پێبکەین کە بە شێوەیەکی پۆزەتیفانە دەتوانین لێیاتن بکۆڵینەوە. کەوابوو دەبێ یاسا میتافیزیکیەکانو پێشداوەریو بەلگە نەویستەکان فڕێ بدەینو ئەو شێوازە ئەزموونیانە بەکاربهێنین کە لە زانستە سروشتیەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوەو لە رووی عەمەلیشەوە تواناو جیهانی بوونی خۆیان سەلماندووە(١٠). پۆزتفیسمە لۆژیکیەکانیش ئەوەی ئەزموون دەکرێتو بە زمانێکی لۆژیکی دەردەبڕێت لە میتافیزیك جیادەکەنەوە. پوپەر (کە زۆر کەس بەهەڵە وادەزانن نزیکە لە پۆرتفیسمە لۆژیکیەکانەوە) بەدەر لەو گفتوگۆیانەی لەهەندێك مەسەلەی تیورەی فەلسەفیدا لەگەڵ بیریارانی (ڤیێنادا) دەیبوو، هەڵوێستێکی سەربەخۆو رەخنەگرانەی هەبوو کە دواجار لەوانی دوور دەخستەوە (١١) بەڵام بەبڕوای ئادرنۆو هابرماس، ئەم هەڵوێستە رەخنەگرانەیە بەس نیە بۆ ئەوەی پێی نەوترێت پۆزتفیسمە.

گفتوگۆی (ئادرنۆ، پوپەر) لەساڵی ١٩٦١ دا لە کۆنفراسێکدا لە (توبینگن) دەستی پێکرد. کە لەسەر دەعوەتی ئەنجومەنی کۆمەڵناسی ئەڵمانیا، ساز درابوو. باسی سەرەکی گفتوگۆکە بەلایەنی کەمەوە لە چرکەی یەکەمدا کۆمەڵناسی نەبوو، بەڵکو سەرەتای گفتوگۆکە جیاوازی نێوان ئەو شێوازانە بوو کە لەزانستیە سروشتییەکاندا بەکاردێت لەگەڵ ئەو شێوازانەی لە

زانستە مرۆییەکاندا بەکار دێت. ئادرنۆ لە باسەکەیدا دەستەواژەیەکی بەکارهێنا (کە پاشان هابرماس کردی بەناونیشانی کتێبێکی خۆی): (بابەت باسەکەمان (لوژیکی زانستە مرۆییەکانە)). ئادرنۆ پێی لەسەر ئەوە داگرت کە پۆزتفیسم ناتوانێت لەم لۆژیکە تێ بگات. دوو ساڵ دوای ئەوە واتە لە ساڵی ١٩٦٣دا هابرماسو ئالبێرت درێژەیان بە وتوێژەکەدا. ئاوازی توندیو وتوێژەکەیان کە جێی وتوێژی (ئادرنۆ- پوپەری) گرتبۆوە، گەرچی دەیتوانی ئارامتر بێت بەلام قولایی جیاوازی دیدگاکانی دەردەخست.

پوپەر هەرگیز ئەوەی خۆی پێی دەگوت (زانستگەری) قبوڵ نەدەکرد. ئەو رەخنەی لەو بڕوا با و ساویلکانەیە گرتبوو کەوا دەزانێت زانست پرۆسەی کۆکردنەوەی دراوە پۆزەتیفەکانەو دەتوانین لەرێی خوێندنەوەوە(٠استقراء) بە ئەنجامی گشتی بگەین. پوپەر هەرگیز قبوڵی نەکرد زانست بتوانێت لەبەهادانانو پێشداوەریەکان رزگاری بێتو سەریەخۆو بێت. ئەویش وەك ئادرنۆ بڕوای وابوو ئەم شێوازە ناتوانێت لە زانستە مرۆییەکاندا بەکار بهێنرێت یان دەرئەنجامێکی هەبێت. بەبڕوای پوپەر لێکۆڵەرەوە ناتوانێت واز سیستمی نرخو بەهاکانی بیری خۆی بهێنێو دەست بەلێکۆڵینەوەی دیاردە مرۆییەکان بکات. زانستگەریی زامنی بابەتی بوون [موجوعیەت] نیە. لەزانستە مرۆییەکانیشدا لێکۆڵەرەوە بەردەوام رێگە چارە بۆ گرفتەکان دەدۆزێتەوەو تا ئەو ئەنجامەی بەدەستی هێناوە هەڵە دەرنەچێت، ئەوا لەکارەکەیدا بەردەوام دەبێت. بەلام هەرکاتێك ئەنجامەکەی هەڵە دەرچوو دەبێت هەوڵ بدات رێگەچارەیەکی دی بدۆزێتەوە. کاری زانستی لەسەر بناغەی سروشتی بەدرۆخستنەوەی تیوریەکان راوەستاوەو بە پێچەوانەی (ئەوەی بەناوبانگە) زانست لەسەر بناغەی خوێندنەوە (الاستقراء) واتە لەرێی پێشکەش کردنی حوکمێك گشتی لەسەر بناغەی چەند ئەزموونێك تایبەتو بچووکەوە بەدەست نایەت.

مەوزوعیەت جیاوازە لەوەی بەباوەڕی هەموان دیاردیگەریە [عەینیەت]. چیتر ناکرێت قبول بکەین لێکۆڵەرەوە بەهەر شێوەیەك توانیوێتی خۆی لە پێشداوەریەکانی رزگار بکات. -گریمان کارێکی واشێمانەیە) کاری لێکۆڵەرەوە زامنێکە بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامێکی دیاریکراو. لەراستیدا پوپەر دیاردیگەری [عین گرایی] لە ئەبەستمولوژیای فەردیەوە ئەگوێزێتەوە بۆ پرۆسەی رەخنەی هەڵسەنگاندنی رێگەچارەکان. لێرەدا ئەو زانایەی لەبواری زانستە سروشتیو فیزیکیەکان دەکۆڵێتەوە وەك زانایەکی زانست مرۆییەکان هەر چارەو لەسەر بناغەی (راستی یان هەڵەی رێگە چارەکان) بەرەو پێکهێنانی دیدگا یان تیورەیەکی دیاردی [عینی] دەچێت، دروست وەك کەوانەیەکی بیرکاری کە بەرەو خاڵێکی دیاریکراو دەڕوات بێ ئەوەی هەرگیز پێی بگات. ئادرنۆ تا ئێرە لەگەڵ پوپەردا بوو بەلام لەم خاڵەوە لێی جیا دەبێتەوە. زانست بەرەو (دیاردیبوون) [عینیت] دەچێت بەلام ئەمە ئەنجامی ئەریتی رەخنەگرانەیە کە رێگە بۆ رەخنەگرتن لە تیورە بالادەستەکان، خۆش دەکات. رادەی دیاردیبوون [عینیت] پابەندە بەهەلومەرجە کۆمەلایەتیەکانەوە نەك بەتوانا زاتیەکانی لێکۆڵەرەوەو توانای دەروونی پەرەسەندنی زانست یان لێکۆڵینەوەی زانستیەوە. ئادرنۆ بەپێی پێناسێکی جیاواز پوپەر بە پۆزتفیسم لە قەڵەم دەدا. ئەو هەموو ئەو کەسانە بە پۆزتفیسم دەزانێت کە بابەتی لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی جیا دەخەنە ژێر لێکۆڵینەوەو نایگەڕێنەوە بۆ سەرجەم ئەو پەیوەندیانەی لێوەی هاتووە. کورتکردنەوەی لێکۆڵینەوە بۆ تەنها هەڵسەنگاندنی دیاردەیەکی سەلمێنراو، تەنها شێوەیەکە لە شێوەکانی پۆزتفیسم لە کۆمەڵناسی تازەدا. بە بڕوای ئادرنۆ ئەو شێوازە زانستیانەی لە شێوازە سروشتیەکاندا بەکاردێت ناتوانێ بۆ زانستە مرۆییەکان سودبەخش بێت. بەلام لەدیدگای رەخنەگرانەی پوپەردا شێوازی ئیشکردن لەهەردوو بوارەکەدا وەکو یەکە.

بگەڕێنەوە بۆ باسەکەمان. بناغەی تیورەی رەخنەگرانە رەد کردنەوەی پۆزتفیسمەو رەخنەگر بە تیورە یان شێوازێکی دادەنێت کە توانای نیە واقیع وەك کۆمەڵێك پەیوەندی ناوەکی بەشەکان، تەماشا بکات. پۆزتفیسم دیدگایەکی نامێژوویی هەیەو بە دیدێکی رەخنەگرانەوە ناڕوانێتە پێشنیارەکانی پرۆسەو ئامێرەکانی لێکۆڵینەوەو سەرنجیان لێ نادات. ماکس هورکهایمەر لەوتاری (تیورەی کلاسیکیو تیورەی رەخنەگرانەدا) نوسیویتی کە ئامانجی گەیشتن بە کۆمەڵگایەك کە لەسەر بناغەی عەقڵ دامەزرابێت (کە ئەمڕۆ تەنها لە خەیاڵی کەسانێکی کەمدا هەیە) ئارەزوویەکی دێرینەو بەهیچ شێوەیەك زادەی کۆمەڵگای مۆدێرن نیە. بەلام لە کۆمەڵگای مۆدێرندا توانا گەیشتن

بەم ئامانجە (لەبەر هۆی کۆمەڵایەتی لەناو چووە). ئایا دەتوانین لەم خاڵەوە ئەو دەرئەنجامە بەدەست بهێنین کە دواجار تیورەی ((رەخنەگرانە)) بە بونیادی تاککەری (فرد گرای) گەیشتووە؟ هورکهایمەر لە وتارێکدا بەناوی (دەوڵەتی دەسەڵاتخواز) وە کە لەساڵی ١٩٤٢ دا نوسیوێتی، دەڵێت رزگاربوون لە ترس و ئیستبدادو کارو قوربانیدان پەیوەندی بەئیرادەی یەك یەکی تاکە کەسەکانەوە هەیە [١٣] ئەم تاککەرییە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە رزگاربوون رەگی لە رەنجدایە بونیادی رەنجیش فەردیە. چەندان ساڵ دوای ئەمە واتە لە ساڵی ١٩٦٩ لە وتاری (تیورەی رەخنەگرانە دوێنێ و ئەمڕۆ) دا نووسی (سەربەخۆی مرۆڤ لە فەردیەتدایە) و (تاکە کەس دەبێت لەبەردەم جیهانی ئیداریدا) بەرگری بکات. لەم دیدگایەوە (کە بیری کافکامان دەخاتەوە) ئەم بەرگریکردنەی تاکە کەس دەبێتە هۆی (هوشیاریەکی تراژیدی): (ئێمە ئەمڕۆ خۆشبەخت نین.. ئەم خۆشنودیە بەهۆی رەنج و ئازارێکی زۆرەوە بەدەستهاتووە. ئەو رەنجانەی مرۆڤ و ئاژەڵەکان چەشتوویانە. کلتووری ئەمڕۆ دەرئەنجامی ئازارەکان رابردووە.. هەر کەسێك لەم خاڵە تێ بگات ئاگاداری تیورەی رەخنەگرانە بووە)[١٤] هورکهایمەر بەداخەوە دەنوسێت کە ئازادی و یەکسانی هەرگیز پێکەوە لەشوێنێکدا کۆنابنەوە. لەهەر شوێنێك هەوڵدان هەبێت بۆ یەکسانی، ئازادی کەمتر ئەبێت و لەهەر کوێیەکیش ئازادی هەبێت کەوابوو ئەگەری پێشکەوتنی تاکە کەس هەیە.. کەوابوو نایەکسانی دروست دەبێت و قووڵ دەبێتەوە[١٥]. لێرەوە ئەوەی مارکس وەك سوشیالیزم پێناسەی دەکرد (هیچ نیە جگە لە جیهانێکی ئیداری)[١٦].

تیورەی رەخنەگرانە بەروونی ئەوە دەبینێت کە (تیورەی کلاسیکی) خۆی ئەزموون -واتە گرنگترین ئامرازەکانی زانین- دروست دەکات. (ئەزمون لە سایەی ئەو مەسەلانەی کە لە ژیانی ناو کۆمەڵگا سەرهەڵدەدەن، دروست دەبێت)(١٧) دەرئەنجامی ئەمەش ئەوەیە زانست نرخێکی کاتی هەیە [چونکە] پێوەری راستی و هەڵەی لە زەمینەیەکەوە وەردەگرێت کە خۆمان ئامادەمان کردووە... زەمیەیەك کە خێرا نرخی خۆی لە دەست دەدات. جگە لەمە لە تیورەی کلاسیکیدا بیرکردنەوە لە بەڵگە نەویستە کۆمەڵایەتیەکان بەشتێکی زیادە دادەنرێت. واتە زەمینەی راستەقینەی زانست بێ بیرکردنەوەو بێ تێگەیشتن لێی، وەلاوە دەنرێت. (ئەم رەخنەگرتنە لە زانستگەریی مۆدێرن لەو رەخنەیەی (هوسرل) دەچێت کە دەیگوت زانست ناتوانێ (ژیانی جیهان) بناسێ. بەڵام بەداخەوە هورکهایمەر لەسەردەمی نوسینی وتارەکەیدا لە دەیەکانی ١٩٣٠دا ئاگاداری کارەکانی (هوسرل) نەبوو کە دواتر لە (قەیرانی زانستە ئەوروپیەکان و..) دا بلاو بۆوە) زانستی مۆدێرن رێگەی لێگیراوە لەو هەلومەرجانە بکۆڵێتەوە کە (ئەگەری بەدەستهاتنی زانستە) ئەمە ئەرکی تیورەی رەخنەگرانەیە کە (بیر لەو هەلومەرجە باڵادەستو ئێستاییە بکاتەوە کە تیایدا ناسین مومکینە) ئەمەش نەك بەو مانایەی لە فەلسەفەی (تراندستالی) کانتدا هەیە، بەڵکو لە سنوری کرداری ئامادەو بەهێزی ژیان و کار لەم جیهانەدا. تیورەی رەخنەگرانە دەچێتە ناو ئەو پانتاییانەوە کە زانستەکان وازیان لێ هێناوە: واتە (سەرچاوەی کۆمەلایەتی گرفتەکان ئەو جێگە راستەقینانەیان زانست تیایدا بەکاردێتو ئەو ئامانجەی زانست لە پێناویدا دروست دەبێت). بیریاری رەخنەگر دەزانێت زانستی رووت بێ مانایەو هیچ رێگەیەك نیە جگە لەوەی کۆمەڵگا وەك گشتێك بخەینە ژێر لێکۆڵینەوەو دراوەکان لەڕێی پەیوەنیان بە دژدەکان و هاوشێوەکانیەوە، بناسین.

پوزتفیسرم کە ناتوانێ لەماهیەتی بونیادنراو لەسەر دژایەتی سەرجەمێکی کۆمەڵایەتی، تێ بگات، بەو دیاردیەش [عینیت] ناگات کە بانگهێشتی بۆ دەکاتو بە پێچەوانەی بانگەشەکانیەوە دەگۆڕێت بۆ دیدگایەکی زاتی. [لە بنەڕەتدا] شێوازێك نیە لە (نرخ و بەهاکان) رزگاری بێت. نرخ و بەهاکانیش لە ئاڵوگۆڕدا مانا وەردەگرن، واتە شتێك دەگۆڕێت بۆ (بوونێك بۆ ئەوی دی) نامۆ بوون لەو شوێنەدا دەردەکەوێت کە ئەم شتە بگۆرێت بۆ (بووونێك بۆخۆی) نرخ و بەهاکان بەهەر شێوەیەك بێت لە کۆمەڵگای چینایەتیدا هەنو چاوپۆشی و چاو داخستن لێیان هیچیان لێ کەم ناکاتەوە.

کۆمکەلگا لە نرخ و بەهاکان پێکهاتووەو لێکۆڵینەوەی واقیع بە هۆی کەسانێکەوەکە خۆیان ((بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتین))، ناتوانێ بەدەر لە بەهاکان بێت. لە باس کردن گفتوگۆی (ئادرنۆ -

پۆبەر)دا باسی ئەوەم کرد چۆن ئادرنۆ گرنگی ئەدات بە سەیرکردنی ((گشت)). ئەوەشم نووسی کە ئەم ((شتبوونە)) ب ناچار ئایدۆلۆژیە. لێرەدا دەتوانین لە نهێنی جیاوازی نێوان ئادرنۆو لۆکاش تێ بگەین.

بە بڕوای ئادرنۆ ئەو گشتبوونەی ((لۆکاش)) باسی دەکات تەنها تەسەورێکە لە گشتبوون. لۆکاش ((گشتی ئایدۆلۆژی))، لەبری گشتی کۆمەڵایەتی دادەنا. (بەڵام ئێمە لە ڕێ لێکۆڵینەوەی دیاردەیەکی تایبەتو تێگەیشتنی ڕەخنەگرانە لێی، تەنها دەتوانین تەسەورێك لە ((گشتیبوون)) درووست کەین. {بێگومان} ڕاست نییە گەر وەك پۆزتفیسمەکان بە لابردنی ئەم دیدگایە دیاردەکان بە جیا لەیەك بخەینە ژێر لێکۆڵینەوەوە – بەڵام ئەوەش هەڵەیە کە گشتی [تامیت] تەسەور کراو لە جێی واقعی گشتیو حەقیقەت دابنێین. حوکمە بەناوبانگەکەی ئادرنۆ کە ((گشت هەڵەیە)) جیابوونەوەیەکی بنەڕەتیئادرنۆ دەردەخات لە بیرۆکەی ((ڕۆحی بابەتی))[18]. ئادرنۆ بەم شێوەیە خۆی لە دوانە لێکدژی ((خود– بابەت)) ڕزگار دەکات (ئەم ڕەخنەیەی ئادرنۆ لە هیگل)) هەر هەمان ئەو دەرئەنجامەیە کە ((جیلّ دۆلۆز)) لە ڕێگەیەکی یەکجار جیاوازەوە، پێی دەگات). لە یەکەم ووتاری ((بەیاننامەکاندا)) کە لە ساڵ ١٩٥١دا نوسراوە، دەخوێنینەوە کە بەرهەمی فیکری سەرکەوتوو ئەوە نییە کە دژایەتیەکانی بابەت لەیەك هاوسەنگی دروستکراودا لەناو ببات بەڵکو ئەوەیە بیرۆکەی ((هاوسەنگی بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە ڕابگەیەنێت)).. بەو مانایەی دژایەتە پەتیەکان کە چارەسەر ناکرێن لە دەرونی بونیادەکەیدا بچێنێ))[19]. دروست بەم مانایە بوو ((ئادرنۆ)) دەیگوت: ((زانست پێویستی بە کەسانێکە کە سەرپێچی لێ بکەن)).

خاڵێکی گرنگ کە لە باسکردنی تیوەرەی ڕەخنەگرانەدا دێتە پێشێ پەیوەندی چەمکی ڕەخنەیە لای هورکهایمەر بەو ((ڕەخنە ئایدۆلۆژیەی)) مارکس هێنایە ئاراوە. هەڵوێستی هورکهایمەر سەبارەت بە ((شێواز ناسی)) مارکس واتە ئەوەی لایەنگرانی پێی دەڵێن ((ماتریالیزمی مێژووی))و ڕەخنەگرانیشی بە ((جەبریەتی ئابووری))[16] لە قەڵەمی دەدەن، نزیکە لە نامەکانی ئەنگلزەوە بۆ ((ژۆزێف بلۆخ))و ((کۆنراد شمیدت)) (لە ساڵی ١٨٠٥دا) کە تیایدا باسی ڕۆڵی چارەنوسسازی ژێرخان لەسەر پەرەسەندی کۆمەڵایەتی تەنها ((لە دوا شیکردنەوەدا)) کراوەو باسی پێویستی لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزەکانی تری ((سەرخان)) کراوە کە بە پێی خۆیان کار لەسەر پەرەسەندنی مێژوویی دەکەن[20].

هورکهایمەر بڕوای وایە باسکردنی کاریگەری ڕاستەوخۆی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەسەر (کلتورو سیاسەتو مافەکان..هتد) لە هەموو کاتێکدا ڕاست نییە. ئەم پەیوەندیانە یەکێك لە هۆکارو ئامڕازەکانی کاریگەرین {بەڵام} لە بواری ژیانی سیاسیدا دەسەڵات لەسەر بناغەی توانایەك دروست دەبێتو ئاڕاستەو ڕەوایەتی وەردەگرێت کە خۆی ئەنجامی قبولکردن یان خواستی تاکە کەسەکانە. ئەم قبولکردنەش خۆی دەرەنجامی دەزگا ڕۆشنبیرییەکانی وەك : خێزان، سیستمی پەروەردەو کارو دینە. دەسەڵات دەبێ دەسەڵاتێکی ڕەوا بێت یان وەك ئانتۆنیۆگرامشی (کە یەکێکە لە ڕوناك بیرترینو بەرجەستە ترین بیریارانی مارکسی) دەڵێت، دەوڵەت دەبێ باڵادەستیەکی ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا هەبێت. ئەگینا ناتوانێت (هاوسەنگی هێزەکان)) ڕابگرێت. شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتیو بونیادە دەسەڵاتدارە بەهێزەکانی (لە بونیادی سیاسیو کلتورییەوە بۆ ئەو بونیادانەی لەسەر بناغەی دینامیکییەتی ژیانی کۆمەڵایەیو شێوەی گۆڕانی نەریتەکانو پەیوەندییەکان دروستدەبن) {هەموو ئەمانە} بەتەنها لە پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان نایەنە دەرێ. ئەم تێڕوانینە کە تا ڕادەیەك ڕەگی لە نوسینەکانی خودی مارکسدا هەیە، لە نوسینەکانی هورکهایمەردا تا ساڵی ١٩٣١ باڵا دەست بوو. لەبەر ئەمە لە دەیەکانی ١٩٣٠دا چەندانجار دوپاتی کردەوە: هەموو شێوەکانی دەسەڵات سلبیو کۆنەپەرستانە سەرکوتکەر نیەو لێرەوە دەسەڵات تەکنیکی بەسر سروشتدا بە دەسەڵاتێکی پێشڕەو دادەنا( تێڕوانینێك کە هەرگیز لە فیکری ڕەخنەگرانەو ڕادیکالانەی ئەمڕۆدا قبوڵناکرێت).

دیارە هورکهایمەر بڕوای بەوە هەبوو بەکارهێنانی شێوازی زانستە سروشتییەکان لە زانستە مرۆییەکاندا، پڕ لە مەترسیە. بە هەر حاڵ ئەوە ئاشکرایە کە بەپێی ئەم تێڕوانینە پێشکەوتنی تەکنیکی دەتوانێت ببێ بە موبوریری دەسەڵات. هەرچەندە ئەمە ئەو ئەنجامە نییە

که هورکهایمەر بە دوایدا گەڕابێت یان بەرگری لێ کردبێت. بەڵام ڕوداوە سیاسیەکانی دەیەی ١٩٣٠، دادگایەکانی مۆسکۆو سەرکوتکردنی نەیارەکانی ستالین لە حزبی کۆمۆنیستو(کۆمەڵگای سۆڤێت، لەو کۆمەڵە هۆکارانە بوون کە تەنانەت سەختگیرترین لایەنگرانی کۆمۆنیستی ناچار دەکرد بە بڕواکانی خۆیاندا بچنەوە، جا چ بگات بە بیریارێکی سەربەخۆی وەك هورکهایمەر. لە نوسینەکانی پاش ١٩٤٠ی هورکهایمەردا دەتوانین سەرەتای ڕەخنەگرتن لە چەمکی پەرەسەندن بدۆزینەوە. هێواش هێواش ئەم ڕەخنەیە، عەقڵانیەتیشی گرتەوە (کە بناغەی سەرەکی بیرۆکەی پەرەسەندنە). هورکهایمەر ڕەخنەگرتنی لە مۆدێرنیتی دەست پێ کرد.

بە بڕوای هورکهایمەر مێژووی مۆدێرنیتی، مێژووی ئابوری ئازادە. ئەو بە شێوازێك کە بیری مارکسی دەخستینەوە، سەردەمی مۆدێرنیتی بە سەردەمی دەسەڵاتی بۆرژوازی ناونا. سەردەمی پەرۆشی بۆ جێگیر بوونی یاساکانی بازاڕی ئازادو (بازاڕ ئازادی ئاڵوگۆڕی کار بە کرێ) کە بوونە هۆی خەباتکردن دژی پاشماوەکانی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەیو شێوازە کۆنەکانی مولکایەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان. ئەو سەردەمە، سەردەمی تێکۆشان بوو دژی ئیستبدادو نەریتە کۆنەکانو باوەڕ سواوەکان.. بەڵام سەرمایەداری ئەمڕۆ بۆ مانەوەی خۆی گەیشتۆتە قۆناغی کۆکردنەوە {تمرکز}و تایبەت کردنی {انحصار} سەرمایەو دەستێوەردانی بەربڵاوی دەوڵەت لە ژیانی ئابووریداو ئەوەی (مارکس فیبەر) ناوینا ((عەقڵانیەتی بەرهەمهێنان)). ((دەوڵەتی لیبراڵ)) کە گونجاو بوو لەگەڵ ئەو قۆناغەی یەکەمدا، هەر لە سەرەتاوە ئەو ڕەگەزانەی لەناوخۆیدا پێدەگەیاند کە سنورداری{محدود} دەکەن، جا چ بگات بە ئەمڕۆ.

هورکهایمەر لە ووتاری ((کوتای عەقڵ)) دا تا ئەو جێگەیە ڕۆیشت کە بنوسێت کە فەردەیەتیش لەم سەردەمە نوێیەدا لە ناو چووەو تاکە کەس لەناو کۆیەکی{مجموعە} ئاڵۆزدا تواوەتەوەو گیانی بونیادە سیاسیە مۆدێرنەکان نەك دیموکراتی بەڵکو سەرکوتکەرە. بەڵام لە زۆربەی نوسینەکانی تری هورکهایمەر لە ساڵی ١٩٤٠دا پێی لەسەر ئەو خاڵە داگیراوە کە ((ڕزگار بوون پەیوەندی بە هەموو تاکەکانەوەیە {فەردەکانەوە}و تاکایەتی{فردانیەت} گۆڕاوە بۆ هێزێکی بەرگریکەرو داهێنەرو ڕەخنەگرانە. خێزان لەم ئاراستەیەدا خوڵقێنەری هەڵومەرجێکی دوو لایەنەیە (کە کاریگەری دوو لایەنەشی دەبێت): {چونکە} لە ناویدا لە لایەك هێشتا گیانی ئازادی دەدۆزینەوەو بەشداریدەکات لە دروستکردنی تاکەیەتیدا {فەردانیەت}و لە لایەکی دیشەوە دەتوانێت ڕۆڵی ئەوە ببینێت کە تاکە کەس هاوڕەنگی کۆمەڵ بێت.. کۆمەڵێك {کە لە بنەڕەتدا} سەرکوتکەری غەریزەو سەربەخۆیی فەردە. پەیوەندی (دایكو کوڕ) و (پەیوەندی جنسی) بەرلەوەی دەستنیشانکەری ڕۆڵە تایبەتیە کۆمەڵایەتیەکانی بن ، ڕاکردنی هەستو غەریزە پیشان دەدەن لەو کۆتو بەندانەی کۆمەڵگاکە بەهۆی ((عەقڵ ئامێری)) یان (عەقڵ ئابورییەوە) بەڕێوە دەبرێت. ئەم تێڕوانینە لە وتاری (دەسەڵاتو خێزان)ی هورکهایمەردا باسکراوە. لەم وتارەیدا {هورکهایمەر} باسی هەردو لایەنەکەی ژیانی خێزانی کردووە.[٢٢] بەڵام ئەو لە وتاری (کوتای عەقڵ) دا ئاوازێکی نائومێدانە تر و چەندان جار ڕەشبینتری گرتە بەر. لەم نوسینەدا دەپرسێت: چۆن خێزان وەك دەزگایەکی ئابوری خوڵقێنەری سەرەتا ترین ڕەگەزەکانی ژیانی ئابورییە؟ ئەم پرسیارە بووە هۆی دەرکەوتنی بیرۆکەیەکی تازە لە نوسینەکانی هۆرکهایمەرو ئادرنۆدا: دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا. ئەوان دەریان خست بیرۆکەی دەسەڵات بەسەر سروشتدا لە دەسەڵاتی واقعی مرۆڤ بەسەر مرۆڤەوە وەرگیراوە. ئەم دوو {دەسەڵاتە} لە پێویستە تەکنیکییەکانی بەرهەمهێنانی سەرەتاوە سەریان هەڵداوەو بەهۆی شێوازە کلتووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە، بەهێز دەبن. ((پەرەسەندن)) کە لە ناوەڕۆکیدا پێویستە تەکنەلۆژیەکان وەك ڕەگەزی باڵادەست کار دەکەن، ئیتر لای هەردوو بیریار وەك خوڵقێنەری ((دەسەڵات لە ژیانی ڕۆژانەدا)) دەردەکەوت. بیرۆکەی کۆنترۆڵکردنو دەسەڵات بەسەر سروشتدا کە ڕۆشنگەرانو (مارکس)و فیبەرو (هورکهایمەر) (لە دەیەکانی ١٩٣٠دا) قبوڵیان کردبوو، ئێستاو لەسەرتا تاریکەکانی دەیەی ١٩٤٠دا، ئیتر قبوڵ نە دەکرا. ئەمە یەکەم هەنگاو بوو بەرەو ڕەخنەگرتن لە ((عەقڵ ئامێری)) کە لە کتێبی ((دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا)) باسکراوە.

ڕەخنەو توندەکانی لە فەلسەفە پێشکەوتن گەرییەکانو مێژوو دەست نیشان دەکات.

لەبەرئەوەی هەردوو ڕەوتەکە هەڕەشەی ئەوە دەکەن شەرعیەت بدەن بە سیستمی جێگیر (مەوجود) بە کەنارکردنی ئەو ئەگەرە یۆتۆپیاییە بۆ هەتا هەتایە کە لەو وشیارییەدایەو پێی وایە لەوانەیە شتەکان بگۆڕێن. پێشکەوتنگەری هەموو ئەو شتانەی بە سروشتی کرد کە مرۆڤ دروستی کردوون. هەموو شتێك دەبێتە حەقیقەتێکی پۆزەتیڤو خۆی دەسەپێنێت بەسەر وشیاری مرۆڤایەتیدا وەك حاڵەتێکی خۆسەلماندن یان شتێکە کە بەرەنگاری کردنی لە توانادا نییە تا ئەوئاستەی وشیاری شۆڕگێڕی هەست بە شەرمەزاری دەکات لە خۆییو لە یۆتۆپیانیزکەیو دەگۆڕێت بە متمانەیەکی ئەوتۆو بەرچاوی ڕدوتەکانی مێژوو کە بەئاسانی وەردەگیرێت. دژە پێشکەوتن نائومێدی مێژوویی دەگۆڕێت بە ڕێسایەك کە پێویستە ئێمە ڕێزی لێبگرین: تا ئەم ساتەی ئێستا هیچ پێشکەوتنێك بەدی نەهێنراوەو لەبەرئەوە هەرگیز هیچ پێشکەوتنێك بەدی ناهێنرێت. لە هەردووکیاندا هەمان ڕەوتی پۆزەتیڤانە بەدی دەکەین کە پێی وایە هەر شتێك مرۆڤ نەیبووە بەفەرمانێکی ئۆنتۆلۆژیانە لێی یاساغ کراوە. ئادۆرنۆ کە متمانەی هەبوو بەمیتۆدە پەرشو بڵاوەکەیو دڵسۆزیش بوو بۆی لەهیچ شوێنێکی نووسینەکانیدا ڕەخنەیەکی سیستماتیك پێشکەش ناکات.

هەروەها تیۆرێکی مێژوویشمان پێشکەش ناکات کەلەوانەیە بناغەی ئەوجۆرە ڕەخنەیە پێك بهێنێت. بە پێچەوانەوە، ئادۆرنۆ خۆی دەنوێنێت بە زنجیرەیەك هەوڵی بەدوایەکتریداهاتوو بۆ دیاری کردنی هێڵەکانی دەوڵەمەنترین و تارماییترین گرفتی دیالێکتیکی چەمکی پێشکەوتن. ئادۆرنۆ کە دەچێتە ئەودیوی ئەفسانەکانی بۆرژواو نۆستالژیای کۆنەپەرستانەوە زاڵ دەبێت بەسەر گەشبینی تاك ئاڕاستەیی مارکسیزمی پۆزەتیڤانەو پاساوە سەرسوڕهێنەکانی لیبرالیزم دا دژایەتییەکانیو دژەکانی پێشکەوتن ڕیزدەکاتو تیشك دەخاتە سەر ئەو ترسو بەڵێنانەی کە هەڵیگرتووە. بیری ئادۆرنۆ کە گرژی ناوخۆ، هەژاندبووی هەرگیز ئارام نەبوو بۆئەوەی پشوو بداتو هیچ ئەنجامگیرییەکیشی نەدۆزییەوە کە قایلی بکات، ئەم سەمفۆنیا بێکۆتاییە، سەرەڕای هەموو شتێك، کەوتۆتە ژێر دەستی تۆنێکی بەدبینیو کەئیبەوە، ئادۆرنۆ ئەوە ڕەت دەکاتەوە مل بۆ گۆرانییە خۆشەکانی پێشکەوتنو مۆدێرنیتی کەچ بکات.

تێڕوانینەکانی ئادۆرنۆ گوزارشتی لە ئەزموونی مێژوویی نەوەی خۆی دەکرد. بۆئەوەی ڕوونتر بدوێین ئەوان لە ئەزموونی جوولەکەیەکی ئەوروپای ناوڕاستەوە دەستیان پێکرد کە خرایە بەردەم دوولایەنی زۆر خراپی ((بە دڵنیاییەوە وە زۆر جاوازی)) فاشیزمو شێوازی ژیانی ئەمریکای سەدەی بیستەمەوە. تێبینی بەدبینانە بەڵام بەجۆرێك کە لێی تێدەگەین لە نووسینەکانی ساڵانی (١٩٤٤-١٩٤٨) ی دا بەدی دەکرێت، دیالێکتیکی ڕۆشنگەریو مینیمامۆرالیا، کە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانو دوورخراوەییدا بۆ ئەمریکا نووسیونی.

بەهەرحاڵ نووسینەکانی وەك گشتی شێوازێکی جەدەلی بەردەوام، تێکۆشانێکی بەردەوامو نائومێد لە بەدەست هێنانی ئومێد بە داهاتوویەك کە لە زنجیرە توانای جادوو یەکانگیری ((پێشکەوتن)) و ((گەڕانەوە)) ئازاد کرابێت.

پەراوێزەکان:

- پێشکەوتنگەری لەجیاتی پێشکەوتنخوازی بەکار هێنراوە چونکە وشەی پێشکەوتنخوازیو پێشکەوتنخواز لەفەرهەنگی ئێمەدا زیاتر ڕەهەندێکی سیاسی هەیە.
- دەستەواژەو وشەی نێو کەوانە گەورەکان زیادەی وەرگێڕن بۆ مەبەستی زیاتر ڕوون کردنەوەو گەیاندنی واتا ناوەڕۆکی ڕستەکان.
- **Aporia** چەقی شاردراوەیە کە لەلایەن زیوسی خوداوەندەوە بەکار هێنراوە.

* مارتن رایل ئەم بابەتەی گۆڕیوە بۆ ئینگلیزی سەرچاوە: گۆڤاری(**Radical Philosophy:**) ژمارە (٧٠) - ١٩٩٥.

دەرکێت))[٢٥] {بەم شێوەیەش} زانست خاوەن ماناو دیدگایەکی کۆمەڵایەتی نابێت. زانای پسپۆر {متخصص} دەست بە کاری تایبەتی خۆی دەکات کە لە باوەڕە کۆمەڵایەتیەکانی جیاوازە. ئەنانەت هەندێ جار {ئەم دوو لایەنە} دەکەونە دژایەتیەوە ((وەك کاردانەوەی ((ئەنیشتاین))و ((ئۆپن هایمەر)) بەرامبەر بە تاقیکردنەوەی چەکی ئەتۆمی). لەم حاڵەتەدا ئامادە بوونی دولایەنەی زانست زیاتر ئاشکرا دەبێت. زانست لە سەرجەمیدا وەك یەکپارچەی دیاریکراو دەرناکەوێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە پەرەسەندنێکی لاسەنگو وێرانکەر وەردەگرێت.

هوکهایمەر بیرۆکەی سەربەخۆیی ژیانی سروشتی ڕەت دەکاتەوە. تێگەیشتن لە سروشت (واتە شێوەی گۆڕینی)، پابەندە بە شێوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە. زانست چەند پەیوەستە بە پەیوەندی بە سروشتەوە، هێندەش پەیوەستە بە پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیو قۆناغێکی دیاریکراوی دابەشبوونی کاری کۆمەڵایەتیەوە. لەو ڕووەشەوە کە کاری لێکۆڵەرەوەی پسپۆر وەك هەموو ئەو کارانەی تر تەماشا دەکرێت کە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە ڕێکخراون، کەوابوو هەمان ئەو یاساسەرەکیە بەسەریدا زاڵە کە ماوە دەخاتە نێوان بەرهەمهێنو بەرهەمەکەیەوە.. ماوەیەك کە دەبێتە هۆی نامۆ بوون. یەکێك لە لایەنەکانی ئەم نامۆ بوونە پێداگرتنو سووربونی زانستی مۆدێرنەلەسەر ئەوەی لێکۆڵینەوەی زانستی بەدەر لە نرخو بەهاکانە. {ئەمە} لە کاتێکدا کە دەتوانین تەنانەت لە ئاڵۆزترین شێوازەکانی پراکتیکی زانستدا، پەیوەست بوونو پەیوەندی بە کاری کۆمەڵایەتیەوە (کە زۆر بە وردیش دەستنیشان ناکرێت) بدۆزینەوە[٢٦]. یەکێك لە ئەرکەکانی تیورەی ڕەخنەگرانە لەناوبردنی دولایەنی {پنائیە} یان جیاوازی نێوان تیورەی تەجریدیو دەرەنجامەکانی زانستە.. {لابردنێك} کە ماوەی نێوان حوکمی فەلسەفیو ئەزموون کەم دەکاتەوە. تیورەی ڕەخنەگرانە هەم ((لە کاری پشت بەستوو بە تیورەوە)) سەرچاوە وەردەگرێتو هەم خوڵقێنەری شێوازی تازەی ئەم کارەیە. لەم ڕووەوە {تیورەی ڕەخنەگرانە} وەك ((هربرت مارکیۆز)) دەڵێت ((بەرەو ڕێکخستنێکی تازە لە ڕێکخستنی کار)) ئاراستە وەردەگرێت. ئێستا دەبێت بپرسین ئەم ڕێکخستنە عەقڵانیە یان نەو؟ ئەگەر عەقڵانیە ئەوا جیاوازی لەگەڵ ((عەقڵ باوەڕیو عەقڵ ئامێریدا)) چیە کە ئەوەندە لە لایەن نوسەرانی (دیالەکتیکی ڕۆشنگەری))ەوە ڕەد دەکرایەوە؟ ئادرنۆ بە پێداگرتن لەسەر ئەو خاڵەی لە بنەڕەتدا ((عەقڵ باوەڕی – ئامێری)) عەقڵانیەت نیە، بەڵکو شاردنەوەی نا عەقڵانیەتی زاتی سەرمایەداریە، ڕێگایەکی بۆ وەڵامم کردۆتەوە. بۆ تێگەیشتن لەم خاڵە چاتر وایە باسی خاڵێك بکەین کە سەرەتا وادەردەکەوێت خاڵێك بنەڕەتی نیە. ئادرنۆ لەو نوسیانانەدا کە پاش جەنگ جیهانی دووەم نوسی ئەو باوەڕە باڵا دەستەی ((مارکسیزمی ڕەسمی)) ڕەد دەکردەوە کە پێی وایە پەرەسەندنی سەرمایەداری ئەگەر و توانای ڕزگار بوونو ئازادی دێنێتە ئاراوە. ئەو بڕوای وابوو ئەمە جگە لە خۆشبینی هیچی دی نیە. جۆرێك لە خەیاڵ لەو مەسەلەیەدا کە ئەگەر هێزەکانی بەرهەمهێنان لە چنگی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان ڕزگاریان بێت، ئەوا زەمینەی ژیانێکی ئازاد لەکۆمەڵگایەکی ئازاددا دەڕەخسێنێ. بەڵام هەر وەك ئەزموونەکانیش سەلماندیان: ڕێگای تێپەڕیوون لە پەیوەندیەکانی سەرمایەداری، نەك کۆمەڵگای ئازاد، بەڵکو(( توانەوەی زیاتری تاکە کەسە لە گشتدا))و ((دەسەڵاتێکی بەهێزتر)) و ((دەوڵەتێکی بەهێزترە)). چیرۆکی ساویلکانەی مارکسیستی کە حوکمەکەی هیگڵ دوبارە دەکاتەوە و مێژوو بە پەرەسەندنی ئازادیدادەنێت، ڕاست نیە. ئادرنۆ نوسیویەتی: ((مێژووی جیهان دەبێت دروست بکرێتو نەفیبکرێت، پاش ئەو هەموو کارەساتانەی ڕوویانداو ئەو کارەساتانەش کە بەرێوەن، بێ شەرمانەیە بڵێین نەخشەیەك بۆ جیهانێکی باشتر دێتە ئاراوەو وەك زنجیرەیەکی پێکەوە بەستراو پیشانی بدات))[٢٧]. لێرەوە بە بڕوای ئادرنۆ ناتوانین دەرەنجامی ((عەقڵ باوەڕی – ئامێری)) ڕۆژئاوا بە سۆشیالیزم بزانین، بەڵکو دەرەنجامو کۆتاییە لۆژیکیەکەی: فاشیزمە. ئەم عەقڵانیەتەی بەدوای دەسەڵاتو تواندنەوەی بەش (تاکە کەس) لە گشتدا (کۆمەڵگا) دەگەڕاو ئامانجی جگە لە یەکێتیو یەکپارچەیەکی درۆزنانە هیچی دی نەبوو، دروستکەری ڕژێمێکی تۆتالیتەرەو بەم مانایەش دیموکراسی ڕۆژئاوا شێوەیەکی کەموکوڕی فاشیزمە. ئەم دەرەنجامە بابەتی هەندێك لە نوسینەکانی (هربرت

مارکۆن)یشه، به تایبەتی له کتێبی ((مرۆڤی تاك ڕەهەندا)) ١٩٦٤. بەڵام ئێمە ئێستا بەرەو باسکردنی کتێبێکی دی دەڕۆین کە بابەتی سەرەکی باسەکەمانە. {کتێبێك} کە بێ ووردبوونەوە لێی نە کتێبەکەی مارکیۆز بە باشی تێدەگەینو نە مێژووی ئەم سەدەیەش. دەزانم ئەم حوکمە لە سەرەتادا بە زیادڕەوی دەزانرێت، بەڵام لەو بڕوایەدام زۆربە خوێنەرانی ((دیالەکتیکی ڕۆشنگەری)) لەم بڕوایەدا هاوبیری منن.

## ڕۆشنگەری: ئازادی یان کۆیلەیەتی

لە بەشی شەشەمی (فینۆمۆلۆژیای ڕۆح))ی هیگلدا باس لە بێتوانای ڕۆشنگەری کراوە لە ئاشتکردنەوەی ((ڕۆحی زیهنی))و ((ڕۆحی بابەتی))دا. ڕۆشنگەری لەبەر ئەوەی نەیتوانی هاوسەنگیەك لە نێوان ئەو دوانەدا دروستبکات، ئاینرایەکی (مژهب) تری دروستکرد، ئەگەرچی دەیگوت لەگەڵ ئاینزادا بەینی نیە. ڕۆشنگەری بە بنەما تایبەتیەکانی خۆیەوە دژی ئیمانی دینی نەدەجەنگا، بەڵکو بنەماکانی خۆی لەسەر ئیمان دامەزراندبوو[٢٩] لێرەوە هیچی تازەی نەهێنا جگە لە ((ئیمانێکی بەتاڵ بە ناوەڕۆکێکی خەیالی خۆی))[٣٠] . لە کرداردا ئەم ناوەڕۆکە خەیاڵیە هیچ ڕێگایەکی لەبەردەمدا نەما بۆ ئەوەی ئەو شتە ئەزمون بکات کە خۆی ناوینا ((ئازادی تەواو))، جگە لەو پەیکەری تیرۆرەی شۆڕشی فەرەنسی خولقاندنی. بەپێی ئەم تەفسیرە لە باسەکەی هیگلٚ تەنها ئەو عەقڵەی کە لە پاش ڕۆشنگەریەوە بەهێز بووەو پەرەیسەندووە (و دیارە بە مانایەك یەکێکە لە دەستکەوتەکانی خۆشی) دەتوانێت لە کەموکوڕیەکانی تیبگات. ئەم عەقڵە تێدەگات کە تێگەیشتنی ڕۆشنگەری بۆ ((هۆشیاری)) دەربڕینێك بەهێزە لە ((بێ عەقڵی)) شێوەیەك کە تەنها لەناو کۆمەڵێك بانگەشەی زانستیدا شاراوەتەوە.. بانگەشەیەك کە ((ئەلکساندەر کۆژیڤ) لە تەفسیریدا بۆ ((فینۆمۆلۆژیای ڕۆحی)) هیگلٚ ناوینا ((پڕۆپاگەندە))[٣١].

ئادرنۆو هورکهایمەر لە ((دیالەکتیکی ڕۆشنگەری))دا درێژەیان بەم ڕەخنەیەدا. دیارە ئەوان خوازیار یان ستایشکەری بێ عەقڵی نەبوون. ئادرنۆ لە کتێبی ((دیالەکتیکی نێگەتیڤدا)) (١٩٦٦) ڕەخنەی لە بێ عەقڵی گرتووە. بەڵام ئەوو هورکهایمەر هەرگیز قبوڵیان نەکرد عەقڵ ئامێری کەلەسەردەمی ڕۆشنگەریدا باڵا دەست بووە تاکە شکڵی ڕاستی عەقڵانیەت بێت. ڕەخنە لەم ((هوشیاریە درۆزنە)) لەسەر بناغە عەقڵانیەتی ڕەخنەگرانە ڕاوەستاوە (بەڵام بە مانایەکی جیاواز لەوەی ئەمڕۆ بەناوی کارڵ پۆپەرەوە ناسراوە). بڕوا بوون بە جیاوازی عەقڵ ئامێری و عەقڵانیەت شتێکی تازە نەبوو. پێش نووسەرانی ((دیالەکتیکی ڕۆشنگەری)) جۆرج لۆکاش لە کتێبی ((مێژوو و هوشیاری چینایەتیدا)) (١٩٢٤) ڕەخنەی لە ئایدۆلۆژیای زانست گرتبوو. لۆکاشیش گوتبووی بڕوا بوون بەوەی ((کۆمەڵگەی زانستی – تەکنەلەوژی)) پەیوەستە بە (کۆمەلگای پیشەسازیەوە)) {هەڵەیەکی} ترسناکەو هەوڵیداوە ئەوە دەربخات ئەم کۆمەڵەیە ببەستێتەوە بە شێوازی باڵادەستی بەرهەمهێنانو لێرەشەوە بە ململانێی سیاسیو چینایەتیەوە.

بە بڕوای ئادرنۆو هورکهایمەر عەقڵ باوەڕی کە عەقڵانیەت لە سودگەریدا دەبینیو ڕۆژگارێك کە بانگەشەی ئازادی مرۆڤی دەکردو دەیویست بە ململانێ لەگەڵ نەریتەکاندا بە ئەفسانەی تازە (بە مانای تازەی ئەفسانە) بکات، بەڵام خۆی لە دەرەنجامدا بووە هۆی سەرهەڵدانی نەریتی تازە یان دەمارگیری تازەو شێوەیەکی فراوانتر و بەهێزتری لە دەسەلات هێنایە گۆڕێ.((عەقڵ باوەڕی – ئامێری)) سیستمێکە پابەندە بەو پلەو پایە دانانو زنجیرە پلەیەك کە سەریەخۆی هەر دیاردەیەك بە قازانجی ((گشتێکی درۆزنو دروستکراو ئایدۆلۆژی)) لە ناو دەبات. لەم عەقڵ باوەڕی – ئامێریەدا تێگەیشتن لە لایەنی تایبەتیو واقعیو مێژوویی هەر دیاردەیەك فەرامۆش دەکرێت. خود ناتوانێ بابەتە نا یەکسانەکان (و ئەو بابەتانەی وەکو یەك نین)) بناسێتەوە. لێکۆڵەرەوە لەسەر ئەو بنەمایەی ((بەش)) سەر بە گشتێکی گریمانەیە (فرچی) پێدەنێتە ئاسۆیەکی زانینیو چەمکیو فیکریەوە کە دەبێتە بەهانە بۆ دەسەلات، یەکێك لە لایەنەکانی ئەم قبولکردنە بڕوا هێنانە بە سالاری تەکنیك. عەقڵ باودڕی –ئامێری ئەوەندە سەرقاڵی ئەو گشتە وەهمیە دەبیت کە (کە خۆی دروستی کردووە)، چیدی توانای هەڵسەنگاندنی مەسەلە تایبەتیەکانی نامێنێت. ئەم شێوەیە لە عەقڵ باوەڕی لەگەڵ ((ئایدۆلۆژی قازانجو سود وەرگرتندا)) ڕێك دەکەوێتو وەك ئامانجێك بۆ

خۆی، دژی غەریزەو لەزەتو شادیو ئازادی ڕا دەوەستێت. لە کاتێکدا ڕۆشنگەران بە خەیاڵی خۆیان خوازیاری ئازادیو خۆش بەختی بوون، لە کرداردا شتێکیان درووست دەکرد کە لەناویەری هەمو ئەوانەیە. ڕێکخستنی ئابوری سەرمایەداری مۆدێرن ڕێگا بۆ جێبەجێبوونی (تحقیق) تەواوی عەقڵ ئامێری دەکاتەوە. لە سەرمایەداریدا بەرهەمهێنان بۆ بازاڕەو ئالوگۆڕ بە ئەنجامی یەکەم دادەنرێتو نرخی مەسرەف (پڕکردنەوەی پێویستی) دەخرێتە پەراوێزەوە. ((عەقڵ ئامێری)) بە پێی ووتە بەناوبانگەکەی مارکس لە ((سەرمایە))دا لەو شێوە بەهەمهێنانەدا دەردەکەوێت کە ((تەنها بۆ پێویستی کالا دروست ناکات، بەلکو بۆ کالاش پێویستی دەخوڵقێنی)). ڕۆشنگەری کە بانگەشەی ئازادیو جێبەجێکردنی پێداویستیەکانو غەریزە مرۆییەکانی کردو پانتای زەرورەت کەمبکاتەوە، شتێکیدروست کردو دەیویست ڕاستەوخۆ پێچەوانەی هەموو ئەمانە. ئەمەیە مانای وردی ((خۆ وێرانکردنی ڕۆشنگەری)).

ئادرنۆو هورکهایمەر، لە ((دیالەکتی ڕۆشنگەری‌دا)) ڕەخنەیان لە ((ئامانجی زانستی ڕۆشنگەری)) گرت. عەقڵ ئامێری ئامانجی دەسەلات گرتنە بەسەر سروشتدا، بەلام پیشکەوتنی مرۆڤ لە دەسەلات گرتن بەسەر سروشتدا، دەرەنجامی نا مرۆڤانەی بەرهەمهێنا. ئامانجەکانی ڕۆشنگەری نەك هەر نەهاتنەدی، بەلکو بووە هۆی کۆیلەیەتی مرۆڤیش لەبەردەم سەرمایەدا[٣٢]. {هەروەها بووە هۆی} پەرەسەندنی فاشیزمو ژیان لەناو کۆمەلگایەکی تۆتالیتەردا[٣٣]. هۆرکهایمەر سەردەمێك کە مەرامە مارکسی‌یەکانی وەك ئامانجێك وەرگرتبوو، نویسبووی تواناکانی مرۆڤ لە کۆمەلگایەکدا دەپشکوێ کە ((تاکە کەسە ئازادەکان پەیوەستی یەك بنو هەریەکەیان هەلی یەکسانیان لەبەردەمدا بێت بۆ پەرەپێدانی خۆیان))[٣٤]. ئەو گوتی گەر بەم ئامانجە نەگەیشتوین لەبەر ئەوەیە دژایەتی کەوتوتە نێوان ((لایەنی نا عەقلانی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان))و ((جەوهەری عەقلانی هێزی مرۆڤ))ەوە[٣٥]. ئەم خاڵە جارێکی دیو بەشێوەیەکی ئالۆزتر لە دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا باس کراوە. لەو شوێنەدا کە باسی پەیوەندی مرۆڤ دەکات بە سروشتەوە((مرۆڤ هەمیشە ناچار بووە لە نێوان کۆیلەیەتی بۆ سروشتو کۆیلەکردنی سرشتدا، یەکێك هەڵبژێرێت))[٣٦]. بۆ کۆیلە کردنی سرۆشت پەیوەندی کۆمەلایەتی دروست بوو کە پەرەسەندنی ئەو پەیوەندیانە دوا جار لە دەسەلاتی مرۆڤ چوونە دەرێ {واتە} مرۆڤ بوو بە کۆیلەی ئەو پەیوەندیانە {لە ئەنجامدا} هەم لە سروشت نامۆ بوو هەم لە جەوهەری مرۆڤانەی خۆی.

لە دیدگای ڕۆشنگەراندا سروشت کۆمەڵێك بابەت (لە دواجاردا بابەتێك) بوو کە مرۆڤ گۆڕانکاری تیا دەکات. دیارە ئەم دیدە مرۆڤ باوەڕو مرۆڤ سەنتەریزمە لە دەرەنجامدا نکوڵی لە ئەفسانە بوونی سروشت دەکاتو ئەفسانە بە ساویلکەو منالانە دادەنێتو بە گاڵتەجاڕی‌یەوە باسی دەکات. بە تایبەتی لە پاش ڕۆشنگەرانەوە هەموو وردبوونەوەیەك لە سروشت ڕەتکرایەوە جگە لەو دیدگایەی سروشتی وەك بابەتێکی بێ گیانو بێ ڕۆح لەبەردەم مرۆڤدا دادەنا... بابەتێك کە ئامادەیە بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی مرۆڤ دەیەوێت ئەنجامی بدات. بەلام ئادرنۆو هۆرکهایمەر دەڵێن(( ڕۆحەکان لە دەرگایەکی دیەوە دەگەڕێنەوە. ڕازو نهێنی بەشە کۆنترۆڵنەکراوەکانی سرۆشت لەناو ناچێتو تەنانەت (زانستی‌ترین دیدگاش) ناتوانێ دەستبەرداری ئەو ڕۆحانە بێت)[٣٧]. بەلام سروشت چیدی زانێتیکی زیندوو نی‌یەو ناکرێ پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەلدا بکەین، تاکە ڕێگەی پەیوەندی تەنها دەسەلات گرتنە بەسەریدا. واتە سود وەرگرتن لە خودی سروشت بۆ دروست کردنی ئەو ئامێرانەی باشتر یارمەتی کۆنترۆلکردنی دەدەن. بەلام شێوەی تازەی کۆیلەیەتی مرۆڤ ڕاستەوخۆ لێرەوە دەستپێدەکات: بۆ ڕزگار بوون لە سروشتی دەرەوە {دەبێ} تەسلیمی ئەو پەیوەندیانە بین کە چیدی ناتوانین لێیان دەرباز بین. ((بەڵێنی خۆشبەختی)) کە شێوەیەکی ژیانی کۆمەلایەتی نیە بە شێوەیەك لە شێوەکان بانگەشەی بۆ نەکات، لەسەردەمی مۆدێرندا ئید بەڵێن نیە، بەلکو گۆڕاوە بۆ شێوەیەکی شەڕانگێزو سەرکوتکەری غەریزەکان. ئەمە ئەو نهێنییەیە کە (مارکی دۆساد) لە هەموو کەسێك باشتر هەستی پێ کردووە: تێرکردنی تەواوی غەریزەکان بە شێوەیەکی ناچاری جەنگ دژی ئەو پەیوەندیانە دەهێنێتە گۆڕێ کە لە دەرەنجامدا ئامێری دەسەلاتن. ئەگەرچی لە سەردەمی مۆدێرندا ژیان لە ڕووی

لەزۆربەی بەشەکانی بەرهەمەکانی فۆکۆدا (بەدیاریکراوی تا کاتی نوسینی دووهەمین بەرگی _ مێژووی سیکسوالیتی_ واتە نزیک ساڵی ١٩٨٠) تێگەیشتنی بۆ رۆژگاری مۆدێرن و ئەو رەخنە توندەی ئاراستەی کۆمەڵگای تازەی دەکرد، بیری ئەندێشە بەهێزەکانی نیتچەو هایدگەرمان دەخاتەوە. ئەم کارتێکردنە تەنها لە هەڵبژاردنی وشەکان و زاراوەکاندا دەرناکەوێت، بەڵکو لە ناوەڕۆکی بیرۆکەکانیشدا خۆی دەردەخات. لە داڕشتن و شێوازی دەربڕینی تایبەتی فۆکۆدا (کە بێگومان یەکێکە لە جوانترین و کامڵترین نموونەکانی نوسین لە زمانی فەرەنسی ئەمڕۆدا) نیشانەکانی جەسارەت و گاڵتەجاڕی و بریندارکردنەکانی نیتچە بەهەمان ئەندازەی دەسەڵاتی قوڵ و نهێنی ئامێزو لە هەمانکاتدا: تاڵی هایدگەر، بە ئاشکرا دیارە، بەڵام فۆکۆ لەدواساڵەکانی ژیانیدا، لە رێگەیەکی دیەوە بیری لە رۆژگاری نوێ کردەوە. ئەو بێپەروا لەوەی بە کۆمەڵێ دەرئەنجام بگات کە چەند لایەنێکی کارەکانی رابردووی وێراندەکات، بەشێوازی تایبەتی خۆی رویکردە ئایدیالیزمی ئەڵمانی (بەڵام) ئەمجارەش نەك لە رێگەی هیگڵەوە بەڵکو بەڕێی فەیلەسوفێکدا رۆیشت کە جارێك بە ((بیریاری مۆدێرنیتی)) لە قەڵەمیدا: [واتە] ئەمانوێل کانت. ئەگەرچی دوا نوسینەکانی فۆکۆ لەبارەی رۆشنگەری و مۆدێرنیتی و تێڕوانینەکانی کانتەوە لە هەندێ لایەنەوە لەو گرفت و خاڵ و کێشانەی بەرهەمەکانی پێشووی دەیهێنایە ئاراوە جیاواز بوو (کە گرنگترینیان بە دەوری بیرۆکەی ((هەلومەرجێکی دیدا)) دەسوڕانەوە)، بەڵام دواجار [ئەو تێڕوانینانە] پەیوەستن بە ناوەڕۆکی سەرەکی فکری سەرجەم ژیانیەوە.

فۆکۆ کاتێك باسی رۆژگاری نوێ یان مۆدێرنیتی دەکرد، مەبەستی سەردەمێکی مێژووی دیاریکراو نەبوو. هەندێ جار وەك رۆسۆ هەموو ئەوشتانەی بە مۆدێرنیتی دادەنان کە لەبەردەم سەدەکانی ناوەڕاستدا رادەوەستان و هەندێك جاریش وشەی مۆدێرنیتی بۆ گۆڕانێکی تایبەت و دیاریکراوی مێژووی بەکار دەهێنا کە کۆتای سەدەی هەژدەی بە سەرەتای سەدەی نۆزدەو گرێ دەداو بەم مانایەش گرنگترین رووداوی مێژووی (بریتیبوو لە) شۆڕی فەرەنسی. فۆکۆ لە کۆتایی ژیانیدا دەریخست کە لە بنەڕەتدا راست نیە لە سەردەمە مێژوویەکاندا بۆ مۆدێرنیتی بگەڕێین، بەڵکو دەبێ مۆدێرنیتی بەر لەهەرشتێك بەئاراستە وەرگرتنێکی بزانین، ئاراستە وەرگرتنێك کە هەمیشە مومکین بووەو هەیە بەڵام لە دوو سەدەی دوایدا بووە بە روداوێکی بالادەستی کۆمەڵایەتی و فکری... ئاراستە وەرگرتنێك بەرەو زەمەنی هەنوکەیی بەرەو قبوڵکردنی بەرپرسیاری و بەرەو ئەمڕۆی بوون و نوێبوونەوە. ئەم تێڕوانینە ئەگەرچی لە بەرهەمەکانی سەرەتای فۆکۆدا بە راشکاوی و وردی نەهاتووە، بەڵام لەهەریەك لەبەرهەمەکانیدا چەکەرەی ئەم تێڕوانینە خۆی حەشارداوە.. بەتایبەتی لەو شوێنەدا کە هەوڵدەدات بیسەلمێنێ کە ناتوانین بەردەوامی مێژووی لە هەلومەرجە جیاوازەکاندا بدۆزینەوەو دەبێ هەر هەلومەرجێك بە جیا لێیان بکۆڵرێتەوەو شوناس بکرێ و بناسرێنەوە... چونکە هەر یەکێکیان دەرئەنجامی دابڕانی تەواوە لە مێژوو.. دابڕنێك کە فۆکۆ بە یارمەتی دەربڕینێکی گاستۆن باشلار ناوی ((دابڕانی ئەبستمولۆژی)) لێنا [٣].

تێڕوانینی فۆکۆ بۆ مێژوو و ئەو راستیەش کەبەردەوام خۆی (نەك بە گاڵتە بەڵکو بە جدی) بە مێژوونووس دادەنا، لەسەر بنەمای ئەم پێشنیارە راوەستاوە. ئێمە ناتوانین ئەمڕۆ لێرەدا.. واتە لە هەلومەرجێکی مێژوویدا کەتیایدا دەژین بە وردی ئەوە روونبکەینەوە هەلومەرجی رابردوو لە تێڕوانین (یان ئاسۆی مانایی) هاورۆژگارەکانیەوە چۆن بووە؟ پرسیاری

پێداویستیە تەکنەلۆژیەکاندا (بۆ بەدەستهێنانی ئامێر) دەگونجێنیٚو دەبێتە ملکەچی. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا دەبیٚ بڵێین ئامانجەکانی ڕۆشنگەری نەخراوەتە لاوە بەڵکو سەراونتەوەو ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە. ئازادی ئیدی مانای ڕزگاری مرۆڤ نیە بەڵکو دابەزیوە بۆ چەمکێکی سیاسی کە لە ناوخۆیدا چاودێرکردنی حەشارداوەو پەروەردەی دەکات.. کلتوریش تا ئاستی ((پیشەسازی کلتوور)) دابەزیوە. ئادرنۆ باسی ((جیهانێکی ئیداری)) دەکرد کە دواتر مارکیۆز ناوی نا ((کۆمەلگای تاك ڕەهەند)). ((شیکردنەوەی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری)) بۆ باوەڕو بزاوتە دژ بە یەهودیەکان، نموونەیەکە لەم دنیا تاك باوەڕییەی، بانگەشەمان دەکەن {بۆ ئەوەی لە ناویدا بژین}. ئادرنۆ و هۆرکهایمەر دەڵێن یەهودیەکان یەکێك بوون لە گرنگترین ئامانجەکانی لایەنی نا مرۆڤانەی دروشمە مۆدێرنەکان. لە کاتێکدا ڕۆشنگەران باسی ئازادی مرۆڤیان دەکرد، ئازادی یەهودیەکانیان نەك هەر لەبەر ئەوە سەرکوت دەکرد کە یەهودیەکان شێوەیەکی دی لە ژیان – واتە ئەوی دی بوونیان– تاقیدەکردەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی زیندوو بوونی نەریتەکۆنەکانیان لە ژیانی ئەمڕۆدا، قبولٚ نەدەکرد {لێرەوە} ئەوان ((بوونە ئامانجی سەرەکی ڕژێمی تۆتالیتاری ڕۆشنگەری)). ((ڕەگەزەکانی دژ بە سامی بوون)) ناونیشان فەسڵێکی کتێبەکەیە کە ئەنجامو ڕەنگدانەوەی وتوێژەکانی هەردو بیریارە لەگەڵ ((لئولو ونتهال)). ناوەڕۆکی ئەم فەسڵە بریتیە لە پەیوەندی تێڕوانینەکانی دژ بە یەهودیەت بە دەسەلات خوازی مۆدێرنەوە. لەم فەسڵەدا ئەوە ئاشکرا کراوە کە پەیوندیەك هەیە لە نێوان ((دژی سامی بوون)) لە لایەكو گرێی ئۆدیبو گرێی خەسینو گرێی سەرکوتکراوەکان بە تایبەتی هاوجنس بازی سەرکوتکراو، لە لایەکی دیەوە. ئەگەر چی شێوەی ترازیدی ئەم دژبوونە لەو ڕێگە چارەیەدا دەرکەوت کە نازیەکان دۆزیانەوە، بەڵام شکستی نازیزم کۆتایی {بەم ترازیدیایە} نەهێنا. بەڵکو لە دوای جەنگەوە دژبوونی یەهودیەت لە کۆمەڵگادا بەردەوامی بە ژیانی خۆیدا. {دیارە} دژ بوونی یەهودیەت تاکە دژایەتیەکی ناوەکی ڕۆشنگەری نەبوو بەڵکو شێوەکانی تری ((کلتورو جیهانبینی مۆدێرن)) ڕەنگدانەوەی ئەم دژایەتین. نموونەی هەڵوێستی ((ئۆلیس)) بەرامبەر سیرینەکان (پەریەکانی دەریا) لە دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا، ئاماژەیە بۆ ئەو شێوانەی تر. ئەم نموونەیە جێگەی هونەر لە سەردەمی مۆدێرندا پیشان دەدات. لە سرودی دوازدەهەمی ئۆدیسەدا ((سیرسە))، ((ئۆلیس)) فێردەکات چۆن لە دەست فیڵی دەریاییەکان ڕزگاری بێت، کەشتی ئۆلیسو هاوڕێکانی بەلای کەنارێکدا تێدەپەڕێت کە ((سەرزەمینی سیرینەکانە)). پەریەکان بە ئاوازە ئەفسوناویەکانیان بانگیان دەکەن بۆ ئەوەی ببن بە میوانیان، ئەوان لەم ئاوازەدا چیرۆکی سەفەری ئۆلیسو هاوڕێکانی دەڵێنەوە بەڵام لە ڕاستیدا هەرکەس ئەو میوانداریە قبووڵ بکاتو شەیدای ئاوازەکەیان بێت، دەکوژرێت. لەبەر ئەوە ((ئۆلیس)) بەپێی پێشنیارەکەی ((سیرسە)) گوێی هاوڕێکانی بە مۆم دەگرێت بۆ ئەوەی گوێیان لە ئاوازی پەریەکان نەبێتو فەرمان دەدات خۆشی بە زنجیر بە عەمودی کەشتیەکەوە ببەستنەوە بۆ ئەوەی نەتوانێت بەهۆی شەیدا بوونیئاوازی پەریەکانەوە، میوانداریەکەیان قبولٚ بکات. بەم شێوەیە هاوڕیٚ کەڕەکانی، گوێیان لە هاوارو پاڕانەوەکانی نابێتو تەنانەت زنجیرەکانی زیاتر دەکەنو سەولٚ لێدەدەن بۆ ئەوەی لەسەر زەمینی ((سیرینەکان ))دوور بکەونەوە. هاوڕێکانی ئۆلیس نابێت واز لە سەوڵلێدان بهێنن. {بەم شێوەیە} کاتێك ئۆلیس گوێی لە ئاوازی هونەر دەبێت ناتوانێت بەرەو ڕووی بڕوات:

((وەسوەسە هەرچی زیاتر بێت، زنجیرەکان پتەوتر دەبن. ئەوەی ئۆلیس گوێی لیٚ دەبێت هیچ دەرئەنجامێکی نابێت. ئەو هەر دەتوانێت بە ئاماژەی سەر داوای کردنەوەی زنجیرەکان بکات. بەڵام ڕزگار بوون مەحاڵە، هاوڕێکانی ئۆلیس کە گوێیان لە هیچ نیە تەنها مەترسیەکانی ئاوازی پەریەکان دەزاننو هیچ ئاگایان لە جوانی ئاوازی پەریەکان نیە، هەر لەبەر ئەمەش ئۆلیس زیاتر کۆت دەکەن بۆ ئەوەی هەموو ڕزگاریان بێت، هەریەکێك لەوانە ئەو کەسەی ستەمێکی ئاوای لیکردوون لەگەڵ خۆیدا ڕزگار دەکاتو ستەمکاریش ناتوانێت واز لە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی خۆی بهێنێت. ئەو کۆتو بەندانەی بە شێوەیەکی ناچاری گرفتاری کردوون، ئەو بەکار دەهێننو ڕێگای لیٚ دەگرن بۆلای ((سیرینەکان)) بچێت. ئەو وەسوەسەیەی پەریەکان دروستی دەکەن بێئەنجامو بێکاریگەر

دەمێنێتەوەو تەنها ئەندێشەیەکی قوول بەجێدەهێڵێت کە دەگۆڕێت بۆ هونەر))[٤٢].

هونەر لە کارتێکردن دوورکەوتۆتەوەو لەگەڵ عەقڵ ئامێریدا ناگونجێت. هونەرمەند ((چیرۆکی سەفەر)) دەزانێتو دەیڵێتەوە، بەڵام کەس ناتوانێ بەدوایدا بڕوات. هونەر لە کردارەوە دوورو کرداریش گوێی بیستنی نیە. هونەر ئێستا سەریەخۆیەو وەك سەرزەمینی دوورو ترسناکو دەست پێنەگەیشتووی پەریە دەریایەکانە. ئەو کەسەش کە ئاوازو دەعوەتە ئەفسوناویەکانی ئەم سەر زەمینەی گوێ لێدەبێت، ناتوانێ دەعوەتەکەی قبوڵ بکات. هاوڕێیانی ئۆلیس ئاوازی ئەفسوناوی هونەریان گوێ لێنیەو ئەو کاتەش کە گوێیان دەکرێتەوەو زۆر لە پەریەکان (هونەر) دوورکەوتونەتەوە، هەموو دڵیان بە ئاوازەکانی خۆیان خۆشە: ((هونەری جەماوەری)). لێرەدا ووشەی ((هەموو)) بیرهێنەرەوەی ئەم مانایەیە کە ((هونەری جەماوەری)) دروستکەری ((گشتی دروزنە)) .. ئەو هەمەکیەی (کلیت) کە دروستکەری بەشە چونیەكو یەکسانو ئیستیسمار کراوەکانەو هیچ مژدەیەکی شادی پێنیە بەڵکو دڵخۆشکەرێکی تێپەڕو سەرگەرمیەکی کاتیەو تەنها مەزەنەیەکە لە شادی کە هیچ واقعیەتێکی نیە. ((سەرگەرمی لە سەردەمی سەرمایەداریدا بەردەوامی کارە ئەگەر چی وادەردەکەوێت ڕاکردن بێت لە ڕیتمی میکانیکی کار بەڵام لە حەقیقەتدا جگە لە بەدەستهێنانەوەی هێز بۆ بەردەوامی کار هیچ شتێکی دی نیە)) [٤٣]. ((هونەری جەماوەری)) خولقێنەری پێداویستیەکانی کۆمەڵگایەکی جەماوەریە. بەم مانایەش خولقێنەری ڕەگەزەکانی ((نامۆبوونە)).

لەبەرامبەر ((هونەری جەماوەریدا)) هونەری مۆدێرن هەیە.. دەربڕینێك لە بەشە ناچونیەکەکانو لە هەمەکیەکی ((پێشبینی نەکراو)). هونەرێك خۆپەرستی درێوی خوێنەر یان وەرگرەکانی تێر ناکات، بەو مانایەی ڕێگا نادات تا ((هەموو شتێك پێشبینی بکات)). هونەرێکی چاوەڕوان نەکراوو بەم مانایەش جدی کە لەبەرامبەر ((هونەر سوك))دا ڕادەوەستێت:

((هونەری سوك سێبەر هونەری سەریەخۆیە. هوشیاریەکی دروزنانەی کۆمەڵایەتیە لە هونەر جدی. ئەو ڕاستیەی کە هونەری جدی لەبەر نەبوونی پێشنیارە کۆمەڵایەتیەکان، سیما وەرناگرێت، دروستکەری هێزی ((هونەری سوکە)). جیاوازی ئەم دوو هونەرە، حەقیقەتە. بەلایەنی کەمەوە ئاشکراکەری ئەو خاڵەیە کە کەلتورلایەنێکی نەفیکەری تیایە. لایەنێك کە بەهۆی دوو شێوەی جیاوازی هونەرەوە دروستبووە)). [٤] بەڵام ئەم دوو شێوازە جیاوازە دەگەڕێنەوە بۆ دوو کولتوری جیاواز.

ئادرنۆ لە ساڵانی پاش بڵاوبوونەوەی (دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا)) زیاتر لەسەر ئەو خاڵە سەرەکیانە ڕاوەستا کە لەم کتێبەدا باسکراوە، واتە: بێتوانایی عەقڵباوەڕی ڕۆشنگەری، پیشەسازی کلتورو ئەفسانەکانی ئەمڕۆ. بەڵام هورکهایمەر گرنگی دەدا بە شیکردنەوەی سیستماتیکی تیورەی سیاسیوبە تایبەتی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسیانە. ئادرنۆ لە یەکێك لە گرنگترین کتێبەکانی ژیانیدا بە ناوی ((ئەخلاقی بچووکەوە)) (١٩٥١) گەڕایەوە بۆ ناوەڕۆکی بابەتەکانی دیالەکتیکی ڕۆشنگەریو هەوڵیدا لە لایەنێکی ترەوە سەیری ئەم ناوەڕۆکانە بکات. ئەو لە کۆتایی کتێبەکەیدا نووسی تاکە فەلسەفەیەك کە بتوانێ بە شێوەیەکی بەرپرسیار لە بەرامبەر نائومێدیدا کاریگەر بێت، ئەو فەلسەفەیەیە کە هەوڵدەدات ((هەموو شتێك لە گۆشە نیگای ڕزگاریەوە هەڵسەنگێنێ)) بەڕاستیش دەتوانین ڕەخنەی ئەو و هورکهایمەر لە ڕۆشنگەری لەم دەروازەیەوە ببینین. ئەوان مۆدێرنیتیان لەو ڕووەوە خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە کە نەیتوانیوە ئەو خواستانە تێر بکات کە خۆی زیندووی کردۆتەوەو لە ئازادیش دوورکەوتۆتەوە. سەرکەوتنی عەقڵانیەتی ڕۆشنگەری پەیوەندی بە ئازادیەوە نەبوو{بەڵکو} لە خزمەت دەسەڵاتو هێزی ئەمڕۆدا بوو. ئەم دیدگا ڕەخنەگرو تاڵە، ڕەگی لە وتوێژی ڕۆشنبیرانی ئەڵمانی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا هەیە. باسکردنی لەناوچوونو شکست یەکێك لە وتوێژە سەرەکیەکانی بیریارانو ئەدیبانی ئەڵمانیو نەمسایی بوو. ((کارل کرئاس)) کە ڕۆڵی سەرەکی دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە درێویو ڕەزالەت دادەناو دەیشوبهاند بەو دەورە سەرکوتکەرەی دەزگاکانی دەوڵەت ئەیبینن، سەرچاوەی تێڕوانینەکانی ئادرنۆو هورکهایمەر دەردەخات. ڤالتر بنیامین کە بەرگری ((لایەنە

پێشڕەوەکەی ئەم دیدگا نائومێدی)) دەکرد، نوسیویتی کە بەبڕوای ((کرناس)) مرۆڤ لە تێکۆشان لەگەڵ داهێنەردا، چۆتە جەنگەوە لەگەڵ داهێنانداو تەکنیکیش لەم جەنگەدا دەوری هەیە[٤٦]. بنیامین کە بەرەو ئەوە دەچوو نکوڵی لە پەرەسەندنو پیشکەوتن بکات لە ڕاستیدا خاڵێکی گرنگ دەهێنێتە پیش کە چوار ساڵ پاش مردنی لە [ڕاستیدا خۆکوشتنی] لەدیالەکتیکی ڕۆشنگەریو چەندان ساڵ دوای ئەوەش لەبەرهەمەکانی ئادرنۆدا بە ووردی خرایە ژێر لێکۆڵینەوەوە. لە ((ئەخلاقی بچووك))دا پارچەیەك هەیە بە ناونیشانێکی گاڵتەجارانەوە ((زێدەڕەوی مەکە!)) ئادرنۆ لەم پارچەیەدا هێرش دەکاتە سەر ئەو دیدگایەی کە کوشتاری گشتی یەهودیەکان لەسەردەمی نازیزمدا بە چرکەیەکی تێپەڕ لە مێژوو دادەنێت کە لە چاو پێشکەوتنی مرۆڤدا بەرەو ژیانێکی ڕاستەقینە، بە چرکەیەکی ئاوارتن (أستپناو)و تێپەڕی دەزانێت، ئادرنۆ دەڵێت کە کارەساتێکی وا ناتوانێت ڕووداوێکی چرکەیی و تێپەڕبێتو بونیادی ئەم سەیرکردنەش لە خزمەتی شەرعیەتداندایە بە کوشتارەکە بۆ ڕێگاگرتن لە کەمبوونەوەی نرخی سوود. هەر ئەم کارەساتە ئەوە ئاشکرا دەکات کە هەرشێوەیەکی بیرۆکەی پەرەسەندن بەرەو شارستانێتی، پەرەسەندنی سودگەریە کەوا بوو ئێمەی ((زۆر بڵێ)) کە ئاگادارو هوشیاری قوڵایی ئەو کارەساتە بووین کە ڕوویدا، ناچارین لەبەردەم پەرەسەندندا (ڕابوەستین)[٤٧] پەرەسەندنی سودگەری ئێمە بە شێت دادەنێتو ئێمەش لەبەردەم ((شێتی مەوزوعیەتی جیهاندا ))ڕادەوەستین. کلتور هەمیشە دوو جەمسەر ئەخولقێنێ نەك هەر تاوانبار لە شوێنێك و ڕەخنەگر لە شوێنێکی دی، بەڵکو پێشکەوتن لەدیدگای تاوانبارەوە و وەستانو تێفکرینی ڕەخنەگریش. بە پێ وتە ڕاچڵەکێنەرەکەی بنیامین لە ((چەند یاداشتێك لەسەر فەلسەفەی مێژوو)) (١٩٣٩-١٩٣٦) (کەبە کەڵکی نووسینی ((چەند تێزێکی فەلسەفە مێژوو)) هات):

((مارکس گوتبووی شۆڕش وەك شەمەنەفەری مێژووی جیهانە بەڵام ڕەنگە هەلومەرجەکە بە شێوەیەکی دی بێت. ڕەنگە شۆڕش وەك پێشکەوتنی شەمەندەفەرەکە نەبێت بەڵکو جوڵەی ئەو دەستە بێت کە دەسگری ڕاوەستاندنی شەمەنەفەرەکە ڕادەکێشێت)). ئادرنۆ کە بیری لە دوو جەمسەر دەکردەوە، نموونەی سیمای ((ژانوس))ی دەهێنایەوە.. دووسیما کە لەیەك جێگەدا کۆبوونەتەوە ئەم ئیستیعارەیە چەندان جار لەبەرهەمەکانی ئادرنۆدا بەکار هاتووە، لە هەمووئەو شوێنانەدا کە باسی ((پێشکەوتنێك کراوە کە لەسەر بناغەی نەشاز دروست بووەو دروستکەری نەشازە)). مێژووی مرۆڤایەتی کە سەرگوزشەی سەرکەوتنی عەقڵ ئامێریە بەسەر سروشتدا، بە هیچ شێوەیەك مێژووی پێشکەوتنی ئازادی نیە. یەکێك لە دوو سیماکەی ئەم ژانوسە: پەرەسەندنە واتە ئەو لایەنەی چاوی بڕیوەتە((بەڵێنەکانی عەقل)) بەڵام سیمای دووهەمی ((لەدەستدانی جەوهەری مرۆڤانەی پێشکەوتنە)). لێرەدایە عەقڵ بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ ناکاتو خیانەت لە خۆی دەکاتو خۆی وێران دەکاتو لێرەشەوە مێژووی مرۆڤایەتی هیچ نیە جگە لە مێژووی قوربانیدان لە پێناوی پێشکەوتندا، بەم مانای چەمکی ئەفسانەوی ((قوربانیدان)) کە لە چیرۆکی((ئۆلیس)) دا دەورێکی گرنگی هەیە، بنەمای مێژووی مۆدێرنەکە بەبڕوای خۆی لە ئەفسانەو خورافات ڕزگاربووە. عەقڵ ئامێری، بینینی سروشت وەك ئامێرێك، بە ئامێریکردنی مرۆڤێکی دی، سوودگەری بە یارمەتی کاری ئامێرەکان، دیدگای ئامێری بۆ سەرجەم پەیوەندی مرۆییەکان ، تا ئەو جێگەیە دەچێتە پێش کە دەبێت هەموو شتێ لە پێناویدا قوربانی بکەین. ڕەخنەگری عەقڵ نابێت جەوهەری عەقڵی مۆدێرن قبوڵ بکات . نەفی بە ئامێرکردنو نکوڵی کردن لە قوربانی خواستن، خۆی جەوهەری ڕەخنەگریە.

کتێبی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری کتێبێکە دژی یۆتۆپیایە. لە کتێبەدا بە ئەسەفەوە نوسراوە کە هەمیشە سەرەنجامو کۆتایی شەرعیەتدان بووە بە ئازارەکانی ئەمڕۆی مرۆڤ. ئەو کەسەی ئەم ئازارانە قبوڵناکات واتە ئەو ڕەخنەگرەی کە سەرچاوەو جەوهەر و شێوەی دەرکەوتنی ئیستیسمار، قبوڵناکات، ناتوانێت بیر لە سەرەنجام بکاتەوە واتە ناتوانێت یۆتۆپیایەك لە کۆتایی ڕێگەی خۆیدا ببینێ. ئادرنۆ لە ((ئەخلاقی بچووك))دا نوسیویتی کە پاش سەردەمێك کە زیاد لە دوو هەزارە کە عەقڵ باوەڕی بە شێوەی جیاواز حوکمڕانی تیا کردووە، ئێستا دیسانەوە ترس گیانی

مرۆڤەکانی داگرتووە: ترس‌و نائومێدی. ئادرنۆ کە باسی هەزارەکانی عەقڵسالاری دەکات، لە ڕاستیدا باس لەسەرچاوەی عەقڵی مۆدێرن‌و خودی ئەو عەقڵە دەکات، ئەو بانگەشەی عەقڵی مۆدێرن قبوڵ نیە کە دەڵێت ئەفسانەم وەلاوە ناوە.

ماکس فیبەریش لە وتارێکدا کە زۆر کەم خوێندراوەتەوە، ئەو خاڵەی خستۆتە ژێر لێکۆڵینەوەوە کە سەرەڕای بانگەشەی ((ئەفسانە داماڵینی)) مۆدێرنیتی، بەڵام هێشتا ئەندێشەی ئەفسانەوی هەر زیندووە. ووتارەکە ناوی ((پیشەو توانستەکانی زانا))یە[49]. ئەم وتارە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی ئادرنۆ و هورکهایمەرە. ئەوان دیسانەوە گەڕانەوە بۆ ناوەڕۆکی باسەکەی فیبەر: وا دەردەکەوت کە خوا کۆنەکان‌و ئەو دیدە ئەفسانەوییەی بناغەی بوونی خواکان بوو، بە هۆی (ئەفسانە داماڵینی)) مۆدێرنیتیەوە، لەناوچوون، بەڵام لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا ئەو دیدەو ئەو خوایانە دووبارە پەیدا دەبنەوە، بەڵام ئەمجارە لە پەیکەری هێزە نەناسراوو بە ڕوکەش نامەعنەویانەی دەیانەوێت جەنگ دژی شەیتان درێژە پێبدەن.

هەنوکە پەیوەندی ئەفسانەو مۆدێرنیتی کەمتازۆر ئاشکرا بووە. ((ئەفسانە داماڵینی)) فیبەر بووە بە بابەتی چەندان لێکۆڵینەوەی گرنگ. چەندان کتێب لەسەر پەیوەندی فاشیزم‌و کۆمۆنیزم بە ئەفسانەوە نوسراوە. دیالەکتیکی ڕۆشنگەری سەرجەم مۆدێرنیتی‌و کۆمەڵگای مۆدێرنی بە ((ئەفسانەیی)) لە قەڵەمداوە. ئەرنست کاسیرەریش لە کتێبێکی بچووك بەڵام گرنگدا پەیوەندی ((زمان‌و ئەفسانەی)) خستۆتە ژێر لێکۆڵینەوەوە.[50] ئەم پەیوەندیە لەسەردەمی مۆدێرنیندا کز بووە بەڵام لەناو چووە.

## ڕەخنەیەك لە عەقڵنامێری

کارتێکردنی ((ماکس فیبەر)) لەسەر نوسەرانی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری چەندانجار زیاترە لەو ئاماژە ڕاستەوخۆیانەی لە کتێبەکەدا بۆی کراوە. لە ڕاستیدا ئەو عەقڵباوەڕی‌و عەقڵانیەتەی لە کتێبەکەدا ڕەخنەی لێگیراوە، ڕەگی لە لێکۆڵینەوەکانی فیبەردا هەیە. چەند ساڵ پاش بڵاوبوونەوەی کتیبەکە، هربرت مارکیۆز لە وتارێکدا بەناوی ((پیشەسازیبوون‌و سەرمایەداری لە تێڕوانینی فیبەردا)) (١٩٦٤) (کە دواتر جارێکی‌دی لە کتێبی ((فەلسەفەی نەفیدا)) (١٩٦١) بڵاوکرایەوە) سەرنجی لەم خاڵە دا)).[51] مارکیۆز لەو چەمکی عەقڵانیەتەوە دەستیپێکرد کە ماکس فیبەر بۆ دەستنیشانکردنی ((سیستمی مۆدێرنی ئاڵوگۆڕی ئابووری))و بەڕێوەبردن‌و مافی تاکەکان، بەکاریهێناوە. بە بڕوای فیبەر چەمکی عەقڵانیەت تەنها کاتێك مانای هەیەو بەدروستی بەکاردەهێنرێت کە بتوانین مەزەنەی{تصوری} ئامانجێکی بۆبکەین. *Zweckrational* زاراوەیەکە فیبەر بەکاریهێناوەو بە مانای ((عەقڵانیەتێکی ئاڕستەوەرگرتوو بەرەو ئامانج)) دێت. فیبەر مۆدێرنیتی بە دەرەنجامی پەرەسەندنی زانستی، تەکنەلۆژی‌و پیشەسازیبوون دادەنێت. بەڵام پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە تەنها کاتێك هەموو ئەمانە مانایان هەیە کە ببەسترێنەوە بە ئامانجێکەوە.[52]

شەرعیەتی کۆن‌و تەقلیدی دیاردە کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکان (دیارە شەرعیەتی دیاردە کەلتوری‌و ئەخلاقیەکانیش) لە بەرامبەر ئەم عەقڵانیەتە ڕوو لە زیاد بوونەی کاری کۆمەڵایەتیدا، بێنرخ دەبێت. ((ئەفسانە داماڵین)) یان خاکیبوون (دنیایی بوونی) مۆدێرنیتی بەرەو وێنەیەکی تازە لە جیهان ئاڕاستە وەردەگرێت کە فیبەر بەزاراوەی *Weltgilder* دیاریکردووە.(دیارە نابێت ئەمە لەگەڵ ئەو باسەی هایدگەردا تێکەڵبکەین کە باسی ((وێنەی جیهان)) دەکات). بە بڕوای فیبەر ئامانج یان دەرەنجامێك لە وێنەی جیهاندا بە مەبەست دەزانرێت کە مانا بە ((ئەفسانە داماڵین)) عەقڵانیەتی مۆدێرنیتی دەبەخشێت.

جۆرج لۆکاش بە تێبینیکردنی هەمان ئەم پەیوەندیە ڕەخنەی لە ((وێنەی جیهان‌و ئەنجامەکەی)) تیورەی فیبەرو ئەو چەمکی عەقڵانیەتە گرتووە کە فیبەر بەکاریدەهێنا. لۆکاش نوسیوێتی عەقڵانیەت خاوەنی ئامانجێکی‌عەقڵانی نیە چونکە مەزەنەی {تصوری} ئەنجام‌و کۆتایی کارەکەی ناکات. بە مانایەکی دی ئەوەی بە ئامانج دانراوە خۆی شەرعیەت دانە بە هەلومەرجی هەنوکەیی. لێرەوە لۆکاش ((عەقڵانیەتی وەك شتبونێك)) باس کردووەو لە /کتێبی/ (مێژوو و هوشیاری چینایەتی))دا ڕەخنەی ئاڕاستە کردووە. ڕەنگە کاتێك ئادرنۆو هورکهایمەر لە دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا باسی (پەرەسەندنیان وەك خولقێنەری

نەشان)) دەکرد، چاویان لەسەر ئەم رەخنەیەی لۆکاش بوو بێت.

مارکیوز بەو شێوەیە باسەکەی درێژە پێدەدات کە چەمکی عەقڵانیەت لای فیبەر چەمکیکی وێنەییە /صوری/ کە گۆڕاوە بۆ عەقڵانیەتی سەرمایەداری. سەرەتا با رەگەزە تایبەتیەکانی عەقڵ لای ماکس فیبەر بهێنینەوە:

١) بیرکاریکردنێکی بەردەوام رووو لە زیاد بوون لە ئاستی ئەزموونو زانستدا لە ئارادا هەیە. بیرکاریکردنێك کە لە زانستە سروشتیەکانەوە دەستپێکردو تەشەنەی کرد بۆ زانستەکانی دیو تەنانەت بۆ ((بەڕێوەبردنی خودی ژیانیش)) ((چەندایەتیبوونی گشتیو جیهانگیر). ٢) پێداگرتن لەسەر پێویستی {چرورە} ئەزموونو بەڵگە هێنانەوە {أستدلال} عەقڵانیەکان لە رێکخستنی زانستو تەنانەت بەڕێوەبردنی ژیاندا. ٣) ئەنجامی ئەم رێکخستنەش هەیە کە بە بڕوای فیبەر زۆر جارەنوسسازە واتە بناغەدانانو یەکپارچەکردنی رێکخراوێکی گشتی، تەکنیکیو دروستکراوی فەرمانبەران کە دەگۆڕێت بۆ ((مەرجی رەهاو ناچاری بوونی ئێمە)). کە ئەم شێوازەی دوایش گواستنەوە لە عەقڵی تیۆریەوە بۆ عەقڵی عەمەلی.. واتە بۆ شێوەی مێژووی عەقڵ، ئاسان دەکات. لە کۆمەڵناسی فیبەردا عەقڵ باوەڕی وێنەیی {صوری} دەگۆڕێت بۆ عەقڵ باوەڕی سەرمایەداری. ((٥٣)).

مارکیوز پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە بەم شێوەیە لایەنی ناعەقڵانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری وەك ((عەقڵانیەت)) دەناسرێنێتو.. واتە ((عەقڵ بەمانای شەرعیەتدان بە پەیوەندیەکانی سەرمایەداری)) دێتو شێوەیەکی تایبەت لە پەیوەندی چەوساندنەوەو دەسەڵاتو هێز، ستایش دەکرێت.

بنەمای ئەم چەمکەی عاقڵو عەقڵ باوەڕەی ((بابەتێکی تەجریدیە کە هەم بەکەڵکی کردار (عمل) دێتو هەم بە کەڵکی تیۆرە)). یاسا سەرەکیەکانی {ئەم عەقڵە} بریتی دەبێت لە تا ئەوپەڕی قازانج یان بە زمانی سەرمایەداری ((زۆرترین بەهرە)) کە مارکیوز دەڵێت: ((هیچ نیە جگە لە زۆرترین دەسەڵات))و هەروەها دەڵێت: ((ئەم شێوەیەی عەقڵ هیچ نیە جگە لە عەقڵێکی تەکنیکی کە مادەو مرۆڤەکان بەکاردەهێنێ)) (٥٤).

کەوابوو چەمکی عەقڵانی فیبەر لە راستیدا ناعەقڵانی زاتی سەرمایەداری دەشارێتەوەو بەم مانایەش چەمکێکی ئایدیۆلۆژیە. {چونکە} تەنها بەوێرانکردنی عەقڵ دەتوانین لایەنی ناعەقڵانی بەرهەمهێنان، بەلایەنی عەقڵانی ژیانی کۆمەڵایەتی دابنێین.

بێگومان مارکیوز ئەوە قبول دەکات کە لە نیشەکەی فیبەردا رەگەزێکی رەخنەگرانە هەیە کە ئاشکرای دەکات چەمکی سەرمایەدارانەی عەقڵانیەت هەرچەند خۆی ((بەدەر لە نرخو بەهاکان)) دادەنێت، بەڵان هیچ بەدەر لە نرخو بەهاکان نیە، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە فیبەر لەم خاڵەدا دەوەستێت.. خاڵێك کە خۆی لە خۆیدا ئاشکراکەری ((جەوهەری شتبوونی پەیوەندیە مرۆڤایەتیەکانو پەیوەندی مرۆڤ بەسروشتەوە)). ئەم خاڵە ئەو کاتە ئاشکرا دەبێت کە فیبەر بۆ ئەوەی عەقڵ بگۆرێت بۆ ((عەقڵی بورژوازی)) ناچار دەبێت پێی لەسەر لایەنێکی ئەو عەقڵە دابگرێت: عەقڵی تەکنیکی سەرمایەداری. لە لایەکی ترەوە لەبەرئەوەی تێگەیشتنی فیبەر بۆ عەقڵانیەت پەیوەستە بەو کردارانەوە کە لە رووی بیرکاریو چەندایەتیەوە دەتوانرێت بژمێرێنو پەیوەستە بە یاساڕێژکردنی سیستمی بەرهەمهێنانەوە، کەوابوو دەتوانێت باسی ((باشترین شێوەی عەقڵانیەتیش بکات)).. کە ئەم باشترین شێوەیەش بۆ فیبەر تەنها یەك مانای هەبوو: زۆرترین قازانج لەسەر بناغەی باشترین حسابی مومکین.

ئەم پێداگرتنە لەسەر لایەنی ئەزموونی ( کە لە یاسا بیرکاریو شیکاریەکاندا دەردەبڕێت) باسی عەقڵانیەت لەباسی ئامانج (یان لەپەیوەندی بەئامانجەوە) دووردەخاتەوە. فیبەر باشترین شێوەی عەقڵ لە هەنوکەدا دەدۆزێتەوە، بێ هیچ پەیوەندیەك بە ئامانجەوە ((ئەگەر چی خۆی لە سەرەتادا دەیگوت ئاگای لەو پەیوەندیە هەیە)).

لە لایەکی دیەوە تا ئەو رادەیە سەرنجدان لە گۆڕانکاری چەندایەتی، {دەبێتە هۆی ئەوەی} پێشکەوتنی تەکنەلۆژیو پیشەسازیبوون وەك قەدەرێك دەرکەوێت {قەدەرێك} کە تەنها یەك مانای هەیە: دەسەڵاتو چەوساندنەوە وەك ناچاری و قەدەرێك دەردەخات. لەم قەدەریەتەشەوە (کەبە بڕوای مارکیوز شەرعیەتدانە بە بێ عەقڵی) تا شەرعیەتدان بە چەمکی ناعەقڵانی ((کاریزما)) تەنها یەك هەنگاو دوورین ((٥٥)).

لێرەدا مارکیوز دەگەڕێتەوە بۆ بنەمای تیۆری

رەخنەگرانەو بە ئاوازێک کە بیری نوسینە کۆنەکانی ((هورکهایمەر)) مان دەخاتەوە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە شێوازی بەدەر لە نرخو بەهاکان کە فیبەر بەردەوام خۆی بە بەرگریکەرو وەفاداری دەزانی، ئەگەر تێگەیشتنی رەخنەگرانەی ئەو پێشنیارانە لەناو دەبات کە تەکنەلۆژیاو پیشەسازیبوون لە چوارچێوەی سیستەمی بەرهەمهێنانی فراوانی کاڵادا، لەسەر بناغەیان دامەزراوە.

لێرەوە چیدی تەکنەلۆژیا نەک وەک چۆن کە هەیە واتە وەک دیارەیەکی مێژوویی _ کۆمەڵایەتی بەڵکو وەک ئامانجی کۆتایی دەناسرێت. لەئەنجامی ئەم بەدحاڵێبونەشدا ئیتر عەقڵی تەکنیکی جێی عەقڵی سیاسی دەگرێتەوەو زۆر بەئاسانی جیابوونەوەی هێزی کار لە ئامێرەکانی بەرهەمهێنان وەک پێداویستنییکی تەکنیکی (چروره فنی) دەردەخات.

ئاشکرایە ئەم رەخنەیە کە بە ئاوازێکی توندی مارکسیانە، نوسراوە خۆی جیا لەو باوەڕەی مارکیوز نیە کە لە سیستەمی سوسیالیستدا (ئیتر پێویست بەوە ناکات بڵێین کە مارکیوز سوسیالیزمی بەو سیستەمانە دانەدەنا کە لە شورەوی‌و ئەوروپای شەرقیدا هەبوو). تەکنەلۆژیا لە خزمەتەمرۆڤدا دادەنرێت‌و عەقڵی تەکنیکی، تەکنیکی ئازادیە[56]. ((یورگن هابرماس)) لە لێکۆڵینەوەی ((رەخنەکەی مارکیوز لە فیبەر)) دا ئەوە دەردەخات کە دەرەنجامەکانی رەخنەکەی مارکیوز زیاد لە سنور دوردەکەوێتەوەو دەسەڵات لەگەڵ ((عەقڵی تەکنیکی دا)) دەکات بەیەک شت. تا ئەو جێگەیەی بونیادی ((عەقڵی تەکنیکی)) بە ((ئامێریی)) دادەنێت‌و ئەمەش بە جەوهەری دەسەڵات لە قەڵەم دەدات. واتە تەکنیک بە زمانی خودی مارکیوز ((نەخشەیەکی کۆمەڵایەتی _ مێژووییە)) کە دەسەڵات مومکین دەکات‌و خۆشی وەک دەرئەنجام یان ئەنجامی کۆتایی دەسەڵات دادەنێت.

رەخنەی هابرماس لە مارکیوز کە لە وتارێکدا هاتووە بەناوی ((تەکنیک‌و زانست وەک ئایدیۆلۆژی))[57] لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە ((چونیەک کردنی تەکنیک‌و دەسەڵات راست نیە)). لە نێوان عەقڵ باوەڕی (وتەکنەلۆژیاو زانست) لە لایەکو چەوساندنەوەو دەسەڵاتدا لەلایەکی دی، پەیوەندیەکی مێژوویی هەیە، بەڵام تەکنیک دەسەڵات نیە. ئەو پەیوەندیەش دەتوانێ لەناو بچێت. تەکنیک ((نەخشەیەکی مێژووییە لە دەسەڵات‌و بە ئامانجی بەرپاکردنی دەسەڵات)). بەڵام ئەم نەخشەیە بە هیچ شێوەیەک ((سیفەتی زاتی دەسەڵات)) نیە.. هەرکاتێک مانایەکی جیاواز بۆ سروشت دەستەبەر بکرێت، ئەوا مانای جیاواز لە دەسەڵات، سود، زانست‌و تەکنەلۆژیا، پەیدا دەبێت. ئەم خاڵە ئەو مەسەلەیەیە کە لە وتارەکەی مارکیوزدا فەرامۆشکراوە. بەڵام لە کتێبی ((مرۆڤی تاک رەهەند)) دا لێی ورد بۆتەوە. مارکیوز لە بەشی شەشەمی ئەم کتێبەدا لەژێر ناونیشانی ((ئەندێشەی تاک رەهەند)) دا باسی جیاوازی چەمک‌و ماناکانی کردووە کە دەرەنجامی تێگەیشتنی جیاوازی ئێمەیە بۆ سروشت[58].

((هابرماس)) لە رەخنەکەیدا بۆ نوسینەکەی مارکیوز دەربارەی فیبەر ئەوەی دەرخست کە عەقڵانیەتی زانستی‌و تەکنیکی وەک ئایدیۆلۆژیا کاردەکات (یان کاریگەری ئایدیۆلۆژی هەیە). بنەمای رەخنەکەی ((هابرماس)) ئەگەر پەرەبسێنێ ئەو چەمکی عەقڵ باوەڕیەش دەگرێتەوە کە لە کتێبی ((دیالەکتیکی رۆشنگەری)) دا هاتووە. لە راستیشدا هابرماس لە کتێبی ((گوتاری فەلسەفی مۆدێرنیتی)) دا بەم کارە هەڵدەسێت، بەڵام پێش ئەوەی باسی ئەم رەخنەیە بکەین، پیویستە بە وردتر بنەماکانی تێڕوانینی ((هابرماس)) مان ناسیبێت کە ئەمەش خۆی بابەتی ئەسکی پێنجەمی ئەم کتێبەیە.

## پیشەسازی کلتورو کلتوری جەماوەری

یەکێک لە گرنگترین باسەکانی دیالەکتیکی رۆشنگەری باسکردنی پێشەسازی کلتورو بەرهەمی سەرەکی ئەم پێشەسازیە، واتە کلتوری جەماوەرییە. لۆژیکی بەرهەمهێنانی کاری کلتوری وەک کاڵا لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کلتورێکی درێوو بێ بەها کە کاریگەریەکی ئایدیۆلۆژی هەیە: واتە وێنەیەکی هەڵە لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان‌و شێوەی دەسەڵات لەبەردەم هوشیاری مرفەکاندا دەخولقێنێ: شەرعیەتدان بە پەیوەندیە درۆزنەکان، ((تیئودورو ئادرنۆ)) بە درێژایی دەیەکانی پاش بڵاوبونەوەی دیالەکتیکی رۆشنگەری، لە چەند وتارێکدا درێژەی بەم باسە دا کە گرنگترینیان بریتین لە: ((سەبارەت بە خەسڵەتی

بتایەتی مۆسیقاو وێرانی بیستن)))، ((پرۆژەی کلتوری جەماوەری)))، ((سەرنجێکی دی لە پیشەسازی کلتور))و چەند وتارێك سەبارەت بە تەلەفیزیون و سینەماو کاتی پشوو..[٥٩]. ئادرنۆ پێش نووسینی دیالەکتیکی رۆشنگەریش لەو نامانەدا کە نوسیبووی بۆ ((ڤالتربنیامین))ی هاوڕێ‌ی و تیایدا رەخنەی لە وتاری ((بەرهەمی هونەری لەسەردەمی لەبەرگرتنەوەی (تکپیر) میکانیکیدا)) ی بنیامینی گرتبوو..چەند لایەنێکی گرنگی سەبارەت بە پێشەسازی کلتورو کلتوری جەماوەری لە چوارچێوەی دەق و لۆژیکی ویرانکاری عەقلئامێریدا باسکردو بوو بە یەکێك لە بنەماکانی رەخنەگرتن لە مۆدێرنێتی.

((ئادۆرنۆو هۆرکهایمەر)) لە دیالەکتیکی رۆشنگەریدا دەریانخست عەقلئامێری و بنەمای عەقلباوەڕی مۆدێرن، هەموو بەرهەمێکی کلتوری وەك کالآیەك بەرهەمدێنی‌و {بەم شێوەیە} لەبەرهەمی کلتوریشداو بە پێ‌ی هەمان لۆژیکی ((بت ئاسای)) کالآکان، جیهان بە لنگەوقوچی وێنە دەکرێت: بەرهەمی فکری‌و هونەری ئەگەر چی بانگەشەی سەربەخۆی لە پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان دەکەن، بەلآم تەنها وەك پاشکۆی یاساکانی بازاڕ دادەهێنرێن. پیشەسازی کلتور، تەکنەلۆژیاو دەرئەنجامەکانی عەقلئامێری بەکار دەهێنێت بۆ ئەوەی پەرە بە دەسەلآتی سەرمایداری بدات. رێکخستنی سەرمایەدارانەی بەرهەمهێنان و سیستمی ئابووری‌و کۆمەلآیەتی لەسەر بنەمای مولکیەتی تایبەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و ململانێ‌و سودخوازی، {هەموو ئەمانە} ئەگەری دەرکەوتنی یان سەرهەڵدانی هێزە داهێنەرە فکری‌و مەعنەویەکان لەناو دەبەن.

ئەو عەقلە رەخنەگرو عەقلآنیەتە سەرکوت دەکرێت کە رێگا بۆ خەیالی جوانناسی دەکاتەوە. و کلتوریش رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە پرۆسەی ((نامرۆڤانەکردنی پەیوەندیە کۆمەلآیەتیەکاندا)) ئەم رۆڵەش رێگا خۆش دەکات بۆ ئەوەی لە کارتێکردنەکانی ئەم سیستەمە تێبگەین. نوسەرانی دیالەکتیکی رۆشنگەری هەستیار بوون بەرامبەر دروست بوون و پێکهاتنی رەگەزەکانی توتالیتەر لە کلتورداو دەریاندەخست کە بواری گشتی ((میدان العام))، {واتە} ئەو بونیادانەی سەربەخۆن بەرامبەر بە دەوڵەت و بەرامبەر بە کۆمەڵگای مەدەنی)) بە هاوکاری دەزگاکانی راگەیاندن، ئەو هەلەیان لە مرۆڤ سەندووە کە بتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان بابەتی عەقلآنی‌و بابەتی نا عەقلآنیدا، ئەوان نموونەی مۆسیقای جەماوەری ((لە نموونەی ئادرنۆدا مۆسیقای جازو پاش پەرەپێدانی باسەکانیشی نموونەی: مۆسیقای راك‌و پاپ، کلیپ ڤیدۆ)و ئەدەبیاتی جەماوەری ((لە رۆمانە خەڵك پەسەندەکانەوە بۆ چیرۆکە داڕێژراوەکان (ترسیە)⁻))و بەرنامە رادیۆیی‌و تەلەفیزۆنیەکانیان هێنایەوەو بە تایبەتی نموونەی ((فلیمی سینەمایی)) یان هێنایەوە کە ((کارکردنی هزری تەمشاچی‌و وەرگر نیوە میکانیکی دەکات‌و هزریان دەخاتەژێر کونترۆڵی خۆیەوەو هیچ رێگایەك بۆ خەیالکردنەوە نامێلنەوە.. )) ((٦٠)) و تەنانەت تەماشاچیش تووشی ئەو وەهمە دەکەن کە ((خەریکی تێگەیشتن لە شتێکە))).

کارتێکردنی کاری رۆژانە لەسەر کارکردنی عەقلّ بە تەواوی لە رۆژانی پشوودا دەردەکەوێت: لەزەت‌و پشوو دەگوێزرینەوە بۆ کارکردنی‌میکانیکی هزریش (زهن) و بیر کردنەوەو ئەندێشە کردن دەبێت بە شتێکی هیلاك کەر.. لەزەت لە وشوێنەدایە کە (بیرکردنەوەیەکی سەربەخۆی) پێویست نەبێت. بەرهەمی هونەری نەك لە بونیادی دەروونی خۆیدا (کە بۆ دەرك کردنی پێویستمان بە پلەیەك لە عەقلآنیەت هەیە) بەلکو لە ئامازەو سیمبولە سادەکانیدا، دەرك دەکرێت[٦١].. واتە نزم دەبێتەوە بۆ سیمبولە ناسراوو دوبارەبووەکان. نەخشەی ماناناسی بەرهەمەکە دەبێت بە بابەتێکی لاوەکی کە ((دەکرێت پێشبینی)) بکرێت. بەم شێوەیەش هەم سەربەخۆیی داهێنەرانەی بەرهەم لەناو دەچێت (و لەناو چنگی سەرمایەدا دیل ئەکرێت: وەك سینەما گەرانی ئەمریکی)و هەم توانای وەرگر بۆ داهێنانی مانای تازەو دۆزینەوەی دەرئەنجامێکی شەخسی‌و تایبەت، لەناو دەچێت یان بەتەواوی کەم دەبێتەوە. مانا دەبەسرێتەوەو بەسەوداو مامەڵەی بەرهەمهێنانی کالآو بازاڕەوە. مرۆڤ لە توانای داهێنەرانە (وهیزی مەعنەوی خۆی) بێ ئاگا دەبێت‌و خو دەگرێت بە کلێشەو هەلومەرجە دوپاتبووەکان‌و رۆمانەستانداردو "تاك ماناکانەوە هەرشتێکی تازەو نوێش نەفرەتاوی دەبێت‌و نەریتە کۆنەکان دەمێنەوە.

ئەم پروسەی دەسەلآتگرتنە بەسەر هزرداو تەسلیم بوونی بەسەوداو مامەڵەی هێزە توتالینەرەکان، بە

هاوکاری تەکنەلۆژیای مۆدێرن دەتوانێت چاودێری بیرۆکرانیانەی خۆی بەسەر بوارەکانی ژیانی تایبەتی‌و گشتیدا، زیاد بکات. هربرت مارکیوز بۆ بەرگریکردن لەم تێڕوانینە سەرەکیانەی ((دیالەکتیکی رۆشنگەری))، تا ئەو شوێنە رۆیشت کە حوکم بدات ئایدیۆلۆژیای سەرمایەداری نەك هەر کەسایەتی تاکەکەسەکان دەست نیشاندەکات، بەڵکو شێوەو ناوەڕۆکی تەکنەلۆژیاش دیاریدەکات، ئەمە ئەو خاڵەیە کە مارکیوز لە وتاری ((چەند مانایەکی شاراوەی تەکنەلۆژیای مۆیرن)) دا باسیکردووە[٦٢].

ئەسکی ((پیشەسازی کلتوری)) کتێبی دیالەکتیکی رۆشنگەری بەم حوکمە دەست پێدەکات: هەرچەندە وادەزانرا کە بە لەناوچوونی ئەندێشەی مەسیحی‌و پەرەسەندنی تەکنەلۆژیاو جیاوازیە کۆمەڵایەتییەکان‌و سستبوون‌و لەناوچوونی زۆربەی بونیادەکانی پێش سەرمایەداری، ئاژاوەی کلتوری لەناو دەچێت، بەڵام ئەمە رووینەدا. هەرچەندە کلتور هەرگیز ئەوەندە بەربڵاویش، پێشتر نەبینراوە. ((کلتور ئێستا مۆرێکی یەکسان بە هەموو شتێکەوە دەنێ. سینەماو رادیۆو بڵاوکراوەی نیزامی‌و دروست دەکەن کە یەکگرتووە.. دروست وەك یەك هەمەکی))[٦٣]. کلتور بە ئاشکرا بووە بە پیشەسازی‌و پەیرەوی لە یاساکانی بەرهەمهێنان لە بازاڕی کاڵادا، دەکات. لێرەوە دروست وەك بەرهەمی پیشەسازی پشتی بەستووە بە ((هاوئاهەنگیەکی درۆزنانەی بابەتی هەمەکی‌و بابەتی تایبەتی)).

هونەر لە بونیادی خۆیدا ئەم هاوئاهەنگیە قبوڵ ناکات، لەبەر ئەو هۆیە سادەیەی ئەوە بەدرۆیەك دەزانێت: ئەزمونگەری ((ئەو قوتابخانەیەی ئادرنۆ لە نزیکەوەو بەوردی سەرنجی لە گەشەکردنی لە لقە جیاوازەکانی هونەردا دەدا)) ((هیچ نیە جگە لە کاردانەوە بەرامبەر بەو یەکێتیە ئۆرگانێکی‌و هاوئاهەنگیە دەرونیەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێت)). یاسا سەرەکیەکانی هونەری جەماوەری بە پیچەوانەی هونەری مۆدێرنەوە دامێنانی شێوەیەکی ناراستی هاوئاهەنگیە، لێرەوە لەزەت وەرگرتن لە هونەری جەماوەریدا نەك هەر ئاستی توانست‌و زەوق‌و

پێداویستیە جوانناسیەکان بەرزناکاتەوە بەڵکو خەسڵەتێکی سەرکوتکەرانەی هەیە. لێرەدا لەزەت واتە ((بیرنەکردنەوە))و ئەندێشەنەکردنی هیچ شتێك‌و فەرامۆش کردنی گرفت‌و ئازارو دژایەتیەکان.. تەنانەت ئەو کاتانەش [کە هەموو ئەمانە] نمایش دەکرێن. بەم شێوەیە لەزەت وەرگرتن لە هونەری جەماوەریدا دژی (دوا سەنگەرەکانی بەرگری ئەندێشە)) دەجەنگێت.

ئەو ئازادیەی کە لەزەتێکی لەم چەشنە مژدەی دەدا{بریتین لە} ((ئازاد بوون لە بیرکردنەوەو لە نەفیکردن))[٦٤]. بە هۆی پیشەسازی کلتورەوە رازیبوون، هاوڕەنگبون لەگەڵ کەسانی دیدا، لەناوچوونی وتوێژی ئازاد لەسەر بنەمای جیاوازی بیروڕاو لە ناو چوونی سەربەخۆیی فکر، دروست دەبێت هونەری جەماوەری‌و((بەرهەمەکانی پیشەسازی کلتور)) جیاوازیە دەرونیەکانی نێوان رەگەزەکانی کۆمەڵ (جمع) دەرناخات. هەموو دەبێت لەگەڵ چرکە غەمگینەکانی ملیودرامێکدا، بگرین، لە ((کۆتایی شادی)) فلیمێکدا خۆشحاڵبن، رازی یان قبوڵی بکەن کە نهێنی سەختی‌و ئاکامی‌و شکستەکان لە ((سروشتی)) و دەرونی مرۆڤ خۆیدایەو پەیوەندیەکی ئەوتۆی بە نایەکسانی کۆمەڵایەتیەوە نیە.. بە کورتی دەبێ هەموو مل بۆ ئەخلاقی دزێوو داب‌و نەریتی سوکی بورژوازی بدەن.

بە بڕوای ((ئادرنۆو هورکهایمەر)) پیشەسازی کلتور هاتنەدی (تحقق) کۆمەڵایەتی، شکستی ئەندێشەیە، [چونکە] یەکێتیەکی خەیاڵی دروست دەکات کە ئادرۆنۆ بە راشکاوی دەڵێت: سەرکەوتکەری غەریزەکانەو لەناویەری هەلومەرجی رزگاری راستەقینەی مرۆڤەکانە ((٦٥)). بە پێی ئەم یەکێتیەو (لەم یەکێتیەدا) وا دەردەکەێت ئەو رێگرەی رێگای لە تێکەڵاوبوونی کلتورو ژیانی عەمەلی‌و رۆژانە دەگرێت، لەناوچووەو جیهانی ئەزموونی (تجربی) بە شێوەیەکی درۆیینە تێکەڵ بە جوانناسی بووە یان لەگەڵیدا بوو بەیەك. هەموو کەسێك خۆی دەخاتە جێی قارەمانی فلیمەکەو دەبێتە هاوبەشی لەزەت‌و سەرکەوتنەکانی، هەموو کەسێك دەبێتە هاودەنگی ئەو سۆزە درۆینە (کزب) و کڵێشەییانەی کە لە گۆرانیەکانی بازاڕدا گوێی لێ دەبێت‌و {لێرەوە} هەموان تێرکردنی خواستە رۆژانەکانی خۆیان بە مانای ((جوانبوونی ژیان)) لێك دەدەنەوە.

وتاری ((نەخشەی پیشەسازی کلتور)) رەشترین نووسینی ئادرنۆیە چونکە نوسەر لێرەدا تەنانەت

هونەری مۆدێرن (کە بەردەوام لەبەردەم هونەری جەماوەریدا بەرگری لێکردووە) تاوانبار دەکات بەوەی هاوبەشە لە کارتێکردنە کۆتاییەکانی هونەری جەماوەریدا. ئادرنۆ کە چەندان جار لە بەرهەمەکانیدا ((بە تایبەتی لە فەلسەفەی مۆسیقای مۆدێرن))دا هونەری مۆدێرنی ستایشکردووەو دەیگوت کە ئەم هونەرە ((دژی ئەو هەمەکی (کلی) و بڕواهێنانە بە گشتگیری درۆزن)) راوەستاوە، لەم وتارەدا دەنوسێت کە ئەم بەرگریە ئەوەندە گۆشەگیرو دەرکراوەو ئەوەندە خراوەتە پەراوێزەوە کە چیدی ناتوانێت کاریگەری‌و کارایی هونەرێکی بالای هەبێت.

ئێستا با باسی یەکێ لەسەرچاوەکانی باسەکەی ئادرنۆو هۆرکهایمەر بکەین لەسەر ((پیشەسازی کلتور)). جورج سیمیل لە سەرەتای سەدەی بیستداو لە ((تراژیدیای کلتور)) دا (١٩٠٠/١٩١١) نوسیبووی ((کلتوری فەردی)) کە ناوینابوو ((کلتوری زاتی)) لە کلتوری گشتی (جمعی) یان ((کلتوری بابەتی)) جیابۆتەوە. ئەم دوانە تەنانەت لەساتەوەختە کەمەکانیشدا پێکەوە کۆنابنەوەو ناگونجێن. دابەشبوونی کاری کۆمەلایەتی گرنگی بە کلتوری بابەتی دەداو خەلك کلتورێك وەردەگرن یەك لایەنەو زیاد لە پێویست پسپۆرانە (تخصص)و لە بنەڕەتدا ناکاملێ‌و ناتەواو. قەیرانی کلتوری زاتی، تاکەکان بێتواناتر دەکات لەوەی لەسەرجەم دیاردە کلتوریەکان تێبگەن‌و گرنگیش بە هەندێ کاری مرۆیی چەندان جار زیاتر لە هەندێکی دی دەدا.

بە بڕوای سیمیل ناتەبایی لە کلتوردا {بریتیە لە} ((تراژیدیای کلتور))[٦٦]. ئەم باسە تا رادەیەك لەو باسەی مارکس دەچێت کە جیاوازی دەکات لە نێوان کاری فکری‌و کاری جەستەیدا. بە هۆی جیاوازی ێوان ئەم دوو کارە، هۆشیاری لە ژیانی کۆمەلایەتی جیا دەبێتەوە. چەند شێوەیەکی هوشیاری (لە قالبی زانستی تەکنیکی‌و پسپۆڕیدا (تخصصی) لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا دەمێننەوە، چونکە پێویستی تەکنیکیان پێی هەیە.. بەلام شێوەکانی دی هۆشیاری (لە قالبی زانینی تیرۆیدا (معرفە نظری) دور لە نیازو مەسەلەکانی بەرهەمهێنان دەمێننەوە.

ئادرنۆ (و پێش ئەویش فالتر بنیامین) جیاکاریەکانی باسەکەی ((سیمیل)) ی یان قبولە. بنیامین جیاوازی لە ناو خودی ((بەرهەمی کلتوریشدا)) دۆزیەوەو نوسی: ((هیچ بەلگەیەك لە ژیار ((حچارە)) ناتوانین بدۆزینەوە لە هەمانکاتدا بەلگەی بەربەریەت نەبێ)) ((٦٧)). کە وابوو ژیار هەمیشە ئاماژەیە بۆ ئەو لایەن‌و قسانەی کە نەوتراوە، واتە باسی ((نەتوانینی دەربڕین)) دەکات. ئادرنۆ پاش چەند سالێك واتە حوکمە پۆستمودیرنیسمەکەی بنیامینی بەم شێوەیە درێژە پێدا:

((هەموو کلتوری پاش ئاشوێتز، تەنانەت ئەو رەخنە توندانەش کە ئاراستەی کراوە جگە لە زبل هیچیدی نیە. کلتور لە پاش ئەو روداوانەوەو بۆ بونیادنانەوەو چاککردنەوەی خۆی، بێئەوەی هیچ بەرگریەك لەبەردەم زیادە پەراوێزیەکان خۆیدا بکات، راستەوخۆ گۆڕاوە بۆ ئایدیۆلۆژیا. {دیارە} پێشتریش بە شێوەیەکی بەزەبر {بالقوە) هەروا بوو، ئیدی کلتور هەولیدا لەو روبەرووبوونەوەی بوونی مادیدا، ئیلهامی بداتێ‌و ئەمەش نەدەکرا بێ جیابوونەوەی هزر {زهن} لەکاری فیزیکی)) ((٦٨)) ئەم دەربڕینە توندڕەوە کە تەنانەت نکولی لە دەستکەوتەکانی مۆدێرنیسمی هونەری دەکا، لەسەر بناغەی چەمکێك بونیادنراوە کە دەتوانین بە بەراود لەگەل نوسینەکەی ((سیمیل)) دا ناوی بنێین ((قەیرانی کلتور)): ((مرۆڤ بەرەو بەربەریەتێك دەچێتە پێشێ کە کلتوری ئێمە راستەخۆ جگە لەوە هیچ پیشان نادات)).

هربرت مارکیوز لە ((وتارێك سەبارەت بە ئازادی)) دا (١٩٦٩) کلتور بانگدەکات بۆ یەکگرتن لەگەل کارداو داوای ((تواندنەوەی هونەر)) دەکات.. واتە تواندنەوەی لە کارو ژیانی رۆژانەدا. بەلام خەسلەتی هەموو دیدگایەکی توندڕەوانە ئەوەیە زوو لە بیر دەچێتەوە. ئەو کەسەی رایدەگەیەنێت لەبەر ئەوەی ناتوانێ خۆی لەبەردەم دژایەتی‌و بابەتە جیاوازەکاندا رابگرێت، بە ئاسانی لە بیری دەچێتەوە. ئادرنۆ پاش وتاری ((نەخشەی پیشەسازی کلتور)) دیسان گەڕایەوە بۆ بەرگریکردن لە هونەری مۆدێرن {بە تایبەتی لە دوا بەرهەمیدا ((تیۆری جوانناسی)) } لە وێدا بۆمان دەردەکەوێت کە بەرهەمەکانی ((بیکێت)) و ((شونبرگ)) ی پاش ئاشوێنز، زبل نەبوون. مارکیوزیش تەنها سێ سال پاش ((وتارێك سەبارەت بە ئازادی)) لە ((دژە شۆڕش‌و شۆڕش)) دا (١٩٧٢) باسی پێداویستی لایەنگری هونەری مۆدێرن‌و سەربەخۆی کرد.

{دیارە} بێگومان نکولیکردن یان ئینکار کردنی دیدگای توندڕەوانە بەمانای ئینکاریکردنی ناوەڕۆکی

باسەکە نیە: واتە ((قەیرانی کلتور)).. قەیرانێك کە تەنها دەرئەنجامی دوری بەرهەمی هونەریو کلتوری نیە لە بەرهەمهێنانی مادی (و لە زورینەی کۆمەلگاوە)) بەلکو زیاتر قەیرانێکە کە چیدی ((ووتن)) بیّ دەرئەنجامو ئەستەم دەکات. ئەم خالەی دوایی یەکجار گرنگە، چونکە وەلامی ئەو پرسیارە دەداتەوە: ((کە بۆچی ئادرنۆ ئەوەندە لای پوستمودیرنیسمەکان ئازیزە؟)).

ئەو گرفتەی لەبەردەم ئادرنۆو هورکهایمەردا بوو لە باسکردنی ((پیشەسازی کلتوردا))، هەمان ئەو گرفتە سەرەکیە بوو کە لەبەردەم سەرجەم تیورەی رەخنەگرانەدا رادەوەستا: پێوەری ئێمە بۆ هەلسەنگادنی دوانە لێکدژەکان (چاکەو خراپە، راستو هەلە ... )) چیە؟ ئەم پێوەرە گەر هەیە لە کوێوە بەدەست دێتو چۆن دەناسرێتەوە؟ رەخنەگری کلتوری خۆی بەرهەمی ئەو کلتورەیە کە رەخنەی ئاراستە دەکات. چۆن دەتوانین دلنیابین کە ئامێرەکانی رەخنەگرتنی دروستە؟.

ئادرۆنۆ لە وتاری ((رەخنەی کلتوریو کۆمەلگا))دا لە کتێبی ((بەیانەکاندا)) (١٩٥٥) نوسیویێتی: ((کلتور تەنها کاتێك راستەقینەو حەقیقیە کە بیّ قەیدو شەرت، رەخنەگرانەبێت))[٦٩]. ئەو، رەخنەکاری بە جەوهەری بونیادی کلتور دادەنێت. بەلام پێوەری ئەم رەخنەیە چیە؟.

## فریشتەی مێژوو

باسی پیشەسازی کلتورو ئەو خالەی ئایا پێشکەوتنی مێژوویی مانای هەیە یان نەو؟ ئێمە لە دنیای ((ڤالتر بنیامین)) نزیك دەکاتەوە... بیریارێك کە کاریگەری قولی لەسەر نوسەرانی دیالەکتیکی رۆشنگەری هەبوو. وتاری بەناوبانگی بنیامین ((بەرهەمی هونەری لە سەردەمی لە بەرگرتنەوەی میکانیکیدا)) (١٩٣٦)[٧٠] و دوا بەرهەمی بەناوی ((چەند تێزێك سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو)) ((٧١)) (١٩٣٩) بە دوو دەقی سەرەکیو بونیادی دەژمێرێن.

بە پیّی وتاری ((بەرهەمی هونەری.. )) بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو لەبەرگرتنەوەی (تکپیر) تەکنیکیو میکانیکی، بەرهەمی هونەری کە لە سەدەی نۆزدەدا بە هۆی پەیدابوونی وێنەگرتنەوە (عکاسی) و لەسەرتای سەدەی بیستدا بەهۆی سینەماوە، هەنگاوێکی گەورەی بۆ پێشەوە نا، ئەو توانایە هاتە ئاراوە کە بەرهەمی هونەری بە شێوەیکی فراوان دوبارە بەرهەم بهێنرێتەوەو لەبەری بگیرێتەوەو بفرۆشرێت. تا پێش ئەم گۆرانکاریانە ئەم بەرهەمانە چەند خەسلەتێکیان هەبوو: تاکانە بوون، دور بوون لە تەماشاچیو ژیانی رۆژانەوەو لێرەوە خەسلەتێکی ئەفسوناوییان هەبوو کە بنیامینی لە ژێر کاریگەری رۆمانسیەکانی ئەلمانیادا، ناوینا {{درەوشانەوە (تجلی) }} (بە ئەلمانی **Erfahrung** و بە ئینگلیزی **Aura** ). بەرهەمی هونەری پاش سەردەمی ((لەبەرگرتنەوە)) (تکپیر) خاوەن رەسەنایەتیو ((درەوشانەوە _ تجلی_ )) نیە. وەك ئەوەی ((نرخی سروتی (ئایینی) نەفیکرابێت. لەبەرامبەر ئەمەدا بەرهەمە هونریەکان لە شکلی نوسخە چاپکراوەکانداو وبەچاپی چونایەتی جیاوازەوە یان (وەك فیلمو وێنە) چونەتە ناو کۆمەلانی خەلکەوە. بەم شێوەیە تێگەیشتنێکی تازە بۆ هونەر هاتۆتە ئاراوە: ئەگەر چی بەرهەمی [هونەری] درەوشانەوەی (تجلی) رابردووی لەدەستداوە، بەلام لەناو ئاپورەی خەلکدا جێگەی بۆ خۆی کردۆتەوەو کاری کردۆتە سەر هوشیاری هونەریو ستاتیکیو لێرەشەوە کاری کردۆتە سەر شێوەی تێگەیشتنیان بۆ ژیانو هەلومەرجی کۆمەلایەتی.

هیگلّ پێشتر لە پارچەی ٦٨ کتێبی ((فەلسەفەی یاسا)) دا پێشبینی ئەمەی کردبوو. ئەو بروای وابوو کە لەم حالەتەدا بەرهەمی هونەریو ناوەرۆکە فکریەکەی، سروشتێکی میکانیکی وەردەگرێت. پێدەچێت کە خالی گرنگ لە باسەکەی هیگلدا ئەوە بێت کە بەرهەمی هونەری دەگۆرێت بۆ ((کالا)) یەك:

((بەلام سەبارەت بە بەرهەمە هونەریەکان، ئەگەر شکلّ (کە بریتیە لە وێنەکردنی بیروراکان لە بابەتێکی درەکیدا) وەك شتێك تەماشا بکەین، {ئەوا} مولیەتی فەردی هونەرمەندە بە پلەیەکی ئەوتۆ کە لاسایکردنەوەی کارە هونەریەکە لە بنەرەتدا دەبێتە داهێنانێك بۆ توانای هونەریو عەقلی لاسایکەرەوە. لە کاری ئەدەبیدا ئەوشکلّەیکە بە هۆیەوە {بەرهەمە هونەریەکە} دەبێت بە شتێکی دەرەکی (یصبح شیئا خارجیا) سروشتێکی میکانیکی هەیە. هەمان ئەم شتەش لەبارەی داهێنانی (اختراع) دەزگایەکی میکانیکیەوە (الە) راستە. چونکە فکر، لە حالەتی یەکەمدا، وەك یەك پارچە (کتلە واحدە **Enbloc**)

دەرناکەوێت ({بۆ نمونە} وەك پەیکەرێك) بەڵکو لە ناو زنجیرەیەك سیمبولی تەجریدیو پێکەوە بەستراودا، دەردەکەوێت. لە کاتێکدا فکر لە حاڵەتی دوهەمدا ناوەڕۆکێکی میکانیکی وەردەگرێت. و ڕێگەو ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی میکانیکی ئەم شتانەش دەستکەوتی هەموانەو بەرهەمی کاری خەڵکانێکی زۆرە. بەڵام لە نێوان بەرهەمی هونەری لەلایەکو بەرهەمهێنانی کاڵاکاندا لە لایەکی دیەوە، دەتوانین چەند قۆناغێکی گواستەنە (مراحل انتقالیه) بدۆزینەوە کە کەم تا زۆر خاوەنی سروشتی هەردو لایەنەکەن))[٧٢][١].

بەڵام بنیامین بڕوای وانیە کە بەرهەمی هونەری بەهۆی لەبەر گرتەنەوەی میکانیکیەوە (تکپیر میکانیکی) ناوەڕۆکێکی میکانیکی وەرگرتبێ. ئەو بە پێچەوانەوە، بڕوای وابوو بە چونەناوەوەی هونەر بۆ ناو جەماوەر، ئاستی هونەر دانابەزێت، بەڵکو ئاستی هوشیاری جەماوەر بەرزدەبێتەوە. لێرەوە لە وتارەکەیدا زۆر سەرنجی لە هونەری ((سینەما)) داو ((بە شۆڕشێکی دانا لە ئیدراکی هونەریدا)).

بنیامین تا رادەیەك بە هۆی لایەنگری مارکسیزمو شۆڕشی روسیاو لە ژێر کاریگەری ((برێخت)) دا (کە زۆر هاوڕێی نزیکی بوو)، سینەمای یەکێتی شورەوی لە دەیەی ١٩٢٠ دا بە نموویەکی بەرزی هونەری جەماوەری دانا کە لە پێناوی پێشخستنی ئاستی هوشیاری جەماوەردا بەکاردێت. ئەو هونەری سینەمای شورەوی لە بەرامبەر، هونەری سینەمای ڕۆژئاوا داناو نوسی ((لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا سەرمایەگوزاری سەرمایەدارانە لە پیشەسازی سینەمادا، توانای تێرکردنو جێبەجێکردنی نیازەکانی ئەو مرۆڤە نوێیەی لە ناو بردووە بۆ ئەوەی وێنەی خۆی بەرهەم بهێنێتەوە. لەم هەلو مەرجەدا ئامادەکەرانی فیلم هەوڵ دەدەن سەرنجی جەماوەر لە ڕێی نمایشە خەیاڵیو گومانلێکراوەکانەوە رابکێشن))[٧٣].

ئەوەی ئادرۆنۆ بە سروشتی کۆنەپەرستانەی هونەری جەماوەری دادەنا، بە بڕوای بنیامین ((رەگەزی پێشکەوتنخوازی هونەری مۆدێرن)) بوو، ئەوەش کە ئادرنۆ وەك نموونەی هونەری مۆدێرن ستایشی دەکرد، لای بنیامین ((خەیاڵبازیەکی گومانلێکراوانە)) بوو کە سەرچاوەکەی لە ((تیۆری کلاسیکی هونەر بۆ هونەردایە)). ئادرنۆ لە نامەیەکدا بۆ بنیامین (١٨ مارت ١٩٣٦) هۆکانی خۆی بۆ جیاوازی تێڕوانینی لە بنیامین، هێنایەوە ((٧٤)). ئەم نامەیە هەڵگری ناوکی سەرەکی تێڕوانینی ئادرنۆیە بۆ هونەری جەماوەری. ئادرنۆ باسی ئەو ((گشتگیریە درۆزنەی)) کرد کە هونەری جەماوەری دەیخولقێنێو نوسی کە لە نێوان هونەری رەخنەگرانە یان مۆدێرن و هونەری دزێوو نزمی هونەری جەماوەریدا هیچ پەیوەندیەك نیە.

ئادرنۆ یەکانگیری {و پەیوەندی} وەرگرانی هونەری جەماوەری بە ((هاویەشیبوون لە بیێ فکریدا)) داناو وەڵامی نموونە نوسراوەکانی بنیامینی دایەوە. بنیامین وەکو برێخت ستایشی یەکانگیری تەماشاچیانی لە پێناوی تێگەیشتنی هاویەشی مانای {فلیمەکاندا} کردبوو، بەڵام ئادرنۆ کاردانەوەی تەماشاچیانی بە تەقلیدیو ((جۆرێك لە نمایشکردن بە یەکانگیری)) لە قەڵەمدا. ئەو دە ساڵ دوای ئەوە لە ((دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا)) ((پێکەنینی هاویەشی تەماشاچیانی فیلمەکانی چارلی چاپلنی)) بە کاردانەوەیەکی درۆزنو کۆنخوازانە دانا کە تەنها ((نمایشێکی گشتیە)) {کە} ئەندامەکانی جگە لە کۆمەڵی مۆناد (یان رەگەزی تاكو تەنیا) زیاترنین، هەموان خۆیان بە لەزەتی هاوڕێ بوون لەگەڵ ئەوانی دیدا، بەخشیووە. هاوئاهەنگی نێوان ئەمانە جگە لە کاریکاتۆرێك لە یەکانگیری زیاتر نیە))[٧٥]. لەو نامەیەدا کەباسی دەکەین ئادرنۆ نووسیویەتی (کەوابوو دیدگای سوقرات کە {دەیگوت} جوانی دەبێت سودمەند بێت بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز، سەرکەوتووە)). چونکە برێختو بنیامین، دڵخۆشن بە ((زیاد بوونی هوشیاری وەرگران)) و ئاشکراشە لێرەوە تا هونەری بەرپرسیار تەنها یەك هەنگاو دورین. بەدەر لە تازەگەریە هونەریەکانی ((ئیزنیشتاین)) ، ((پودوفکین))و ((داوژنکۆ)) ئەوەی پڕوپاگەندە سیاسەکانی بەرهەمەکانیان بە ((هوشیارکەرەوە)) دابنێین، هیچ نیە جگە لە قبولکردنی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی ئەو پڕوپاگەندانە.

دەتوانین لە ناوچوونی دروشانەوەی (تجلی) بەرهەمی هونەری کە بنیامین هێناویەتە ئاراوە، بە ((ئەفسانە داماڵینی)) مۆدێرنیتی دابنێین. ئەمە خاڵێکە خودی بنیامین لە کتێبی ((پاسارژەکاندا)) ئامارژەی بۆ کردبوو و ((کتێبێك کە دواساڵەکانی ژیانی بۆ نوسینی تەرخان کردبوو و{ئێستا} لە شێوەی کۆمەڵێك وتارو یاداشتدا ماوەتەوە))[٧٦].

---

١ * ئەم بەشەی قسەکانی (هگل) م بەیارمەتی وەرگێڕانە عەرەبیەکە کردۆتە کوردی واتە لە کتێبی: ((اصول فلسفه الحق _ هیکل _ ت: د. امام عبد الفتاح امام _ دار التنویر للگباعه والنشر _ الگبعه الپانیه ١٩٨٣_ ص ١٧٩ {و.ك}

بەڵام ئادرنۆ پێش هەموو کەسێك وەڵامی ئەم خاڵەی دابۆوە کە ئەفسانەو ئەفسونی مۆدێرنێتی لەو مەزەنەیە لە ((گشتگیری درۆزنانە))دا زیاتر دەردەکەوێت، تا لە هەرشتێکی دیدا، ئادرنۆ نوسیبووی کە هەر بەرهەمێکی پیشەسازی کلتوری کە بە ئەندازەی زۆر و بۆ جەماوەرێکی زۆر بەرهەم دەهێنرێ، لە راستیدا سەرچاوەی نامۆ بوونو بەشتبوونە. ئەم زانیە [واتە ئەو زانینەی بەرهەمی پیشەسازی کلتوری دەیبەخشێ – و.ك] جواننناسیانە نیە بەڵکو لەسەر بنەمای عادەتو ئاشنایی لەگەڵ رەمزو کلێشەکاندا، دروست دەبێت. بنیامین ((وەرگتنی کۆیی (جمعی) ((٧٧)) بەرهەمی هونەری بە شتێکی ئیجابی دەزانیو بە نیشانەی جیهانێکی دادەنا ((کە بە تەواوی لە ئەفسانە رزگاری بووە)) لای بنیامین ئەفسانە مانایەکی ئیجابی نەبوو ((رەنگە بتوانین بڵێین بنیامینیش وەك هیگڵ ئەفسانەی بە پلەیەکی تێپەڕێنراوی هوشیاری دەزانی))(٧٨).

ئەمە بەرگریکردنی بنیامینە لە مۆدێرنیتی. دروشانەوەی (تجلی) بەرهەمی هونەری سروشتێکی ئەفسانەییە. دیدگای ئەفسانەی لەسەر بنەمای لێك چوونی شتەکان یان مانای شاراوەو نادیار، راوەستاوە. رەمزی ئەم دەلالەتە، سیمای پیرۆزە لە هەموو ئەفسانەیەکدا، ئەم ((بنەما فکریە تایبەتە لەبارەی حەقیقەتەوە)) لەسەردەمی مۆدێرندا نکوڵی لێکراوە. رەنگە بتوانین بڵێین کە لە تێڕوانینی بنیامیندا لە بەرهەمێکی هونەریدا لەنێوان (تەجلی)و ((رەگەزی عەقڵانیدا)) **Ration** جیاوازی هەیە، دیارە هیچ بەرهەمێکی هونەری تەنها لە رەگەزی عەقڵانی دروست نابێت، ئەگینا چیدی هونەر نابێت. نرخی سروتی (ایینی) یان تەجلی یا تایبەتمەندی ئەفسانەیی بەرهەمی [هونەری] تا رادەیەك دەمێنێتەوە، بەڵام بنیامین دەڵێت لەسەردەمی تازەدا رەگەزی عەقڵانیەت بەسەر تەجلیدا سەردەکەوێت.

بەدەر لە رەخنەکانی ئادرنۆ سەبارەت بە دەرئەنجامە عەمەلی (و سیاسی‌یەکانی) دیدگای بنیامین کە باسمان کرد) دەبێ ئەو خاڵە ئاشکرا بکەین کە رەگەزە دروستکەرەکانی بەرهەمی هونەری، بێ تەجەلی بێ مانان. کارل کرئاس دەیگوت ((هەرچی زیاتر لە وشەکان نزیك بینەوە، ئەوان لە ماوەیەکی دورترەوە سەیرمان دەکەن)) پێشتر بینینمان کە بنیامینیش وەك ئادرنۆ لە دوای ((سیمیل ))ەوە باسی نەتوانینی دەربڕینیان کردووە، کەوابوو ئەو توانایەی بنیامین لە وتاری ((بەرهەمی هونەری..)) دایە بە((هونەری جەماوەری)) دەدا چیە؟ بۆ سەلماندنی ئەو خاڵە کە کارل کرئاس دەساڵ بەر لە وتاری ((بەرهەمی هونەری..)) درکانبووی، شیعر باشترین نموونەیە. شیعر (کە خودی بنیامین بۆ باسکردنە مۆدێرنیتی پشتی پیبەستبوو و لە کتێبی پاساژەکاندا لە شیعری بودلێر کولێببۆوە) نموونەیەکە لەو هونەرەی کە بێ تەجلی بێ مانایە، بوونی نیە. چونکە لە نێوان دەلالەتی وشەکانو مانا مەجازیەکانی لە شیعردا، جیاوازیەکی گەورە هەیە. بنیامین لە کتێبی پاساژەکاندا (١٩٣٥_١٩٣٩) دەریخستووە کە دەتوانین خاڵێکی گرنگ لە شیعری بودلێردا بدۆزینەوە: مۆدێرنیزمی بەرهەمی هونەری هاوڕێی شتێکی کۆنە_ کە لە کۆنێتیدا ناناسرێتەوە.. واتە رەگەزێکی ئەفسانەیی لە شیعری ئەم شاعیرە تازەگەرەدا سەریهەڵداوە، [بە شێوەیەك] کە تەنانەت خۆشی هوشیار بووە پیێ و لێرەوە یەکجار ئەم خاڵەی وەك ((گەڕانەوەی شتێکی کۆن لە ناوجەرگەی تازەگەریدا)) باسکرد. لێرەدا دیالەکتیکی ((ئەفسانەو مێردێرنیی)) ((ئەریتو مۆدێرنیزم))تێك دەشکێت. واتە گرنگترین ئەفسانەی مۆدێرنیی لە ناو دەچێت.[٢] ئەگەر لە پشت زمانی مەجازیو ئیستعاری شیعری بودلێرەوە (زمانێك کە داهێنانی شاعیری مۆدێرنیزمە) تەجلیەکی ئەفسانەییو کۆن راوەستابێت، کەوابوو لەو بابەتانەشدا کە پەیوەندی بە داهێنانەوە نیە، ئەو شتە کۆنە، ئەریتیی یان تەنانەت ئەفسانەییو نەناسراوە، بە هێزێکی زیاترەوە دەتوانێت هەبێت. بنیامین دەنوسێت کە ((زمانی دەریای)) شاعیر بیرهێنەرەوەی پاریسە: پاریسی بودلێر شارێکی مۆدێرنو هزیانیو مالیخولیایی. شارێکە غەرق بووە لە ژێر ئاوەکاندا. شارێکی زەمینی نیەو ژێرزەمینیش نیە، بەڵکو شارێکە کە لە دورگەیەکی ئەفسانەی دەچێت لە ژێر ئاوەکاندا. لێرەوە بە پیێ وتەی بنیامین، مێژووی مۆدێرنیتی بەردەوام لە مێژووی رابردوو، لەسەرچاوەی خۆیەوەو، مەرجەعی قسە دەهێنێتەوە. تەمو مژ کە گرنگترین هاوڕێ(و لە حەقیقەتدا هاوڕێی ئەمری) هونەرە، بەباشی هەواڵ لە بارەی زیندووبوونی ئەفسانە یان نرخی ئایینەوە دێنێ. لە هونەری بەرجەستەکاریدا لە رەسمکردنەوە تا وێنەگرتنو سینەما (کە بنیامین هەموو ئەمانە بەو هونەری بەرجەستەکاری دادەنێ) دیسان دەتوانین

---

[٢] مەبەست ئەوەیە کە بانگەشەی مودیرنیتی کە دەیگوت ئەفسانەکانی لەناو بردووە، جگە لە ئەفسانەیەك هیچی دی نیە. (و.ك)

((شکلگیری شێوەیەکی تازە لە ئامادەبوونی ئەفسانە بدۆزینەوە. ئەم خاڵە بەتایبەتی سەبارەت بە هونەری مۆدێرن راستە کە ((هەر شتێکی مۆدێرن)) وەك بودلێر دەڵێت: ((دورترین شتەکانە .. واتە بە [دوریەك]و جیابوونەوەیەکەوە ئامادەی هەیە (کە دەلالەت لە نرخی ئاینیو تەجلی دەکات). دەتوانین بڵێین بنیامین لە کتێبی پاساژەکاندا تا رادەیەك لە خاڵێك نزیك دەبێتەوە کە ئەو بروایەی پێشووی پوچەڵ دەکاتەوە سەبارەت بە لە ناوچوونی تەجەلی لە بەرهەمی هونەریدا لەسەردەمی لێگرتنەوەو دوبارە بەرهەمهێنانەوەی میکانیکیدا. بەئاسانی دەتوانین دەربیخەین کە ((وێنەگرتنو سینەما)) ماوەیەك (مسافە) لە نێوان هوشیاریەکاندا دروست دەکەن کە هەم ئەفسانەییەو هەم دیدگای بنیامین لەبارەی یەکانگیریەوە (ئەوەی ئادرنۆ پێی دەگوت ((گشتگیری درۆینە) لە ناو دەبات.

هەرچەندە بنیامین ((بەرهەمی هونەری..)) و ((کتێبی پاساژەکانی)) بەتەواوکەری یەکتر دادەنا، بەڵام دەتوانین ببینین کە لە گرنگترین خاڵدا ئەم دوو دەقە وەکو یەك نین. بە ئاشکرا لە باسی بنیامین سەبارەت بە بودلێر لە ((کتێبی پاساژەکان)) دا (کە بە جیاش وەك کتێبێکی سەربەخۆ لە بارەی بودلێرەوە بلاوکرایەوە))[٧٩] گەرانەوەیەك ئادنرۆ دەبینین بۆ بیرۆکەی تەجەلی. رەنگە بتوانین هاوبیری ئادرنۆ بین کە دەیگوت بنیامین لە ((بەرهەمی هونەری..)) دا لە ژێر کاریگەری برێختدا ملی بۆ کارتێکردنەکانی گوتاری مارکسیزمی دابوو، بەڵام یاداشتەکانی لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٣٧ تا ١٩٣٩ خۆی رێگای بۆ ((لۆژیکێکی جیاواز)) کردەوە. بێگومان یاداشتەکانی ئەم ساڵانە گرنگیەکی مەزنیان لە پەرەسەندنی ئەندێشەی بنیامیندا هەیە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا بوو بنیامین تێگەیشتنێکی تازەی بۆ فەلسەفەی مێژوو دەستەبەرکرد. تێگەیشتنێك کە زۆربەی نوسینەکانی پێشووی خۆی بەتایبەتی چەمکی پێشکەوتنی مێژوویی، دەخستە ژێر پرسیارەوە. رەنگە لێرەشدا هەندێك روداوی سیاسی رۆژانە کاریان لە ئەندێشەی بنیامین کردبێت. روادی وەك ئیمزاکردنی پەیمانی دەست درێژی نەکردن لە نێوان ئەڵمانیای نازیو یەکێتی شورەویو نزیکبوونەوەی هەردوو وڵات لەیەکتر.

بەهەرحاڵ گرنگ ئەوەیە لە ((چەند تێزێك لە بارەی فەلسەفەی مێژووەوە)) بنیامین خۆی لە دەسەڵاتی گوتاری مارکسیستی رزگار کردو تێگەیشتنێکی تازەی بۆ فەلسەفەی مێژوو پێشکەش کرد.. تێگەیشتنێك کە کاریگەریەکی گەورەی کردە سەر هزری ئادرنۆو هورکهایمەر. ئەوان دوا نوسینی بنیامینیان بە تایبەتی ((چەند تێزێك)) یان لە وڵاتە یەککرتوەکانی (ئەمەریکا) لە رێی ((هاناٰرنتەوە)) بەدەست گەیشتو خوێندیانەوە. بنیامین چەند مانگێك پێشتر لە دوادیداریدا لەگەڵ ((ئارنت)) دا کە بەرەو ئەمەریکا دەچوو، ئەو نوسینانەی پێدا بوو. لەو ماوەیەدا بنیامین لە پاش داگیرکردنی فەرەنساو لە رێی راکردنیدا بۆ ئیسپانیا، لە شارۆچکەیەکی سنوریدا، خۆی کوشتبوو.

((چەند تیزێك لەبارەی فەلسەفەی مێژووەوە)) گرنگترین بەرهەمی بنیامینە. دابرانو جیابوونەوە لە هەموو ئەو شتانەی لە ساڵە کورت بەڵام پڕ درەوشانەوەکانی نوسینیدا، بووبوونە رێگر لەبەردەم تێگەیشتنێکی دروستدا بۆ مۆدێرنیی، لێرەدا رێگەیەکی تازەی لەبەردەمدا کردەوە. ئەو بۆ هەمیشە لە مارکسیزمی شورەوی جیا بوویەوە. بنیامین لە ((یەکەمین تێزدا)) باسی قەمورێك دەکات کە لە ناودڵی مرۆڤێکی ئالیدا دانیشتووەو چاودێری جوڵەکانی دەکات. ئەو مرۆڤە ئالیە لە هەموو یاریەکی شەترەنجدا دەیباتەوە بەڵام لە حەقیقەتدا ئەوە قەمورەکەیە کە دەیباتەوە ((مرۆڤە ئالیەکە مارکسیزمی مێژوویە تەنها ئەگەر تیئۆلۆژی بەکار بهێنێ)). بنیامین لە ((تێزی دوهەمدا)) دەنوسێت کە تێگەیشتنی ئێمە (یان راستتر تەسەوری ئێمە) بۆ خۆشبەختی ئەنجامی سەردەمی ئێمە یان ئەنجامی خەیاڵی رۆژگاری ئێمەیە بۆ ئایندە. لێرەوە مسیانیسم وەك باوەڕ بە رزگارکەرێك لە ناوجەرگەی تێگەیشتنی مۆدێرندایە بۆ خۆشبەختی. مۆدێرنیتی کە لەو باوەڕە ((میسانیکیە)) جیا بو بۆوە، لە حەقیقەتدا پابەندە پێوەی ((٨١)). لە ((تێزی پێنجەمو شەشەمدا)) باسی ئەوەیە کە [تێگەیشتنو] ئیدراکی سەردەمی مۆدێرن ناتوانێ لە رابردوو و کاریگەریەکانی رزگار بێت[٨٢]. لە ((تێزی حەوتەم)) دا بە راشکاوی هاتووە کە مێژوونوس تەنها هاوبیری سەرکەوتوانەو هەر راڤەکردنێکی رابردوو، گیرۆدەی بەرژەوەندی سەرکەوتوانی ئەمڕۆ رابردووە. مێژوو لەحوکمی هاوبیری دەسەلاتداراندایە. مێژوو سەرکەوتاون (باڵا دەستەکان) دەینوسنەوەو ئەم لایەنە مێژوییە لە خۆیدا هیچ نیە جگە لە رەنگدانەوەی (ئازارو) رەنجی رابردوان. ئەوەی ئەمڕۆ وەك مژدە ئازادی دەردەکەوێت، کۆبونەوەی (ئازارو) رەنجەکانە.هەر بەڵگەیەکی ژیار لە هەمان کاتدا بەڵگەیەکە لە بەربەریەت کە تەنها هەواڵی

سەرکەوتنەکان ناهێنێ: ((سەرچاوەی ئەمڕۆ.. تەنها قەزاری ئەندێشەو تواناکان نیە، بەڵکو قەرزاری ئازارو رەنجی بێ ناوو نیشانو فەرامۆشکراوی ئەو کەسانەیە کە هاوزەمانی بیریارانو بەتواناکان بوون))[٨٣].

لە ((تێزی هەشتەم)) دا ئەم حوکمە راچڵەکێنەرە هاتووە ((نەریتی ستەملێکراوان فێرمان دەکات کە ئەو هەلومەرجە نائاساییەی تیایدا دەژین..نەک ئاوارتن (استپناو) بەڵکو یاسایە))[٨٤].

ئەمە هاواری بیریارێکە کە لە تۆفانی ١٩٤٠ وە گوێمان لێدەبێت. ئەو لە دروشمە شۆڕشگێڕەکانی ژیانی چالاکانەی فکری خۆیماڵئاوایی دەکاتو پێمان دەڵێت مۆدێرنیتی خولقاوی ساتەوەختە قەیراناویەکان و ((ئەم هەلومەرجە نائاساییو ترسناکە)) نیە، بەڵکو سەرجەم مێژووی مۆدێرنیتی ئەم هەلومەرجەیە. قەیرانێکە بەردەوام. بەم شێوەیە پەرەسەندنو پێشکەوتن بێ مانا دەبن ((یەکێك لە هۆکانی بەختی سەرکەوتنی فاشیزم ئەوە بوو نەیارەکانی لەژێر دروشمی پەرەسەندندا وەك پێویستیەکی (چرورە) مێژووی قبوڵیان کرد))[٨٥] وێنەی کاملی مۆدێرنیتی لە ((تێزی نوهەمدا)) هاتووە.

تابلۆیەك لە ((کلی)) بە ناوی ((فریشتەی نویێ)) وە، فریشتەیەك پیشان دەدات کە هەوڵدەدات لە جێگەیەك رابکات کە ماوەیەکی زۆر بە تێفکرینەوە تیایدا راوەستابوو. چاوەکانی دەدرەوشێنەوەو دەمی کردۆتەوەو باڵەکانی کراونەتەوە. دەتوانین فریشتەی مێژووش وادابنێین. روی کردۆتە رابردوو، لە کاتێکدا ئێمە شایەتی زنجیرەیەك روداین ئەو تەنها کارەساتێکی بێوێنە دەبینێ. کارەساتێك کە وێرانیەکی زۆر دروست دەکاتو دەیخاتە ژێر پێی. فریشتەکە دەیەوێت بمێنێتەوە، مردوەکان زیندوو بکاتەوەو هەموو شتە شکاوەکان چاك بکاتەوە. بەڵام رەشەبایەك لەبەهەشتەوە دەست پێدەکاتو وا بە دەوری باڵەکانیدا دەسوڕێنەوە کە چیدی توانای داخستنی باڵەکانی نابێت. ئەم تۆفانە بە شێوەیەکی ناچاری پاڵبە فریشتەکەوە بەرەو ئایندەیەك دەنێن کە پشتی تێی بوو. لە ژێر پێیدا وێرانیەکان زیاد ئەکەن. ئێمە بەم تۆفانە دەڵێین گەشەکردن))[٨٦].

خاڵی گرنگ ئەوەیە فریشتەکە رووی لە ئێمەیە. نیگای ئێمە (کە روی لە فریشتەکە یە) رەشەباکە بەرەو فریشتەکە دەنێرێت. دیدی ئێمە نیگای ئێمە کە دەدرەوشێتەوە لە خەیاڵی بەهەشتی مۆدێرنێتیدا بەڵام لە رابردووەوە دێتو وەك تۆفانێك رێگای دروستکردنی خۆشبەختی لە فریشتەکە دەگرن: تۆفانیی گەشەکردن.

((کانت)) دەیگوت بنەمای رۆشنگەریو مۆدێرنێتی تێگەیشتن لە ئێستا یان زەمانی هەنوکەیە (حاچر). بنیامین لە ((چەند تێزێکدا)) دەڵێت کەئەم بنەمایە زەمانی ئێستا وەك ساتەوەختێکی پەرەسەندن دەناسێت. ئەو [واتە بنیامین] دەریدەخات کە تێگەیشتنی سوسیال دیموکاسی بۆ پەرەسەندن تا چ رادەیەك ترسناك بوو [تا چ رادەیەکیش] ترسناکە ((پەرەسەندن وەك شتێکی ناچاری لێهات کە بە شێوەیەکی میکانیکیو لە هێلێکی راست (یان پێچاوپێچدا)) بەرەو پێشەوە دەچێت)).

بەڵام ئەم پێشکەوتنە خەیاڵیە. لە ((تێزی چواردەهەمدا)) دەخوێنینەوە ((مێژوو بابەتی بونیادێکە کە جێگاکەی نەك زەمانی خاڵیو چونیەکە، بەڵکو زەمانێکە وەرگیراو لە ئامادەبوونی (حچور) ئێستاوە **jetztzeit** )) ((٨٧)). لێرەدا بنیامین سودی لە وشەی کانتی ((**Gegenwaert**)) وەرنەگرتووە کە بە سادەیی مانای ((زەمانی هەنکە)) یە، بەڵکو باس لە ((ئامادەبوونی ئێستا (حچور الان) دەکات. رەنگە بنیامین ئەم چەمکەی لە **Nunc Stans** ی عرفانی مەسیحیەوە وەرگرتبێت: ئێستا نەك وەك ساتەوەختێك یان پارچەیەك لە هەمەکی زەمان، بەڵکو وەك واقعیەتێك کە پشت بە رابردوو دەبەستیێو چەند راڤەکردنێك بۆ رابردوو دەست پێدەکات. ئێستا یان ((زەمانی هەنوکە)) (زمان حاچر) هیچ نیە جگە لە قبوڵکردنو وەرگرتنی یەك مانا، یان یەك راڤەکردنی تایبەت. کەوابوو وێنەکانی مۆدێرنێتی وەك کاملبوون، تێگەیشتنی ئەمڕۆ، تێگەیشتنی گۆڕانکاری هەموو ئەمانە دەبن بەکۆمەڵێ چیرۆکی کۆنو هەزار جار وتراوو بیستراو.

((لە دوا تێزدا)) دەخوێنینەوە ((یەکێك لە زیندەوەرناسانی سەردەمی ئێمە نوسیوێتی ((پەنجا هەزار ساڵ ژیانی ((مرۆڤی عاقل)) لە چاو مێژووی ژیانی ئۆرگانێکی سەرزەویدا، وەك دوچرکەی کۆتایی وایە لە چاو. بیستو چوار سەعات ژیانی رۆژنەدا. بە پێی ئەم پێوەرە مێژووی مرۆڤی خاوەن شارستانێتی تەنها یەك لەسەر پێنجی دواچرکەی کاتژێر کۆتایی، داگیر دەکات)).

زەمانی هەنوکە یان ئێستا وەك نموونەی زەمانێکی پشت بەستو بە مسیانیسم، هەموو مێژووی مرۆڤی لەناو خۆیدا چڕکردۆتەوە دروست وەك جێگای مێژووی مرۆڤایەتی لە جیهانی بووندا)) ((٨٨)).

**پەراوێزو سەرچاوە:**


١. همچنان مهمترین کتاب تاریخی دربارەی مکتب فرانکفورت، کتاب مشهور مارتین جی است:

M. Jay, *The Dialectical Imagination*, New York, 1974.

2. M. Horkheimer, T. W. Adorno, *La Dialéctique de la raison*, trans. E. Kaufholz, Paris, 1983

ماخذ کارمن همین ترجمەی فرانسوی بودە، اما همە جا، بی‌استثناء، اشارات و بازگفت‌های کتاب را با ترجمەی انگلیسی قیاس کردەام:

M. Horkheimer, T. W. Adorno, *Dialectic of Enlightenment*, trans .J, Cumming, London, 1971

3. T. W. Adorno, *Minima Moralia*, trans. E. F. N. Jephcott, London, 1974.

4. M. Horkheimer. *Notes critiques, 1949-1969*, trans. S. Cornille. P. Ivernel, Paris, 1993.

5. M. Horkheimer, T. W. Adorno. *La Dialectique de la raison*, p. 13.

6. M. Horkheimer, 'The End of Reason', A. Arato, E. Gebhardt eds, *The Essential Frankfurt School Reader*, New York, 1978. pp. 26-48.

7. J. Locke, *An Essay Concerning Human Understanding*, ed. P. H. Nidltch, Oxford, 1990, pp. 668-688.

8. M. Horkheimer. *Théorie traditionnelle et théorie critique*, trans. C. Maillard, S.Muller, Paris, 1974, pp. 15-90.

9. T. W. Adorno and Others, *The Positivist Dispute in German Sociology*. trans. G. Adey, D. Frisby, London, 1976.

10. A.Comte, *Philosophie des sciences*, ed. J. Laubier, Paris, 1974. pp. 11-14.

11. A.O'Hear, *Karl Popper*, London, 1980, pp. 31-36.

12. M. Horkheimer. *Théorie traditionnelle...*, p. 75.

13. M. Horkheimer, *Théorie Critique*, paris, 1978, p. 351.

14. *ibid*. p. 361.

15. *ibid*. p. 99.

16. *ibid*, p. 365.

17. M. Horkheimer, *Théorie traditionnelle...*, p. 40.

18. T. W. Adorno, *Philosophie de la nouvelle musique*, trans. H. Hildenbrand, Paris, 1979. pp. 24-25.

19. T. W. Adorno, *Prismes*, trans. G. et R. Rochlitz, Paris, 1986, pp. 7-23.

20. K, Marx, F. Engels, *Selected Correspondence*. Moscow, 1975, pp. 394-402.

21. A,Gramsci, *Quaderni del Carcere*, ed.V. Gerrataana. Torino, 1975. pp. 751-752, 1222-1224, 1518-1519.

22. M. Horkheimer. *Théorie traditionnelle...*, pp. 219-307.

23. M. Horkheimer. *Théorie critique*, p. 2, p. 6.

24. K. Marx, *Capital*. trans. B. Fowkes, London, 1979, vol.1, p. 102.

25. M. Horkheimer, *Kritische Theorie*, Frankfurt A. M 1968, Bd. 2, S.292.

26. *Ibid*. p. 146.

27. T. W. Adorno, *Negative Dialectics*. trans B. Ashton, London, 1973, p. 320.

28. G. W. F. Hegel. *Phenomenology of Spirit*, p. 328.
29. *ibid.* p. 344.
30. *ibid.* p. 349.
۳۱. اما این یگانه تفسیر ممکن از متن هگل درباره‌ی روشنگری نیست. نگاه کنید به:
J. D'hond ed. *Hegel et le siècle des Lumieres*, Paris, 1974.
32. M. Horkheimer, T. W. Adorno, *La dialéctique de la raison*, p. 94.
33. *ibid.* p. 40.
34. M. Horkheimer, *Kritische Theorie*, Bd.1. s.193.
35. *ibid.* p. 159.
36. M. Horkheimer, T. W. Adorno, *La dialéctique de la raison*, p. 48.
37. *ibid.* pp. 24-25.
38. *ibid.* p. 51.
39. *ibid.* p. 51.
40. *ibid.* p. 60.
41. *ibid.* p. 69.
42. *ibid.* p. 50.
43. *ibid.* p. 145.
44. *ibid.* p. 144.
45. T. W. Adorno. *Minima Moralia*, trans. E. F. N.Jephcott, London, 1974, p. 147.
46. W. Benjamin, 'Karl Kraus', K. Kraus, *Cette grande époque*. trans. E. Kaufholz-Messmer, Paris, 1990, p. 27.
47. T. W. Adorno, *Minima Moralia*, pp. 233-235.
۴۸. و. بنیامین، نشانه‌ای به رهایی، ترجمه‌ی ب. احمدی، تهران ۱۳۶۶، ص ۸۷.
49. M. Weber, *Le savant et politique*, trans. J. Freund, Paris, 1963.
۵۰. ا. کاسیرر، زبان و اسطوره، ترجمه‌ی م. ثلاثی، تهران، ۱۳۶۷.
51. H. Marcuse, *Negations*, London. 1968, pp. 201-226.
52. M. Weber, *Économie et société*, Paris, 1971.
53. H. Marcuse, *Negations*, p. 204.
54. *ibid.* p. 205.
55. *ibid.* p. 217.
56. *ibid.* p. 225.
57. J. Habermas. *La technique et la science comme 'idéologie'*, trans. J.-R. Ladmiral, Paris, 1990, pp. 3-74.
58. H. Marcuse, *One-Dimensional Man*, London, 1986.

59. T. W. Adorno. *The Culture Industry*, de J. M. Bernstein, London, 1991.

برای خواندن شماری از مقاله‌های کمتر شناخته شده‌ی آدورنو در مورد صنعت فرهنگ نگاه کنید به:

T. W. Adorno, *Modèles critiques*, trans. M. Jimenez, E. Kaufholz, Paris, 1984.

60. M. Horkheimer, T. W. Adorno, *La dialectique de la raison*, p. 136.

61. *Ibid.* p. 146.

62. A.Arato, E. Gebhardt eds. *The Essential Frankfurt School Reader*, pp. 138-162.

63. M. Horkheimer, T. W. Adorno, *La Dialectique de la raison*, p. 129.

64. *ibid.* p. 153.

65. T. W. Adorno, *The Culture Industry*, ed. J. M. Bernstein, London, 1991, pp. 53-84.

66. G. Simmel, *Philosophie de la modernité*, vol.2, pp. 271-275.

67. W. Benjamin, *Essais*, trans. M. de Gandillac, Paris, 1983, vol.2, pp. 198-199.

68. T. W. Adorno, *Negative Dialectics*, trans. E. B. Ashton, London, 1973, p. 367.

69. T. W. Adorno, *Prismes*, p. 10.

۷۰. و. بنیامین، نشانه‌ای به رهایی، ص‌ص ۲۸۶–۲۳۵.

71. W. Benjamin, *Essais*, vol.2, pp. 195-207.

برگردان انگلیسی ***نهاده‌ها*** در کتاب زیر آمده است:

W. Benjamin. *Illuminations*, ed. H. Arendt, trans. H. Zohn, London, 1973, pp. 255-266.

72. G. W. F. Hegel, *Philosophy of Right*, p. 54.

۷۳. و. بنیامین، نشانه‌ای به رهایی، ص ۲۵۹.

74. T. W. Adorno and others, *Aesthetics and Politics*. trans. R. Taylor, London, 1977, pp. 120-126.

75. M. Horkheimer, T. W. Adorno, *La dialectique de la raison*, pp. 146-150.

76. W. Benjamin, *Paris, capitale du XIXème siècle*, trans. J. Lacoste, Paris, 1989.

۷۷. و. بنیامین، نشانه‌ای به رهایی، ص‌ص ۲۶۲–۲۶۱.

78. R. Tidedmann, *Études sur la philosophie de Walter Benjamin*, trans .R. Rochlitz. Paris, 1987, p. 119.

79. W. Benjamin, *Charles Baudelaire*, trans. J. Lacoste, Paris, 1982.

80. W. Benjamin, *Essais*, vol. 2, p. 195.

81. *ibid.* pp. 195-196.

82. *ibid.* pp. 197-198.

83. *ibid.* pp. 198-199.

84. *ibid.* p. 199.

85. *ibid.* pp. 199-200.

86. *ibid.* p. 200.

87. *ibid.* p. 204.

88. *ibid.* p. 206.

# دەربارەی ئاستەنگی هەنووکەیی

■ کریشنا مۆرتی

● و: چنور محەمەد

پرسیار: تۆ دەڵێیت قەیرانی هەنووکەیی، بێپێشینە. بەچ ڕێگەیەك ئەمە ئاوارتنە (استپناو)؟

کرشنا مورتی: ئاشکرایە قەیرانی بێپێشین لەسەرتاسەری هەموو دونیادا ئاوارتنەو لەهەمان کاتیشدا بێپێشینە.

لەماوە جۆراوجۆرەکانی سەرتاسەری مێژوودا گەلێ قەیرانی جیاواز هەیە: کۆمەڵایەتی، نەتەوەیی، سیاسی. قەیران دێتو دەڕوات، سستیو قەیرانی ئابووری، دێت دەگۆڕێتو بەردەوام دەبێت لە فۆرمی جیاوازدا. ئێمە دەزانین کە ئاشناین بەم پرۆسەیە. بێگومان قەیرانی بێپێشین جیاوازە، وانیە؟ جیاوازە سەرەتا لەبەر ئەوەی ئێمە نە بە پارەو نە بەشتی واقیعی مامەڵەی لەگەڵ ناکەین بەڵکو وەك فکر مامەڵەی لەگەڵ دەکەین. قەیران ئاوارتنە چوونکە لەبواری تێفکریندایە. ئێمە دوژمنایەتی لەگەڵ فکر دەکەینو بەهانە بۆ کوشتن دەهێنینەوە، لە هەموو جێگەیەکی ئەم جیهانەدا بەهانە بۆ کوشتن دەهێنینەوە وەك ڕەوشێ بۆ کۆتایی ڕاستی، کە لەناوخۆیدا بێپێشینە. پێشتر، شەرانگێز دەزانێت دەبێ شەرانگێز بێت، کوشتن دەزانێت دەبێت کوشتن بێت، بەڵام ئێستا کوشتن وەك ڕێگەیەکە بۆگەیشتن بە ئەنجامێکی شەریف (Noble). کوشتن ئەگەر کەسێ بی یا کۆمەڵە کەسی بێ بەهانە دەهێنێتەوە چونکە بکوژ یا ئەو کۆمەڵە کەسەی کە نوێنەری بکوژەکانە، ئەو بەهانەیە وەك ڕێگەیەك بەکاردەهێنێت بۆ گەشتن بە ئەنجامێك کە بە سوود بێت بۆ مرۆڤ. بەمەش ئێمە ئێستا دەکەینە قوربانی ئایندە– ئیدی ئەوە گرنگ نابێت بە ڕێگەیەك ئیشی پێبکەیت، لەبەر ئەوە مەبەستە ئاشکراکانمان ئەنجامێك بەرهەم دەهێنێت کە دەڵێن بە سوودە بۆ مرۆڤ.

لەبەر ئەوە ئەم تێگەیشتنە ڕەوشێکی هەڵەیە بۆ بەرهەم هێنانی کۆتایی ڕاستیو بەهانەهێنانەوەی تۆ بۆ ئەو ڕەوشتە لەڕێگەی تێفکیرنەوە هەڵەیە. جۆرەکانی قەیران کە پێشتر ڕوویداوە، مەسەلەیەکی پاوانکردنە (استغلال) بۆ شتەکان یا بۆ مرۆڤ، بەڵام ئێستا پاوانکردنی فکرە، کە زۆر زیانبەخشە، زۆر خەتەرناکە، چونکی پاوانکردنی فکر زۆر وێرانکردنو زۆر وێرانگەریشە. ئێمە ئێستا فێری ئەوە بووین کە هێزی پڕوپاگەندە یەکێکە لەو بەڵا گەورانەی ڕوودەدات بۆ بەرکارهێنانی فکر وەك ڕێگەیەك بۆ گۆڕینی مرۆڤ.

بەمەش لە دونیای ئەمڕۆ چی ڕوودەدات. یاساو فکری مرۆڤ گرنگ نیە، بەڵکو گرنگ دەبێت. ئیتر مرۆڤ چیدی مانایەکی نابێت.

ئێمە دەتوانین ملیۆنێ مرۆڤ نابوود بکەین، لەبەر ئەوە ئەنجامێك بەرهـەم دەهێنـینو ئەنجامەکەش بە فیکر بەهانەی بۆ دەهێنینەوە، ئێمەش ستراکچەرێکی گەورەمان هەیە لە فیکر بۆ بەهانە هێنانەوەی شەڕانگێزی، کە بێگومان ئەمەش بێپێشینە. شەڕانگێزی، شەڕانگێزییە، ناتوانێت ئاسایش بەرهەم بهێنێتز شەڕ رەوشی نیە بۆ ئاشتی. لەوانەیە شەڕ سوودێکی لاوەکی بهێنێت وەك تونای لەڕادەبەدەری فڕۆکەکان (**aeroplanes**)، بەلام ئاشتی بۆ مرۆڤ ناهێنێت. شەڕ بەهانە هێنانەوەیەکی فیکرییە وەك رێڕەوێك بۆ هێنانی ئاشتی، کاتێك هێزی ئەقڵ دەستی بالای هەبێت لە ژیانی مرۆڤدا، ئەوە قەیرانێکی بێپێشین دەهێنێت.

گەلێ هۆکاری تریش هەیە بۆ دەستنیشانکردنی قەیرانی بێپێشین، یەکێك لەوانە گرنگی پێدانێکی نائاسایی مرۆڤ بۆ بەها هەستیەکان، بۆ سامان، بۆ ناوبانگ، بۆ کاست (بەواتەی: یەکێکە لە چینە کۆمەلایەتیەکانی هیندۆس- چین) و ولات، بۆ ئەو هێما تایبەتیەی کە تۆ دەیپۆشیت ئیدی تۆ هەر چیەك بیت موسلمان بیت یا هیندو یا مەسیح یا کۆمۆنیست. ناوبانگو سامان، کاستو ولات، دەبێتە هێزێکی زاڵ، کە رێڕەوێکە مرۆڤ گیرۆدەی بەها هەستیەکانو بەها پێداویستیەکان دەکات، جا ئەگەر لەلایەن هۆشەوە بێت یا لەلایەن هێزەوە. پێداویستیەکان لەلایەن هێزەوە بەرهەم بهێنرێت یا لەلایەن هۆشەوە، زۆر گرنگ دەبێت بۆ ئەوەی بکوژین، وێرانبکەین، خوێنبرێژین یەکدی لەناوبەرین. ئێمە لە لێواری لوتکە نزیکدەبینەوە. هەموو چالاکیەکان بەرەو ئەوێمان دەبەن جا چالاکی سیاسی بێت یا ئابووری، بێگومان بەرەو ئەو لوتکەیەمان دەبەنو بۆ ناو ئەو ئاژاوەیە بۆ ناو ئە دۆزەخ شلەژاوییە کێشمان دەکەن.

هەر لەبەر ئەمەیە قەیرانی بێپێشین داوای چالاکی بێپێشین دەکات. بۆ دورکەوتنەوەو دەرچوون لەو قەیرانە، چالاکیەکی بێزەمەنی پێویستە، چالاکییەك کە نەلەسەر ئەساسی فکرو نەلەسەر ئەساسی رێسا بێت. چونکە هەر چالاکیەك لەسەر ئەساسی فکرو ریسا بێت، بێگومان بەرەو تێکشکاندن دەچێت. ئەو چالاکیە بەرێگای جیاواز تەنیا بەرەو دۆزەخمان دەبەن لەبەر ئەوە قەیرانی بێپێشین پێویستی بەچالاکی بێپێشینە، کە رێگەیەکە بۆ تازەکردنەوەی تاك کە پێویستە رووبدات نەك بە پرۆسەی زەمەن. پێویستە ئێستا رووبدات نەك بەیانی، بۆ بەیانی پرۆسەکان شیدەبنەوە.

ئەگەر بەیانی بیر لە گۆڕانی خۆم بکەمەوە، ئەوە دەبمە میوانی سەرلێتێکچوون، بەوەی کە من تا ئێستا لە بواری وێرانی دام، ئایا دەشێ ئێستا بگۆڕێت؟ ئایا دەشێ کەسێك خۆی لە هەنووکەدا بگۆڕدرێت؟ من دەلێم بەلێ، ئەم مەبەستە کە وەك قەیرانە، نوێنەری ئاوارتنە بۆ گەیشتن پێی پێویستی بە شۆڕشێکی فکر هەیە، ئەم شۆڕشەش لە رێگەی هیچ شتێکی ترەوە روونادات، نە لە رێگەی هیچ کتێبێکەوەو نە لە رێگەی هیچ رێکخراوێکەوە، بەلکو پێویستە لە رێگەی خۆمانەوە لەرێگەی هەریەکێك لەخۆمانەوە رووبدات. تەنیا ئەوکاتە دەتوانین کۆمەڵی نوێ، ستراکچەرێکی نوێ دووربێت لە ترس، دووربێت لەو کۆمەڵە هێزە وێرانگەرە لەرادەبەدەرانەی کە خراونەتە سەریەك دروست بکەین، کاتێك تۆ وەك تاکێك ئاگاداری هەمو فکرەکانو هەموو چالاکیو هەستکردنەکانی خۆت بوویت تەنیا ئەوکاتە گۆڕان دروست دەبێت.

تێبینی:

ئەم وتارە لە کتێبی

Krishnamurti, the first & Last freedom,) USA, Conada, Harper san Francisco, A Division of Harper Collins publishers, 1975. P: (145- 147)) وەرگێڕ

# پۆست مۆدێرنیتی

## بۆ فەلسەفەکردن بەسەر جیهانی نوێوە

## – ژان بۆدریار –

■ ئازاد حەمە

**ناواخن:**

۱ـ دوان لەتەك خۆ/و لەمەڕخۆ. لەمارکسیزمەوە بەرەو نیهلیزم ـ هیچگەریی ـ

۲ـ ئەمەریکا کۆپییەکی ئەسڵی مۆدێرنیتێیەو ئەورووپاش ڤێرسیۆن Version – ێکیبەدووجارکراوە. لێرەوە بەراستیکردنی یۆتۆپیا دەستپێدەکا.

۳ـ کۆمەڵگەی پۆست مۆدێرنیتیێ شوێنی بەرهەمهێنانی نیشانەو کۆتای راستیە.

□ ~

**۱ـ دوان لەتەك خۆ/و لەمەڕخۆ. لەمارکسیزمەوە بەرەو نیهلیزم ـ هیچگەریی ـ**

نووسەر و بیریاری فەرەنسی ژان بۆدیار یەکێکە لەدەنگە روناکبیرییەکانی سالآنی پاش هەفتاکان. ئەم روناکبیرە پاریسیە بەدژایەتیکردنی پرۆژەی مۆدێرنیتێی رۆژاوا نوێسازییکی بەناوی پۆست مۆدێرنیتیێ بەرهەم هێناوە. ئەم روناکبیرە پاریسییە هاتووە تاکۆتایی بەهەموو روناکبیرییێك بهێنیێو راستییێك دژ بەهەموو راستیەکان بخووڵقێنیێ.

بۆ دریار سەر بەهەمان ئەو ژینگەو بارودۆخە روناکبیرییە فەرەنسییەیە کەگەڵیێ لەهاوسەردەمەکانی ((وەك: میشیل فۆکۆ M.Foucault ـ ژاك دێریدا ـ J.Derrida ـ ، ژیل دۆلۆز ـ J.Deieuze ـ پێیربۆردیۆ P.Bordieu)) تیایا ژیاون. شۆڕشی قوتابیان کەلەپاریس لەئایاری (۱۹٦۸) بەرپاکرا هەمان ئەو سالە بووە کەبۆ دریار یەکەم کتێبی بەناوی (سێستەمی ئوبێکتەکان) بەچاپگەیاندووە۲.

کارە سەرتاییەکانی بۆدریار دەچنە خانەی نیشانەی (شۆڕشی مارکسیزم)یەوە. بەلآم مارکس لەگەل لێکدانەوە زمانەوانیەکانی فردینانددی سۆسێر (Ferdinand de Saussur) چووە قۆناغێکی بەپیتەوە، کەدواجار زۆریەی بونیادخوازو پاش بونیاد خوازەکانی لەخۆ کۆکردەوە.

بەشێوەیەکی گشتی، کارەکانی بۆدریار توانی لەژێر سایەی یەکگرتننەوەی بیرەکانی مارکس، لەسەر فیتشییەتی (بتگەریی) شمەكو وانەکانی سۆسێر، لەمەڕ نیشانە، پەرەبستێنیێ. کەچی پاشان هەر ئەم بیریارە فەرەنسیە لەسەرەتای هەفتاکاناو بەتایبەت لەدوتۆیی لاپەڕەکانی کتێبی (ئاوێنەی بەرهەم)، کەلەسالی (۱۹۷۳) بەچاپیگەیاندووە، وەك رەخنەگریێ لەمارکسیزم خۆی دەردەخاو، بانگەواز بۆ

دابڕان لەبیری چەپگەریی دەکا. ئیدی لێرەوە بۆدریار پتر ئامێز بۆ بیری پۆست مۆدێرنیتیێ دەکاتەوە، ئەو بیرەی کەلەماوەی ساڵانی سەرەتای هەشتاکانەوە دەست بەسەرهەڵدان دەکات.

دیدە سیاسیەکانی بۆدریار لەماوەی ئەم ساڵانەدا بەمیتامۆرفۆسێکی زیاد لەپێویست بەرچاوی تێپەڕیوە. ئەم کەلە بنەچەدا دیدی بەدیدی چەپە فەرەنسیەکانی شەستەکان وابەستەبووە، کەمە کەمە خۆی لەهەموو بڕوایێک بەئەلتەرنەتیفێکی یۆتۆپی کشانووەتەوە. بەڵام لەوەنەکەوتوە رەخنە ئاراستەی رۆژئاوای ئیمپریالیزمو کۆمەڵگەی پیاوانو ژیانی بەرخۆریی نوێی ئەم چاخەنەکا.

بۆدریار لەئاخاوتنێکدا سەبارەت بەوەی سۆسیۆلۆژ ـ کۆمەڵناس ـ ە یاخود نە بەم جۆرە وەسەرەتای وەڵامدانەوە دێ:

(من) لەزانکۆی (Nanterre) وەك پرۆفیسۆرێ لەسۆسیالۆژیا کارم کردووە. (من) لەهەقیقەتدا هەرگیز سۆسیۆلۆژ نەبوومە. لەساڵی (١٩٦٦) هاتمە گۆڕەپانی زانکۆی (Nanterre)و لەتەك هێنری لۆفیڤەر (H.Lefebvre) کەوتمەکار. ئەو کاتە هێنری لۆفیڤر ئینستیتوتەکەی بەڕێوەدەبرد. (من) تەنیا دوساڵ (١٩٦٦-١٩٦٧) وە دووی سۆسیالۆژیا کەوتمو کارم تیاکرد. (من) نەك لەو ماوەیەدا لەزانکۆی ناوبراودا مامۆستای سۆسیۆلۆژیا نەبووم، بەڵکو خودی بەشی سۆسیالۆژیا تا(١٩٧٨) هەڵگیرابوو.

ماوەیەك گەلێ لەسەرکردە شۆڕشگێڕەکان (وەك، Cohn - Bendit) قوتابیم بوونو، هەروەها زۆربەی زۆری سۆسیالۆژیاوەکان قوتابی زانکۆی ناوبراوبوون. رۆشنبیری زۆربەی نووسەرانی ئەم چاخە، ماوەی ساڵانی (١٩٦٨) سەرچاوەی لەسۆسیۆلۆژیاوە هەڵدەگرت. لەپاش (١٩٦٨) بیشەوە هەموو لەچەند بوارێکدا دەستییان بەکارکردووە (وەك بواری: شیکردنەوەی دەروونی، مارکسیزم، ئەنترۆپۆلۆژیا)و وتاریشیان تیاداوە. نەشونمای بۆدریار وەك دەردەکەوێ ئەنتی ـ سۆسیۆلۆژی نەبووە. بەڵکو ترانس ـ Trans ـ سۆسیۆلۆژی بووە. بەکورتی، بایەخی بۆدریار بەسۆسیۆلۆژیا لەپەناوە بووە نەك راستەوخۆ.

ـ سەبارەت بەبۆردیۆ کەکۆمەڵناسێکی هاوچەرخی فەرەنسییە، بۆدیار پێیوایە ناوبراو لەبواری سۆسیۆلۆژیادا شوێنی دیارە. ئەوەیشی ئەم سۆسیۆلۆژە فەرەنسییە لەهەدوو کتێبی (میراتگران ١٩٦٦ ـ و دووبارە بەرهەم هێنان ـ ١٩٧٠) نوسیویەتی جێگای سەرنجی بووە. شایەنی باسکردنە، بۆدریار پلەی ماستەری لەساڵی (١٩٦٨) لەبەردەست ئەو لیژنەیە وەرگرتووە کەبۆردیۆ ـ جگەلە رولان بارت (R.Barthes)و هێنری لۆفیڤێر ـ یەکێك بووە لەئەندامەکانی.

بەڵام بۆدریار دەڵێ: بۆردیۆ لەناو لیژنەکە تووڕەبوو و؛ سەبارەت بەکارەکەی (من)یش ووتی: ئەم کارە ناسۆسیۆلۆژییو نازانستییە. ئیدی ئەوە بوو هەر لەوکاتەوە بۆردیۆم کرد بەدووژمنی خۆم. بەباوەڕی ئەم روناکبیرە پۆست مۆدێرنە هیچکات بۆردیۆ بەزمانێکی دیاریکراو نانووسێو بەهەمان زمانی ئەو وتارە دەنووسێ کەرەخنەی ئاراستەدەکا. ئەو شێوازەش کەبەکاریدەبا جۆرە کاوێژکردنێکی تیابەدی دەکرێ. پاشان زمان ئەو مانایەی بۆ (من) نیە کە بۆ بۆردیۆ هەیەتی. بەپێی تێگەیشتنی بۆدریار جیاوازییەکی روناکبیری زۆر لەنێوان خۆیو بۆردیۆدا هەیە. یەك لەو جیاوازیانەش ئەوەیە بۆردیۆ لەشیکردنەوەیدا پتر لەشیکردنەوەی مارکسیستییەوە نزیکەو، لەڕووی سۆسیۆلۆژیشەوە قوتابی رایمۆندئارون (Raymond Aron)ە.

بۆدریار لەوەڵامی ئەو پرسیارەی بەم شێوەیە ئاراستەی دەکرێ: (ئایا سۆسیۆلۆژی دی لەفەرەنسا هەیە ئەم جۆرە رەخنانەی ئاراستە نەکرابێ کە(ئێوە) ئاراستەی بۆردیۆی دەکەن!!!) بەمجۆرە دێتە وەڵام دانەوە:

نەخێر، نەك سۆسیۆلۆژەکان. چونکە سۆسیۆلۆژی راستەقینە زمانی ئەوتۆی نییە. وەکیتر، بۆدریار لەم بارەیەوە بەم شێوەیە دەدوێ: (من) حەز بەشێواز ناکەم. چونکە (ئەوە) رەنگدانەوەی رۆمانسیەتە. لەم رووەشەوە نموونە لەسەر ئەو سۆسیۆلۆژانە دێنێتەوە (وەك، (Crozir, Rosset) کە بێ شێواز دەنووسێ، بەڵام لەهەمان کاتدا نرخی زۆر بۆ نووسەرو فەیلەسوفێکی وەك (clement rosset) دادەنێ کەزمانێکی جوانو کراوەی هەیە.

ـ بۆدریار دەربارەی ئەو پرسیارەش کەئایا سۆسیۆلۆژیای خوێندووە یان نە!! ئاوا وەسەرەتای وەڵام دانەوە دێ:

(من) زمانی ئەڵمانیم خوێندووە. پاشان دەستم بەزمانی ئەڵمانی وتنەوە لەئامادەیەکدا کردوە. (من) سۆسیۆلۆژیام وەك بوارو بەش نەخوێندووە. هەروەها فەلسەفەش. بەڵام توانیوومە شارەزایی لەسەر فەلسەفە پەیدابکەم. لەلاویدا سەرقاڵی زۆری کارەکانی ریمبوود (Rimbaud)، ئارتۆ (Artaud)، نیچە (Nietzche)، باتای (Bataille) بووم. هەر لەو کاتەشدا تێکستێ زۆری، نەك تیۆری، بەڵکو شیعریم نووسی. لەماوەی تەمەنی بیستو سی ساڵیمدا یاخوود بەواتایەکی دی لەپەنجاکانا، کاری زۆرم لەگەڵ کارەکانی نیچەدا کرد. ئەوەبوو هەر لەو کاتەشدا کارەکانی نیچەم بەزمانی ئەڵمانی خوێندەوە. بەپێی ئەمەبێ، (من) دەچمە ریزی یەکەم نەوەی نیچە خوازانی فەرەنسا.

بەبۆچوونی بۆدریار دۆزینەوەی نیچە لەشەستو هەفتاکانا بۆ (ئەو) شتێ مەزن بووە. هەر لەو ماوەیشدا بۆدریار هەوڵی داوە تاقیکردنەوەیەك لەسەر کارەکانی نیچەبدا، بەڵام حەیف بۆدریار لەم تاقیکردنەوەیەدا سەرنەکەوتووەو، ئەو لیژنەیەش کەسەرپەرشتی کارەکەی کردووە لە(نیچە) خوازەکان پێکهاتووە.

- بۆدریار تایبەت بەرۆلآن بارت بەمجۆرە دەدوێ:

لەنێوان کارەکانی (من)و کارەکانی (بارت) هاوشێوەییەك لەئارادایە. بۆ نموونە، (ئەو) - سێستەمی مۆد - ی نووسی، (من) - سێستەمی ئوبێکتەکان - م نووسی. (ئەو) - وتاری عاشق - ی نووسی، (من) ئیغراکردن - م نووسی. (ئەو) - بارت بەهۆی خودی خۆمەوە - ی نووسی، (من) - ئەویتر بەهۆی خودی خۆمەوە - م نووسی. ئەڵبەتە هەر ئەم باسەش (واتە، ئەویتر بەهۆی خودی خۆمەوە) بابەتی دکتۆراکەم بوو.

- هەروەها سەبارەت بەسەرقاڵبوونی بەسیاسەتو ئایدیۆلۆژیا بەم شێوەیە دێتە رونکردنەوەی:

لەتەمەنی (سی) ساڵیو بەرەو سەرەوە خۆم بەسیاسەتو ئایدۆلۆژیا سەرقاڵکرد. لەگەڵ گەیشتنم بەتەمەنی (سیو پێنج) ساڵی دەستم دایە کاری تیۆری، سارتەر (Sartre)و پاشان بونیاد خوازیم خوێندەوە. هەر لەو ماوەیەشدا بەزمانی ئەڵمانی کەوتمە خوێندنەوەی مارکسو فرۆید.

- سەبارەت بەمیشیل فۆکۆ (M.Foucault)، کەبیریارێکی پاش بونیاد خوازو نیهلیستی پاش هەفتاکانە، دەڵێ: کاتێ فۆکۆ لەبارەی (ویستی زانین) نووسی؛ کە ئەم باسە بەشێ بوو لە (مێژووی سێکسگەریی) گۆڤاری –critigue– داوای لێ کردم سەروتارێك لەم بارەیەوە بنووسم. کەسەروتارەکەم نووسی ئەوەبوو سەرنووسەری گۆڤارەکە (Jean Piel) نەیویست ئەم سەروتارە بلآوبێتەوە. دواجار هەر خۆشی نووسراوەکەی بۆ کەسێتر بۆ خوێندنەوە ناردبوو، ئەم کەسەش ژیل دۆلۆز (G.Deleuze) ببوو. ئەوەبوو هەر لەو ماوەیەدا گۆڤارێ بەناوی کاتە نوێکان (Les Temps mod emes) پێوەندی پێوەکردم کەئامادەیە ئەو باسە بلآویکاتەوە.

لەهەمان کاتدا (فۆکۆ) پێوەندی لەگەڵ گرتم. فۆکۆ ئەم مەسەلەیەی بەئارامی گرتبوو. هەروەها داوای سەروتارەکەی کرد کەبیخوێنێتەوەو گفتوگۆی لەسەر بکا. دواتریش (منو فۆکۆ) ئەو باسەمان بەتەلەفۆن سێ سەعات باسکرد. لەم بارەیەوە فۆکۆ بریاری خۆیداو، منیش وەڵامێکم نووسیز ماوەی ساڵێك بەسەر ئەمەدا تێپەڕیو ئەوەبوو فۆکۆ تەلەفۆنیتری کردەوە.

لەتەلەفۆنەکەدا ئاگاداری کردمەوە کەبڕیاری داوە وەڵامێ بنووسێ. بەڵام (من) ئیدی بیرم لەهیچ گۆڤاری تر نەکردەوەو، نووسینەکەشم لەبلآوکراوەی گالیلێ (Galilee)، وەك کتێبێك لەژێر ناونیشانی (فۆکۆ لەبیرکە) بەچاپ گەیاند. لەدوای ئەمەوە فۆکۆ زۆر لەبەر چاوکەوت. رەنگە هەر ئەم نووسینەش لەپاڵ ئەوەوە بووبێ کەبۆدریار بۆ ئەو کۆنفرانسە بانگ نەکرێ کەبەناوی (کۆنفرانسی فۆکۆ) سازکرابوو - کەزۆربەی ئەو وەرگێڕو نووسەرانە لەدەرەوەو ناوەوەی فەرەنسا بەشدارییان تیاکردبوو کەلەسەر فۆکۆ نووسینیان نووسیوە یان کاری (ئەو)یان وەرگێڕاوە.

بەڵام بۆدریار دان بەوەدا دەنێ کەکتێبی (فۆکۆ لەبیرکە) شتێکی تایبەت نەبووە لەگەڵ خودی فۆکۆو، هەڵەشە ئەو بەرهەمە بەوجۆرە لێکدرێتەوە، کتێبی ناوبراو رەخنەیەك بوو لەدەسەڵاتی روناکبیری فۆکۆ، ئەم دەسەڵاتە روناکبیرییەش لەستروکتوری بیری (فۆکۆ)دا چەقی گرتووە.

- لەبارەی لیۆتار (Lyotard)ەوە، کەپۆست مۆدێرنیستێکی فەرەنسییەو بەهۆی کتێبی نابراو بە(دۆزی پۆست مۆدرێن) ناوی رۆشتووە، دەڵێ: (ئەو) بەکاری خۆیەوە سەرقاڵەو منیش بەکاری

خۆمەوە. بیری فەرەنسی گشتێتی خۆی هەیە. ئەم بیست ساڵەی دوایی دیمەنی روناکبیریی فەرەنسی تەواو گۆراوە. پێشتر پێشبرکێیی زۆرتر لەئارادابوو وزەیەکی روناکبیری پتریش وەبەردەهێنرا، بەڵام ئەمرۆ لەفەرەنسا باری روناکبیریی لەدۆخێکی وەستاودایە. (من) بەگشتی لەسەفەری زۆردامو بەبەردەوام لەدەرەوەی فەرەنسام. زۆربەی سەفەرەکانیشم بەرەو ئەمەریکایە.

بۆدریار کاتێ سەفەر بەرەو ئەمەریکا دەکا خۆی لەناو پرسیاری روناکبیرە ئەمەریکایەکان دەبینێتەوە کەهەواڵی پاریس لەچیدایە. کەقسەش لەسەر (پارانۆیا)٣ ی روناکبیرانی فەرەنسی دەکا ئەوە وەڕوودەخا کە(فەرەنسییەکان لەچەقی لووتبەرزیو خۆنواندو بانگەشەکردندا دەژین). سیاسەتمەدارو روناکبیرەکانیشمان لەفەرەنسا ئەو توانایەیان لەدەست داوە کەبکارن رەخنە لەشتەکان بگرن. ئەم فەرەنسایەی کەدەخوازێ خۆیبکا بەمۆزەخانە بۆ ئەوانیتر لەحاڵەتێکی تووندڕەو کەنارگیری روناکبیری دایەو، ناتێستاش بەیادی رۆژە گەورەکانی لەمەوبەری دەژی. ئەم بیریارە پۆست مۆدێرنە بەقسەی خۆی تەنیا لەفەرەنسا نەبێ کەهەست ناکا لەماڵەوەیە، ئەگینا لەهەموو شوێنێ‌تر ئەو هەستەی تیایە.

- ئەی پێوەندی بەدیدی بۆدریار دەوەیە سەبارەت بەهێدگەر (Heidegger) بەمجۆرەیە:

ئەو مشتو مڕە زیادەی لەدەوروبەری هێدگەردایە هیچ مانایەکی فەلسەفی نیە، ئەم شێوە مشتو مڕانە بەڵگەن لەسەر ئەو لاوازیەی لەبیری هەنوکەدایە. ئەو تاوانەش کەدەدرێتە پاڵ هێدگەر کەگوایە نازی بووە پێشتر ئاڕاستەی بۆ نموونە مارکس دەکرا، ئەمە بەتایبەت کاتێ بیری مارکسیزم پیرۆزی خۆی لەدەستدا، ئەوەبوو ئیدی دەستکرا بەخوێندنەوەی ژیانیو تاوانبارکردنی بەوەی بۆرژوابووە. هەروەها کاتێ شیکردنەوەی دەروونی رەونەقی خۆی لەدەست دا دەست کرا بەپشکنین لەژیانی شەخسی (فرۆید)و دەروونناسییەکەیو ئاشکراکردنی ئەوەی فرۆید سێکسیو باوك خوازبووە. سەرباری ئەوەیووترا بۆدریار پێیوایە، جیاوازی زۆر لەنێوان ئەوەیە کەهێدگەر تاوانبارکرێو ئەوی بێگوناهیش کرێ.

- تایبەت بەستاتۆی بیری کەچۆن تەماشای دەکا دەڵێ:

بیرم بەمانا باوەکەی تیۆری بەرهەم نەهێناوە. بیری (من) پتر بیرێکی ورووژێنەرە.

□

٢- ئەمەریکا کۆپییەکی ئەسڵی مۆدێرنیتێ یەو ئەوروپاش ڤێرسیۆن - Version - ێکی بەدووجارکراوە، لێرەوە بەراستیکردنی یۆتۆپیا دەست پێدەکا.

لەپاش دۆتۆکفێل (de Tocqueville)٤ ەوە بیریارە فەرەنسییەکان دەستیان کردووە بەبایەخدان بەئەمریکا، بەڵام سەبارەت بەپارادۆکسە شاراوەو نهێنیو ئاڵۆزییە لبریکیەکانی ئەم چاخە نوێیەو کۆمەڵگای تازەی ئەمەریکی ناکرێ هیچ روناکبیرێکی فەرەنسی بەبۆدریار بەراوردبکرێ. بۆدریار ستاتۆی کۆمەڵگەی ئەمەریکی، کەبۆ ئەو بۆتە نێوەندەی جیهان زۆر سەیر شیدەکاتەوە. ئەم تەنیا بیریارێکی فەرەنسی‌نیە کەلەبارەی ئەم نێوەندە نوێیەی جیهانەوە لێکدانەوەی ئەنجامدابێ، بەڵکو گەلێ لەروناکبیرانی پاریس لەمڕووەوە بەرهەم هێنەرن. ئەم روناکبیرە پاریسی‌یە پاش دۆزینەوەی جیهانێك لەدەرەوەی پاریس. بەناوی ئەمەریکاو پاش نوسینی پەرتوکێك تایبەت بەم جیهانە نوێیە بەناوی (ئەمەریکا) - ساڵی چاپ ١٩٨٦ ناوێ زۆری لەئەوروپاو ئەمەریکا پەیداکردووە، شوهرەتی بودریار لەئەمەریکا گەورەترە وەك لەفەرەنسا. ئەم شوهرەتەش بۆ ئەو بۆچوونە جیاوازانەی دەگرێتەوە کە لەسەر ئەمریکا هێناویەتە کایەوە، ئەم کتێبەی بۆدریار لەبارەی دیموکراسیەتو شۆڕشی مۆراڵی لە ئەمریکا نیە، بەڵکو لەمڕ مێنتەلێنتیتی کۆمەڵگای ئەمریکیو خەونی شاشەی کۆمپیوتەرو زانینی بەتەکنۆلۆژیاکراوی ئەم کۆمەڵگەیەیە، لەم کتێبەدا ئەم نووسەرە سەفەرێکی جوداواز دەکا. شێوازێ لەنووسین بەکاردەبا کەنا ئەکادیمی‌یەو پتر لەشێوازی گێڕانەوەی ئەدەبی‌یەوە نزیکە.

بۆدریار لەسەر شێوازی دۆتۆکفێل - ئەڵبەتە پاش تێپەڕبوونی سەدەو نیوێك - بەچاوێکی ئەوروپایەوە ستروکتورە ئەمۆرفەکانی کۆمەڵگەی نامۆی ئەمەریکی دەخوێنێتەوەو تاپێشی دەکرێ وەدووی بزافی مێژوو دەکەوێو لەرۆژئاواوە وەسەرەتادێ رووەو قارەی ئەمەریکا. لەوباوەڕشدایە لەم قارەیەدا مێژووی جیهان لەکۆتایی بووندایەو رۆحی جیهانیش

لەراڕا بووندایە. بۆدریار لەکتێبی ناوبراو بە(ئەمەریکا)و لەزۆربەی لێدوانو کارەکانیدا لەبارەی دەسەڵاتو توانای ئەم کۆمەڵگە تازەیە بەم شێوەیە دەدوێ: دەسەڵات لەئەمەریکادا لەپلەیەکی دەسەڵاتی بەئەزموونداییە. ئەمەریکا وەك حاکمی دەسەڵاتی سیاسیو کەلتووری جیهان بۆتە دەورانێکی ئەوتۆ کەهەموو بەدەوریا دەخولێنەوە.

ئەم روناکبیرە پاریسییە، وای بۆدەچێ گشت ئەمەریکا بووە بەکالیفۆرنیا وەك وێنەیەك لەرێگان (Reagan) ئەمەریکاییەکان هەروەك ئەوروپاییەکان تاقەتی ئەوەیان نییە لەخۆیان بپرسن ئایا بڕوایان بەکارەکانی رابەرەکانیانهەیە یان نا!!

ئەوەی ئەم بیریارە زۆر بەلایەوە گرنگە تایبەت بەم وڵاتە بۆ ئێمەی باسبکا ئەوەیە، یۆتۆپیا لەم وڵاتەدا بەراستیکراوە. ئەوانەش لەمەدا (واتە لە بەراستی کردنی یۆتاپیا) بەشداری ناکەن پێویستە وونبن یان بەدرێژایی رۆژگار دەکەونە زۆنی بیرچوونەوە، بۆدریار لەپرۆژەی ئەم کتێبەدا وڵاتی دیزنی (Disney) وەك وڵاتێکی رەواخواز بەرچاودەخا. ئەوە بەلایەوە ئەمەریکایەو وڵاتی راستەقینەی (Disney)ییە ئەوا ئەمانەن:

Safeways, Freeways، خێرایی، بیابانەکان، فیلمەکانی (TV)ن، نەك مۆزەخانەیو کلێسەو شوێنە کەلتووریەکان، بۆ ئەوەی مرۆڤ ئەمەریکا بناسێو ببینێ پێویستە بەلای کەمەوە بۆ چرکە ساتێ لەجەنگەڵێکی Downtown سەنتەری شار، - شوێنی بازرگانی شار - لە Painted Desert یاخود لەکۆرفێ لە Freeway پیاسەبکات، تائەوەی بۆ دەرکەوێ کەئەوروپا ونبووە. سەبارەت بە(راستی)یش لەم کۆمەڵگە تازەیەدا بووە بەراستییەکی زێدەڕۆ تیاکراو، ئەمەش لەبەرئەوەی راستی یۆتۆپیایەو، یۆتۆپییاش بەراستیکراوە.

بۆدریار لەم بەرهەمەدا سەرسامە بەوەی ئەمەریکاییەکان ئازادیو یەکسانیان بۆ هەمیشەیی وەرگرتووە، ئەمە لەکاتێکدا یەکسانی لەئەوروپادا ئامانجێکی سیاسییەو مرۆڤ ململانێیی زۆری لەپێناودا کردووە.

ئەم رۆشنبیرە پۆست مۆدێرنە لەم سەرچاوەیەدا لەبارەی (ئەمەریکا)وە ئەوەمان بۆ بەرباس دەخا کەکاتێ هەزار میل بەناو ئەمەریکا لێدەخوڕین ئەوکات لەبارەی ئەو وڵاتەوە شارەزایی پەیدادەکەین نەك بەهۆی ئەو زانیاریانەی کەئینستیتوتە کۆمەڵناسیو زانستییەکان پێمان دەڵێن. ئەوەیپتر لەمە سەیرترە لەم وڵاتەدا ئەوەیە، خۆرئاوابوونەکان پەلکە زێڕینەیەکی زەبەلاحەکە یەك سەعات درێژە ئەکێشێو، وەرزەکانی ساڵیش هیچ مانایەکی نییە. بەیانیان بەهارە، بەنیوەڕۆ هاوینەن شەوانیش لەبیاباندا ساردە بێئەوەی هەرگیز زستان بێ، لەم وڵاتەدا، لەوڵات Disneyدا ساڵ گشت رۆژێ نوێ دەبێتەوە.

نووسەری ئەم کتێبە کاتێ گەشت بەنێو نیویۆرکو لۆس ئەنجلس - Los Angeles - دەکا باس لەوەدەکا کەلێرە هەمووشتێ بەڕووکەشو بەبەرچاویکراوە تابیبنرێ. مرۆڤی ئەم وڵاتە پیادەی ئاگای خۆی راستەوخۆ دەکا. لەراستیدا، (USA) تاکە کۆمەڵگەێکە کەتائەمرۆ بەپریمەتیڤی - سەرەتایی - ماوەتەوەو، تاکە کۆمەڵگەێکیشە دەتوانی تیایدا هەست بەوەحشەتگەری شتەکان، دەموچاوەکان، ئاسمانەکان، دەشتەکان بکەی. بەکورتی بۆدریار ئاگادارمان دەکاتەوە کەدەتوانی بەهۆی ئەم وڵاتەوە باس لەجیهانی (پووچی) بکەی.

بەڵام پرسیاری ئەوەش لەئارادایە بۆ ئەم دیاردانە، بۆئەم شوێنانە (لوس ئەنجلۆس، بیابانەکان، شەقامە قەرەباڵغەکان، شوێنە رەنگاورەنگەکان،...) بەرلێکدانەوە کەوتوون!! رەنگە ئەمە پێوەندی بەوەوەبێ قووڵایی لەم وڵاتەدا هەڵوەشاوەتەوە. ململانێ لەئارادایە دژ بەمانا، ناواخن، کەلتوور. ئەم وڵاتە شوێنی پایانی دەسەڵاتو مێژووە. لەکاتی پایانی مێژووش دا سروشت وەك ئەوی تری کەلتوور ووندەبێ. لەبری ئەوە سروشتو Hightech لە وێنەی ئاسمانی نوێو نەناسراو گەشە دەکا.

بیریاری ناوبراو، هەوڵدەدا نەك تەنیا ترادیسیۆنە سیاسیەکانی ئەمەریکی شیبکاتەوە، بەڵکو هەوڵدەدا پێکەنینە دەستکردەکانی (TV)ی ئەمەریکیو سیاسی بەتەلەفزیۆن کراوی ئەمەریکیش شیبکاتەوە کەکاریگەری زۆری بەسەر خەراکتەری مرۆی ئەمەریکاییەوە بەجێهێشتووە.

ناکرێ لێکدانەوەکانی بۆدریار بۆ کۆمەڵگەی بەرخۆرییو زانیاریو تەکنەلۆژی ئەمەریکیو ئەوروپاییو، رونکردنەوەکانی بۆمانڤێستی تازەگەری رۆژئاوا بەوڕێنەی کۆمەڵناسو بیریارێك دانرێ. چونکە

گەلێك لەخوێنەرانو رۆشنبیرانی ئەورووپاو ئەمەریكا پاش سەرقاڵبوونی بۆدریار بەبابەتی پۆست مۆدێرنەوەو، پاش وتاردانی لەسەر ئەمەریكاو ئایندەی مۆدێرنێتی ئەورووپا ئەو بۆچوونانەیان لادروست بوو. ئەمە لەلایەك، لەلایەكی ترەوە، بۆدریار باس لەخەمی خۆی دەكا كەگەلێ لەچاپخانە ئەمەریكییەكان رازابوونە لەبەچاپگەیاندنی كتێبی (ئەمەریكا). گەلێ لەو چاپخانانە پێیان وابووە ئەم كتێبە وێنەیەكی نێگەتیڤ لەسەر ئەمەریكا پێشاندەدا. بەلام بۆدریار دڵنیایە ئەو ئەمەریكایە، كەشێوەیەكی ئەسڵییەیە لەمۆدێرنیتێ پتر بەماڵی خۆی دەزانێ وەك ئەورووپا، ئەم روناكبیری نیهلیستییە پۆست مۆدێرنە، كەبەوتەی مارشاڵ بێرمان (M.Berman) خۆی مەستی رەوانبێژی پۆست مۆدێنێتی كردووە لەجیهانێكی بێكەلتوورو بێقورسایی مێژوویی وەك ئەمرۆ، لەجیهانێك دا كەرەنگدانەوە، رەخنە، بیرەوەری وون بووە، خەون بەئاسانی شتەوە دەبینێ. ئەم نووسەرە فەرەنسییە كەورووژێنەری تێمای كۆتایی مێژووە باس لەویستی ئەمرۆ دەكا كەچ ویستێكی بازاڕیو نەخۆشە. جیهانی ئەمرۆش كەبەهۆی ئەم ویستەوە پیادە ئەكرێ لەشوێنێكی وەك ئەمەریكا لەترۆپكدایە.

□

### ٣ـ كۆمەڵگەی پۆست مۆدێرنیتی شوێنی بەرهەم هێنانی نیشانەو كۆتای راستییە

بۆدریار لێكۆڵینەوەی فراوانی لەمەڕ سیستەمی شمەكی ـ كاڵای هاوچەرخ (رێكلام، TV، زێدەڕۆیی لەبەكاربردن، گومڕاسازی، وێنە، مۆدە، بازاڕ،...) بەرهەم هێناوەو لەزۆربەی كارەكانیشیدا وەك زمانێك تەماشای ئەم سیستەمە دەكا.

بەشێكی زۆری بۆچوونەكانی بۆدریار لەم بارەیەوە لەژێر كاریگەری بۆچوونەكانی فرۆید، لەمەڕ نائاگایی، دان. بەباوەڕی ئەم بیریارە رۆژئاواییە سەردەمی پۆست مۆدێرن لەژێر سایەی چەند دیاردەیەك (وەك، تەكنەلۆژیای گەیاندن، شاشەی كۆمپیوتەر، فیزیای كوانتی، هەندێ زاراوەی وەك: ئابڕوچوون، زیاد لەپێویست ریالیتێت، ورووژاندن،......) پیادە دەكرێ، هەر لەم بوارەشدا باس لەستروكتوری كۆمەڵایەتی كۆمەڵگە پیشەسازییەكان دەكاو دەڵێ:

كۆششێكیو رێناوییە گەڕان بەدووی بنەچە، هۆ، بەرپرسیاریەتیو سەرچاوە (ریفێرنس). لێكدانەوەی مێژووش بەهیوای گەڕان بەدووی سەرچاوەو گەڕانەوەی شتەكان بۆبنەچەو سەرچاوەیان شتێكی ورێناوییە. لەبەرئەوەی شتەكان لەوەكەتوون راست بن، راستی لەناو مێژو بوونینییە. لەبەرئەوەیش كەمێژوو لەناوبوون ریشەكێش كراوە ئیدی زەمەن ئەو بوونەی نییە. بەهۆی زێدەڕۆی لەنەشونما گەشە لەسەرە مەرگدایە. خێراییەكی بێتامیش لەخێرایی داهاتووە كەسستیو ناچالاكی بەرهەم هێناوە. بۆیە بەرامبەر بەبزوتنو زێدەڕوی لەخێرایی دەبێ سستی بەرهەم بێت. ئەمەش بۆ وەستاندنی جوڵەو دەنگ. پاشان دەبێ لەگەیاندن پەلەترمان دەست بكەوێت، چونكە گەیاندن ئەنجامی هاوتاییە، مرۆڤی ئەم كۆمەڵگەیە هەموو شتێك لەدەوروبەری خۆیدا كۆنترۆڵ دەكات، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەر تەنیایە. كۆمەڵایەتی ئەم كۆمەڵگەیە كۆمەڵایەتییەكی رووكەشو ساختەیە. لەوە سەیرتر، سوبژێكت ـ خود ـ لەم كۆمەڵگەیەدا هەڵوەشاوەتەوە. مرۆڤی ئەم كۆمەڵگەیەو هی چاخی پۆست مۆدێرن ئیدی ناتوانێ باس لە ویستێكی سۆسیالو كۆلێكتیڤی بكا. لەحاڵەتی ئاوادا نەستی سیاسیش بوونی نییە، هەروەها بەرهەم مانای خۆی لەدەست دەدا. یاخود مانای نییە. چونكە بەرهەم هەر لەزیادبوون دایەو پایانی بۆ نییە. دەسەڵاتیش لەم كۆمەڵگە هاوچەرخانەدا كەدەسەڵاتە بەسەر شتەوە لەگەڵ گۆڕانی شت دەسەڵاتیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

لەكۆمەڵگەی پۆست مۆدێرندا شتو نوێنەرایەتی بێمانان. لەكۆمەڵگەی پاش پیشەسازیدا دابڕانێكی زۆر لەنێوان شتو مانا، لەنێوان نوێنەرو نوێنراودا هەیە. دەمێكیشە سیستەمی شتو نوێنەرایەتی لەژوورێكی پووچدا نووستوون. بەپێی دیدی بۆدریارن ژیانی ئەمرۆی رۆژئاوا دەكرێ بەژیانی پاش ئازادی ناوببرێ. ئەم جۆرە ژیانەش كودەتا یان گۆڕانی رادیكاڵی تیابەدی ناكرێو بوونیشی شیاونییە. لەگەڕان بەدووی دیدەكانی بۆدریار لەكارەكانیدا ئەوە بەدیدەكرێ كەپتر لەهاوەڵەكانی باسی ترانس ئێستاتیكو ترانس سێكسویلی ورووژاندووە.

شمەك لای بۆدریار هەروەك ماركس بەهایەكی نیشانەیی هەیەو، لەشیكردەوەكانیشیدا نیشانەیەكی ئابووری سیاسی هەیە. شمەك، كەلە كۆمەڵگەی

پۆست مۆدێرندا شوێنی بەرهەم هێنانی شتە، نرخی تایبەتی خۆی هەیەو، بەشت بوون یەکێکە لەڕوخسارەکانی ئەم کۆمەڵگەیە، بەگشتی بۆدریار ڕەخنەی توند لەلۆژیکی عەقڵی تازەگەری دەگرێو یۆتۆپیاکانی پرۆژەی رۆشنگەریی ئەورووپایی لەمەڕ (برایەتی، ئازادی، یەکسانی) بەدرۆ دەخاتەوە. ئەم پۆست مۆدێرنە بەبانگەوازەکانی بۆ (کۆتای کار، کۆتای بەرهەم، کۆتای ئابووری نەتەوە، کۆتای گفتوگۆی لۆژیکی، کۆتای ئیپوکی کۆنی نیشانە، کۆتای ئیپۆکی بەرهەم هێنان،....) تیۆری ڕەخنەی کۆمەڵایەتی گۆڕیوە، سەبارەت بەدیاردەی پایانی راستیش پێی وایە، وڕێنە ئیدی شیاو نیە لەبەرامبەر راستی دانرێ، بەتایبەت خودی راستی خۆی بۆ بۆدریار بوونی نییەو جیاوازی کردنیش لەنێوان راستیو درۆ، واقعیو ناواقعی شتێکی نوێ نیە. ئەو بیریارانەش کەپێش بۆدریار لەئارادابوون، وەك بیری رۆسۆ (Rousseau)، لەبارەی ئەوەی کەشارستانیەت لەگەڵ نەشونما هاتۆتە کایەوە. یان بیری ئۆسکار وایڵد (Oscar Walde)، کەتازەگەری ماسکەکانی راستییە، یان بڕوای (Kliping)یش، کەبوونی مرۆڤ شتێکی تازە دروست کراوە، گەشەی زۆریان لەسەردەستی ((ئەو))بە سەرداهاتووە. بۆدریار شیکردنەوەکانی لەبارەی مۆدێرنێتی بەبابەتی وەك: شەفافیەت، مێدیا Media ـ Genetknik ـ وابەستە دەکا. کەباسیش دێنێتە ئارا لەبارەی نیشانەوە بەو لێکدانەوانەوە گرێدەدا کەبابەتی مێدیا وەتایبەتی کردوون.

بۆچوونی ئەم پۆست مۆدێرنە بۆ میدیای هاوچەرخ ئەوەیە کەمێدیا پەیامەو ـ Antiode ـ ی ئێمەش جیهانی مێدیایە. نیشانە بەرچاویەکانی مێدیاش بەوەدیار دەکرێ کەمێدیا ڕۆڵی گرنگی لەناچالاککردنی بەکاربرو بەرهەم هێنانی گەیاندنێکی تاك لادا هەیە. بەڵام گرفتەکە لەوەدایە، ئەوی مێدیا بۆ تەماشاکەران ئەیخولقێنێ لەراستی راستیترەو دیاردەیەکە لەراستی یان بەواتایەکیتر مێدیا راستێکی باڵایە، واتە ئەو راستییەی کەزێدەڕۆیی تیاکراوە.

بەپێی روانگەی بۆدریار جیاوازی لەنێوان نیشانەو راستی دەکرێ، وەك گشت جیاوازیەکانی تر هەڵوەشێتەوە. پاشان مانای نیشانە بەوە دیار ناکرێ کەبەراستێکی دەرەکی ـ رووکەش ـ بەراوورد دەکرێ.

بەڵکو بەوە دیار دەکرێ کەبەنیشانەیەکی دی بەراوردبکرێ. روناکبیری ناویراو، لەکتێبی ((سیستەمی ئوبێکتەکان))دا ئاماژەی بەوەکردووە کەئوبێکت ـ شت ـ فاکتەرێکی رۆشنو واقعییە، ئوبێکت لەم سەرچاوەیەدا وەك نیشانە تەماشا کراوەو جەختیش لەوە کراوە کەسیستەمی ئوبێکت بۆ لەمەولا بوونی‌نیە، هەر تایبەت بەبابەتی ((مییدیاو نیشانە)) پەیڤین دێنێتە ئارا لەبارەی ((مۆد)) ـmodeـ ەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە(مۆد)ە دیاردەیەکە کۆنترۆڵی سەردەمی نوێ دەکا. لەسەردەمی (مۆد)دا، واتە لەم سەردەمە چەپەڵە، هەموو شتێك دەبێ بەنیشانە. دیاردەو مۆدە هەموو شتەکانی‌تر قۆرخ دەکەن وەك: جلوبەرگ، جەستە، مێدیان سیاسەت، هونەر، زانست،.... ئەم مۆدەیەش کەئەمڕۆ لەکۆمەڵگە پاش تازەگەریەکانا کارەکا، نیشانەیەکی خۆ بەخۆ نیە، بەڵکو مۆدە وەك نیشانەیەك لەپێوەندی‌دایە لەگەڵ نیشانەی تردا. بەواتای بەرینتر، مۆدە کە مومارەسەی ئیغراکردن (Seduction) دەکا لەتەك (Simulathon) ئەمڕۆمانی داگیرکردووە. ئیغراکردنیش کەلەبنەڕەتدا هاوشانی (Simulathon)ە خۆیان وەك سەرووی راستی دەردەخەن. مۆدە دەیەوێ لەجوان جوانتر بەرهەم بهێنێت، مۆدەکە هەڵگری نهێنییە سیستمێکی بێ بەهاو ناڕەوشتیە، ناڕەوشتیش یەکێکە لەنهێنی‌یەکانی مۆدە، بەڵام مۆدە لەوە بۆتەوە جوان لەناشرین جودابکاتەوە. بەکورتی مۆدە دزی هەموو چێژو هەوەسێکە، هەوەس لەهەموو بوارەکانا (کۆمەڵایەتی، سیاسی) شێوەی ناڕەوشتی وەرگرتووە.

بیروبۆچونی ئەم لێکۆڵەرە پاش تازەگەرییە لەسەر کۆمەڵگەی زانیاری هەمان ئەو بۆچونانەن کەتایبەت بەکۆمەڵگەی مێدیا بەرهەمی هێناوە، ناواخنی ئەو بۆچونانەش ئەوەن کەلەکۆمەڵگەی زانیاریدا جیاوازی نێوان ڕوو و قووڵایی، ماناو بێمانایی، ژیانو مەرگ لەداکەوتندایە. ئەوی ئێمە وردە وردە لێی نزیك دەبینەوە بریتی‌یە لەپایان داهاتنی ژیان. بۆدریار، کەبەرهەمی راستەوخۆی پۆست مۆدێرنە رونکردنەوەیەکی بێسنووری لەبارەی نیشانەو کۆدەکانی کۆمەڵگەی پۆست مۆدێرنەوە هێناوەتە ئارا. هەرزوو لەکارەکانیدا پەیامو دیاگنۆس

بەنیشانە ـ Symptom ـ لەقەڵەم دەداو، راستیش بەدیاردەیەکی ونبوو و بەسەرچوو دەزانێ.

ئەم پاش تازەگەریی خوازە ئەوە روون دەکاتەوە کەئەگەر لەمەویەر واتە لەسەردەمی مۆدێرنیتیدا، راستی دەپەرسترا ئەوا بۆ لەمەولا لەبارەی ناراستییەوە راڕا دەبین. ناڕاستی لەجیهانی ئەمڕۆی پووچ دا بەشێوەیەك لەشێوەکان بووە بەچارەنووس‌و هاوڕێگای لەمەودوامان. نووسەری ناوبراو، لەیەکێ لەکتێبەکانی بەناوی ((تاوانی پێرفێکت)) دیسانەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کەتاوانی تازەی کۆمەڵگەی مەدەنی‌و شارستانی هاوچەرخ بەهۆی مێدیاوە ئەنجام دەدرێ. هەر لەسەرچاوەی ناوبراودا جاریتر دەگەڕێتەوە سەر وروژاندنی بابەتی راستی‌و ئەوەش روندەکاتەوە کەچۆن راستی کۆتایی دێ‌و چۆن وێنەی راستی جێگەی ـOrigin ـ ی راستی دەگرێتەوە. ئەویشی ئەم پۆست مۆدێرنە فەرەنسییە بەلایەوە بایەخ دارە ئەوەیە کەکەس نەیتوانیوە دەرك بەناپایانی راستی بکاو، هەرچی راستییە گریمانیەکان‌و هەواڵە پەخشکراوەکانی ـ TV ـ یشن وامان لێدەکەن کەراستەوخۆ لەتەك دیاردەی وەك: جەنگ، مەرگ، قوربانی، هێرشەکان بژین. بەجۆریتر، گریمان داوامان لێدەکا باوەڕ بەوە بکەین لەهەموو شوێنێکدابین‌و هەموو شتێکیش لەیەك کاتدا بکەین. روخسارەکانی کۆمەڵگەی پاش پیشەسازی‌و زانیاری وایان لەبۆدریار کردووە دیالیکتیکی مانا بەشتێکی پووچ بزانێ. ئەوە بەپووچ بزانێ کەبیر لە دیالیکتیکی کۆسمۆس بکرێتەوە. چونکە کۆسمۆس لەسەر بناغەی دژەگەریی‌و پێچەوانەگەریی دامەزراوە. ئەمە وادەکا بەدووی گۆڕان نەگەڕێین‌و بەراوردیش لەنێوان جێگیرو ناجێگیر نەکەین. بەڵکو بەدووی لەجوڵاو جوڵاوتر. لەناجێگیر ناجێگیرتر بگەڕێین: واتە ناشیاوی. بەدووی جیاوازی لەنێوان راستی‌و موزەیف نەگەڕێین. بەڵکو بەدووی لەزەیف زەیف تر بگەڕێین؛ واتە وڕێنەو رووکەش. بەدووی جیاوازی لەنێوان جوان‌و ناشرین نەگەڕێین. بەڵکو بەدووی لە ناشرین ناشرینتر بگەڕێین.روخسارەکانی کۆمەڵگەی پاش پیشەسازی‌و زانیاری وایان لەبۆدریار کردووە دیالیکتیکی مانا بەشتێکی پووچ بزانێ. ئەوە بەپووچ بزانێ کەبیر لە دیالیکیتکی کۆسمۆس بکرێتەوە. چونکە کۆسمۆس لەسەر بناغەی دژەگەریی‌و پێچەوانەگەریی دامەزراوە. ئەمەش وادەکا بەدووی گۆڕان نەگەڕێین‌و بەراوردیش لەنێوان جێگیرو ناجێگیر نەکەین. بەڵکو بەدووی لەناجێگیر ناجێگیرتر بگەڕێین: واتە ناشیاوی بەدووی جیاوازی لەنێوان راستی‌و موزەیەف نەگەڕێین. بەڵکو بەدووی لەزەیف زەیف تر بگەڕێین: واتە وڕێنەو رووکەش. بەدووی لەنێوان جوان‌و ناشرین نەگەڕێین. بەڵکو بەدووی لەناشرین ناشرین تر بگەڕێین– بەدووی جیاوازی لەنێوان دیارو شاراوە نەگەڕێین. بەڵکو بەدووی لەشاراوە شاراوەتر بگەڕێین: واتە نهێنی. بۆ لەمەولا واقعی لەبەرامبەر خەیاڵی دانانرێ بەڵکو لەبەرامبەر لەواقعی واقیعی‌تر دانانرێ. وتە هیپەر (Hyper) واقعی. بەتاڵ لەبەرامبەر پڕ دانانرێ. بەڵکو لەبەرامبەر تێرو دووبارە دادەنرێ واتە لەپڕ پڕتر. جوڵە لەبەرامبەر وەستاو دانانرێ. بەڵکو لەبەرامبەر خێرای دادەنرێ. سێکسوالیتێت لە زەبرووزەنگو رەوشتدا وننابێ. بەڵکو لە سێکسوالیتێتێکی پترسێکسولیتێتدا وندەبێ: واتە لەبەرەلایی‌و بەرخۆریی سێکسیدا. دیاریکردن لەبەرامبەر نادیاریکردن _ گومڕا _ دانانرێ. بەڵکو لەبەرامبەر هیپەر دیاریکردن دادەنرێ. واتە هەڵاوسانی دیاریکدن لەبەردەم بۆشایی دادەنرێ. تێلیۆلۆژی (غایە گەریی) بەرامبەر بە رێکەوتگەریی دانانرێ. بەڵکو بەرامبەر بە هیپەر تیۆلۆژی دادەنرێ. بۆدریار شان بە شانی ئەو باسانەی لەمەڕ راستی‌و راستی زێدەڕۆتیاکراو باس لەبارەی *Simulcer* یش دێنێتە ئارا. بە پێی دیدی (ئەو) جیهانی _ Simulation _ جیهانێکی مزەوەرە _ قولابی‌یە _ ناوبراو لە راستی راستی ترە. چونکە _Simulation _ داوای هیچ بەهایەکی راستی ناکاو، _ Simulativ_ یش دژەمانای نوێنەراتییە. نیشانە بە سیمولێرەکراوەکان ئاماژە بۆ راستی ناکەن بەڵکو ئاماژە بۆ راستی یەکی زێدەڕۆ تیاکراو دەکەن. واتە _ Simulation_ بەرهەمی نیشانەیەو *Simulacreum* شوێنی شکانی مانیفێستی یان تارمایی _ Simulation _ ە. نموونەش لەسەر ئەوە ولاتی *Disney* یە، کە بۆتە شوێنی مۆدێلی رەهای _Simulacreum _، نەك تەنیا وەك وڕێنە، بەڵکو وەك خۆشیەکی سیمۆلۆێرەکراو بەسەر سیستەمێکی ئایدیۆلۆژی‌یەوە. لە راستی‌دا، ولاتی _ Disney _ لە روانگەی بۆدریار _ ئەمەریکایە بەڵام بە ئەندازەی کەمتر. لەم ولاتەدا، کە جەنگەڵێکی تەکنەلۆژییە، ئازادیەکان کە لە

شێوەی نیشانە کاردەکەن، شێوازی جۆراوجۆریان وەرگرتووە: ئازادی کار، ئازادی دەنگدان، ئازادی سێکس، ئازادی ئافرەت، ئازادی هۆمۆسکسۆیل،... ئەم ئازادیانە هەموو ئامادەن بەڵام ئازادی هەر لە گرفتدایە.

ئەمانە ئەو دیدانە بوون کە بیریاری پۆست مۆدێرنی فەرەنسی ژان بۆدریار بەبەرهەم هێنانیانەوە سەرقاڵ (٥)، بنەمای روناکبیری پۆست سترۆکتۆرالیستی _ پاش بونیادخوازی _ و سیمیۆلۆژی ئەم بیریارە وای لێکردووە کە رەخنەیەکی کەلتوریو تیۆری سەیر لەبارەی کۆمەڵگەی پۆست مۆدێرنی ئەوروپا دارێژێ.

بە گشتی ، بیری نیهلیستی بۆدریارو چەند بیریارێکی شێوە نیتشەیی دی ئەو شەپۆلە فکریانە ئەخولقێنن کە ساڵانی هەشتاکانی رۆژئاوا دەکەن بە ساڵانی رەخنەگرتن لە (سوبژێکت _ خود _، نرخە جێگیرو رەهاکان، ئایدیۆلۆژیا مەزنەکان، دیالیکتیك، مێژوو، راستی، جوانکاری، بەها، نیشانە، ......)، بە کورتی، ساڵانی هەشتاکان بووە بە ساڵانی هەڵوەشانەوەو شیبوونەوە. جا ئەوی کە بۆ روناکبیرو بیریاری ئەمڕۆی رۆژئاوا ماوەتەوە رەخنەی ئاڕاستە بکا دەبێ چی بێ! ئایە ئەوی ماوەتەوەو ویستی سەرلەنوێ دارشتنەوەو سازاندنە یان گەڕانەوەیە بۆ تێزی هەشتاکان _ لەوانە هەڵوەشانەوەگەریی _!! بە شێوازی دی.

روناکبیرو لێکۆڵەرەوانی رۆژئاوا لە ئەم ئێستادا دەبێ بە چ جۆرە تێمایەك: ئیکۆلۆژیا ( ژینگە ناسی _، تەکنەلۆژیا، جوانکاری، فیمێنیزم _ مێ خوازی _، سیستەمی نوێی جیهانی یان .. سەرقاڵ بن!. لەراستیدا، هەرچی ئەوی بەرچاویو دیارە ئەوەیە کە ژیانو بیری نەتەوەکان زیاد لە پێویست ترسناكو گومڕایە. لەم بارودۆخەدا. کەلتووری ئەوروپاییو شێوازی ژیانی بە بازرگانی کراوی ئەمەریکی بۆتە فەرهەنگێکی باو و لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان لاسایی دەکرێتەوە. جیهانی ئەمڕۆ، جیهانێکی شەهوەتاوییو نەزۆكو بێ بارو _Neutral_ە و، دەستی لە بەرهەم هێنانی چەند شێوازێکی ژیانی نوێی بێ ئاسۆو بێ بەر هەیە. بۆ لەمەولا هەڵوەشانەوەو پووکانەوە لە ئاستی باڵا لەناو کەلتووری ئەم جیهانە کاری خۆی دەکاو، بێ بەهاییو پووچی شتە باوەڕپێکراوو کۆنکرێتەکانیش ئاشکرا دەبن.

زستانی ١٩٩٦، ستۆکهۆلم

پەراوێز:

١- ئەم باسە بەشێکە لەو بابەتەی تایبەت بە (بیری بیریارانی پۆست مۆدێرن) نووسراوە. ئەو بیریارانەش کە بیریان وەرگێڕاوە ئەمانەن ١: ژان _ بۆدریار (Jean Baudrillard) ٢: ژان _ فرانسوا لیۆتار (Jean _ Francois Lyoard) ٣: زیگمۆن باومان (Zygmunt Bauman) ٤: ریچارد رۆرتی (Richard Rorty) ٥: فردریك جێمسۆن (Fredric Jameson) ٦: مارشال بێرمان (Marshall Berman) .. و هتد.

٢- هەندێ لە کارەکانی بۆدریار:

- سیستەمی ئۆبێکتەکان ١٩٦٨
- کەمەڵگەی بەرخۆیی ١٩٧٠
- بەرەو رەخنەی ئابووری سیاسی بۆ نیشانە ١٩٧٢
- ئاوێنەی بەرهەم ١٩٧٣
- گۆڕانی سمبۆلو مەرگ ١٩٧٦
- فۆکۆ لە بیرکە ١٩٧٧
- ستراتیژە بەدبەختەکان ١٩٨٣
- خواوەندیەتی چەپ ١٩٨٥
- ئەمەریکا ١٩٨٦
- 1987 Cool _ memories
- ئەویتر بەهۆی خودی خۆمەوە ١٩٨٧
- تاوانی پێرفێکت ١٩٩١

٣_ PARANOIA جۆرێکە لە نەخۆشی دەروونیو شێوەێکە لە خودگەریی.

٤_ Alexis de Tocqueville (١٨٠٥_ ١٨٥٩). فەیلەسوفێکی سیاسیو مێژووکردێکی فەرەنسی سەردەمی نۆزدەیە. قووڵبوونەوە لە لێکدانەوەکانیاندا بەدیدەکرێ دوای ئەو سەفەرەی رووەو (ئەمەریکا) کردوویەتی. ئەم سەفەرەش کۆتایی بە کارێ هاتوو بە نێوی: لەمەڕ دیموکراسیەت لەئەمەریکا. ناوبراو لەم کتێبەدا مانای زۆر بۆ بیرە لیبراڵیەکانی سەدەی هەژدە دادەنێ.

لەم بەرهەمەدا (تۆکفیل) وشەی (دیموکراسیەت) دوو مانادار دەکاو، پێشی وایە (ئازادی بەدان هێنان بەوانی تر دەست پێدەکا.

٥ _ ئەم باسە تەنێ بە بیری بیریارانی ناوبراوەوە تایبەتە. بەڵام ئەوی بە ناوانخو ناوەڕۆکی دیاردەی (پۆست مۆدێرن) ەوە تایبەتە ئەوا لە چەند بابەتێکدا لێکدانەوەمان لەبارەیەوە ئەنجامداوە. بۆیشە دەڵێین چەند بابەتێك لەبەرنەوەی فەلسەفەی رۆشنگەرییو مۆدێرنێتیو ئاڕاستە زانستیو ئەپستیمۆلۆژییەکانی سەدەی هەڤدەو هەژدەو دواتریش چرکەساتەکانی پراکتیزەکردنی روانگەکانی فەلسەفەی مۆدێرنێتە چەند ئاقارو رەهەندی لێکدانەوەی جۆراوجۆری بەرهەمهێناوە. هەروەها شیکردنەوە لەمەڕ پێوەندی فەلسەفەی (نیچە)و فەلسەفەی پۆست مۆدێرنیتیو بابەتی وەك : کۆتایی مێژوو، ئاوابوونی راستی، گرفتی عەقڵ، مەرگی خود، پایانی هیۆمانیزمو، دیدگاکانی پۆست _ ناسیونالیزمو پۆست _ ئیدێنتیتیو داکەوتنی ئونیڤێرساڵیزم.. و هتد ئاوڕی چاکیان لێدراوەتەوەو لە فورسەتی دیدا بەردەست خوێنەران دەکەوێ.

## سەرچاوەکان:


1- Zymunt Bauman: Doden och ododligheten i det moderna samhallet. Oversattnin: Sven Erik Thorhell, Daidalos, 1992

2- Jean Baudrillard. Amerika. Oversattning: Johan Oberg, Kopen, Goteborg, 1990

3- Nietzache. Om moralens harstamning. Forar av Carl- Goran Ekarwald. Oversattning: Jan Igren, Raben Pisma, 1994.

4- magnus Hornqvist. Foucalts makt anals, Carlsson Bokforlag, Stokholm, 1996.

5- Hannah Arendt. Manniskans villkor. Over: Joachim Retzlaff, Roda Bokforlag, 1986.

6- Paul Ricoeur. Fran text till handling. Over: Margretta Fatton, Syposiun, Lund. 1988.

7- Marshall Berman. Allt som ar fasrforflyktig. Over: Gunnar Sandin, Arkiv,1987.

8- Ord & Bild. Nr3, 1986. Maktens slut? Jean Baudrillard.

9- Respublica. Nr: 14, 1989. Den hkrospetiva striden Martin Heidegger. Jean Baudrillard.

10- Ord &Bild. Nr,3, 1989. Punkarna _ Marx och coca _ Coles barn. Marshall Berman.

11- Sydsvenska Dagbladet. 860109. Ett liv idubbla verklighetr. Jan nilson.

12- D.N. 901016. Angest frihopplashet. Ulf Eriksson.

13- Arbete. 900812. Snomos och dimma. En post _ modernistisik taskspelare. Joel Ohlsson.

14- D.N . 880309. Baudrillards tomhet och Lytards...? Lars Ericsson.

15- Modernatider. Nr: Nov, 1900. Mannen som avskaffade verkligheten. Svante Nording.

16- Expressen. 900713. Varlds andan har lanat I Sante Monica. Dniel Birnbaum.

17- Sydsvenska Dagbladet.900717. En fransman upptaker America. Oscar Hemer.

18- ResPublica. Nr: 17, 1991. I otaket med spraket. Interviu med Baudrillard.

19- Tempus. Nr: 52, 1988. Ar Amerika perfekt? James Markman.

20- S.V.D 910906. Sken Kriget vid persiska viken. Steve Sem _ Sandberg.

21- GoteborgPosten: 900716. En europe ser pa Amerika varken drom bild eller realitet. Monika Tunbak Hason.

22- Nya Argus. Nr: 9, 1991. Postmodernismens tio minuter.


## فەرهەنگۆك

| | |
|---|---|
| پووچ، ناماقولْ، بیْ فیرِۆیی | Absurd: |
| بوون | Being: |
| ناشوست، بیْ بناغە | Amorphous : |
| ئاگایی، هوشیاریی | Conscience : |
| بەکاربر | Consumer : |
| بەرخۆریی | Consumtion : |
| وتار | Discours : |
| بتگەریی | Fetishism : |
| ورێنە | Hallucination : |
| لە رادەبەدەر راستی، راستی زێدەڕۆتیاکراو | Huperrealite : |
| هەلاوسان | Inlfation : |
| ناڕاستی، ناواقعی | Irreality : |
| باری زەینی یان عەقلی | Mentality : |
| گۆڕان، هەلاوگۆڕ | Metamorphose : |
| مۆدێل، نموونە، شێواز | Model : |
| تازەگەریی | Modernity : |
| قۆرخکردن | Monopoly : |
| هیچگەریی | Nihilism : |
| بابەت | Object : |
| باوك خوازی | Paternalism : |
| ڕوو | Plateau : |
| تام، چێژ | Pleasure : |
| شیاو | Possible : |
| پاش تازەگەریی | Postmodernity : |
| پاش بونیادخوازی | Poststructurslism : |
| سەرچاوە، پێشینە | Reference : |
| ئیغراکردن | Seduction : |
| هەست، مانا | Sense : |
| نیشانە | Sign : |
| خۆ وادەرخستن، خۆ وانیشاندان | Simulation: |
| وێنەی خەیالی | simulacreum : |
| دۆخ، بار، دۆز | Situation : |
| کۆمەلگە | Society : |
| کۆمەلناسی | Sociology : |
| بوونیادخوازی | Structuralism : |
| شت، بابەت | Subject : |
| غائیەتگەری | Teleology : |
| بیریار | Thinker : |
| نائاگایی، نەست | Unconscious : |
| زەبروزەنگ | Violence : |
| بینراو، دیار | Visible : |



# شۆڕشی دەستە سپیەکان

## سەفەرەکەی میشیل فۆکۆ بۆ ئێران

■ دیدیار ئێریبۆن

● و: ئاوات ئەحمەد

کاتێك میشیل فۆکۆو تیری فۆڵتزێل لەفڕۆکەدا بەرەو تاران دەفڕین، دڵیان خورپەی تێکەوتبوو. کە گەیشتنە جێ، تەنیا چەند ڕۆژێك بەسەر (هەینی رەش – ٨ی سێبتەمبەری ١٩٧٨)دا تێپەڕیبوو. لەو ڕۆژەدا سوپاکەی شا دەستی لەجەماوەر کردەوەو زیاتر لەچوار هەزرا کەس کوژران. هەموو جیهان دژی ئەو رەشەکوژییە وەستابۆوە. لەپاریسدا ڕێکخراوی مافی مرۆڤو پارتە چەپڕەوەکانو هەندێ دامەزراوی دیکە ڕێپێوانی ناڕەزاییان سازکرد.

فۆکۆ بۆ کارێکی ڕۆژنامەگەرییانە رووی کردبووە ئێران. لەساڵی ١٩٧٧دا، سەرنوسەری ڕۆژنامەی ئیتالیان داوای لێکرد ستونێکی بەردەوامیان بۆ ئامادە بکات، بەڵام فۆکۆ حەزی نەدەکرد لەبارەی ئەدەبەوە یان فەلسەفە بۆیان بنوسێت، وای پێ باش بوو لەسەر مەسەلەی تاوانکاریی بنوسێت. جا ئایا، وەك هەندێك بۆی دەچوون، ئەوە بیانوویەك بێت بۆ خۆ دزینەوە؟ یاخود دەیویست کەمێك بجوڵێتو لەپاریس دوور بکەوێتەوە هەر چۆنێك بێت، کوورێر دیلاسێرا، پێشنیارەکەی پەسەند کرد.

ڕۆژنامەگەریی بەلای فۆکۆوە شتێکی تازە نەبوو، ماوەیەکی درێژ بۆ (Liberation)و (NOVVEL OBSERJTEUR Novver)ی نوسیوە. لەگەڵی دەمەتەقێو دانوستاندندا بەشداریی کردووە، لەگەڵ گروپی زانیاری [GIP]دا هاوکاریی کردووە. یەکەمین شت کە فۆکۆ بۆ چوونە ئێران کردی، پێکهێنانی گروپێکی بچکۆلە بوو، دەیویست تادەتوانێ زانیاریی کۆبکاتەوە. پاشان تیری فۆڵتزێل کرد بەسەر پەرشتیاری تیمەکە. تیری لەپێشدا شۆفێر بوو، لەگەڵ فۆکۆدا بەڕێکەوت یەکتریان ناسیو بوون بەهاوڕێ. فۆکۆ چەند جارێك دەربارەی رابووردوویو ئێستای تیری گفتو گۆی لەگەڵدا کردو پرسیاری دەربارەی هەمو ژیانی بەگشتی لێکرد. شەش حەوت مانگێك لەوەبەر کتێبێکی بچکۆلە بڵاوکرابۆوە، کلۆد مۆریان پێشەکی بۆ نوسیبوو. لەو کتێبەدا گفتو گۆریەك هەبوو بەڵام ناوی قسە لەگەڵ کراوەکە نەنوسراویوو، فۆکۆ هەستی بەهەندێ لێکچوون دەکرد لەنێوانی گفتو گۆکەی خۆیانو ئەو کتێبەدا، ئەمەش تاڕادەیەك مایەی ناڕەحەتی بوو. فۆکۆ ئەندرێ گلۆکسمانو ئالان فینکلکرۆتو چەند هاوڕێیەکی دیکەی بانگ کردو بۆچوونی خۆی دەربارەی نوسین بۆ کۆرێر بۆ روون کردنەوە: لەم بەهارە بەدواوە تەواوی خۆی جیهان دەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو ئایدیاکان، تێکەڵاو دەبن، ون دەبن،




سەیرانێکی بونیادگەرانە: میشیل فۆکۆ، جاك لاکان، کلۆد لیڤی شتراوس، لەگەڵ رۆناڵد پارتدا.        وێنەکێشانی مۆریس هنری ١٩٦٧

یان خۆیان چاك دەکەن، شتەکان‌و خەڵکیش رادەچڵەکێنن. ئەمە شتێك نیە تەنیا لەناو بازنە رۆشنبیرییەکاندا رویدات، یاخود تەنیا لەناو زانکۆکاندا، یان ئەورووپای رۆژئاوادا. ئەمە بەپێی پێوەرێکی جیهانی، روودەدات، بەشێوەیەکی تایبەتی لەوردیلەکان روودەدات‌و هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو، ئەوانەهەتاکو ئێستا نەریتی ئەوەیان نەبووە کە وا لەخۆیان بکەن گوێیان لێ بگیرێت. فۆکۆ لەسەری رۆیشت:

ئایدیا لەسەر زەوی زۆر لەوە زیاترە کە رۆشنبیران بۆی دەچن. ئەم ئایدیایانە زۆر لەوە کاریگەرترو بەهێزترو خۆگرترو ئینفیعالیترن لەوەی سیاسیەکان بیری لێ دەکەنەوە. ئێمە پێویستە لەوێ بین، لەشوێنی لەدایکبوونی ئایدیاکاندا، شوێنی تاقیکردنەوەی هێزی ئەو ئایدیایانە، نەك لەناو ئەو کتێبانەدا کە باسیان دەکەن، بەڵکو لەناو خۆپیشاندانی ئەو هێزانەو ململانێی دەوری ئایدیاکاندا. ئایدیا حوکمی جیهان ناکات، بەڵام لەبەر ئەوەی جیهان ئایدیای هەیە (هەروەها لەبەر ئەوەش کە بەبەردەوامیی بەرهەمی دەهێنێ) چونکە بەیەك شێواز، لەلایەنی سەرکردەکانەوەو ئەوانەش کە وەك دەرس دەیڵێنەوە، حوکمڕانیی ناکرێت، پێویستە بۆ هەموان یەکجار بیربکرێتەوە، ئەمەیە ئەو ئاڕاستەیەی کە ئێمە بەرەو رووی دەچین (راپۆرتی رۆژناکەرییانە) بۆ هەڵگرتنەوەو شیکردنەوەی بیرکردنەوە، تابخرێتە سەر لێکدانەوەی ئەوەی روو دەدات چیە. لەو شوێنەدا کە ئایدیاو رووداوەکان بەیەك دەگەن، ئالەوێدا رۆشنبیران‌و رۆژنامەنووسان پێکەوە کاردەکەن.

فۆکۆ پێش ئەوەی بچێت بۆ ئێران، چەند جارێك ئەحمەد سەلامەتیانی بینیبوو، ئەحمەد دوور خراوەیەکی ئێرانی بوو، لەساڵی ١٩٦٥ ەوە لەپاریس دەژیا، یەکێك بوو لەئەندامانی حیزبی توودە کە پارتێکی بێدینی سەربەستیخواز بوو لەوێنەی (ناوەڕاستی چەپ، کۆماری سێیەم، رادیکاڵ سۆسیالیست) کە بۆ سەربەخۆیی نیشتمانی تێدەکۆشا. سەلامەتیان ئاوای وت. ئەوە پارتەکەی مەحمود موسەددەق بوو کە هەوڵی دیموکراسیکردنەکەی ساڵی ١٩٥٣ی دا. فۆکۆو سەلامەتیان لەرێگای تیێری میگنۆنەوە یەکتریان بینی، میگنۆن پارێزەر بوو، ژنەکەی ناوی سیڵڤیا بوو، ئەمان لەوکاتەدا فۆکۆیان ناسی کە لە GIP نیشیان دەکرد، هەروەها لەساڵی ١٩٦٦یشدا لەو کۆمیتەیەدا کاریان کردبوو، کەسارتەر پێکی هێنابوو بۆ داکۆکی کردن لەزیندانیانی سیاسی ئێوارانی. لەم نێوەندەدا تیێری میگنۆن لەساڵی ١٩٧١ بەدواوە بەشداریی چەند کارێکی هەرەوەزیی کۆمەڵەی مافی مرۆڤی کردبوو. فۆکۆش هەموو ئەو هاوارنامانەی ئیمزا دەکرد کە ئەو کۆمەڵەیە دەری دەکرد. ئەگەرچی لەبانگەشەکردنەکانیدا بەشداریی نەدەکرد. بۆ نموونە لە ٤ی فەبریوەری ١٩٧٦دا نارەزایی نامەیەك لەرۆژنامەی لۆمۆندا بڵاو کرایەوە دژی بێدەنگی فەرەنسا لەمەڕ پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەئێران، لەوێدا نۆزدە شۆڕشگێڕی دژ بەفاشیزم قەلاچۆکرابوون. لیستی ئیمزاکان بەناوی سارتەر دەستی پێکرد بوو، فرانسوا میتێران‌و میشیل رۆکارو لیۆنێل جۆزفین‌و جین پیێری چیفێنمێنت

تادەگاتە یاڤیس مۆنتان و کلۆدمۆریاك و جیل دۆلۆزو دواجاریش سیمۆن دی بۆ وار. فۆکۆش ئیمزای خۆی لەم نارەزاییینامەیە دابوو، لەساڵی ١٩٧٧دا راپەڕین دژی رژێمی شا پەرەی سەندو لەسەرەتای سێپتەمبەرەوە دۆزەخەکە وەرچەرخا.

ئەحمەد سەلامەتیان کۆمەڵێك کتێب و بەڵگەنامەی بۆ فۆکۆ پەیدا کرد، کۆمەڵێك ناونیشان و لیستەیەك ناویشی پێدا تاکو چاوی پێیان بکەوێت، شەش حەوت رۆژ دواتر فۆکۆ گەیشتە ئێران (دوای ماوەیەك چاوەڕوانی کە لە فرۆکە دادەبەزێت، تەکسییەك بەخێرایی دەتباتە ناو شەقامەکانی شارەکەوە. شەقامەکان چۆڵ و هۆڵن. تەنها شتێك کە لەخێرایی ئۆتۆمبیلەکان خاو بکاتەوە بریتیە لەو تاسانەی کە پیاوە چەکدارەکان دروستیان کردوون. ئەگەر شۆفێرێك نەیانبینێت، تەقەی لێ دەکەن. ئێستا خوارو ژوری شەقامە درەختڕێژ کراوەکەی رەزا شا بێدەنگە، هەتا چاو بڕکات بێدەنگە. رۆشنایی سەوزو سور هەڵدەبن و دەکوژێنەوە، وەك چکە چکی سەعات، یاخود گیانەڵای پیاوێك لەسەرەمەرگدا. ئانەمەیە دەستەڵاتەکەی شا) فۆکۆ وای پێ باش بوو هەر لەسبەینێوە دەسبەکار ببێت، بەزەحمەت دەتوانرا پەیوەندی بەئۆپۆزسیۆنە ئایینیەکانەوە بکرێت. سەرەتا چەکدارێکی سەر بەئۆپۆزسیۆنی دیموکراسخوازی بینی، ژمارەیەك سەربازیشی چاوپێکەوت، تاکو لەو دەورە تێبگات کە سوپا لەکاتی گرژییدا دەیبینێت. لەدەفتەرەکەیدا نوسی (برادەران لەگەڵ چەند ئەفسەرێکدا چاوپێکەوتنیان بۆ ساز کردم، هەمویان ئەفسەری پایەبەرز بوون و پێشتر لەسوپادا بوون. ئەوانە پێیان راگەیاندم کە گەورەترین تەنگو چەڵەمە پەرە بسێنێت ئەوەیە حکومەت سوپای مەشق نەدراو بهێنێت بۆ پاراستنی هێننی. ئەم سەربازانە هەر زوو دەکەونە حاڵێکەوە کە تێدەگەن لەگەڵ کۆمۆنیزمی نێو دەوڵەتیدا روو بەڕو نابنەوە، بەڵکو کە هەر وەکو برای خۆیان وان، یاخود وەکو خودی خۆیان وان ئەگەر سەرباز نەبوونایە.

فۆکۆ لەسەر راپۆرتەکەی دەڕوات، قسەی لەگەڵ سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆندا کرد کە ئەوان شایان بەوە تاوانبار دەکرد کە (مۆدەرنیزم و تاکڕەویی و بەدڕەوشتی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە) لێرەدا فۆکۆ پیاسەیەکی دوو سێ رۆژ لەوەوبەری بیرکەوتەوە:

کاتێك سەرم لەبازاڕدا حەپەسام، بازاڕ لەدوای هەفتەیەك مانگرتن تازە کرابۆوە. بەدەرزەن مەکینەی درومان ریزکرابوون، مەکینەی گەورەو ئاڵۆز، وەکوو ئەوانەی لەرۆژنامەیەکی سەدەی نۆزدەدا دەبینرێن، هەموویان بەنەخش و گوڵ و گوڵزار، رازێنراونەتەوە، تەواو وەکو لاسایی کردنەوە مۆدێلی کۆنینەی پاریس. ئەم هەموو مەکینەیە خرابوونە پشت گوێ، لەسەریان نوسرابوو (لەکۆریای باشور دروست کراوە). لەو کاتەدا هەستم بەوە کرد کە فاکتەری نوێ و نزیك نەبوونەتە هۆی فڕێدانی ئەم مۆدێلانە، لەپێش مۆدەرنیزمێکدا کە خۆی زۆر کێوییانەیە، ئەمە تاڕادەیەك رەتکردنەوەیەکە لەلایەنی کولتورێکی دیکەوە، خەڵکێکی دیکەوە ئەنجام دەدرێت، رەتکردنەوەی مۆدەرنیزمێکە کە خۆی لەخۆیدا ئانارشیزمێکە بۆ خۆی، بەدبەختی شا لەوەدا بوو کە خۆی بەشێك بوو لەو کۆنەو دێرینیە، ئەو لەتوێی ئەو ئەنجومەن و ئەو تاکڕەوییەدا پارچەکانی رابردوویەك لەناو ئێستایەکدا بهێڵێتەوە کە چیتر نەیدەویست مامەڵەی لەگەڵا بکات.

بۆیە فۆکۆ دەرسی لەهەموو ئەو شتانە وەردەگرت کە دەیبینین یان دەیبیستن (مۆدەرنیزم وەك پرۆژەیەکی سیاسی و وەکو پرنسیپێکی گۆڕانی کۆمەلایەتی، لەناو ئێراندا شتێکە بۆ رابردوو دەگەڕێتەوە، بەنیسبەتی رژێمی ئێستای ئێرانەوە میتۆدێکی مردووە. ئێمە لەدوا ساتەکانی قۆناغێکی گرنگداین کە شەست ساڵ لەوەبەر دەستی پێکردووە:

(هەوڵدانێك بۆ مۆدرێنەکردنی ولاتانی ئیسلامی لەسەر شێوازی ئەوروپایی). فۆکۆ مەقالەکەی خۆی بەم وشانە تەواو کرد: سەرەنجام تکاتان لێدەکەم، باچیتر لەئەوروپادا ئەم قسانەمان گوێ لێ نەبێت، دەربارەی سەروەریی و ناسەروەریی فەرمانڕەوایەك کە زۆر مۆدێرنە لەولاتێکدا کە زۆر کۆنە. لەئێران ئەوشتەی کە کۆن بووە خودی شایە. ئەو پەنجاو بگرە دەشێ سەد ساڵیش لەدواوە بێت. ئەو خەونێکی سەمەرەی دەبینی کە بەهەمو مانایەکی سکولاریی و پیشەسازیی ولاتەکەی ئاوەلا بکات. پرۆژەی مۆدرێنە کردنی شا چەکی کۆنینەی پێبوو، سیستەمە رەوشتییەکەی ئەو ئەمڕۆ بووە بە فۆلکلۆر) فۆکۆ سەرکردە سیاسییەکانی ئۆپۆزسیۆنی نەدەبینی و بەس دەیویست گوێی لەقوتاب و پیاوی

سەر شەقام بێت، ئەو لاوە ئیسلامیانەی کە ئامادەیی خۆیان نیشان دەدا بۆ مردن. بەدەوری گۆڕستانەکاندا دەسوڕایەوە، چونکە ئەوێ شوێنی کۆبوونەوە نهێنیەکان بوو. سەری لەزانکۆکان داو لەدەرگای مزگەوتەوە چووە ژورێ. لەگەڵ تێریدا هەوڵیاندا لەشاری قوم ئایەتوڵڵا شەریعەتمەداریی ببینن، کە وەك دورخراوەیەك لەوێ دەسبەسەرکرابوو، وەکو یەکێك لەوانەی لەکاروباری مافی مرۆڤدا تێوەگلابوون. فۆکۆ قسەی لەگەڵ مەداریو مەهدی بازرگانیشدا کرد کە دوای گەڕانەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی بوو بەسەرەك وەزیران. گەیشتن بەماڵی مەهدی زۆر ناڕەحەت بوو: سەربازی چەکدار پاسەوانی شەقامەکەیان دەکرد. یەك هەفتەی تەواو فۆکۆ زانیاریی کۆکردەوە، گوێی رادێرا، تەماشای کرد، سەرنجی خۆی تۆمار کرد. خۆی کرد بەهەموو شوێنێکدا. دەیویست هەموو شتێك ببینێو لەهەموو شتێك تێبگات. تێری وەکو رۆژانی خەبات یادی ئەو رۆژانە دەکاتەوە.

چەند رۆژێك بەر لەوەی ئەوان بگەنە ئێران، مزگەوتەکانی ناو ئێران دەنگی ناڕەزاییان بەرزکردبۆوە، وتارەکانی مەلاکان لەسەر کاسێت تۆمارکرابوونو لەهەموو شوێنێکەوە بڵاودەکرانەوە، فۆکۆ سەدای ئەو دەنگانەی دەبیست. دەبێ سافانا رۆلاش لە فلۆرەنسە هەر ئاوا هاوری کردبێت، وەك ئاناباتیس لەمیونستەر، یاخود بیربستێریان لەسەردەمی کرۆمویلدا.. فۆکۆ بەهەر کەسێك بگەیشتایە لێی دەپرسی: (چیت دەوێت؟) هەمو جارێکیش هەر هەمان وەڵامی دەست دەکەوتەوە (حکومەتی ئیسلامی).

فۆکۆ هەفتەیەك لەئێران مایەوە، کە گەڕایەوە بۆ پاریس چوار مەقالەی زۆر جوانی نوسی کە درێژەی روداوەکانو چیرۆکی مرۆڤەکانو کاردانەوی قووڵی خۆی لەو مەقالانەدا ئاوێتەی یەکتریی ببوون. مەقالەکان لەکاریەر دێلاسێرادا بڵاوکرانەوە، لە ٢٨ی سێپتەمبەرەوە تاکو ٢٢ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٨. لە ١٦ی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا پوختەی ئەو بابەتانەی لەنۆڤێل ئۆبزێرڤەردا بڵاوکردەوە کە بەم وشانە کۆتایی دێت:

لەدامێن مێژوودا، فارس پەیوەندیی کرد بەئیمپراتۆرییەتی ئیسلامەوە، شێوازێکی تایبەت بەخۆی بەخشی بەئیسلام، فارس پەرەیدا بەدینێکی دیکە بۆ خۆیو کردی بەگژی دەستەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامیدا. تۆ بڵێی لەم (حکومەتی ئیسلامی)یەدا شتێکی نوێ ببینین؟.. چ مانایەك دەگەیەنێت بۆ دانیشتوانی ئەم گۆشەیەی زەوی، کە سەرو ژێری خاکەکەی لەستراتیژی جیهانیدا بەشدارن، کاتێك کە بەدوای نرخێکدا دەگەڕێن بۆ ژینی خۆیان، بۆ شتێك کە ئێکە لەبیرمان چۆتەوە، تەنانەت وەکو شێمانەیەکیش، لەڕێنیسانسەوە، لەگەورەترین رەخنەگرتن لەمەسیحیەتەوە، لەسیاسەتی رۆحانیەو، گوێم لە پێکەنینی فەرەنسییەکانە، بەڵام دەزانم بەهەڵەدا چوون.

پیاوێکی ئاینی پایەبەرز، پیاوێکی پیر هاتە پێشەوەو بەهێواشی لەژێر دارسێوە گەورەکەی ناوەڕاستی باخچەکەدا دانیشت. هەفتا -هەشتا کەسێك بازنەیەکیان بەدەوریدا دروست کردبوو، گوێیان بۆ شل کرد. کابرا بەدەنگێکی هێمن دەدوا، بەڵام ئەوەندە بەرزبوو کە دەیتوانی هەزار جار ئەم جیهانە رابوەشێنێت. ئایەتوڵڵا خومەینی لە ٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٨دا گواستیەوە بۆ نۆفێل دۆشاتو، کەشارێکی بچووکە لەنزیکی پاریس، پێش ئەوە چواردە ساڵی رەبەق لە عێراق مابۆوەو خەباتی کردبوو. لەسەرانسەری ئەورووپاوە قوتابیانو خەباتگێڕانو خەڵکی ئاسایی هاتن بۆ سەردانی. ژمارەیەك ئەورووپاییش هاتن کە زۆربەیان رۆژنامەنووس بوون. لەوانە پیری بلانشێتو کلێر برێری رۆژنامەی لیبراسیۆن، لەگەڵ ئەوانیشدا فۆکۆ هات. ئایەتوڵڵا بەنی سەدر یەکێك بوو لەسەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆنو کوڕی رۆحیی خومەینی بوو، دەمێك بوو لەفەرەنسا دەژیا. هەر ئەوەندەی خومەینی گەیشتە پاریس، سەدر خەبەری دا بەبلانشێتو برێر (بەنی سەدر بەم نزیکانە دەبێت بەسەر کۆماری ئێرانو ئێستاش لەپاریس دەژی). بلانشێتو برێر، فۆکۆیان لەکاتی سەردانەکەیدا بۆ ئێران بینی، ئەوانیش هەر بۆ رۆژنامەگەریی هاتبوون، تەلەفۆنیان بۆ فۆکۆ کردو پێکەوە چوون بۆ ماڵی بەنی سەدر لەکاشان تاچاوەڕوانی ئایەتوڵڵا خومەینی بەن، فۆکۆ داوای لەسەدر کرد بۆ خومەینی روون بکاتەوە کەوا باشترە بەڕاشکاویی باسی شانەکات، چونکە ئەمە شا والێ دەکات کاردانەوی یەکسەریی و خراپی ببێت. ئەو ئێوارەیە فۆکۆ نەیتوانی لەخومەینی نزیك ببێتەوە، حاڵی رۆژنامەنوسەکان لەنۆفێل باشتر نەبوو، دەبوایە چەند رۆژێك چاوەڕوانیی بکەن پێش ئەوەی بیانبینێ.

دوای ئەو شتانەی لەئێران کەوتنە بەرچاوی، فۆکۆ زۆر حەزی دەکرد خومەینی ببینێ ناوی خومەینی ملیۆنەها ئێرانی خستبووە جوولە، بەڕادەیەکی وا هیچ شتێك نەیدەتوانی کە رایان بوەستێنێت. بەڵام هەروەکو فۆکۆ بۆی چوو بوو، خومەینی هەر زوو نەخشەی ئەوانیتری هەڵوەشاندەوە. وتی: نا بۆ هیچ هەوڵێکی ئاشتبوونەوە. نا بۆ دانوستاندن. نا بۆ دەنگدان. نا بۆ حکومەتی هاویەش. شادەبێ بڕوات. پاش ماوەیەك هەموو ئەوانەشی خستە لاوە کە رەنگە یاریدەی شا بدەن، بۆ پاراستنی رژێمەکەی، هەموو ئەوانەی کە لەنۆفێل بوون، هاتوچۆی خەڵکی پایەداری ئێران، وایان پیشان دەدا کە ئایەتوڵڵا هیچ هاوکارییەك ناکات. لەوڵاتدا هەموو کەسێك باوەڕی بەتواناو هێزی نێوان ئەو پیاوە پەنجا ساڵانەیەو لایەنگرەکانی هەبوو) وەزعی ئێران وای پیشاندەدا کە شتێکی زۆر گەورە لەنێوانی دوو کەسدا دەقەومێت، کە هەریەکێکیان چەکی خۆی پێیە: شاو مەلا، ئەویان دەستەڵاتدارەو ئەمیان پیاوێکی بێ دیفاعەو قۆڵی هەڵکردووەو بەدەستی بەتاڵ دەجەنگێتو لایەنگرەکانی داکۆکیی لێ دەکەنو خۆیان لەخۆیاندا هێزێکی لەبن نەهاتوون، بەڵام لەپشتی ئەمەوە واقیعی مردنی هەزاران کەس هەیە.

لەسەردانەکەیاندا بۆ نۆفێل لەگەڵ ئەحمەد سەلامەتیانو تێری ماگنۆندا، فۆکۆ روداوێکی گچکەی بینی. یەکێك لەمەلاو هاوکارەکانی خومەینی دەیویست رێگە لەکچە رۆژنامەنوسێکی ئەڵمانیی بگرێت، تاکو نەچێت بۆ لای خومەینی، چونکە ئەو کچە پەچەی نەکردبوو (حیجاب). سەلامەتیان نارەزایی دەربڕی (تۆ دەتەوێت وێنەی بزووتنەوەکەت ئاوا پیشان بدەیت؟) کوڕەکەی ئایەتوڵڵاو زاواکەی مەلاکەیان راوەستاندو رێگە درا بەکچەکە بچێتە ژوورەوە.

لەکاتی گەڕانەوەیاندا، فۆکۆ وتی من سەیرم لەوە دێت کە پەچەکردن بوە بەکارێکی سیاسیو ئەو ژنانەی خوویان پێوە نەگرتووە، ناچار دەکران بۆ پەچەکردن تاکو بتوانن بەشداریی لەخۆپیشاندان بکەن.

فۆکۆ بەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئێران بەمانگێك



بەدوورو درێژی بەنی سەدری بینی. بەنی سەدر دەیوت: (دەمەوێ تێبگەم ئەم شۆڕشە چۆن هەڵایسا، بەبێ یارمەتی هیچ هێزێکی دەرەکیی، میللەتێکی ئاوا گەورە، سەرباری ماوەی زۆری نێوان شارەکانی چۆن ئاوا چوون بەناو یەکدا، لەگەڵ ئەوەدا کە پەیوەندیکردن زۆر ناڕەحەتیشە).

جارێکی تریش فۆکۆو تیێری ڤۆلتێر گەیشتنەوە ئێران. فۆکۆ درێژەیدا بەگفتو گۆکانی. پرسیاری لەکرێکارە ماندووەکان کرد، قسەی لەگەڵ کەسێتیە دیارەکانی چینی ناوەڕاستدا کرد، وەك فرۆکەوانێکی تارانی لەناو ڤێلا مۆدرێنەکەیدا، هەروەها لەگەڵ کرێکارانی کارگەی نەوت دوا لەعەبادان کە هەزاران کیلۆمەتر دوور بوو لەباشووری وڵاتدا. لەم گەشتەوە زنجیرەیەك راپۆرتی تازەی نوسی. چوار مەقالە بوون و لەنۆڤەمبەری ١٩٨٧دا لەکاریرەردا بڵاوکرانەوە.

لەدوایین مەقالەدا فۆکۆ باسی رۆڵی خومەینی وەك کاراکتەرێکی ئەفسانەیی ئاوا دەکات:

نەسەرۆك، نەسەرکردەی سیاسی، لەپاڵ ئەو هەموو پشتیوانیەی میدیای وڵاتەکەیدا، کەس ناتوانێ شتێکی ئاوا تایبەتی ئاشکرا بکات. ئەمەش بەرەنجامی سێ دانە فاکتەرە:

خومەینی لەوێ نییە، ئەو بۆ ماوەی چواردە ساڵی رەبەق خەباتی دەکردو نەیدەویست بگەڕێتەوە هەتا شا بەجێی نەهێڵێت. خومەینی هیچی نەدەوت، هیچ شتێك جگە لەنا.. نا بۆ شا، بۆ رژێمو بۆ پشتیوانی. دواجار خومەینی سیاسی نیە، خومەینی پارتی خۆی نابێت، حکومەتی خومەینی پێك نایەت. خومەینی دەبێت بەخاڵی بەیەك گەیشتنی پەیمانێکی هەرەوەزیی.

فۆکۆ سەرقاڵی ناسینەوەی بزووتنەوەی ئێرانییەکان بوو (ئەمە راپەڕینی ئەو پیاوانەیە کە بەدەستی بەتاڵ هاتوونەتە مەیدانو دەیانەوێت هێزێکی ئەوەندە مەزن بخولقێنن کە هەریەکە لەئێمە بخات بەلادا، ئەمانە یەکە یەکە دەکەونە سەر زەوی، کرێکارانی نەوت، گارگەرانی ناو ئەم ئیمپراتۆرییەتە، ئەم هێزەی کە قورسایی جیهانە. رەنگە ئەمە یەکەمین مەشق بێت لەبەرامبەری وڵاتێکی کشتوکاڵیدا مۆدێرنیترین فۆرمی یاخیبوون، ئەوەیان کە لە هەموویان شێتانەترە).

رۆژنامەکانی فەرەنسا لەپێش زنجیرە راپۆرتی دووەمەوە دەستیان کردبوو بەهەڵمەتێکی میللی. لە ٦ی نۆڤەمبەردا نۆفێل ئۆبزێرڤەر ژنێکی ئێرانیی بڵاوکردەوە کە لە راپۆرتی رۆژی ١٦ی ئۆکتۆبەری فۆکۆ توورە ببو (دوای بیستو پێنج ساڵ لەبێدەنگیی و ناعەدالەتی، ئایا تەنیا لەنێوانی ساڤاك (پۆلیسی نهێنی)و فانتازیای دینیدا، ئێرانیەکان بۆیان هەیە هەڵبژاردن بکەن؟ ئەو ژنە نووسی:

لەرووی دینیەوە؟ بەگەڕانەوەیەك بۆ چاوگە میللییەکان؟ سعودیە وڵاتێکە کە لەسەرچاوەی ئیسلامەوە ئاو دەخواتەوە، دەستی دزو سەری دڵداران دەپەڕێنێت. وادیارە رۆژئاوای خاوەن هیومانیزم پێی وایە کە ئەوانیتر شایستەی ئیسلامن! ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئێران، وەك من لەناوهێنانی بیرۆکەی حکومەتی ئیسلامی زراویان دەچێت. ئەوان دەزانن چی دەڵێن، لەسەرانسەری ئێراندا، کاروباری ئیسلامیی خزمەتی فیئۆداڵەکان یان شۆڕشگێڕە ساختەکانی ئۆپۆزیسۆندایە، لەتونس، لەپاکستان، لەئەندەنوسیا، لەگەڵ ئێران، ئیسلام، خودا، نازناوی جەماوەرە نەفامەکەن، پێویستە چەپی لیبراڵی ئەوروپایی بزانێت کە دەشێ چ یاسایەکی پۆڵایینی ئیسلام بێتە گۆڕێ بۆ کۆمەڵگایەك کە تامەزۆری گۆڕانە. نابێت بەدەرمانێك چارەسەر بکرێت کە خۆی لەنەخۆشییەکە خراپترە.

فۆکۆ لەمەقالەی هەفتەی داهاتوودا وەڵامی دایەوە:

لەو کاتەوەی ئێران راپەڕیوەو خەڵکانێك مردوون، هاوار دەکرێت (حکومەتی ئیسلامی) ئەرکێکی سەرەکی بوو بپرسرێت ئەو وشانە چین، چ هێزێك لەپشتیانەوەیە. من ژمارەیەك فاکتەرم باس کرد کە بەلای خۆمەوە زۆر خەتەرناك نین. ئەگەر (maraH) تەنیا خراپ خوێندنەوە هەڵەکەی بوایە، من وەڵام نەدەدایەوە. بەڵام دوو شتی وای باسکردووە کە ناتوانم خۆمیان لێ لابدەم:

١- هەموو ئاراستەیەك، فۆرمێك، بەهایەکی ئیسلام بەشێوەیەکی ناخۆش درێو دەکاتو هەموو ئەو فانتازیایە لەبەر کۆنیی رەت دەکاتەوە.

٢- وای بۆ دەچێت کە هەموو ئەوروپاییەك پێی خۆشە ئیسلام لەدەرەوەو بەتەنیا بۆ موسڵمانەکان بێت (ئەی بەرامبەری رۆژئاواییەك کە رێزی ئیسلامی لانیە چی دەڵێت؟). کێشەی ئیسلام وەکو هێزێکی

سیاسی یەکێکە لە کێشە سەرەکیەکانی ئەم سەردەمەو ئایندەش. یەکەمین شێوازی کۆنترۆڵکردنی ئەم کێشەیە بە تۆزقاڵێك رۆشنبیرییەوە، ئەوەیە رق و کینەی زیاتر نەخەینە پاڵی.

فۆکۆ بەردەوام چێژی لەئێران وەردەگرت، کە ئایەتوڵڵا خومەینی لەسەرەتای فەبریوەری ١٩٧٩دا پاریسی بەجێهێشت،فۆکۆ لەگەڵ ئەو خەڵکەدا لەفرۆکەخانە ئامادە بوو کە لەسەرانسەری جیهانەوە هاتبوون. لە ١٣ی فەبریوەریدا مەقاڵێکی تازەی نارد بۆ کاریێر ویلاسێرا. شا رۆیشتبوو، خومەینی گەڕابۆوە. ملیۆنەها ئێرانی رژابوونە سەر شەقامی فرۆکەخانەکە، ملیۆنەها پیاوو ژن هاواریان ئەکرد (خومەینی، ئاخریەکەی گەڕایتەوە)، فۆکۆ بەسەر ئایندەدا بازی دا، لەمەقاڵێکی پێشووتردا وتبووی: (من نازانم مێژووی ئایندە بنوسم، من نوقڵانەلێدەرێکی کەم فامی رابوردووم. هەرچۆنێك بێت، من حەز دەکەم شتەکان چۆن روودەدەن، ئاوا تۆماریان بکەم. چونکە ئەو رۆژانە هیچ شتێك تەوا نەبوو بوو، زارەکان هێشتا هەر دەخولانەوە. دەبێ کاری رۆژنامەنوسی بەمجۆرە بێت. بەڵام ئەوە راستە کە من هێشتاکە لەسەرەتادام.

لەدوا مەقالەیدا چەند پرسیارێکی دەربارەی ئەو جوڵانەوەیە بەرزکردەوە کە خۆی چاودێری کردبوو، لەپێش چاوی خۆی رویدابوو: رەنگە بایەخە مێژووییەکە لەناسینەوەی شێوازێك یان مۆدێلێکی شۆڕشگەڕاییدا نەبێت، بەڵکو لەو شێمانەیەدا بێت کەهەموو فاکتەرە سیاسیەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەخاتە گەڕ، هەر لێرەوە هەمان شت دەکات بۆ ستراتیژی سەرانسەری جیهان. خۆی بەتەنیا درێژ دەبێتەوەو دواتر سەرچڵیی دەکاتو دەبێت بەهێزی فراوان بوون. بەڕاشکاویی ئەمەیە جوڵانەوەی رژێمە ئیسلامییەکان کە ئاگری دین جۆش دەداتو زوربەی رژێمە جێگیرەکان هەڵدەگێڕێتەوەو زوربەی نارەحەتییەکان دەبەزێنێت. بەپێوەری سەدان هەزار پیاو، ئیسلام تەنیا رژێمێك نیەو بەس، بەڵکو رێبازێکە بۆ ژیان کە دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەكو شارستانییەتێك کە توانای بەرهەمهێنانی هێزێکی زەبەلاحی هەبووە. هەروەك چۆن دوێنێ دەتوانرا هەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی لەرێگای ترادیشنە تایبەتیەکانی خۆیەوە بخرۆشێنرێت.

دەربارەی نوسینە ئێرانیەکانی فۆکۆ زۆر شت وتراوە. بەڵام کەم کەس هەموو نوسینەکانی ئەوی لەمەڕ شۆڕشی ئێران خوێندۆتەوە، چونکە نوسینەکانی کاریرەر هەرگیز لەئیتالیەوە وەرنەگێڕدران. فۆکۆش حەزی نەکرد بیانکات بەکتێبێکی سەربەخۆ بەئیتالی. ئەو وەکو راپۆرتی رۆژنامەگەریی سەیری ئەونوسینانەی دەکرد، نەك وەك دەقی کتێبێك، ئەوەی ئەمڕۆ بیانخوێنێتەوە شتی ئەفسوناویو نائاسایی دەربارەی شۆڕشی ئێرانیەکان دەبینێت. لەدێدی ئەوەوە. ئەوە شۆڕشێك بوو بەدەر لەسیاسەت، یان هەر هیچ نەبێت بەدەر لەدراوەکانی سیاسەتی رۆژئاوایی، ئەوە جوڵانەوەیەك بوو جادووی لەهەموو چاودێرێك دەکرد. لەبۆنەی مردنی فۆکۆدا ژین دانیاڵ دەربارەی ئەو هەڵەیە قسەی کرد کە هەر هەموومان پێکەوە تێی کەوتین. هەتا ئەمڕۆش سیرجی جوڵای دەڵێت کە منیش هەروەك ئەو بیرم کردۆتەوەو نوسیومە. دواتر وتی: (هەر لەهەوادا ئەو نیشانانە دەبیستریێن لەسەر ئەو شتانەی کە روو دەدەن). ئەو سەرکوتکردنە عەجایەبەی کە پێشکەوتن دەگۆڕێت بۆ گەرماوی خوێن، کە ئەو کشانە بەوەجەی دژی شای وریا کردەوەو سۆزی خەڵکی ئێرانی جوڵان. هەموان ئاواتەخوازبوون کە شا جەنگەکە بدۆڕێنێتو ئێران بەجێ بهێڵێت. کەس پرسیاری نەدەکرد ئەی دوایی چی دەقەومێت. فۆکۆ بەڕوونیی دەیبینی کە وڵاتەکەی بەئاسانی ناگەڕێتەوە بۆ سەر فۆرمە ترادیشنەکانی سیاسەت، ئەو جۆشو خرۆشە دینیەش جارێکی تر ناکشێتەوەو، مەلاکان هەروا بەئاسانی ناچنەوە بۆ ناو مزگەوتەکانی خۆیان!

ئالەم گۆشەنیگا ساکارەوە، کە دینو سیاسەت پێك دەگەن، هێزێکی ناهاوسەنگ دەخولقێنن. فۆکۆ بەبێ هیچ گومانێك ئومێدە ناخۆشەکانی ئایندەی ناسیەوە. بەڵام لەکاری رۆژنامەگەرییدا لەتای ساتە مێژووییەکاندا زۆر خۆشە کە شت بدۆزێتەوەو تێڕوانینێکی سیاسی گەڵاڵە بکەیت. بەبڕوای تیری فۆلتیزێل فۆکۆ دەیویست رۆژنامەنوسێکی سادە بێت. کۆمەڵەی راپۆرتنوسەکان بۆ کوێ بچونایە، ئەویش دەچوو. بەڵام ئەو رۆژنامە نوسێکی ساکار نەبوو، چونکە ئەگەر وابوایە ئەوا ئەمڕۆ کەس گوێی نەدەدایە نوسینەکانی.

گەلێك کەس ئامادەبوون راستیەکان بخەنەوە بیری فۆکۆ. هەر ئەوەندەی روخساری هێزی تازە

دەرکەوت، هەر یەکسەر دوای گەڕانەوەی خومەینی لەفەبریوەری ١٩٧٩دا، گرتنو لەسێدارەدان وەکو جاران دەستی پێکردەوەو سەرکوتکردنو خوێنڕژان بەردەوام بوون. کلۆدیاو جاك برۆیەلی کۆنە ماویی کەوتنە لێپرسینەوەی فۆکۆ. کلۆدیا لەستونێکدا لە لێ ماتین وتی، فۆکۆ لەمەقالەیەکیدا پرسیارێك دەکات (خەونی ئێرانیەکان چییە؟) برۆیەلیش لەهەمان ستوندا نوسی (بیکردنەوەی فەیلەسوفان چۆنە؟) فۆکۆ بەرەقی وەڵامی دانەوە.

چەند هەفتەیەك دوای ئەو گۆڕانکارییانە، فۆکۆ نامەیەکی کراوەی بۆ مەهدی بازرگان بڵاوکردەوە، کەببوو بەسەر کۆماری ئەو کۆماری ئیسلامییە، باسی کۆبوونەوەکەی سێبتەمبەری ١٩٨٧ی کرد لەشاری قوم:

ئێمە قسەمان لەسەر ئەو رژێمانە کرد کە بەناوی مافی مرۆڤەوە ستەمیان کردووە. تۆ ئومێدت خواست و دڵنیا بوویت کە خەڵکی ئێران لەکۆماری ئیسلامیدا رژێمێك دروست دەکەن کە گرەنتی ئەو مافانە بدات. تۆ باسی سێ فاکتەرت کرد، یەکەم رەهەندی رۆحیی، وتت گەڕان بەناو ئەم خەڵکەدا بۆت دەردەخات کە هەریەکەیان دنیایەکی جیای دەوێتو بەهەموو شتێکەوە موغامەرە دەکات (زۆریەی ئەو هەموو شتە خودی خۆیان بوو نەکەمترو نەزیاتر). دووەم، شایستەی ئەوە بێت کە حکومەتی مەلاکان بەڕێوەی ببەن - خۆت وات کرد- من پێم وایە تۆ ئەو سەرکوتکردنەت بەکار هێنا. ئەوەی من لەتارانەوە بۆ عەبادان ببینم لەگەڵ قسەکانی تۆدا یەك ناگرنەوە. دواجار، تۆ وتت ئیسلام، تانەو رادەیەی لە مێژووی دوورو درێژی کۆنیو دینامیەتی ئێستایدا، توانای هەبووە بڕوانێتە ئەو مافانەو بیانپارێزێت، ئەو گرەوە سامناکەی کە دەڵێت سوسیالیزم لەوە باشتری نەکردووە (ئەمە کەمترین شتە بوترێت) لەچاو سەرمایەداییدا.

لە ١١ی مەی ١٩٧٩ دا فۆکۆ بۆ جارێکی تریش خۆی لەمەسەلەکە دایەوە، لەلاپەڕەی یەکەمی لۆمۆندا مەقالێکی درێژی نوسی: (هەڵچوون سوودی نیە) ئەوە تەقینەوەیەکی گەورە بوو لەلایەنی بریندارێکی خوێن لەبەر رۆیشتووەوە کە هەستێتە سەر پێو قسە بکات، بەشێوازێکی بێزهاتنەوەی کارامە وانەیەکی رەوشتی سیاسی بڵێتەوە. کۆتایی مەقالەکە دیاریی کردنی رۆڵی رۆشنبیرانە:

ئەو رۆژانە رۆشنبیران فشارێکی باشیان نەبوو، پێم وایە دەتوانم تارادەیەك بەکەفو کوڵەوە ئەم وشانە بەکار بهێنم. بۆیە ئەمە کاتی ئەوە نیە کە بڵێیت ئەوان رۆشنبیریان نەبوو.

خەڵك هەرچۆنێك بێت پێدەکەنن. من رۆشنبیرم. گەر یەکێك پرسیارم لێبکات دەربارەی ئەوەی کە خۆم پێم وابوو چیم دەکرد، وەڵامی دەدەمەوە: ئەگەر ستراتیژ پیاوێك بێتو بڵێت (مەرگێکی دیار چەند گرنگە، هاوارێکی دیار، راپەڕینێکی دیار، پەیوەندیی بو سیستەمە مەزنەوە هەبێت بۆ هەموان، هەروەها چی بۆ من گرنگە کە پرنسیپی شکۆداریی ئاواو - ئاوا لەو وەزعەدا کە خۆمان تێیدا ببینینەوە؟ ئەو کاتە بۆ من جیایە چ ستراتیژی سیاسی بێت، مێژووی بێت، شۆڕشگێڕ بێت، هەر کەسێك کە پشتیوانی شابێت یان هی ئایەتوڵڵا. رەوشتی تیۆریی من بەپێچەوانەوەیە، بریتیە لە (ئەنتی ستراتیژ): کاتێك کە تاکەکان رادەپەڕن، لەوکاتەدا نیشانەی رێزبێت، هەروەها کە هێزی کۆمەڵگا دەشێوێنێت ئەو کەللە رەق بێت. هەڵبژاردنێکی سادە، شتێکی گرانە بەجێ گەیاندنی، چونکە پێویستە لەگەڵ کاتدا بێت، لەکاتی گەڕاندا بۆ شتەکان، بەکاوەخۆ لەژێر توێژاڵی مێژوودا، کە دەیشێوێنیو گرفتاری دەکات، هەروەها لەژێر توێژاڵی سیاسەتەوە بۆ شتەکان بڕوانێت، ئەمەیە ئەو دیاریکردنەی بارودۆخ، کەدوای هەموو شتێك ئەرکی منە: من یەکەمین کەسو تەنها کەسیش نیم کەوام کردبێت، بەڵکو من ئەمەم هەڵبژاردووە.

دواتر فۆکۆ هەموو توانای خۆی خستەگەڕ بۆ پاراستنی ئەحمەد سەلامەتیان کە لەساڵی ١٩٧٩دا ببو بەجێگری وەزیری دەرەوە. دوای چەند مانگێك خۆشاردنەوە، دەبوو لە ساڵی ١٩٨١دا ئێران بەجێ بهێڵێت.

ماوەیەکی زۆریش دوای ئەوە فۆکۆ خۆی لەسیاسەتو رۆژنامەگەریی دورخستەوە. سێرجی جولای چەند مادەیەکی بۆ هێنا، بەڵام فۆکۆ هەموویانی رەت کردەوە. بەو بیانووەی کە خۆئامادەکردنی زۆری دەوێت.

* ناونیشانە ئینگلیزیەکە ئاوایە: Arevolotion of bare hands.

** ئەم ناونیشانە لاوەکییە لەلایەن وەرگێڕی کوردییەوە دانراوە.

سەرچاوە:

Michel Foucault
By:
Didaier Eribon – 1993
Pp 281 – 293.

# رەخنەو تۆژینەوە





**میتۆدو تۆژینگەکان**

**قسە بکەو بمرە**
**(سەبارەت ئەدەبی جەزائیری هاوچەرخ)**



**یۆلیسیس**

# میتۆدو تۆژینگەکان[1]

■ ئاکێبیدی ڤارگا

● و: ئەحمەد موفتی

مەبەستی تیۆریی ئەدەب بریتییە لە وەسفی دەقو مەعنای گشتیی‌دەق دەکەوێتە سەنتەری گرنگی دانی تیۆریی ئەدەبەوە. ئەو پرسیارەش کەخۆی دەسەپێنێ، برتی‌یە لە زانینی ئەوەی لەچ چوارچێوەیەکەوە دەبێ دەست بەم کارە (واتە وەسفی دەقو مەعنای گشتیی) بکرێتو دەبێ چ جۆرە میتۆدۆلۆجی (منهجیە) یەك بەکار بهێنرێت.

ئەو تۆژینگەیانەی گۆرەپانی ئەدەب لەنێو، خۆیاندا دابەش دەکەن زۆرنو، زۆر جار ئەستەمە سنوورەکانیان لەپاڵ یەکدا دابنرێن. لێرەدا تۆژینگە سەرەکی‌یەکان ناو دەبەینو هەوڵ دەدەین پەیوەندیی نێوانیان روون بکەینەوە:

زمانناسی Linguistics

لەسەرەتای ئەو سەردەمەی بە تێرامانی گشتی (generalisee) دەربارەی کێشە تیۆری‌یەکانی ئەدەب دەناسرا، واتە لە سالانی شەستەکاندا، ئەو تۆژینگەیەی کە دەبوو -وەکو دیارە- ببێتە جێگری مێژووی ئەدەبی ئاسایی، تۆژینگەی زمانناسی بوو. زمانناسی بە کردەوە - دەیان ساڵ پێش شەستەکان- سەرکەوت لەوەی لەزاڵ بوونی ئاراستەی مێژوویی -دایکرۆنی- رزگاری بێ، ئەوەش بە تایبەتی بەهۆی قوتابخانە بنیادگەرا جۆرەبەجۆرەکانەوە بوو- لە جنێڤ و پراگو کۆپنهاگنو ولایەتە یەکگرتووەکاندا-. زمانناسی فەرهەنگ یاخود دەزگای زاراوەکان - ی تایبەتی خۆیو کۆمەڵێك لەو ئامرازانەی وەدەست هێنا کە پاراکتیزە - تطبیق- کردنیان لەسەر دەقە ئەدەبی‌یەکان چەند ئەنجامێکی گرنگیان لێ کەوتەوە. لەساڵی ١٩٦٠دا جاکوبسن رایگەیاند: دەکرێ بە شیعربوون -الشیعریە- بە بەشێکی دانەبڕاوی زمانناسی دابنێین).. (جاکوبسن ١٩٦٣- ٢١٠).

جگە لەمەش، زمانناسی بووە نموونە (مۆدێل Model) ی تۆژینگە جۆراوجۆرەکانو بەم شێوەیە لەدوو رێگاوە بەشداریی لە لێکۆڵینەوەی تیۆریی ئەدەبدا کرد، یەکەم: لە رێگای راستەوخۆو لەرێگەی ئەتنۆلۆژی (رەگەزناسی) و ئەنترۆپۆلۆژی‌یەوە. لیڤی شتراوسو داندو گریماسو تۆدورۆڤ

لەزمانناسی بەهرەیان وەرگرت بۆ ئەوەی نموونەیەکی بنیادگەرای تایبەت دابمەزرێنن بۆ وەسفی بنەما تایبەتی‌یەکانی گێڕدراوە (محکی recit) ێکی دیاری کراو، چ ئەفسانە بێت یان حیکایەتی خورافیو، دووەم لەرێگای ناراستەوخۆوە: چونکە تیۆریی ئەدەب

بە لێکۆڵینەوەیەکی زمانناسیی زمانی ئەدەبی لەقەڵەم درا.

لەم ئاراستەیە بەرهەمێکی رەخنەگرانەی زۆر هاتنەکایەوە، کتێبو گۆڤاری تایبەتی (بۆنموونە لە فەرەنسادا بڕوانەك زمانەکان -١٢- ١٩٦٨) رەخنەی نوێ ١٩٦٩، زمانی فەرەنسی ٧- ١٩٧٠، کارە هەڵبژاردەکان یەك لەدوای یەك روونیان کردەوە کە دەکرێ لەسەر ئاستی زمانو بەهۆی زمانناسییەوە درك بە تایبەتمەندیی نەوعیی دەقی ئەدەبی بکرێ.باهێندێ بەرهەمی دەوڵەمەندو تایبەتی ئەم چالاکییە چڕوپڕە باس بکەین وەکو، فەرهەنگی ئینسیکلۆپیدیی زانستیەکانی زمان دیکرۆو تۆدۆرۆف ئامادەو بڵاویان کردەوە (١٩٧٢)و ئەو چوار بەرگەی ئیهوێ ( IHWE) نووسینی (١٩٧١-١٩٧٢).

زاراوەی بە شیعر بوون (الشعرية) زۆرتر وەکو هاوشانی تیۆریی ئەدەب بەکار دەهێنرێ، بەو شێوەیەی فرێزە بەناوبانگەکەی جاکۆبسن- کە پێشتر هێنامانەوە- ئاماژەی بۆ دەکات، بەڵام ئەم هاوشانییە هەرگیز تەواو نەبووە. سرووش -ایحاء- ە تایبەتییەکانی زاراوەی (شیعر بوون) زیاتر بۆ بەرژەوەندیی گۆڕانێکی وروورژێنەرو مەعنادار کاریان دەکرد: (بەشیعر بوون) ی زمانناسی (بە شیعربوون)ێکی سنوور بۆ دانراوەو، تارادەیەك تەنها بایەخ بە لێکۆڵینەوەی بەشێوەیەك کە مرۆڤ بپرسێ: ئایا دەکرێ ئەم تۆژینەوانە بەبێ سەختی لەشێوەی ئەدەبیی نالیریکی (غیر غنائی) بکۆڵێنەوە گریمانەی (بەشیعربوون) ی زمانناسی بریتییە لە بوونی (پێوەر) رێكو پێی وایە کە هەر شتێك بتوانرێ بەو پێوەرە جیابکرێتەوە بە تایبەتمەندییەکی نەوعیی زمانی شیعری دادەنرێ. واتە نموونەی بەهێزکردنی ئەو هەماهەنگی (انتظام-regularity) یەی بە زمانەوە بەستراوەتەوە- پێوەر (هاوشانی- هاوتەریبی)- ئەمە لەلایەکەوەو، لەلایەکی دیکەوە، ئەوەی بریتییە لەسەرپێچی کردنی ئەو هەماهەنگییە ئاساییانەی کە پێوەرکە دایدەمەزراندن (جووڵان). هەموو ئەم چەمکە پێشنیار کراوانە بە ئاسانی لە میراتی زمانناسیی بنیادگەریدا تۆمار دەکران، بەڵام نزیکیی زمانناسی لە ئەدەبەوە، وەکو دەردەکەوێ، چەند کێشەیەکی دەخستەڕوو

لەوکاتەدا کە رێسا بەرهەمهێنەر -تولیدی-یەکان لە کۆتایی شەستەکاندا، بەشێوەیەکی کوتوپڕ لە چوارچێوەیەکی بەریندا، تارادەیەك، شوێنی بنیادگەریی دەگرتەوە. لە سەرەتادا نوێنەرە یەکجار بەرجەستەکانی ئەم ئاراستەیە، ئەوانەی بەکێشە رێزمانییەکان خەریك بوون- واتە بەمۆرکی دروستی رستەو جوانیی پێکهاتنی- خۆیان دوورخستەوە لە بایەخ دان بەو کێشانەی لە (بە شیعربوون) ەوە نزیکن، ئەو کێشەیانەی- لەروانگەی زمانناسیی وردەوە -تایبەتن بە لایەنە نائاساییو لاوەکییەکان (بە بەراورد کردن لەگەڵ نەریتی باوو بەکارهێنانی زمانەوانیی باو): لەگەڵ ئەوەشدا دلگیریی زمانناسیی نوێ (بەرهەمهێنەر) هێندە گەورە بوو کە راستەوخۆ دەست بە چەند کۆششێك کرا -بە تایبەتی لە ئەڵمانیاو ولایەتە یەکگرتووەکان- بۆ سەپاندنی بەرپاکردنی لێکۆڵینەوەی زمانی شیعری لەسەر بناغەی زمانناسی بەرهەمهێنەری گوێزەرەوە (الالسنة التوليدية التحويلية) . (لەم رووەوە، لەزمانی فەرەنسیدا بڕوانە دانراوی دیلاوتو: بەهاچییە؟ ١٩٧٨).

سەرەڕای ئەوگرنگی دانەی کە (بە شیعر بوون- الشعريه) ی زمانناسی لە وروورژاندنیدا سەرکەوت، بەڵام هەر زوو رووبەڕووی چەندین رەخنە بووەوە، نەك تەنها لەبەر ئەوەی پێی دادەگرت لەسەر ئەوەی بواری تۆژینەوە لە تیۆریی ئەدەبدا، وەکو بینیمان، تەنها ئەو دەقانە بگرێتەوە کە بە (شیعر)ی ناودەبران، بەڵکو دەتوانرێ رەخنەی دیکەشی ئاراستە بکرێ: بۆ نموونە، چەمکەکانی (پێوەر- المعيار) و (جووڵان، لاچوون- الانزياح) ئاستەمە دەرك بە مەعنایان بکرێ، چونکە زۆربەی ئەو پێناسە باوانەی پێشنیار کراون مەبەستەکە ناگەیەنن. جگە لەمەش، دەکرا گومانی جیددی دروست ببێ دەربارەی ئەو پرسیارەی کە بەستراوەتەوە بە زانینی ئەوەی ئایا هەر (جولان، لاچوون) ێکی زمانناسی ئوسلوبی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیو دەقاودەق (جولان- لاچوون) ێکی ئەدەبییە. لە کۆتاییشدا دەبێ ئەوە بڵێین کە جاکۆبسن، لەو وتارەی تێیدا داوا دەکات ((بە شیعر بوون) بە بەشێکی دانەبڕاوی زمانناسی دابنرێ، هێندێ مەرجی پابەندکردوو (مقيد) دەسەپێنێ، بە تایبەتی لەو رووەوە کە پەیوەندیی بە سیمانتێکس (علم الدلالە Semantique) ەوە هەیە، لە راستیدا ناتوانرێ (بەشیعر بوون) ی زمانناسی بە تیۆرییەکی خاوەن توانای دیاری کراوی ئەوتۆ دابنێ کە تەنها بە نیوەچڵی بابەتەکەی خۆی باس دەکا.

## تیۆریی پەیوەست بوون[٢] (التواصل)

ئەوەی دەلالەتێکی گەورەی هەیە ئەوەیە کە نموونـە (مۆدێـل) ی جاکۆبسـنیی ئـەو شـەش هۆکارەی لـە پرۆسـەی پەیوەست بووندا جیـیان کراوەتـەوە (جاکۆبسن ١٩٦٣،٢١٤) وا مامەڵـەیان لەگەڵدا کراوە کە مۆدێلێکی زمانناسین، کـەچی ئەمڕۆ، لەیەکەمین پلـەدا، بـەمۆدێلێکی پەیوەست بـوون دادەنرێـنو، بەسـەرەتاگەی گونجـاوی خسـتنەرووی بنـەماکانی پرۆسـەی نـاوبراویش دادەنرێن. پێویستیش نی‌یـە بگوتـرێ کـە ئـەو پرۆسـەیە تەنها بریتی نی‌یە لەقسەکردن، لەبـەر ئـەوەی زمانناسـی پـترو، هـەنگاو بـە هـەنگاو، بەیـەکێك لـە شێوە شیاوەکانی پەیوەست بـوون دانراوە (بڕوانە: جاکۆبسن ١٩٦٣، ٨٧-٩٩).

بەشێوەیەکی گشتی تیۆریی پەیوەست بوون جۆرە تایبەتمەندی‌یەك دەبەخشێتە لێکۆڵینـەوەی ئـەو چالاکیو کێشـەیانەی مەبەستیان گـەیاندنی پـەیامێکی دیاری کـراو یـان زانیاری‌یەکـە. ئـەو تیۆری‌یە بۆ ئەم مەبەستە چەند میتۆدێکی هێنایـە کایەوە بۆ پێوانی بڕی راگەیـەندراوی گواسـتراو (یان زانیاریی گواستراو). لەگەڵ ئەوەشـدا، بـەهای راگەیاندن بە نیسبەت ئەو پەیامانـەوە کە یـەکجار ئاڵۆزی‌یان کەمە پەیوەندیی هاوڕێژەیی پێچەوانەی لەگەڵ بڕ (کمیـە) ی راگـەیاندندا هەیـە. ئـەمبرتۆ ئیکۆ دەنووسێ: (ئـەو سیسـتمەی کـە توانـای تێگەیشتنی هەر پـەیامێك رێك دەخات، لەهـەمان کاتدا ئەو مۆرکەشی دیـاری دەکات کە دەتوانرێ بخـەملێنرێ، یـان بـە شێوەیەکی دیکـە، سـواوی (ابتـذال) دیـاری دەکـات (...). لـە ئاسـتی ئەنجامگیری‌یەکی تارادەیەکی گـەورە ناتـەواودا، پێ دەچـێ کە مەحاڵە ئـەو هاوشانی (تکافؤ) ە پەسەند بکرێ، کە لە سەردەمی ڤینـەر (Wiener) ەوە بەکۆی دەنـگ، لـەنێوان دەلالـەتی پـەیامێکی دیاری کراو ئەو راگـەیاندن (زانیـاری) یـەدا رەچاو کراوە کە لەناخی پەیامەکەدایە، بەم شێوەیە تـێ دەگـەین بۆچـی گریمـاسو کورتـی رەخنـەیان ئاراسـتەی تیۆریی پەیوەسـت بـوونو تیۆریـی راگەیاندن (Information) دەکـەن بـەوەی کە بـە نیسبەت چالاکی‌یـەکانی پەیوەست بوونەوە، پـتر لەرادەی پێویست، میکـانیکین (لاپـەڕەکانی (٤٥-٤٦، ١٨٨، ١٨٩).

لەبەر ئەوەی تیۆریی پەیوەست بوون، تا ئێستاش، تۆژینگەیەکە پتر مۆرکی تەکنیکیی بەسەرەوە زاڵـە، زۆر بەکەمی لە لێکۆڵینەوەی دەقدا دەتوانین بەشێوەیەکی جیددی سوودی لێ وەربگرین، لەگـەڵ ئەوەشدا هێندێ لەتێڕامانـەکان (التأملات) شایانی ئـەوەن لـە روانگـەی تیۆریی ئەدەبەوە لێیان بکۆڵرێتەوە. بەم شێوەیە مرۆڤ دەتوانی بپرسی کە ئـەو سـێ بـەردەر (عتبـە) یـەی (مۆلـسMoles) ی رەنگرێژیـی کـردن (١٩٥٨- ١٩)



"هەست تەوەرێکی کەمی لەنێوان بەردەری هەستیاری‌و بـەردەری تێرکردن (الاشباع) لـە رێگـای زنجیرەیـەك لەبـەردەرە جیاکـار (differentielles) ەکانـەوە وەدی دینێ"، دەڵێین مرۆڤ دەتوانێ بپرسێ ئایا دەکـرێ ئـەم یاسایە لەسەر (درك کردن بـە دەق) دا جێبەجێ بکرێ، یـان ئایا بـە (توانـای) دەقگـەری (النصیە) و ئـەدەبیی ئێمـەوە بەسـتراوەتەوە؟ نموونەیـەکی دیکـە: پـەیامێك

هیچی تێدا نییە جگە لەوەی تایبەتە بە راگەیاندن، بۆ پاراستنی پەیامێکی لەو ئیحتیمالەی بزربوون کە پیاوانی میدیا (راگەیاندن) ناوی شێواندن (تشوش) ی لێ دەنێن، نێرەر راگەیاندن (زانیاری) یەکەی بە چەند دووبارە بوونەوە (تکرارات) دەپێچێتەوە کە چەندین ئەگەر (احتمال) ی یەکجار دیاری کراوی هەیە "ئیکۆ١٩٦٥، ل٧٧). ئەمە دووبارە بوونەوەی ناوی درێژدادڕی (یاخود پڕکردنەوە Redondance) ی هەڵگرت) لە روانگەی ئابووریی عەقڵانییەوە دەست بڵاوی (اسراف)ە لە بەکارهێنانی هێما (علامە) کاندا" (بڕوانە: مۆلس- زیتلمان ١٩٧١: ل٥٠٢)، بەڵام لەرووی کار تێ کردنی بەلاغییەوە پێویستە، پێویستیشمان بە هیچ نییە جگە لە گۆڕینی زاراوەی درێژدادڕی -الاسهاب- بە زاراوەی گێڕانەوە (الاعادە- Repetition) بۆ ئەوەی ئەو سوودە ببینین کە ئەم چەمکە هەیەتی، ئەم چەمکە لە زمانناسیو تیۆریی پەیوەست بوونەوە، لە بواری تیۆریی ئەدەبدا، وەرگیراوە.

چالاکیی پەیوەستکار (تواصلی) روونادات ئەگەر پەیامەکە شێوەیەکی باوو ئاساییو ناسراوو پەسەندکراو لەلایەن نێرەر بۆ نێردراوەوە بەخۆوە نەگرێ و، دەبێ پەیامەکە کۆمەڵە هێمایەکی دیاری کراو بەکاربێنێو، دەبێ ئەم هێمایانە بە پێی کۆمەڵە ڕێسایەکی دیاری کراو ڕێک بخرێن. لەحاڵەتی نامەی دەماو دەم (شفوی) دا هێماکان بریتین لەو دەنگانەی کە شێوەی پەسەندکراویان لە زمانی سروشتیدا، لەلایەن فۆنۆلۆژی- Phonology) و شێوەی دەرکردنی دەنگی وشەکانەوە لەم زمانەدا دیاری دەکرێو سینتاکس (نحو) ئەو بوارەیە کە ئەو ڕێسایانە دەگرێتەخۆ کە ڕێگا دەدەن بە ڕێکخستنی دەنگەکان بەشێوەیەکی راستو دروست (کۆمەڵە دەنگەکانیش). سیمیا (کە لێکۆڵینەوەی شێوە ئامێز (شکلی) ی سیستەمە دەلالییەکانە، بەوە ناوەستێ کە لە هێماکانو پەیوەندییەکانی نێوانیان بکۆڵێتەوە، بەڵکو -ئەگەر پەیڕەوی لەو جیاکارییە بەناوبانگە بکەین کە مۆریس پێشنیاری کرد- لە پەیوەندیی نێوان هیماکانو دەلالەتیشیانو پەیوەندیی نێوان هێماکانو ئەوانەی بەکاریان دێنن (پراگماتیکس Pragmatique) دەکۆڵێتەوە.

**سیمیا، ژیربێژی (بلاغە)، هێرمنیۆتیکس**

نەخشەی کلاسیکیی پەیوەست بوون سێ ئایتم (عنصر) بەخۆوەدەگرێ: نێرەر، پەیام (نامە) و وەرگر (وەرگری نامە) کە بواریان رەخساند بۆ سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی سێ تۆژینگەی سەرەکیی زانستە مرۆڤایەتییەکان: ژیربێژی (بلاغە) و سیمیا (سیمیوتیك Semiotics). هەروەها ئەم نەخشەیە دەرگای لەبەردەم پێشکەوتنو سەر لەنوێ کەوتنەگەڕی ئەو سێ توێژینگەیە کردەوە.

نێرەر نامە (پەیام) ێك بەرهەم دەهێنێ. ئەم بەرهەمە بەپێی یاساکانی ژیربێژی دروست دەبێو، نامەکە وا دەخرێتەروو کە کیانێکی گشتیی خاوەن چەند بنیادێکەو، لەناخدا ئەو یاسا تایبەتییانەی خۆی هەڵگرتووە کە لەگەڵ یاساکانی سیمیۆتیك (تیۆری هێماکان) دا دەگونجێو، لە کۆتاییشدا دەبێ وەرگری نامەکە (کە بەرهەم هێنراوەو چەند بنیادێکی هەیە) لێکی دەداتەوە: ئەمەش کاری هێرمنیۆتیکس (زانستی لێکدانەوە Hermeneotics)یە.

بە دڵنیاییەوە رەگەکانی ئەم تۆژینگەیانە گەلێك هەمەجۆرو جیاوازن: رەگی ژیربێژی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتا یەکجار کۆنەکانی قسەی تۆکمە (واتە وتار) واتە زانستێکی عەمەلیی وتار کە تەرخان کراوە بۆ فێرکردنی خاوەن مورافەعەکان (پارێزەران)، (ئەمە ئاماژەیە بۆ هونەری وتاری ئەرستۆ، کە یەکێك لە جۆرەکانی بریتییە لە وتاری دادوەرانەو راوێژکارانە)، بەڵام سیمیۆتێکس لە کۆتایی خاچە کۆنەکاندا (مەبەستی خاچە یۆنانیو لاتینییەکانە-ی) لە ئەنجامی چەند تێڕامانێکی مەنتیقیو سینتاکسییەوە. زانستی لێکدانەوە (هێرمنیۆتێکس) ی سەدەکانی ناوەڕاستو رۆمانسییەت کەمتر پەیوەندیی خۆی بەلاهووتو زانستی زمان رەت کردۆتەوە. سەرەڕای ئەمەش، بەڕێوەبردنی کاری قەناعەت پێ هێنان تەنها پاوان نەکراوە بۆ پارێزەران (المحامین) و تەنها بریتی نییە لە (زانستی گوتن). بۆ نمونە، ژیربێژی- یەك هەیە تایبەتە بەوێنەی وەبەرچاو هێنراو (Image). پاشانیش، زانستی لێکدانەوە تەنها لەسەر دەقە (پیرۆز) ەکان کار ناکات، واتە ئەودەقانەی کە بە (دژوار -قورس) ناسراون. ژیربێژیو لێکدانەوە بەشێوەیەکی دیاری کراو، هەمان ئەو رواڵەتانەیان هەیە کە سیمیۆتیك هەیەتی، رەنگە بە

هەمان ئەو ئاستە مامەڵەیان لەگەڵدا بکری لەگەڵ سیمیۆتیك (تیۆریی هێماکان) دا دەکرێ. لەبەر ئەوەی تاقە جیاوازی لە جیاوازیی گۆشەی روانین (المنظور) دایە: ئەو بۆچوونە چییە کە لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا دەبێ زاڵ بێت، ئایا بۆچوونی نێرەرە، یان هی نامەکە، یان هی وەرگر؟

سەرەرای ئەمەش، تا رادەیەك هەمیشە بەشێوەیەکی یەکجار جیاواز لەم سێ تۆژینگەیە کۆڵراوەتەوە. زۆربەی جار سیمیۆتیکس، لەکاتی دارشتنی هێندێك لە پێشنیارەکانی (پێرس Peirce) دا، بە جۆرە زیادەرۆییەکو، رەنگە بەپێ داگرتنێکی زیاد لە رادەی پێویستیشەوە، لەگەڵ هەلومەرجی چەند شێوازێکی وردی پۆلێن (تصنیف) دا گونجاوەو، بە نیسبەت (پێرس) ەوە پێی باش بووە ئەو شێوازانە ببنە شێوازگەلێکی تەزامونیی یەکجار کاریگەر. (ژێربێژی) ش پتر، بەشێوەیەکی هاوشانی ئەوتۆ کە مایەی بایەخ پێ دانە، بریتییە لە تەنها جەردکردنی جۆرەکانی شێوازی نووسین (الاسلوب) و، مەسەلەی دروست کردنی پەیوەندی لەنێوان بەڵگەهێنانەوە (المحاجه Argumentation) و شێوەکانی وتار کە بەڵگەهێنانەوە بەکاریان دەهێنێ. بەڵام هێرمنیۆتیکس (زانستی لێکدانەوە) بە گشتی لە مەیلێکی دەروونی فەلسەفیداخۆی دەبینێتەوە لە بری ئەوەی ئەو شێوازانەی بخاتە روو کە ئامرازە بەکارهێنراوەکانی کردەوەی لێکدانەوە دیاری دەکەن.

رەنگە زاراوەی سیمیۆتیکس بەدوو مەعنا بەکاربهێنرێت، یەکەم، بەمەعنایەکی تەسك: زاراوەی سیمیۆتیکس ئەوتۆژینگەیە دەگەیەنێ کە تەنها شێوەی نامە (پەیام) لەچوارچێوەی مۆدێلێکی پەیوەست بوندا وەسف دەکاتو، لەم حاڵەتەدا بریتییە لە جۆرێك لە جۆرەکانی (رێزمانی هێماکان- grammaire des signes)و، مەعنای دووەم بەرینتر: زاراواکە ئەو تۆژینگەیە دەگەیەنێ سەرجەمی ئەو سێ هۆکارە بەخۆوە دەگرێ کە لە رەوشی پەیوەست بوون (التواصل) دان، بەم شێوەیە سیمیۆتیکس لێرەدا تەنها زانستێکی هێماکانی نییە، بەڵکو زانستێکی گشتی سیستم (نسق) ە خاوەن دەلالەتەکانەو، لێرەشەوە ژێربێژیو زانستی لێکدانەوە تەنها بەچەند ناوێکی تایبەتیی چەند بەشێکی ئەم زانستە گشتییە دادەنرێن.

نزیکی (المقاربە) ی سیمیۆتیکس بەڵگەی لەرەگەوە وەرچەرخاندنی زانستە مرۆڤایەتییەکانە، چونکە وەکو پێ دەچێ رێگا دەدات، لەرووی رواڵەتەوە، لەو شتە بکۆڵرێتەوە کە تائێستا تەنها دەتوانرا وەسفی بکرێ. زانستە کۆمەڵایەتییەکان (ئەنترۆپۆلۆژیو کۆمەڵناسی) تەنها لەرێگای لایەنەکانی ناوەرۆکەوە، ئەو روون دەکەنەوە کە لێکۆڵینەوەی ناوەرۆك دەبێتە مایەی جیاکردنەوە بەتاك هێشتنەوە (تفرید Individualise)، کەچی لێکۆڵینەوەی خودی دیاردەکە، لە رێگای شێوەوە، رێگا دەدات کە ئەو ئایتم (عنصر) انەی بەرواڵەت جیاوازن کۆبکرێنەوە، بۆیە لێکۆڵینەوەی شەکلی مۆرکی بەگشتی کردن (تعمیم) ی هەیە نەك بەتاك هێشتنەوە، فۆلکلۆر، پێش پەنجا ساڵ، بارمەتیی دەدابن بۆ ئەوەی بگەرێینەوە بۆلای (گیان) ی تایبەتیی نەتەوەیەك، کەچی لێکۆڵینەوەیەکی سیمیۆتیکی بۆ جلو بەرگو نەریتو بیروباوەر، بەوردی رێگا دەدات کە رەوشتەکان بەراورد بکرێنو لە خاسیەتە خودی (ذاتی) یە نەتەوایەتییەکان دەگوزەرێت. مۆرکی شۆرشزا (تپویری) ی ئەم وەرچەرخانە رەنگە بۆ ئەو کەسانە دەرنەکەون کە لە هونەرەکانی زمان بەولاوە لە هیچی دیکە ناکۆڵنەوە، لەبەر ئەوەی زمان، لەنێو سەرجەمی سیستمی هێماکاندا- چونکە ئاڵۆزترین سیستمی سیمیۆتیکە- لەسەردەمیکی زۆر زووەوە لە روانگەی شێوەوە لیی کۆڵراوەتەوە، چونکە لە چەندین سەدەوە رێزمانێکی زمانمان هەیە، کەچی (رێزمان- نحو) ی بیروباوەرو مۆدێلی جلوبەرگمان نییە.

با ئێستا هەوڵ بدەین دەسەندە (حصە)ی ژێربێژیو هێرمنیۆتیکس (زانستی لێکدانەوە) لەناو سیمیۆتیکسێکی گشتیدا دیاری بکەین. لەم رووەوە ئاسانە سەرنجی ئەوە بدەین کە شێوە ناهاوتاییەك لە ئارادایە. هێشتا کراوەیی (انفتاح) ی سیمیۆتیکس لەبەردەم هێرمنیۆتیکس گەورەترە لە کرانەوەی لەبەردەم سیستمە دەلالییەکاندا. بوونی زاراوەی - لێکراوە- Interpretant- لای پێرسو مۆریس دەلالەتی خۆی لەم بوارەدا هەیە. رەنگە مرۆڤ بییەوێ بپرسی کە ئایا ناکرێ دەستگیرۆیی (اقتصاد) لەژێربێژی (بلاغە) بکەین، چونکە ژێربێژی لەگەڵ هێرمنیۆتیکسدا دەگونجێ؟ ئایا ناتوانری بگوترێ کە ئەوەی لێکدەداتەوە رەوشەکە بە مەعنای پێچەوانە دووبارە

دەکاتەوە لەو ڕێگایەدا کە نێرەر (المرسل) بڕیویەتی؟ ئایا وەرگری نامە (پەیام) ئاوێنەی ڕەنگدەرەوەی نێرەر نییە؟ ئایا زێربێژییەکی ئاوەژوو کراو (معکوس) بەم شێوەیە هاوشانی (هێرمنیۆتیکس) ە؟ ڕەنگە بتوانری هاوشانییەك بەگریمان دابنری لەو حاڵەتانەی لێکدانەوەی دەتوانی تەنها دۆزینەوەی مەبەستەکانی نێرەری نامە بکاتە ئەرکی خۆی. زانینی مەبەستەکانی نێرەرو تێگەیشتنی مەعنای نامەکە لەهەمان کاتدا ئەو مۆدێلەیە کە ئاسانی درکی پێ بکری لەو کاتەدا کە مەسەلەکە پەیوەندیی بە هێماکانی ڕێگاویان هەبێ، بەڵام ئەم مۆدێلە دەبێتە مۆدێلێکی کیشەزا (اشکالی) لە حاڵەتی نامە ئێستاتیکییەکاندا. مرۆڤ ئاگادارە لەوەی کە چەند لەنێرەرانی ئەم جۆرە نامەیە ڕقو کینە دژیان وروژێنرا لەو کاتانەدا کە هێندێ پەروەردەکاری -پیاوچاك- ویستیان مەبەستی نووسەر دیاری بکەن، لە ئەنجامەیشدا، ئەگەر هێندێك لە جۆرەکانی نامە هیچ مەعنایەکی دیکەیان نییە جگە لەو مەعنایەی کەنێرەر پێیان دەبەخشێ. چ نێرەر تاك بێت یان دامەزراو یان کۆمەڵ-، ئەوا ئەو پرسیارەی سەبارەت بە جۆرەکانی دیکەی نامە دەخرێتە ڕوو بۆ زانینی ئەوەیە ئایا کارایی هێرمنیۆتیکی -لێکدانەوەیی- بەناچاری لەسەر بناغەی لێکدانەوەی مەبەستە دان پێدانراوەکانی نێرەرو، بەشێوەیەکی سیستمزا -نسقی- بنیات نراوە؟

لەگەڵ ئەوەشدا مەبدەئی (زێربێژیی پێچەوانە) هەر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە کە دروستە، چونکە وەرگری نامە بە بێهوودەیی مەبەستەکانی نێرەری ڕەت کردەوە یان پشت گوێی خستنو، ناچارنییە نامەیەك هەڵبژێری کە قەناعەتی پێ بهێنێ، ئەگەر بییەوێ لەم نامەیە تێ بگات یان مەعنایەکی پێ ببەخشێ. ئەوەی ئەرکە (لێکدانەوە) بەجێ دەگەیەنێ، لە هێندێ حاڵەتدا ڕێچکەی مەبەستە دیاردەکانی نێرەر دەگرێتە بەر، لەهێندێ حاڵەتیشدا سەربەستانەو، بەبێ دەست تێ وەردان نێرەر، ئەوە هەڵدەبژێری کە قەناعەتی پێ بکا.

کۆششی هێرمنیۆتیکی لەو کاتەدا کەمەسەلەکە پەیوەندی بە وەسفی چالاکیی لێکدەرەوە (تأویلی) ی نامە بۆ نێردراوەوە هەبێ؛ لەگەڵ کۆششیی زێربێژیی ئاوەژوو کراو (معکوس) دا دەگونجێ، بەڵام هەردوو توێژینگەکە لەوکاتەدا کە بایەخ بدەینە بابەتی لێکدراوە (المؤول) لەیەك جیادەبنەوە. دەتوانین بۆ هەر یەکێك لەو دوو تۆژینگەیە ئەرکێکی تایبەتی بدەینە پاڵیەوە: هێرمنیۆتیکس لە پرۆسەکانی لێکدانەوە دەکۆڵێتەوە، کەچی زێربێژی لە پەیوەندییەکانی ئەم لێکدانەوەیە بە بابەتەکانیەوە دەکۆڵێتەوە.

هێرمنیۆتیکس (زانستی لێکدانەوە) دوو ئەرکی هەیە:

أ- دەبێ لە ئەنجامی بەرجەستەکراو (Coneret) ی چالاکیی لێکدەرەوە، بکۆڵێتەوە- واتە ئەو شێوەیەی کە لێکدانەوە بەخۆوەی دەگرێ- و پێ دەچێ ئەم شێوەیە پەیوەندییەکی پتەوی بە هێندێ لە خاسیەتەکانی بابەتی لێکدراوەوە هەبێ. ئەگەر بابەتی لێکدراوە مۆرکی بەلگەهێنانەوە (برهانی argumenatif) ی هەبێ، وەکو داکۆکی پارێزەری -المدافعە- و تەصمیمی ڕاگەیاندن)، ئەوا هێرمنیۆتیکس لەسەر بناغەی یەکجار کورت کردنەوەی پەیامەکەیدا بنیات دەنرێ. کاتێکیش کەمەسەلەکە پەیوەندیی بە تابلۆیەکەوە هەبێ ئەوا وەرگر (المتلقی) بەو لایەدا دەشکێنێتەوە کە لێکدانەوەکەی بەشێوەیەکی گێڕانەوە ئامێز (سردی) پەردەپۆش بکاتو، تابلۆکە دەبێتە وێنەیەکی ڕوونکەرەوەی چرکەیەکی دیاری کراو لەناو زنجیرە زەمەنییەکەی ئەم گێڕانەوە (السرد) ە دامێنراوە. ئەگەر ئەم گێڕانەوە (حیکایەت recit) لەگەڵ ئەزموونە ڕۆژانەماندا بگونجێ، ئەوا لەوانەیە چالاکیی لێکدەرەوە لێرەدا بوەستی، دەنا دەست پێ دەکاتەوە بۆ ئەوەی لەم گێڕاو (محکی) یە ناوەڕۆك (مغزی) یەك هەڵێنجێت کە دەبێ لەوکاتەدا مۆرکی هەماهەنگی لەگەڵ ئەزموونی پەیام بۆ نێردراو، کە لەناو حیکایەتەکەدا نەبووە، بخاتەڕوو.

ب- لەبەر ئەوەی ژمارەی لێکدانەوەکان تا ڕادەیەك لەبن نەهاتووەو، زۆربەی جار مۆرکی هاودژی (تناقص) یان بەخۆوە گرتووە، دەبێ زانستی لێکدانەوە، بۆ ڕێکخستنی لێکدانەوەکان، هەوڵ بدات سیستمێکی پۆلێن کردن دابمەزرێنێو، بەوەش دەتوانێ چەند مەبدەئێك ڕەچاوبکات:

١- لەکاتی لێچواندنی لێکدانەوەکانی شێوەی گێڕانەوە بەو لێکدانەوانەی کە شێوەی بەلگەهێنانەوە (تدلیلی) یان هەیە، ئەوا کێشەی توانای گۆڕینی

بنیادگەری (Stratturale) ی ئەم دوو شێوەیە دەخاتەروو.

٢- لەکاتی دانانی ئەم لێکدانەوانە لە چەند ئاستێکی جۆربەجۆری تەجریددا ئەوا رێگا دەدات کە لێکدانەوە دژ بە یەکەکان لێك نزیك دەکەنەوە.

٣- لەکاتی جیاکردنەوەی چەند سەرچاوەیەکی شیاوی ئەم لێکدانەوانەدا، رێگای دەدا بە ناوبژی کردن لەنێوان ئەو لێکدانەوانەی بە رواڵەت هاودژن.

ئێمە ئاگامان لەو لێکدانەوە لە ژماردن نەهاتووانە هەیە رەخنەگرانو لێکۆڵەرەوەکان دەربارەی حیکایەتی (کڵاوە بچووکە سوورەکە) دەریان بڕی، تارادەیەك ئاسانە ئەو لێکدانەوانە بەپێی دووەمینو سێیەمین مەبدەئی ناوبراو رێکبخرێن. ئەو لێکدانەوەیەی ئەم حیکایەتە تەعبیری لێ دەکات بریتی‌یە لە پاراستنی لاوان دژی مەترسی‌یەکانی ژیانو لەئاستێکی ئەوتۆی تەجریددایە بەرزترە لەوەی پێی وایە کە مەسەلەکە لێرەدا پەیوەندیی بە پاراستنی چەند کیژێکی لاوەوە هەیە لە کۆششی هەڵخەڵەتێنەری لاوان. لەبەرانبەردا ئەگەر لەگەڵ هێندێ شیکەرەوەی دەروونناسی‌دا قایل ببین بەوەی کە ئەو حیکایەتە نوێنەری خەونی کیژە سەبارەت بە جڵەوگرتنی دەروونی (angoisse) بەرانبەر بە سێکس، ئەوا ئەوەی لێرەدا دەگۆڕێ سەرچاوەکەیە نەك ئاستی تەجرید. مرۆڤ دەتوانێ بەو شێوەیە بڕوانێتە ئەو دوو مەبدەئە کە دوو تەوەرن لێکدانەوەکان لە دەوروبەریاندا رێك دەخرێنو، بۆ ئەوەی نموونەیەکی ئاسایی سیمیۆتیك بهێنینەوە، کە هەور دەبینمو وای لێك دەدەمەوە کە هێمای بارانە، یان هێمای مەترسی یاخود بووژاندنەوەیەکی چاوەڕوان کراوە، ئەوا لێکدانەوەکانم لە چەند شوێنێکی جیاوازی دوو تەوەری باس کراودا تۆمار دەکەم.

هێرمینیۆتیکس لەشێوەی لێکدانەوەکان دەکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی پێکەوە رێکیان بخات، بەڵام ژێربێژی ئەوە دەگەیەنێ کە بۆ بابەتە لێکدراوەکان دەگەڕێنەوە، دەتوانرێ وا پێناسەی ژێربێژی بکرێ کە پرۆسەیەکە رێگا دەدات کە (راستی) ی لێکدانەوەکان تاقی بکرێتەوە لەو کاتەدا کەهەوڵ دەدات هەر لێکدانەوەیەکی پێشنیار کراو بەو بەشانەی بابەتی لێکدراوەوە گرێ دەدات کە پاڵپشتیی ئەم لێکدانەوەیە دەکەن. لە حیکایەتی (کڵاوە بچووکە سوورەکە) دا رەنگە مەسەلەکە پەیوەندی هەبێ بە دڵنیابوون لەوەی ئایا ئایتمەکانی دەق لێکدانەوەی هەڵبژێردراو دووپات دەکەنەوە -واتە ئەم ئایتمانە دەتوانن ببنە بەڵگە بۆ بەرژەوەندی ئەم لێکدانەوەیەو، ژمارەی ئەو ئایتمانەی یەکلاکراونەتەوە، پتر نەك تەنها بەپێی رادەی وردیی ئەو لێکدانەوانە جیادەکرێنەوە- ئەمەش ئەو مەسەلەیەیە کە دەبێ لەمەبدەئی‌یەوە رێگا بەدوورخستنەوەی هێندێکیان بدات، بەڵکو بەپێی ئاستی تەجرید کردنیش. بەڵام بە نیسبەت بەها (القیمە) شەوە، ئەوا شێوەو رەنگ لێرەشدا دەلالەتێکی ژێربێژیی ئەوتۆیان هەیە کە دەکرێ پێیان بکۆڵرێتەوە.

**دانراوە ناوبراوەکان:**


- نووسەر لە لێوەرگرتن (اقتباس) ەکانیدا سوودی لە شێوازی تازە وەرگرتووە کە تەنها لەسەر بناغەی (ناوی دانەرو ساڵی چاپو ژمارەی لاپەڕە) دامەزراوە، ئەویش بۆ قورس نەکردنەوەی دەق بە دووبارە بوونەوەی ناوی سەرچاوەکانو دانەرانیان. ئەم شێوازەی ئێستا لە تۆژینەوە ئەکادیمی‌یە رۆژئاوایی‌یەکاندا دەگێڕرێتە بەر، پەراوێز بۆ کتێبەکان دانانێ، بەڵکو ناوی کتێبەکە لە نێو دەقدا تۆمار دەکرێو، پەراوێز بۆ سەرنجەکان تەرخان دەکرێ، پاشان لیستێك بەو دانراو (مؤلف) انەی سوودیان لێ وەرگیراوە لە کۆتایی تۆژینەوەکەدا دادەنرێ. ناوی ئەو کتێبانەی کە بە فەرەنسیو ئینگلیزی دانراونو سوودیان لێ وەرگیراوە، وەرمان گێڕایە سەر زمانی کوردی، بەڵام لەبەر ئەوەی زمانی ئەڵمانیمان نەزانی ناوی نووسراوە ئەڵمانی‌یەکانمان وەرنەگێڕا.
- پینتیل، ئیڤانو پێسترینا گۆنتەر: ١٩٧٩، سیمیا (شتوتگارت کۆملهامەر)
- شیری کۆڵن، ١٩٧٥: لەبارەی پەیوەست بوونی مرۆڤەوە (کامبردرج، لەندەن (M.. I. T. Press)
- کونن، چ: ١٩٧٧: مەعنا ئەدەبی (تۆرن، جیابشلی)
- کۆرنی: ماریا ١٩٧٨: سەرەتایەك بۆ سیمیۆتیکی ئەدەب (لەندەن).
- دالاس، دانێلو تۆماسن جان. جاك ١٩٧٨: بەشیعر بوونی بەرهەمهێنەرانە، ژمارەیەکی تایبەت دەربارەی زمانەکان ٥١.
- دیکرۆ، ئیزفالدو تۆدۆرۆف، تیزتیفان ١٩٧٢: فەرهەنگی ئیسیکلۆپیدیی زانستەکانی زمان (دەزگای بڵاوکردنەوەی سێوی) فەرەنسا.
- ئیکۆ: ئەمبیرتۆ ١٩٦٥: کاری کراوە سێوی، فەرەنسا.

- جینێت، جیرار ۱۹۷۰ ژێربێژیی پابەندکراو لە گۆڤاری Communications، ژمارە (۱٦)، ل ۱٥۸- ۱۷۱.
- گریماس: أ. ج کۆرتێ ج ۱۹۷۹/ سیمیا. فەرهەنگێکی قیاسیی تیۆری زمان- (دەزگای بڵاوکردنەوەی هاشێت)
- هیلبۆ، ئەندرێ (سەرپەرشتکار) ۱۹۷۹: بواری سیمیۆتیکس -چەند روانگەیەکی نێودەوڵەتی.
- ئیهوێ، جێنز (سەرپەرشتکار) ۱۹۷۱-۱۹۷۲.
- Literaturwissenschatt und Linguistik-) (Frankfurt- A, th naum- 4. Vol
- جاکۆبسن، رۆمان ۱۹٦۳: لینگویستیک (زانستی زمان) و بەشیعربوون لە -چەند تۆژینەوەیەك لە زانستی گشتیی زماندا (سێوی- Seuil)
- ۱۹۷۳: مەسەلەکانی بەشیعربوون.
- کیبێدی ڤارگا- ئارۆن ۱۹۷٦: زانستی زمانو شیعر، تایبەتمەندییەکانی زمانی شیعری لە کتێبێکدا: (أ. ماکای) سەرپەرشتی کردووە بەناوی -بەرەو تیۆریی مەعنای گشتی لە زانستی زمانو ئەدەبدا (The Hogue Mouton ل ۱۳- ۳٤).
- ۱۹۷۹، دەق، گوتار، حیکایەت (گێڕانەوە) لە گۆڤاری (زانستی جوانی) دا ۱۰- ۲ ۱۹۷۹.
- کلاوس، جۆرج ۱۹۷۳: Semiotik and Erkenntnis theorie Munchen
- لیش، جیۆفری ۱۹٦۹: رێنوێنێکی لینگویستیکی بۆ شیعری ئینگلیزی (لەندەن- لۆنگمان)
- لیڤی، س. ر. ۱۹٦۳: لادانی ئاماریو دیاری کراو لە زمانی شیعریدا، لە گۆڤاری l\Lingya، هەردوو ژمارەی ۱۲و۱۳، ل ۱۷٦- ۲۹۰.
- زانستی زمانو سیمیۆتیك ۱۹۷٦، کارەکانی سەنتەری تۆژینەوەکانی زانستی زمانو سیمیۆتیك لە شاری لیۆن/ ی فەرەنسادا.
- مایلەر، جورج، أ (سەرپەرشتکار) ۱۹۷۳، پەیوەست بون زمانو مەعنا، نیوویۆرك، Basic Books
- مول، ئیبراهام- ۱۹٥۸: تیۆریی راگەیاندنو دەرك کردنی جوانیگەرانە (Fiummarion - بلاوکەرەوە)
- مول، زیتمان (سەرپەرشتکار) ۱۹۷۲: پەیوەست بوونی: فەرهەنگی زانیاریی تازە.
- مۆرکارۆفسکی، جان- ۱۹٦٤: زمانی پێوانەییو زمانی شیعری، واشنتون، ل ۱۷-۳۰.
- نۆث، وینفرید- ۱۹۷٥ سیمیا (تۆبنگن- Niemeyer).
- ئۆمن ئۆرسۆلا ۱۹۷۳: Linguistische Crundlggen Poetischer teat, Niemeyer
- بۆسنەر، رۆلاند ۱۹٦۹: Strukturalismuc inder Gedichtinter Pretation
- رای دیبوف، جۆزیت ۱۹۷۹: سیمیا، بڵاوکراوەکانی زانکۆز
- ریڤاتێر میکایل ۱۹۷۱: چەند تۆژینەوەیەك لە شێوازیەند بنیادگەریدا- Flummarion
- رۆلان، بێرنارد ۱۹۷٦: هێما سروشتیو باوەکان..
- رۆمی نیکۆلا ۱۹۷۲: زمانو مۆسیقاو شیعر- Seuil
- ۱۹۷٥: هاوتەریبیو لادان لە شیعردا.
- شمیدت، سیگفرید: ۱۹٦۸: Alltagssprache und Gedichrsprache
- گۆڤاری- زانستی ئەمریکی ۱۹۷۲- ژمارەیەکی تایبەت بە (پەیوەست بوون) ئەیلول ۱۹۷۲.
- سۆلۆفسکی - جان (سەرپەرشتکار) ۱۹۷٦، چەند لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویيو سیمیایی ۱۱۱
- وێرپ، پۆل ۱۹۷۹- شیکردنەوە زارەکییەکانی جاکۆبسن بۆ شیعر، لە گۆڤاری (لینگویستیك) دا ژمارە ۱۲، ل ۲۱- ۷۳.
- وایت، هایدن ۱۹۷۲- لێکدانەوە لە مێژوودا، لە (مێژوویەکی ئەدەبیی تازەدا) ل ۲۸۱- ۳۱٤.
- لە کتێبی Theorie de la Li pterature- Ouvroge Presentes Par
- Kibedi Varga-Picord, 1981, Paris.
- پێشتر گۆڤاری (العرب والفکر العالمی) فایلێکی تەواوی لەم کتێبە وەرگێڕا کە ئەو فەسڵەیە تۆژینەوەکانی (ڤانو دیجك ئارت ڤان رۆیستو پیێر زیما) ی لەخۆ گرتبوو.

(۱) تۆژینگە: لە (تۆژین، تۆژینەوە)، (گە) پێکهاتووەو، بەرامبەر بەوشەی (discipline) فەرەنسیو (مبحپ)ی عەرەبی بەکار هێنراوە، میتۆد ئەو چوارچێوە مەنتیقییە بەرینەیە کە لایەنەکانی کۆششە تیۆرییەکە دەگرێتە خۆی، تۆژینگە بریتییە لە بوارێکی تایبەتیی ئەو میتۆدە.

(۲) پەیوەست بوون: هەردوو مەعنای (پەیوەندی)و (بەردەوامی) بەخۆوە دەگرێ، کە تێکرا دەتوانێ مەعنای (تواصل)ی عەرەبی بگەیەنێ، چونکە (تواصل- مواصلە) هەردوو مەعنای پەیوەندیو بەردەوامی لەخۆیدا کۆدەکاتەوە، لێرەدا وشەی (پەیوەست بوون) بە مەعنای فەرهەنگییەکەی، نەك مەعناو بەکارهێنانە باوەکەی، کراوەتە زاراوەیەکی تایبەتی.

# قسه بکەو بمره

## لەبارەی ئەدەبەوە لە جەزائیری ئەمڕۆدا

● و: زۆراب

بێدەنگی مردنە
گەر بێدەنگ بیت ئەمریت
گەر بدوێیت
تۆ ئەمریت
کەواتە قسە بکەو بمرە

تاهیر جوت

زۆرن ئەو نووسەرە جەزائیریانەی کە دەرکراون بۆ هەندەران. ئەوانەی ئەمێننەوەو داوای مافی خۆیان ئەکەن کە بە ئازادی بیربکەنەوە، لە مەترسی هەمیشەییدا ئەژین. بۆیە بە ناچاری بەشێکی زۆر لە ئەدەب ئەبێت بە ((گیرفانێکی بەرەنگاری)) دژی توندو تیژی، خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتو دژی توندڕەوێتی لە ئایندا.

لێرەدا مۆنیکا مالمستروێم (Monica Malmstrom) چەند نووسەرێکی گرنگی جەزائیری ئەمڕۆمان پێ ئەناسێنێ.

زیاتر لە (٥) ساڵە لە جەزائیر شەڕێکی ناوخۆیی خوێناوی بەڕێوە دەچێت کە تیایدا زیاتر لە شەست هەزار کەس ژیانیان لەدەست داوە. سەدان مرۆڤ لەمناڵو ژنو پیاو لە کارەساتی بۆمب تەقینەوەدا کوژراون یان بە شێوەیەکی بەربەری بە چەقۆو تەور لەماڵەکانی خۆیاندا کەللەپاچە کراون. ئەم شەڕە بێ بەزەیی‌و بەردەوامەی دەسەڵات لە نێوان ڕژێم‌و موسڵمانە توند ڕەوەکاندا بووەتە هۆی ئەوەی جەزائیر وەکو نموونەی بەربەریەت‌و شتێك کە خەڵکە گشتییەکە لێی تێناگەن، بێتە بەرچاو.

لە پەنجاو شەستەکاندا جەزائیر نموونەی دیموکراتیەت‌و ئازادیی خوازی بوو. ساڵی (١٩٦٢) دوای هەشت ساڵ لە خەباتی خوێناوی و سەر بەخۆ بوون لە فەڕەنسا، ئەو نەتەوە لاوە لە ڕووی نێو نەتەوەییەوە بە سۆزێکی زۆرەوە پێشوازی لێکراو وەکو نموونەیەکی باش بۆ وڵاتەکانی تری دنیای‌تازە پێگەیشتووە ئەناسێنرا.

وێنەکانی ئەمڕۆ و دوێنێی جەزائیر یەکەیەکی واپێك ناهێنن لێ تێگەیشتنی ئاسان بێت. لە ڕاپۆرتی دەنگو باسەکاندا کەم جار جێگای قوڵبوونەوە لە هۆکارەکانی پشت ڕووداوەکان. هۆکارو ڕابردوو زۆر ئاڵۆزو پڕ دژایەتییە.. لایەنی کەم لە دیدە نیگای خۆرئاواوە.

شێوازێك بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی زیاتر لەوەی لە جەزائیری ئەمڕۆدا ڕوو ئەدات ئەوەیە ئاوڕ

بدرێتەوە لە ئەدەبی هاوزەمانی جەزائیری. ئەم ئەدەبە ئەدەبێکی تازە پێگەیشتوو و گەنجە، هەمان تەمەنی نەتەوەکە[1]ی هەیەو لە مندالدانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی‌و خەباتی رزگاریخوازییەوە لەدایك بووە، بەلام لەلای ئێمە کەم ناسراوەو وەریش نەگێردراوەتە سەر زمانی سویدی.

تا سەربەخۆیی، ئەو ئەدەبەی لە جەزائیر ئەنووسرا دائەنرا بەبەشێك لە مێژووی ئەدەبی فەرەنسی. نووسەرەکان بە رەچەلەك فەرەنسی بوون یان سەر بە ژینگەی کلتورێك بوون کە فەرەنسی بوو، ئەم ژینگەیە لەسەردەمی دەسەلاتی فەرەنسیدا جەزائیری گرتبۆوە.

بۆ یەکەم جار دوای ١٩٦٢ ئەتوانرێت باسی ئەدەبێکی جەزائیری سەربەخۆ بکرێت، ئەدەبێك جەزائیری نووسیبێتی. ئەم ئەدەبە تا رادەیەکی بەربلاو بەفەرەنسی _ کە لە سەردەمی حوکمی کۆلۆنیالیدا تاقە زمانی رێگە پێدراوی قوتابخانەکان بوو _ ئەنووسرا. دەبووایە دوو دەیە (بیست ساڵ)ی تر تێپەرێت تا زمانی نەتەوەیی جەزائیری سەربەخۆ، زمانی عەرەبی، هەموو لایەنەکانی ئەدەبی جەزائیری بگرێتەوە.

## تێکۆشان بۆ سەرفرازی

یەکەم نەوە لە نووسەرانی جەزائیری دوای کۆلۆنیالیزم لە سالانی پەنجاکاندا دەستیان بە نووسین کردو هەموویان کەم یان زۆر مۆرکی ناسیونالیزمی بەهێزو خەباتی ئازادیخوازی جەزائیری چلەکان‌و پەنجاکانیان پێوە بوو. کەواتە هەر لە سەرەتاوە ئەدەبی جەزائیری بەشداریی سیاسەتی کردووە. ئەو نووسەرانەی ئەو وەختە هاتنە پێشەوە، لەوانە: (مەولود فیرعەون ١٩١٣ _ ١٩٦٢، کاتب یاسین ١٩٢٩ _ ١٩٨٩، مەولود مامەری ١٩١٧ _ ١٩٨٩ هەروەها محمد دیب (لەدایك بووی ١٩٢٩))، هەموویان بەرهەمەکانی خۆیان خستە خزمەتی خەباتی ئازادیخوازییەوە.

ئەم نووسەرانەی پەنجاکان بوون کە یەکەم جار بابەتی کەسایەتی‌و رەگو ریشەی کلتورییان فۆرموله کرد، لەبارەی مۆدەرنیزمی خۆرئاوا لە بەرامبەر (Kontra) نەریتی ئیسلامیدا، ئەمەش بە بەردەوامی رەگەزێك بوو دووبارە ئەبوەوە لە ئەدەبی ئایندەی جەزائیریشدا. بەرهەمەکانیان رەنگدانەوەی پرۆسەیەکی نەتەوایەتییە، کە زۆر پێش سەربەخۆبوون دەستی پێکردبوو، هێشتا هەر بەردەوامەو ١٣٠ ساڵ لە حوکمی کۆلۆنیالی فەرەنسیش ئەگرێتەوە. ئەمە مێژوویەکە مۆرکی توندوتیژی زۆر، چەوسانەوەی سیاسی‌و کلتوری پێوەیەو تەنانەت هەتا ئەمرۆش ئاوێتەی زۆربەی واقیع بینی ئەمرۆی جەزائیر بووە.

دوای سەربەخۆبوونیش لایەنی سیاسەت‌و رەخنەی کۆمەلگا بەردەوام سیمای دیاری ئەدەبی جەزائیر بووە. زۆر لەو بەرهەمانەی سالانی یەکەمی سەربەخۆیی نووسراون مۆرکی بەختیاری دوای شۆرش‌و مەستیی سەرفراز بوونیان پێوەیە. بەلام زۆری پێ نەچوو ئەمە مەیدانی چۆڵ کرد بۆ دەنگی نارەزایی. شێوەی نوێی چەوساندنەوەو خراپ بەکارهێنانی دەسەلات لە کۆتایی شەستەکانەوەو بەرو ژوور جێ پێی خۆی لە ئەدەبدا کردەوە. سیانی‌یەکە (trilogi) ی (محەمەد دیب) کە بە چاوی پشکنین سەیری جەزائیری دوای کۆلۆنیالیزم ئەکات: (سەمای شا، ١٩٦٨، La Danse du roi)، (راوچی‌یە کارامەکە، ١٩٧٣، La maitre de chasse) نموونەی ئەمەن. ((سیانی‌یەکە))، بە شێوازێکی سوریالیستی زاتی نووسراون‌و، زۆر دوورن لە شێوازی پێشووتری نووسەر _ کە ریالیزمی کۆمەلایەتییەو، رەنگدانەوەی نارەزایی پەرەسەندووی سالانی حەفتاکانە دژی سیاسەتی گۆرانکاریی توند پەیرەو کراو لەژێر سایەی سەرۆکی وولات هەواری بۆمیدن (١٩٦٥ _ ١٩٧٨)دا.

## رەشید بۆدێدرا ((تابۆ)) ئەروخێنێ

لە حەفتاکاندا نەوەیەکی نوێ لە نووسەر هاتنە پێشەوە.. لەوانە (رەشید بودێدرا _ لەدایك بووی ١٩٤١)، بەناوبانگو ناسراو لە جیهاندا بەلام وەکو زۆربەی نووسەرە جەزایریەکانی تر وەرنەگێردراوەتە سەر زمانی سویدی.

رۆمانی یەکەمی، تەلاق (La Requdiation) ئەم ناونیشانە گوزارشت لە مافی پیاو ئەکات کە بە پێی شەریعەتی ئیسلام بۆی هەیە ژنەکەی رەت کاتەوە کاتێك بیەوێت لێی جیا بێتەوە _، سالی ١٩٦٩ بلاو بۆوەو بووە هۆی هێنانە ناوەوەی مۆدەرنیزم لە ئەدەبی جەزائیریدا.



رشید بۆدێدرا

هەروەها هەرایەکی زۆری نایەوە، لەوەدا بەئازادی باسی بابەتی (تابۆ) داری وەکو سێکس، کحول‌و زینا ئەکات. لە (La Repuiation) دا نووسەر لە رەخنەگرتنی‌دا لە گەشەکردنی سیاسی جەزائیری (بۆمیدن) دا نەرمی نانوێنێ.

ئەو توندو تیژیوو بەتایبەتی لە روو بە روو بوونەوەی نەریتی ئیسلامیدا کە دژی گەشەکردنە، توندوتیژەو چەوسێنەری ژنانە. رۆمانەکە لە فەرەنسا نووسراو بلاو کرایەوە.. بەلام لە جەزائیر تا پانزە ساڵ تێنەپەری ((پاشەڵ پاك))[2] دانەنرا.

لە ناوەراستی هەشتاکاندا (بودێدرا) بریاری‌دا زمانی فەرەنسی وەکو زمانی پیشە بەجێ بهێڵێ‌و راستەوخۆ بە عەرەبی بنووسێت. ئەو خۆی ئەمە بە تەحەدایەکی ئەدەبی دائەنێت.وەکو خۆی روونی کردۆتەوە، ئەو ئەیەوێت تەلیسمی زمانی عەرەبی لابەرێت‌و جێگا خۆش کات بۆ دنیا بینی مرۆڤی مۆدێرن لە ئەدەبی هاوچەرخی عەرەبیدا. مەسەلەکە ئەوەیە سنووری کلتووریەکان هەڵوەشێنرێتەوەو (تابۆ) بروخێنرێت. بۆدێدرا دەڵێ‌ترە گەر ئەمە بە زمانی عەرەبی نەك بە زمانی فەرەنسی ئەنجام بدرێت، کارێکی ترسناکترو کاریگەرتر دەبێ.

پاش چەندەها ساڵ ژیان لە فەرەنسا ئێستا (١٠) ساڵ زیاترە بودێدرا لە جەزائیری نیشتمانی ئەژی‌و کارئەکات. سەرباری مەترسیەکان لە جەزائیری ئەمرۆدا بریاری داوە بمێنێتەوە. لە نەوەدەکاندا بە ئاشکراو زۆر چالاکانە برەوای دژ بە موسڵمانە توندرەوەکان دەرخستووە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی (بودێدرا) بخرێتە پێشەوەی لیستی تیرۆر لای ئەو توندرەوانە.

دوا دوو رۆمانەکەی: (تیمیمون Timimon، ١٩٩٤ _ ناوی هۆرێکە لە بیابانی جەزائیر)و(لا دروستەکەی ژیان La vie a L Endroit، ١٩٩٧) روو داوە توندو تیژی‌و پڕ لە کێشەکانی ئەم چەند ساڵەی دواییەی لە جەزائیر ئەگێڕنەوە. (ماسکۆتێك)[3]، کورتە بالا (قەزەم) ێك لە لایەن ئیسلامی یەکانەوە لە مانگی ئاداری ١٩٩٥ دا ئەکوژرێت. ئەیکوژن چونکە جەماوەر هان ئەدات سەرپێچی بکەن بەرامبەر ترس‌و قەدەغەکردنی چوونە دەرەوە لە شارەکەداو.. بەختەوەر کردنیان لە تەماشاکردنی یاریەکی تۆپی پێدا. ئەمە رۆمانێکە لە بارەی رق‌و توندوتیژی‌یەوەو کاریگەریی خراپی بۆ سەر ژیانی مرۆڤەکان لە مرۆی جەزائیردا.

## رەشید میمونی‌و توندرەوێتی ئایینی

یەکێك لە پێشەنگترین نووسەرانی هەشتاکان لە جەزائیر (رەشید میمونی) بوو، لەدایك بووی (١٩٤٥)، کە ساڵی (١٩٩٥) لە نەخۆشخانەیەکی پاریس بە نەخۆشی زەردوویی مرد. لەکاتی مردنەکەیدا دوو ساڵ بوو خۆی‌و خێزانەکەی لە تاراوگە لە مەغریب ئەژیان. چ وەکو نووسەرو چ وەك گفت‌وگۆساز (debator)، لە وڵات‌و لە هەندەرانیش بە ئاشکرا روو بە رووی توندرەوەوە ئیسلامیەکان ئەبۆوە، ئەمەش وای کرد هەموو سالانی نەوەدەکان دووچاری هەرەشەی مردن بێت. ساڵی (١٩٩٣) کاتێك منداڵەکانیشی هەرەشەی ژیانیان لێکرا بریاری‌دا جەزائیر جێبهێڵێت.

میمونی نووسەر تەنانەت پێش ئەوەی توندرەوەکان ببن بە سەرچاوەی هەرەشەیەکی گەورە بۆی زۆر خۆی بە رێرەوی وڵاتەکەیەوە خەریك کردبوو.. هەر زوو لە حەفتاکاندا، ئەوکاتەی وڵات دەوڵەتی سەربازی، یەك حیزبی بوو، وە کەش‌و هەوای گفتوگۆ تەنگە نەفەس بوو، ئەو رەخنەی لە دژی خراپ بەکارهێنانی دەسەلات، لە دژی بەرتیل‌و نەبوونی دیموکراتی دەربری. هەردوو رۆمانەکەی لەسەرەتای حەفتاکاندا، کە رەخنەی کۆمەڵایەتی بەهێزن، (رووبارە هەڵگەراوەکە، ١٩٨٢، Le fleuve detourne) و (Tombeza، ١٩٨٤) بە گاڵتەبازیەوە دیاردەی لەبەر یەکهەڵوەشانو لەرێگالادان لەجەزائیری ئەو سەردەمەدا ئەخەنە روو، جەزائیرێك کە لە ساڵی ١٩٧٩ وە موقەدەمێك (چارلی بن جەدید) بەرێوەی ئەبرد.

لە (حوکمدراو بە ژیان، ١٩٩١، Une peine a vivre) دا دەسەلات‌و خراپ بەکارهێنانی دەسەلات لە چەقدا وەستاون. رۆمانەکە باسی بەرەو ژوور چوون‌و کەوتنی دیکتاتۆرێك ئەکات.. زۆر ئازایانە لۆژیك‌و

یاساو رێسا نا مرۆییەکانی ناوەوەی سیستەمە دیکتاتۆریەکە ((بخۆیت یان بخورێیت)) ئاشکرا ئەکات.

دوا رۆمانی رەشید میمونی، نەفرەت، La،١٩٩٣ Maledicion)[4]ە، کە پشت بە رووداوە راستەقینەکانی هاوینی (١٩٩١) لە جەزائیر ئەبەستێت. ئەو وەختە بەرەی رزگاری ئیسلامی ( F I S) لە دژی یاساکانی هەڵبژاردن مانگرتنی گشتی راگەیاند، ئەمە پێش هەڵبژاردنی پەرلەمانیی چاوەڕوانکراو. مانگرتنەکە لە دەست دەرچوو گۆڕا بە خۆنیشاندانی توندوتیژ. رژێمو توندڕەوەکان لە روو بە روو بوونەوەیەکی خوێناویی ئاشکرادا پەلاماری یەکیاندا، لەم رۆمانەدا رووداوەکان لەزمانی کەسی سەرەکیەوە باس ئەکرێت.. کە لە خەستەخانەیەکی جەزائیری پایتەخت پزیشکە. رۆمانەکەی میمونی بە تووڕەییەوە بەرەنگاری توندڕەوێتی ئایینی ئەبێتو بە توندیش لە خۆڕازاندنەوەو باوەڕە کوێرانەکەیان ئەدات، وە لە بەرەودواچوونی سەرانسەری لە جێ‌پێ‌ی ئەوانەدا.هەروەها وێنەی ولاتێک ئەکات تیایدا ئۆپۆرتۆنیزمی سیاسیو خراپ حوکم کردن زۆر زۆر بڵاوبۆتەوە، کە ئۆباڵی زۆری رووداوەکانی ئێستای جەزائیری لە ئەستۆدایە.

**تاهیر جووت _ Tahar Djaout**

**سیمبۆل بۆ مافی پرسیارکردن (گومان)**

(تاهیر جووت) ی لاویش لەوانە بوو لە هەشتاکاندا هاتنە پێشەوە، لەدایك بووی ١٩٥٤ بوو. لەسەر



تاهیر جووت

جادە لەبەردەمی ماڵەکەی خۆیدا لە جەزائیری پایتەخت، ساڵی ١٩٩٣، لەلایەن توندڕەوەکانەوە کوژرا. (جەوت) شاعیرو نووسەر بوو، هەروەها وەکو رۆژنامەوان کاری ئەکرد بەلام لە راستیدا گەر بە مانا سیاسیەکەی بڵێین ئەوا ((ئارەزوومەندی سیاسەت)) نەبوو. ئەو هیومانیست بوو، بەدیدێکی کراوەی نادۆگماتیکیو پڕ گومانەوە بەرامبەر ((بوون)). لە رووی ئایینییەوە، سەر بە بەرەی (دنیایی) بوو، بە بڕیاریشەوە ئەیووت ئایین پێویستە مەسەلەی تاکە کەسو شەخسی بێت. هەموو ئەمانە کردبویە دوژمنێك لە بەرچاوی توندڕەوەکان. (جەوت) دوای مردنەکەی بووەتە جۆرێك لە سیمبۆل بۆ مۆدەرنیزمو بیرکردنەوەی ئازاد لە بەرامبەر ئەوەی موسڵمانە توندڕەوەکان لە جەزائیری ئەمرۆدا نوێنەرایەتی ئەکەن.

لە رۆمانەکانیدا: (گەڕیدەی ئێسكو پرۆسك، Les chercheur dos،١٩٨٤ ) و (ئەندێشەی بیابانی، L Invention do desert،١٩٨٧) دا لە رێگای گاڵتە بازیەکی نەرمەوە توانج ئەگرێتە توندڕەوێتی ئایینی، قورسایی نەریتو درۆ مێژووییەکەی کۆمەڵگای جەزائیری. (پاسەوانەکان، Les Vigiles،١٩٩٢ ) بووە دوا رۆمانی کە ساتیرێکی چاو نەترسانەیە لە بارەی بیرۆکراتیی ئیفلیج کارو زوڵمو زۆری کاربەدەستان لەبەرامبەر هاونیشتمانییەکاندا، ئەمەش ماوەیەکی دوورو درێژە هاوشێوەکەی لە واقیعی جەزائیردا هەیە.

**چەند ژنە نووسەرێکی تر**

ژنە نووسەرە جەزائیریەکان رۆڵێکی لاوەکییان لە ئەدەبی هاوزەمانی جەزائیریدا بینیوە. راستییەکەی هۆکەی ئەگەڕێتەوە بۆ تێڕوانینی نەریتی بۆ رۆڵی ئافرەت وە بۆ دوا کەوتنی رێڕەوی خوێندنی کچەکان. سەرباری خوێندنی بە زۆر، کەسەرەتای شەستەکان لە جەزائیر ئەنجامدرا رادەی نەخوێندەواری لە ولاتدا هێشتا بەرزە، بۆ ژنان زۆر لەسەرو لەسەدا پەنجاوەیە. ئەو ژنانەی کە خوێندنی بالایان تەواو کردووە بە شێوەیەکی سەرەکی یان سەربە (چینی ناوەند) ی شارە گەورەکانن کە خاوەنی خوێندنی بالاو سیستەمی خۆرئاوایی کاری تێ کردوون یان سەر بە خێزانی خانەدانو زەنگینن کە دیدێکی ئازاد تریان لە دیدە نەریتییەکە لە بارەی ئافرەتەوە هەیە.

لە ماوەی سالانی دواییدا ژمارەی ژنە نووسەرەکان لە جەزائیر زۆر زیادی کردووەو لە

ماوەی ساڵانی هەشتاکان و نەوەدەکاندا ناوی نوێ هاتوتە پێشەوە. زۆریەیان بە هۆی هەلومەرجی ئێستاوەو لەبەر هۆکاری ئاسایش ناچاری مەنفا لە دەرەوەی وولات کراون.

ئەو شێوازی ژیان و بەها کۆمەلایەتی یانە دژایەتی نێوان مۆدەرنیتێتی و نەریت ئەیگەیەنێت لە کۆمەلگایەکی نەریتی‌دا.. تێمایەکی ئاسایی‌یە بۆ ژنە نووسەرە جەزائیری‌یەکان. پلەو پایەی ژنانی جەزائیر لەمرۆدا زۆر لە ژێر زەبرو زەنگدایە. داواکاریە (زیادە رۆکانی) (توند رەوەکان) بۆ ریفۆرمی دژ بە ژن لە یاسای خێزانی ئێستادا پشتگیری باشی لێ ئەکرێ. ئەم یاسایە ساڵی (١٩٨٤) دانرا سەرباری نارەزایی زۆر بەهێز، لەوانە لەلایەن ژنانەوەو.. زۆر پێش ئەوەش توندرەوەکان بێنە سەر شانۆی رووداوەکان.

### ئاسیا جەبارو دەقە پێویستەکان

ناسراوترین ژنە نووسەری جەزائیری لە رووی نێونەتەوەییەوە (ئاسیا جەبار) ە، لەدایك بووی (١٩٣٦) ەو لە حەفاتاکانەوە لە فەرەنسا ئەژی. هەر زوو ساڵی (١٩٥٧) بەرهەمی بڵاوکرایەوە. لە ژمارەیەکی زۆر رۆمان و نۆڤێلدا کە پشت ئەبەستن بە بابەتی مێژوویی و بایۆگرافی ئەو بەوردی و لە ناوەوە هەل و مەرجی ژنانی وەسف کردووە. لە (لە ماڵەوە لەلای ژنانی جەزائیری پایتەخت، ١٩٨٠، Femmes d Alger dans leurs appartements) دا رێگا ئەدات بە ژنانی ژینگەی جۆراوجۆر بدوێن و چاوێك بە دنیای ژناندا کە خۆی لە خۆیدا داخراوە ئەخشێنێ.

لەم ساڵانەی دواییدا، ئاسیا جەبار، وەکو زۆر لە نوسەرە جەزائیریەکان لە ناوەوەو لە دەرەوەی وولات خۆیان بە رووداوە نوێکانی وولاتەوە خەریك کردووە. جۆرێك لە دەق و نووسین کە پێویستە (ecriture d urqence) بنووسرێن بە هۆی ئەوەی روویداوەو روو ئەدات لە جەزائیر. لە (Le blanc de l Algerie)، ١٩٩٦، ئاسیا جەبار زنجیرەیەك پۆرترێتی کەسایەتی لە هاورێکانی کێشاوە، کە بە هۆی جیا جیاوە لە ژیاندا نەماون. لەوانە سێ ساڵانەی دوایی ئیسلامیەکان. لێرەدا (ئاسیا جەبار) بە غەم و پەژارەو تاڵی‌یەوە سەیری رووداوە هەنووکەیی‌یەکانی وولاتەکەی ئەکات. ناونیشانی کتێبەکە {Le blanc de l Algerie، کە تا رادەیەك ((سپێتی جەزائیر)) ئەگەیەنێت} مەبەستی ئەوەیە بیر لە رەنگی ئەو



ئاسیا جەبار

خامە بکەینەوە کە جەزائیریەکان مردووەکانی خۆیانی تێدا ئەنێژن.

ساڵی ١٩٩٧ کتێبی (Oran, Langue morte) واتە (ئۆران، زمانێکی مردوو) خرایە بەردەست، کە تیایدا جەزائیری ئەمرۆ خۆی وەبیر دێنێتەوە. ئەمە کۆمەلێك نۆڤێل و گێرانەوەیە لە بارەی چارەنووسی ژنانی جۆراوجۆرەوە، بە شێوازێکی شاعیرانەو لە هەمان کاتدا ساکار کە سیمای ئاسیا جەبارە، وەسف ئەکرێن. باسی چارەنووسی ژیانی ئەم تاکە کەسانە بەیەکەوە مەبەستێکی گرنگ و بە نرخی گشت لایەنە ئەگەیەنێت کە زانیاریمان لەبارەی ئەمڕۆ و دوێنێی جەزائیر فراوانتر ئەکات.

ئەم وولاتە کە ئەمڕۆ بە توندوتیژی، کۆمەڵ کوژی و توندرەوویی ئایینی‌یەوە گرێدراوە، تەنها سی ساڵ لەمەوبەر بە ئازادی تازە بەدەست هێنراوی، سۆزو لایەنگیری نێونەتەوەیی بۆ خۆی بەدەست هێنابوو. بۆچی بەم جۆرەی لێ هات؟ بۆ ئەم پرسیارە وەلامێکی ساکار نی‌یە. بەلام ئەدەبی هاوزەمانی جەزائیر یارمەتیمان ئەدات هەنگاوێکی باش بنێین بەرەو وولاتێك و کەلتورێك کە زۆر کەمی لە بارەوە ئەزانین.. کە بۆ ئێمە لە هەمان کاتدا نامۆو دوور دەرئەکەوێ، کەچی لە واقیعدا بە فرۆکە تەنها گەشتێکی چەند کاژێری لێمانەوە دوورە.

### مۆنیکا مالمسترویم

رۆژنامەوانی کلتوری‌یەو لە رادیۆی سوید لە بۆتۆبۆری کار ئەکات.

ئەم نوسراوە کورتکراوەیەکە لە دەستپێکی کتێبی (چەند دەنگێك لە جەزائیرەوە) ی مالمسترویم. لە بارەی ئەدەب و ئەدەبی نوێی جەزائیرەوە.



ئاسیا جەبار

## چوارینە جەزائیریەکەی ئاسیا جەبار

لەبارەی ژنەکانەوە، وولاتە خۆشەویستەکەو هاورێکانەوە کە کوژراون.

ئاسیا جەبار چوار رۆمانی سەربەخۆی نووسیوە کە مۆتیڤەکانیان مێژوویی و بایۆگرافین. کاروانە (Kavalakad) گەورە جەزائیریەکەیەتی کە ئیڤۆن ئیهمێلس (Yvonne Ihmels) لێرەدا لەسەری ئەدوێت.

(L ammour, la fantasia)[٥]، یەکەم بەشی چوارینەکەی، رێگا بە خوێنەر ئەدات ژانی کۆنی سەردەمی کۆلۆنیالی شارەزابێت. دووبارە دەست درێژی بۆ سەر ((ناموس)) سیمبۆلە بۆ بێ توانایی کەسە بێ هێزەکە بۆ بەرگری لە خۆ کردن. بەڵام ئەمجارە ژنەکە ناوی جەزائیرە. ئەمە باسی کام جەنگە دەکرێت؟ ئایا ئەو جەنگەیە لە نێوان پیاوو ژندا، قوربانیو دەست درێژی کەردا، یان لە نێوان دەسەڵاتی کۆلۆنیالیو وولاتە داگیرکراوەکەدا؟

لە پێش هەموو شتێکەوە ئاسیا جەبار دەنگی هەموو ئەو ژنانە بەرز ئەکاتەوە کە بیرەوەری تاڵی جەنگیان چەشتووەو بۆ هەموو ((تەعدای ناموس)) ێکی نوێ بۆ سەر وولاتەکەیان، بۆ سەر خێزانەکەیان بۆ سەر خۆیان بێدەنگتر بوون.

لە (Ombre Sultane) ٦دا، بەشی دوو، رێگا ئەدات بە ژنە پەچە بەسەرە زوڵم لێکراوەکە بێتە پێشەوە بۆ بەر رووناکی، بەڵام هەروەها لێفەی سەر فرەژنیی رێگە پێدراو لە تاریکایی ژووری خەوتن دا لائەدات. بە عەرەبی زاراوەیەکی تایبەتی بۆ (ژنی لاوەکی bihustru) هەیە کە لە هەمان کاتدا مانای (برین / زام) ئەگرێتەوە.

پرسیاری ناوەندی لە رۆمانەکەدا ئەوەیە ئایا دوو ژنی هەمان پیاو سەرباری هەڵو مەرجی پڕ نەهامەتی خۆیان هەست بە هاریکاری یەکتر ئەکەن!

لە (Ombre Sultane) دا ژنی یەکەم ئازاد بوەکەیە، لە کاتێکدا ژنی ژمارە دوو پەروەردەیەکی نەریتیی ئیسلامی پێدراوە. یەکەمیان خۆی لە پیاوەکەی جیا کردۆتەوەو دووهەمیان ناچار کراوە لە هاوسەرێتییەکی بێ خۆشەویستیدا بمێنێتەوە.. کە دایکە هەژارەکەی بۆی دۆزیوەتەوە.

بەڵام ژنی یەکەم ئەگەڕێتەوەو ئازادی نیشان ئەدات. وورده وورده، لەگەڵ (حەجیلە) ی چەوساوەدا، خوێنەری پشت پەچەو ناوەوەی وولات ئەتوانێت چۆنیەتی خۆ ئازادکردن فێر ببێت. چۆن (حەجیلە) هەنگاو دوای هەنگاو خۆی ئەگەیەنێتە ئەم ((رووتییە وەك ئاسمان ئاشكرایە))[٧]، کە تیایدا هەموو جوڵەیەك لەلایەن خەڵکەوە چاودێری ئەکرێت، و ئەگاتە دوا یاخی بوون دژی پیاوەکەو دایکەکە. بەڵام راپەڕینەکە زۆر گەورە دەبێت. (حەجیلە) کە بە هەنگاوی هێواش بە قادرمەکەدا بۆ خوارەوە رائەکات ئەکەوێتە بەردەم ئۆتۆمبیلێك. ئەمە کارەساتەیان بە ئەنقەست؟ حەجیلە نامرێت، بەڵام خۆی لە منداڵە چاوەڕوانکراوەکەی ناو سکی رزگار ئەکات.. کە بەرهەمی تەعدایەکی ناو ژیانی هاوسەرێتی یە کەیە.

لە ناوەڕاستی (Ombre Sultane) دا بەشێك هەیە باسی چارەنووسی دەیان ژن ئەکات. ئەمانە باسی منداڵی چەندان ژنە کە هەموو هیواو خۆشەویستی شەخسییان لێ زەوت کراوە. ژنانی خێزانەکە هەموو پاش نیوەڕۆیەك لە حەوشەکەی ماڵەوە دا کۆ ئەبنەوە. لە ژێر ئاسمانی کراوەدا باسی ژیانە داخراوەکەی خۆیانو ژنانی تر ئەکەن. دەنگ بەرزو نزم ئەکەنەوە، بە منجە منجو چپە چپ لەگەڵ یەکتر ئەدوێن، ئەگرینو بە دەنگی بەرز سکاڵایە کە هەرگیز شەپۆلەکەی کۆتایی نابێت دەر ئەبڕن.

ژنـان نـەریتی گێڕانـەوەی دەمـاو دەمیـان هەیـە، ئەمەش کڵۆڵەکەی سەرەکی نووسـەرێتی‌یەکەی ئاسیا جـەبارە. لـە حەکایـەتو قسـەو باسـی ئەوانـەوەو لـە خەونەکانیانـــەوە بەشـــێکی زۆر لـــە کەرەســـەی ڕۆمانـەکانی خـۆی وەرگرتـووە. بـەڵام هـەروەها لـە دیالەکتە بەریەری یە جۆراوجۆرەکانیانەوە کە ڕێگـای گاڵتە بـازیو پرسیار ئاراستە کردن بە شێوەیەکی نایاب ئەدات..




سەرەوە: کاروانە جەزائیرییەکە




خوارەوە: خوشکێکی شەهرزاد

باسکردن لە ژیانی ژنان لـە هـەمان کـاتدا نـــارەزایی دەربڕینـــە بەرامبـــەر قەدەغـەکردنی (بەریـەری) وەکـو زمـانی ڕەسمـــی لـــە ســـەردەمی حوکمـــی سۆسیالیزمدا.

(Vaste est la prison) [8] بەشـــی سێهەمەو باسی پرۆسـە نووسـین ئـەکات کە زیندانێکـە تێیـدا مـرۆڤ لەسـەر خۆ ئەمرێت. نووسین مانای ئەوە نی‌یە ژیان دەربـازبکرێت بـەڵکو پۆشـەرێکە لـــە خۆدەنـاڵێنرێ، ئـەوەی کـە هەناســە ئەداتو ئەژی ئەشاردرێتەوە. ئیتر ئەمە بۆ خۆ پاراستن یان بۆ حەشاردان بێت؟ ناواخنی ڕۆمانەکە داپۆشراوە بـە خامـە سـپی‌یەکەو بـە هـەموو ئـەوەی بـە شاراوەیی لە ژێریدا دێتو دەچێـت. ئـەوەی کـە جلـە سپێکانی حاجیەکانی مەککە ئەبێت بیشـارێتەوە لـەو تیشکە بەهێزەی کە چاو ئازار ئەدات.

(Le blanc de I Algerie) [9]، دوا بەشـــی چوارینەکەیەو کاروانێکە (سیرە) لە بارەی ڕۆشنبیرو نووسـەرە مـردووە جەزائیری‌یـەکان. کتێبەکـە بـە (ئەلبێر کامۆ) دەست پێ دەکـاتو بـە شـاعیری لاو (یوسـف سـێبتی) کـە ١٩٩٤ کـوژرا کۆتـایی دێـت. چرکەساتی مردنەکەو کاژێرەکان یان هـەندێك جـار ڕۆژەکـانی پێـش مردنەکـە بـاس دەکرێـت. ئاسـیا جەبار گفتوگۆی لەگەڵ کەسو کـارو هـاوڕێ یـانی مردووەکـانو کوژراوەکـان کـردووە. بـە شـوێن ووردە کاری‌یـەکاندا گـەڕاوەو تەنانـەت ئەوەشـی نووسیوەتەوە کە لـە گرنگیدا بچووکـە بـەڵام لـە گشـتەکەدا مانـا بەخشـە. ئـەو بـەرگی ئاسیایەك کـە ڕاستی بێـژە ئەپۆشـێ.. بـەو ئاواتـەی کـە ئەوانـەی لەدەستی‌داون ببینێتەوە داوا مان لێ ئەکات شـاهیدی مردنەکانیان بین.

نووسینی: ئیڤۆن ئیهمێلس

ئـەم نووسـراوانە هـەموویان لـە (Halva Varldens litteratur) ژمارە ٢ سالی ١٩٩٨ وەرگێراون.

چەند تێبی نی یەك:

ئێمە لێرەدا راستەوخۆ دەقە سویدیەکانمان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بە هیوای ئەوەی:

١_ خوێنەران بۆیان دەرکەوێت کە بزووتنەوەی ئەدەبیو وەرگێڕان چەند بەپەرۆشەوە لە وولاتی سووید کاری بۆ ئەکرێت. ئەوەتا لە پێشکەش کردنی کتێبەکانی (ئاسیاجەبار) دا ئەپرسێت: چاپخانەکان، ئێوە لە کوێن؟

چونکە کتێبەکانی ئەکراون بە زمانی سویدی.

٢_ وەکو لە خوێندنەوەی وتارەکاندا بۆتان دەرکەوت هەندێك زانیاری ناشاشکراو نادیاریان خستۆتە روو!

٣_ مەرج نی یە وەرگێر هەمان رای نووسەرانی وتارەکانی هەبێت.

ناتوانم هیچ بەرهەڵستی یەك بەرامبەر بیروراکانیان دەربڕم بەلام حەز ئەکەم تەنها یەك نموونە لەسەر هەڵسو کەوت کردنی بەرامبەر ژنانی سویدی لە سوید بهێنمەوە (ئەم باسە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژ هەیە بەلام لەبەر نەبوونی سەرچاوە هەڵی ئەگرین بۆ کاتێکی نادیار):

لە رۆژنامەی (Aftonbladet) دا یەك شەممە، یانزەی ئابی ١٩٩٦، وە بە مانشێتی گەورە نووسراوە: Kvinnas huvud sprangdes I bitar

ووتارەکە باسی کەللەسەری ژنێك ئەکات کە تەقێنراوەتەوەو دۆزراوەتەوەو گومان ئەکرێت یەکێك بەو کردارە هەستابێت کە خۆیان پێیان وایە هاوسەرەکەیەتی (Sambo). سوید وولاتی یاسایە، بەلام هەلومەرجی کارو ژیانی کۆمەلایەتی لە هەندێك لایەنەوە چ ژنو چ پیاوی سەرگەردان کردووە.

بە نیسبەت ژنەوە رۆژانە لێیان ئەکوژرێتو دەست درێژی بۆ ناموسیان ئەکرێت، ئەمەش لە رۆژنامەکاندا بلاو ئەکرێتەوە..

ئەوانەی ئەم تاوانانە پیادە ئەکەن کۆمەڵۆ حیزبی تایبەتی یان دەستەی دژ بە ژن نین، بەلکو زۆربەی کات کەسانی تاکە کەسن: ئەو پیاوانەن بەپێی قانون ژنەکانیان یان ژنە دۆشستەکانیان وازیان لێ هێناون بەلام پیاوەکان وازیان لێ ناهێنن. لەبەر کەمی تواناو هێزی پۆلیس ناتوانرێت پارێزگاری لە ژیانی هەموو ئەو ژنانە بکرێت، کە زۆرن.

ئەو ژنانە (یان) ئەو کچانەی ئەکوژرێن پێ دەچێت لەلایەن نەخۆشی نەفسی یەوە کە لە دامەزراوا نەفسی یەکان مۆڵەتی ئەوەیان پێ دراوە بۆ یەك رۆژ تێکەلاوی کۆمەلگابن، لەو رۆژەدا یان فریا ئەکەون ژنێك/ کچێك کە خەرێکی وەرزشە یان شەو درەنگ لە دیسکۆ بەرەو مال ئەگەرێتەوە، کەللەپاچەکان.

ئەمە پاساویك نی یە بۆ ئەو بەدکرداریانەی بەرامبەر ژنانی جەزائیر یان پیاوو مندالْ یان بەرامبەر دانیشتوان ئەنجام ئەدرێن، ئیتر ئەمە لە هەر ولاتێکی تریشدا بێت.

فەرموون لەگەلْ هەندێك کۆپلەی وەرگێڕدراوی ووتارەکە:

رۆژنامەی (Aftonbladet)' لاپەرە ١٦، سالی ١٩٩٦، یانزەی ئاب.

کۆپلەی ژمارە یەك: {{کەللەسەرێکی کەللەپاچە کراوی ژنێكو قۆڵێکی لە بندا براو لە Brista لە نێوان ماشتاو ئۆدینسالا دۆزراوەتەوە.}}

ژمارە دوو: {{دەلالەت لەوە ئەچێت پارچە لاشەکان لە هەمان کەسەوە بنو ئێمە هێشتا لەسەر ئەو تیۆری کار ئەکەین کە ئەوە (مارتیا پێنتینمێکی) یە کە لەتو پەت کراوە، ئەمە بە پێی ووتە بێژی پۆلیس (کلاس کاسێل). }}

ژمارە سێ: {{.. سەرەکە لە جێگای دۆزینەوەکەیدا تەقێنراوەتەوە.}}

ژمارە چوار: {{گەران بە دوای لاشە لەتو پەت کراوەکەی ژنەکەدا چەند هەفتەیەکە بەردەوامە.}}

ژمارە پێنج: {{ (بێنگت ریدی بێری) لەو باوەرەدایە کە چەند کەسێك بەشداربوون لە لەتو پەت کردنی لاشەکەدا، کە ئەوە ئەگەیەنێت گرتنی تریش چاوەرێ ئەکرێت.}}

هەروەها لە لاپەرە (١٥) ی هەمان رۆژنامەدا باسی حالەتێکی تر ئەکرێت، بەم مانشێتە:

(Mannen Kan Vara en sexgaluing)

واتە ((پێ دەچێت پیاوەکە _ شێتی جنس _ بێت))

سەرەتای ئەم ووتارەش ئاگادارکردنەوەیەکی ژنانە لەلایەن کچێکی (١٨ سالْ ) ەوە بۆ خۆپاراستن لە پیاوێك کە پێ دەچێت شێتێکی جنسی بێت.

کۆپلەی ژمارە یەك: {{ماریای ١٨ سالْ ئەخوازێت ژنانی تر ئاگادار بکاتەوە لە پیاوەکەی سویدەرتێلیە.

_ پێ دەچێت شێتێکی جنسی بێت چونکە ئەو پیاوە هێخەی ژنانی تریشی گرتووە، ماریا ئەلێت.}}

کورتەی مەبەست: وەکو وەرگێڕێك حەز ئەکەم خوێنەرانی کورد سوود لە زانیاری تێروپڕو هەمەلایەنە وەربگرن تا لە ڕێگای وەرگێڕەوە شارەزایی باش لە سەر کلتورە جۆراو جۆرەکان‌و جۆرێتی ژیانی وولاتانی تر پەیدا بکەن. بەڕای من لەم سەر زەمینەدا ((بەهەشتێك)) نی‌یە مرۆڤ بێ غەم تێیدا بژی.

□

## ڕەشید میمونی
## Rachid Mimoni

ڕەشید میمونی یەکێکە لە نووسەرە هاوچەرخە گەورەکانی جەزائیر.. لە ڕۆمانی ((حوکمدراو بە ژیان)) دا میمونی هەوڵی داوە پۆرترێتی مرۆڤێکی بە دەسەلات، دیکتاتۆرێك، بکێشێت، بێ ئەوەی بیبەستێتەوە بە ولاتێکی دیاری کراوەوە. ڕۆمانەکە چاوخشاندنەوەیەکە بە ژیانی ئەم پیاوەداو وەسف کردنی ئەوەیە چۆن بووە بەوەی کە بووە.



ڕۆمانی حوکمدراو بەژیان

لێرەدا، لەبەشی دەسپێکی ڕۆمانەکەدا، دیکتاتۆرەکە، منی گێڕەرەوەی ڕۆمانەکە، لەبەردەمی دەستەی دەسترێژ کردندا وەستاوە. مومارەسەی دەسەلاتی زاڵمانەو بێ ڕەحمانە بووەو ژیانی زۆربەی ئەوانەی لە ڕێگەیدا وەستاون لە ناوبردووە.

□



رشید میمونی

ئێستا خۆی بە ڕێوەیە، ڕوویەڕووی هەمان چارەنووس دەبێتەوە، وەکو چەندەهای پێش خۆی. چاوبرسی‌یە نوێکانی دەسەلات بە ڕیز وەستاون کە جێگاکەی بگرنەوە.

لەو شوێنەدا کە وەستاوم‌و پشتم داوە بە شورای زیندانەکەوە هەست ئەکەم مێلکەکانی گونم لێ ئەدەن. دەعباکەم لە ترسا ڕەق بووە، ترسێکی ئاژەڵانە، عەفەوی‌و دانەمرکاو. ئەزانم کە کاتێك دوا چرکەم دێت میزم بە خۆمدا کردووە.

خۆ خۆم چەندان کەسم ناردووە بۆ ئەم شورایە. زۆرجار ڕوویداوە بەدزی‌یەوە سەیرم کردووە کاتێك ئەوانە ئیعدام کراون. من حەزم لە کازیوەی ئەو بەیانی‌یە بێ دەنگانەیە کە بۆنی مردن‌و قەوزەی دەریایان لێ دێت. هێشتا، تەنانەت لەم ڕۆژەشداو سەرباری غەم‌و پەژارەی زۆرم، سەرم سوڕماوە لە جددیەتی ئەم چرکەساتە ڕەنگ پەڕیوە خۆڵەمێشی‌یە، کۆتایی هاتنی شەوێك ژیانی مرۆڤێك.

فەرمان دان بە کوشتنی حوکمدراوێك، ئەوانەی ئەم سرووتە ترسناکە ئەنجام ئەدەن زۆر جدیین. من هەمیشە بیرم لەوە کردۆتەوە کە بۆچی خەڵك بە پێویستی ئەزانن دەربڕینی دەموچاویان ڕەسمی بێت. من بەو جۆرەم نەئەکرد. بە بزەیەك بەسەر لێوانەوە ئەچووم بۆ شانۆی ڕووداوەکە، بە پەرۆش بووم کۆتایی پیلانگێڕێك ببینم، کە کاری بۆ لە گۆڕنانی من کردووە. لە دوای دەسترێژەکان هەمیشە برسیم ئەبوو. ئەرێ ئەوە لەبەر ئەوەیە من ئەوەندە خەڵکم ناردووە بۆ ئێرە وا سزا ئەدرێم؟

چەند خولەکێکی تر گوڵێکی سوور[1] لە لای چەپی کراسەکەمەوە دەرئەچێت. زۆرکەس لەبەر خاتری من

لێرەن. ئاگام لێیە ئەوان چۆن خۆ ئەشارنەوە لە دوای دواوە لە حەوشەی زیندانەکەدا، بە پەرۆشەوە چاوەڕێی ئەو چرکەساتە ئەکەن لاشەکەم وەکو لێبوکێك بچەمێتەوە. رقی ئەوان بەرامبەر بە من هێند ئەستوورە کە هەموویان بە پێویستیان زانیوە بێنو چێژ لە دیمەنەکە وەرگرن، بەڵام لە پێش هەموویەوە تاکو دڵنیابن لەوەی کە بەڕاستی کۆتاییم پێ هاتووە. من هێشتا ترسیان ئەدەمێو ئەشزانم کە ئەوان خۆیان بەیەکەوە نووساندوە تاکو هێز پەیدا بکەن..و کە بەردەوام بەرەو دوا ئەکشێنەوە بۆ تاریکترین پەنا، هەروەکو بیانەوێ نەیانبینم. دڵنیام لەوەی زۆر بە ئاسانی تەنگە نەفەس ئەبن، کە دەستیان ئارەقە ئەکاتەوە، ریخۆڵەکانیشیان لە ریخۆڵەکانی من زۆر تر دەنگە دەنگیانە.

پەژارەی ئەوان لە هی من زۆر ترە، کە لە وێدا بە دەمی وشکەوە چاوەڕوانی دەنگی فیشەکی رەحمەت ئەکەن. سەرباری دەستە لە دواوە بەستراوەکانم، ماوەی نێوانمانو ئەو شورایەی لەیەکتر جیامان ئەکاتەوە، ئەوان کاتێك تێم ئەڕوانن زەندەقیان دەچێت.

ئەوان لە نەرمیی ئەو کەسە نوێیەی کۆشکەکەی داگیر کردووە ئەترسن.. کە بڕیار بدات وازم لێ بێنێت هەڵێم. لەبەردەم ئەو بیرەدا ئەلەرزن کە لایەنگرانی من بە شێوەیکی موعجیزە ئاسا لە هەڵاتندا سەرکەوتوو بنو کتوپڕ بۆ رزگار کردنی من بەم شمشێرەوە دەرکەونەوە. بە ساردییەوە حساب بۆ ئەوە ئەکەن کە دەسەڵاتێکی بیانی، کە من نەوت بە چەکم لە گەڵدا کردبێت، مۆڵەتێکی ترسێنەریان بۆ دانێت پێش ئەوەی رێگا بدات شاڵاوێك لە میسیل ببارێت بەسەریاندا، بیەوێت وڵات داگیر بکات بۆ بەرگری کردن لە من، لە یاخی بوونێکی کتوپڕی ناو لەشکر ئەترسن، لە شۆڕشێکی میللی، یان لە بوومەلەرزەیەك، یان لە بورکانێك کە بتەقێتەوەو ئەترسن لەوەی کە هەورە بروسکە لە ئاسمانە بێ هەورە کەوە لە زەوی بدات.

ئەوان ئەترسن لەوەی تفەنگەکان بە ئاسنە تاریکە تیشك دەرەوە پڕ لە هەڕەشەکەیانەوە چروك بکەن، هەرچەندە هەر ئێستا لە دەبۆی چەکەکان هاتوونە دەرەوە، لەوەی پەلەپیتکەکان بە رادەی پێویست رەق نەبن، لەوەی سەربازەکان دەستیان بلەرزێت، لەوەی من لەبەرچاو ون بم، لەوەی گوللەکان نەپێکن، لەوەی راستو چەپ وەکو پەپوولەی بەهار بفڕنو بڕۆن، لەوەی ئەوان شەرمنانە لەبەرچاومدا بکەونە بەر پێم، لەوەی قەفەزە پۆڵاینەکەی سنگم وردوخاشیان کات، لەوەی ئەوان بەبێ بەرهەڵست بەناو لەشمدا تێپەڕنو بگۆڕێن بە ئێکتۆپلازم، لەوەی تارماییە زەبەلاحەکەم بەردەمی نیشانەگرتنەوەکە بگرێتو سەربازەکان ناچارین تەقە لە ئاسمان بکەنو قورقوشمی ناو گوللەکان بتوێتەوەو بێتە دەرەوەو ئیتر من کون نەکات.

بێ عەقڵە بەدبەختەکان! کەچی ئێوە بە وریاییەوە ئەو دوانزەیەی ناو دەستەی کوشتنەکەتان هەڵبژاردووە، ئەوانە هەموویان بەڵێنی دوا رۆژی درەوشەداریان پێ دراوە، شارەزا چەکەکانیانی پشکنیوە، یەك بەیەك فیشەکەکانیان سەیر کردووە، پرسیان کردووە بە ئەستێرەکان، بە عەرافەکان، بە نەخشە جوگرافیەکانو مێتێریۆلۆژەکان،[٢] حەوشەی زیندانەکەتان بە تانك دەور داوە، بازنەیەکی (١٠) کیلۆمەتریتان لە دانیشتوان چۆڵ کردووە، چوونە دەرەوەتان قەدەغەکردووە، فڕۆکەخانەکانتان داخستووە، دوا پەیامنێری بیانیتان لە وڵات دەرکردووە، یاسای جەنگو حەسارگەی سەربازیتان دەرکردووە، هەموو لایەنگرانی منتان ترنجاندۆتە زیندانی سەربازگە باش چاودێری کراوەکان.

ئەزانم ئەو ترسەی من لاتان دروستی دەکەم هێند گەورەیە کە ئێوە دوای مردنیشم ناتوانن بە هێمنی بخەون یان تام لە ژیان ببینن. چەندە زۆرتر ئێوە سەیری لاشەکەم بکەن گیانی تیانەمێنێو رۆبچێتە سەر زەوی، بە مارش بەلای لاشەکەمدا تێپەڕن، بە نۆرە تف بکەنە دەموچاوە شین هەڵگەڕاوەکەم، هێدی هێدی برینەکە ئەپشکننو دەست ئەدەن لە پەلوپۆ ساردەکانم، هێشتا باوەڕ بە مردنەکەم ناکەن. هەتا لە تواناندا بێت لە قوڵاییدا ئەمنێژن.. چەند چینێك چیمەنتۆ ئەکەن بەسەرما، بەڵام بێ سوودە، ئەمسوتێننو خۆڵەمێشەکەم ئەدەن بەدەم هەموو باکانی ئاسمانەوە یان بە پارچەی بچوك لەتو پەتم ئەکەن، کەچی لە خەوندا هەر بەردەوام ئەبم لە راونانتاندا.

بەڵێ، دەسەڵاتی من ئەوەندە گەورە بوو کە وەکو نەمر سەیرتان ئەکردمو لەخەوە ناخۆشەکانتانا ئەتانبینیم، بە بزەیەکی پڕ لە رقەوە بەرەو رووتان ئەهاتم کاتێك ئینزارەکە ئەنیشتەوەو تەقەکانو دوکەڵی بۆنە شیرینەکەی بارووتەکە ئەڕەویەوە.

ئەوان ئێستا لێرەن، هەموو ئەو پیاوە بێ خەوە دوودڵو هەمیشە پڕ لە غەمو پەژارانە، لە چاوەڕوانی ئەو فرمانەدا کە کۆتایی بە ئازارە درێژخایەنەکەیان ئەهێنێ. لە ماوەی حوکمی مندا ئەوان ئەبوایە لە کازیوەدا لە ژووری دەوامیاندا ئامادە بوونایە، بۆ ئەوەی پێشەکی هەوڵ بدەن لەو پیلانانە خۆیان لابدەن کە من خەریك بووم بۆم دائەنان. دوای ئەوەی هەموو ڕۆژەکەیان بەوەوە خەریك بوون زۆر لە خۆیان بکەن ئەو نەخشەی کودەتایانە هەڵوەشێننەوە کە دۆزیبوویانەوە.. بۆ یەکەم جار دوای نیوەشەو ئەیانتوانی کونەکانیان جێ بهێڵن. ئەوان هەرگیز داڵغە نەیئەبردنەوە، تەنانەت ڕۆژانی پشووشیان، تەنانەت گەر بیانویستایە بە خێرایی ژنە دۆستە زۆر جوانەکەشیان، لە ژنە دۆستەکانیان، ببینن یان لە ناشتنی دایکیاندا ئامادە بن.. هەرگیز پشووی درێژیان بە خۆیان نەئەدا، سەرباری پرتەو بۆڵەی ژنەکانیان، کە تەنها هەلی ئەوەیان هەبوو سێبەری مێردەکانیان ببینن. دوای گواستنەوەم بۆ ناو کۆشکەکە ئەوان نەهێمنیو نە ئاسودەییان نەبووە. لە چاوەڕوانیەکی گرژدا بوون کە تەلەفۆنە ڕەشەکە هەرکاتێك بێت لێ بدات. تەلەفۆن کردنم بۆیان هیواو ترسی لەلایان بەخەبەر ئەهێنا.

ئەوان لەوە ئەترسان لەبیر بکرێن کە بەڵگەی ئەوەیە ئیتر جێی ڕەزامەندی نین، بەڵام هەروەها لەوەی بە لێ توڕەبوونێك وەبیر بێنەوە کە پێ دەچوو نیشانەی دەرکردنێکی چاوەڕوان نەکراو بێت. ئەوان ئیتر نەیانئەزانی بە چ شێوازێك لەبەردەمی مندا هەڵسوکەوت بکەن، خۆیان زیرەك یان بێ ئەقڵ نیشان بدایە پێ دەچوو ببێتە هۆی کورسی لە دەست دانیان. ئەوان ئەترسان لەوەی سەرکەوتوو یان ژێرکەوتوو بن لەو ئەرکانەدا کە پێم سپاردوون، دوو لەت ببوون لە نێوان ئارەزوویان بۆ ئەوەی بە توانای باشیانەوە لە خزمەتی مندا بن یان کۆششیان بۆ ئەوەی من نەخەنە سێبەری خۆیانەوە یان زۆر زاڵ نەبن. ئەوان بە وریایی‌یەوە تێ گەیشتبوون بە هەمان شێوە کە هەژاری ڕۆشنبیری‌یان دوریان ئەخاتەوە بۆ وەزیفەیەکی جێگیر خوا لە بیرکردوو، ئەوا بیرتیژی‌یەکی زۆریش مەترسی ئەوەی تیابوو ببرێن بۆ زیندانێکی سەربازی تێروتەسەل چاودێری کراو. هەر هەنگاوێکی نوێیان ئەنا دوارۆژیانی نا دڵنیاتر و کەوتنیانی پڕ ئازارتر ئەکرد.

هەندێك جار سەردانی چاوەڕوان نەکراوم بۆ ئەم سەرو ئەو سەری وڵات ئەکرد، بەبێ ئەوەی کەسیان لەگەڵ خۆم ببەم. ئەوسا خۆیان لە ژووری کارکردنەکەیاندا قایم ئەکردو بە پەژارەوە چاوەڕێی گەڕانەوەمو ئەو سزایانەیان ئەکرد کە نەیانئەتوانی خۆیانی لێ لابدەن. تووشی سك چوون ئەبوونو ئەبوون بە هەیکەلی ئێسك.

من حەزم لەوە بوو وایان لێ بکەم زیاد لە پێویست پیسایی بکەن. بەوهۆیەوە، بڕیارە تۆ لە ئامێزەکانم زوو زوو دەرئەکرد. من لەو پرنسیپە ئاقڵانەیەوە دەرئەچم کە باشترە دوور لە دادپەروەری سزای کەسێکی بە تواناو جێ باوەڕ، لە شوێنێکی پڕ مەسئولیەتدا بدرێت.. ڕێگاش بدرێت هەڵەی لێ نەهاتوویەك بێ سزا گوزەر بکات. بەم جۆرە ئەتوانیت ئەوەی یەکەم ببینی کۆششی نوێتر ئەکات بەڵام مەترسی ئەوە هەیە هانی ئیهمالی ئەوی دووەم بدرێت، بەهەرحاڵ ئەمزانی کە ئەوانە هەردووکیان، هەمیشە هۆیەکیان هەبوو خۆیانی پێ لۆمە بکەن. لەسەرەتادا زۆر بوون ئەوانەی باوەڕیان وابوو ئەتوانن گوناحە بچوکەکانیان لە من بشارنەوە. خوگرتنیان بە نهێنی پاراستنەوە، بە دزی‌یەوە ئەیخستمە بزە. من لەبارەی ژیانی منداڵی‌یانەوە لە دایکیان شارەزاتربووم. هەڵوێستی من دڕدۆنگی ئەکردن چونکە نەیانزانی من چیم بەدڵە لەهەڵسو کەوتیاندا چی ڕێگا پێ ئەدەمو چی ڕەت ئەکەمەوە. ئەو بێ شەرەفانە هەوڵیان ئەدا دڵسۆزی هاوسەرێتی‌یان دەرخەنو لەگەڵ ژنە خیانەت لێکراوەکانیاندا ئەهاتن بۆ هەموو سەردانێکی ڕەسمی، بەو هیوایەی ژیانی بێ ئەخلاقی شەوانیان لای من بەشاراوەیی بمێنێتەوە. نەیانئەزانی لیستەی تەواوم لەبارەی ژنە دۆستەکانیانەوە هەبوو. زۆر پیسکەکانیان لەو باوەڕەدابوون بتوانن بمخەڵەتێنن بەوەی جلو بەرگی هەژارانە لەبەر منداڵەکانیان بکەنو ڕێ بە ژنەکانیان نەدەن ئەو خشڵو زێڕانەی کە سندوقەکانیانی پڕ ئەکرد بەکار بهێنن.. لە کاتێکدا من زانیاری تەواوم لەبارەی سامانە نا یاسایی بەدەست هاتووەکەیان پەیدا کردبوو. ئەوانەی ڕاهاتبوون بە دزی‌یەوە لە ژووری کارەکانیاندا ویسکی بخۆنەوە بە ڕەسمی تەنها شەربەتی پرتەقاڵیان ئەخواردەوە. ئەوانەی ئارەزووی کوڕی گەنجیان هەبوو بە رووکەش پیوریتان[٢] بوون. ئەوانەی قاچاغچێتی بێهۆشکەریان

ئەکرد وایـان نیشـان ئـەدا بەرگـەی دووکـەڵی جگـەرە ناگرن.

دڵم تێك ئـەچێت کـاتێك ئـەبینم لـە حەوشـەی زیندانەکەدا کۆبوونەتەوە.

لـە راسـتیدا نـاڕازی نیـم کۆتـایی بـە ژیـانم بێـت. لێدانی هێلکەکانی گونم کۆتایی پیّ هاتووە.

ئیتر هەست بە بۆنی تووتن ناکـەم، کـەجار جـارە بۆنـی هەناسـەی نـاخۆش ئـەکردو تـامی تـاڵی ئـەدا بەلیکەکەم. ئۆخەی ئیتر بۆ خۆم ئەحەوێمـەوە. ئیـتر پێویستم بەوە نابێت لە نیوەشەودا لە خەو هەڵسم تا ژووری خەوتن بگۆڕمو، شەخسی خۆم هەموو ئامرازی چاودێری کردنەکان بپشکنم کە ئـاخۆ ئیش ئەکـەن، سـەربارى ئـەوەی چـاودێری کردنیـان سـپێردراوە بـە ئـەندازیارێکی ئـەلکترۆنی لێـهاتوو، نازیسـتێکی توندوتیژ کە هەمیشە بـە دوایدا ئەگـەڕێنو.. کـە مـن پەناگەیەکی دڵنیام داوەتیّ بە پێناسی نوێـوە لەگـەڵ مووچەیەکی زۆر بەرزدا.

ئیـتر ترسـم نییە لـە دەسیسـەی هـەموو ئـەو جەنەڕاڵانەی کە من یەك بە یەك، لـە پێشدا تـەرفیعم داونەتیّو پاشـان نزمـم کردوونەتـەوەو تـا لـە دواییدا دووبـارە تـەرفیعیان بدەمـیّو.. کـە ئـەوەندە لـەژێر چاودێری‌دا بوون ئیتر نـەیان ئـەوێرا زیـان بـە مێشـێك بگەیەنن، بە ئاشکرا کەمتر بـۆ خۆشیان پـیّ بکـەن، رۆژنامـەی بیـانی بخوێننـەوە، بـە ژنـە دۆسـتەکانیان بڵێـن ((خۆشـم ئـەوێیت))، یـان تەنانــەت لـە کـاتی لەکارخستنیاندا میز بکەن. ئیتر پێویستم بـەوە نییـە لە ئاستی هەموو ئەوانـەدا کـە نزیـك ئەبنـەوە وریـا بم یان هەمیشە حساب بـۆ دڵسـۆزی هـەندێکو خیانـەتی هەندێکی تر بکەم.

– ئامادە بە ! ئاگر بدە !

ئەو هـاوارە تیـژە ئـەو بـیّ دەنگی‌یـەی حەوشـەی زیندانەکەی داگرتبوو لەتو پـەت کرد. هێدی هێدی چاوەکانم لێك ناو دەموچاوێکم بینی بۆم پێکەنی.

وەرگێڕانی بۆ سویدی: مۆنیکا مالمستروێم

بەشی یەکەم لە

1991- (Une Peine a vivre)

سـەرچاوە: HVL ژمـارە (٢) سـاڵی ١٩٩٨، وەرگێڕانی بۆ سویدی مۆنیکا مالمستروێم.

وەرگێڕ لە سویدی‌یەوە: زۆراب

[١] مەبەستی دەوڵەتەکەیە

[٢] بە سویدی نووسراوە Rumsren واتە ((ژووری خاوێن)) یان رێگە پیّدراو..

[٣] شتێکە بەختەوەری بڵاویکاتەوە (بۆ نموونە لێبوکێك)، لەم حاڵەتەدا کورتە باڵاکە یارگاکە ماسکۆت بووە !

[٤] Forbannelsen، غەزەب

[٥] ١٩٨٥ نووسراوە. وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی لە ١٩٨٨ دا بە ناوی (An Algerian Cavalcade)

[٦] ١٩٨٧ نووسراوە، هەمان ساڵ بە ناوی (A sister to Scheherazade) کراوە بە ئینگلیزی.

[٧] بە سویدی نووسراوە ((himmelsskriande nakehet))

[٨] ١٩٩٥ نووسراوە. بە ئینگلیزی ١٩٩٧ ناوی (Vast Is the Prison) ە.

[٩] ١٩٩٦ نووسراوە. بە ئینگلیزی (The Whte of Algeria) یە.

[١٠] گوڵێکی سور؟

[١١] مێتێریۆلۆژەکان.

[١٢] پیوریتان.

# یۆلیسیس

● و: پێشواز سعدالله

یۆلیسیس بریتی‌یە لە سەرجەمی ڕووداوەکانی یەك ڕۆژ لە ژیانی هاووڵاتیانی دەبلن لە ساڵی ١٩٠٤دا. بەم پێیەش، وەسف کردنی ژمارەیەکی سنووردارە لە ڕووداو، کە ژمارەیەکی سنووردار لە خەلکی تیایە لە دەورووبەرێکی سنووورداردا. بەڵام جۆیس چاوەڕوانی لەمەش زیاتری دەکرد، ئەو دەیویست کردارەکان بکاتە ووردبینێکی گەورەو لە ڕێیەوە ئەزموونی هەموو خەڵك پیشان بدات. بەم جۆرەش، ڕووداوەکان لەسەر یەك ئاست نەگێڕدراونەتەوە، چیرۆکەکە بە شێوەیەك خراوەتە ڕوو کە قوڵیو مانا داری تیادایە، کە وای کردووە ببێتە هێما بۆ چالاکی‌یەکانی مرۆڤ لە جیهاندا.

دیارترین فێڵی هونەری کە جۆیس بەکاری هێناوە لە پێناوی پیشاندانی لایەنی جیهانگیری چیرۆکەکەی بریتی‌یە لەو هاوتەریبی‌یەی کە لەگەڵ ئۆدێسای هۆمیرۆس‌دا هەیەتی. هەر بەسەرهاتێك لە یۆلۆسیسدا، بە شێوەیەك لە شێوەکان هاوشێوەی بەسەرهاتێکە لە ئۆدێسادا. (یولیسیس) ی هۆمیرۆس بەلای جۆیسەوە کامڵترین مرۆڤە لە ئەدەبدا، مرۆڤێکەو لە هەموو ڕوویەکەوە نیشان دراوە، وەك ترسنۆكو پاڵەوان ، سەرکەشو ووریا، بێ هێزو بەهێز، مێردو عاشق، باوكو لە هەمان کاتدا کوڕ، زۆر پایە بەرزو زۆریش سووك.

هەر بۆیە جۆیس، (لیۆپۆڵد بلوم)ی (جولەکەی ئیرلەندی) پاڵەوانی ڕۆمانەکەی کردووە بە یۆلیسیسێکی نوێ، بەم جۆرەش بلومی کردووە بە هەموو مرۆڤێكو (دەبلن)یشی کردووە بە هەمو جیهان.

ڕووداوەکانی کتێبەکە لە کاتژمێر ٨ی بەیانی ڕۆژی ١٦/ حوزەیرانی/ ١٩٠٤ دەست پێ دەکات. ستیڤن دایداڵۆس (هەمان کەسێتی{وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا} بەڵام ئێستا دوو ساڵ دوای ئەو کاتەیە کە دواجار (ستیڤن)مان تیادا دیوە لە وێنەی هونەرمەنددا) گەڕاوەتەوە بۆ دەبلن بە هۆی نەخۆشی‌یە کوشندەکەی دایکی‌یەوەو ئێستا لە قەڵایەکی سەربازی‌دا لەسەر کەنار لەگەڵ (بەك مۆلیگان)دا دەژی، بەك مۆلیگان خوێندکارێکی قۆشمەی بەشی پزیشکی‌یە، وە هەروەها لەگەڵ پیاوێکی ئینگلیزیش‌دا کە ناوی (هاینن)ە. لە سێ بەسەرهاتی یەکەمی یولیسیس‌دا کە تایبەتە بە ستیڤن، وەك دوورەپەرێز پیشان دراوە، هونەرمەندێکی نا سازشکار، هەموو ئەو باشیانە ڕەت دەکاتەوە کە لەلایەن نوێنەرانی جیهانی ئاسایی‌یەوە پێشکەشی دەکرێن، مرۆڤێکی نا کامڵ. پاشتر بەراوورد دەکرێت لەگە (بلوم)ی کامڵ‌دا، کە زیاتر ئاساییەو میان ڕەوشە.

پاش دیقەت دان لە ستیڤن لە چالاکی‌یەکانی بەیانی‌یەکی زوودا، وە تێگەیشتنە لە بیرکدنەوە سەرەکی‌یەکانی. لە بەسەرهاتی چوارەمدا دەچین بەرو ماڵی بلوم، زۆر لە نزیکەوە شوێن چالاکی‌یەکانی

دەکەوین: بەشداریکردنی لە مەراسیمی ناشتندا، ڕاپەڕاندنی کارەکانی، خواردنی نانی نیوەڕۆ، پیاسەکردنی بە شەقامەکانی دبلندا، ترسی لە دەست تێکەڵکردنی ژنەکەی لەگەڵ (بلەیزیز بۆیلان)– وە لە هەریەکێك لەمانەوە ناوەڕۆکی بیرکردنەوەیمان بۆ دەردەکەوێت، وە هەروەها پێشبینی ئاوڕدانەوەکانی لە ڕابردوو، ئەمانە هەموو دەخرێنە ڕوو هەتا هەموو مێژووی ڕابردوو ئاشکرا دەبێت.

لە دواجاردا، بلوم و ستیڤن، بە درێژایی ڕۆژ لە یەکتر دابراون و پاش ئەوە یەکتر دەبیننەوە، بەڵام کات درەنگە، ستیڤن لەگەڵ چەند خوێندکارێکی پزیشکیدا خواردوێتیەوە و خراپ سەرخۆش بووە. بلوم هەستێکی باوکانە بەرامبەر ستیڤن دەیجوڵێنێت (کوڕەکەی بلوم کە کوڕپە بووە مردووە)، وە بەشێوەیەکی ڕەمزی، ستیڤن جێگەی دەگرێتەوە) چاودێری ستیڤن دەکات لە ڕووداوی سەرکەشیدا وەك پارێزگاری لێکەر.

ترۆپکی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە لەویدایە کە ستیڤن تەواو سەرخۆش و بلومی تەواو ماندوو. ئەکەونە ژێر کاریگەری زنجیرەیەك لە وڕێنەوەکە تیایدا نەست و پێش هەست (ما قبل الشعور) یان ئاشکرا دەبێت، بە شێوەیەکی درامی کەسێتی هەردووکیان ئاشکرا دەبێت لە دانسقەیەکی تەواو ڕاستگۆیانەی نەدەبیدا.

پاشان بلوم، ستیڤن بێ ئاگا دەباتەوە ماڵی خۆی و ژەمێك خواردنی دەداتێ، پاش ئەوەی ستیڤن ماڵی ئەو بەجێ دێڵێت بلوم دەچێتە ناو جێگاوە– ئێستا کاتژمێر (٢)ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ٦/١٧– لەو کاتەدا مۆڵی هاوسەری بلوم، کە ڕەمزی سێکس و وەچە خستنەوەیە کە ژیانی مرۆڤی لەسەر بەندە، بە مۆنۆلۆگێکی درێژ کۆتایی بە ڕۆمانەکە دێنێت کە تیایدا ئەزموونی مۆڵی وەك ژنێك هەرگیز لەبیر ناچێتەوە.

لەسەر ئاستی وەسف کردنی واقیعی، یۆلیسیس پڕە لە ژیان، ئەشێت چێژی لێ ببینرێت وەك ئەو وورووژاندنەی تیاماندا درووستی دەکات سەبارەت بە بەرایی سەدەی بیستەمی دەبلن. لەسەر ئاستی دۆزینەوە سایکۆلۆجیەکانیش، نمایشێکی قووڵ و جوڵێنەری کەسێتی و ئاگایی بلوم و بە ڕادەیەکی کەمتر (ستیڤن)ە.



جیمس جۆیس

لەسەر ئاستی شێواز (Style) سەرنج ڕاکێشترین بەکار هێنانی زمانەوانی تیادا بەکار هێنراوە.

لەسەر ئاستێکی ڕەمزی قوڵتر، ڕۆمانەکە ئەو ناکۆکیەی نێوان تەنیایی مرۆڤ و کۆمەڵایەتی بوونی دەردەخات.

(بلوم لە هەمان کاتدا جولەکەشە و خەڵکی دەبلنیشە، پەناهەندە و هاووڵاتیە، هەر وەك چۆن هەریەکێك لە ئێمە بە مانایەك لە ماناکان پەناهەندەشین و هاووڵاتیشین)، وە هەروەها پەردە لەسەر ئەو پەیوەندیانەش هەڵدەماڵێت کە بریتییە لە: پەیوەندی نێوان باوکان و وەچەکان، نێوان نەوەکان، وە هەروەها پەیوەندی نێوان نێر و مێ. لە هەمان کاتدا، لە ڕێی بەکار هێنانی چەند بیرۆکەیەکەوە لە هەریەك لە هۆمیرۆس و دانتی و شکسپیر وە لە ئەدەب و فەلسەفەوە، لە مێژووەوە، ڕۆمانەکە کلێشەیەکی زۆر پایە بەرزی ڕەمزی دەهۆنێتەوە کە زۆربەی لایەنەکانی ئەزموونی مرۆڤ ڕۆشن دەکاتەوە.

هەتا یۆلیسیس زیاتر بخوێنیتەوە شتی زیاتری تیادا دەدۆزیتەوە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا خوێنەر پێویستی بەوە نییە زیاتر بچێتە قوڵایی مانا ڕەمزییەکانەوە لە پێناوی وەرگرتنی چێژی زیاتر لە کارە هونەرییەکان و هەستە مرۆییەکان.

لە ڕووکاری پێشەوەدا بلوم وەستاوە، لە دیدگایەکەوە بێ ئومێدو شڵەژاوە، لە کۆمەڵگایەکدا کە تیایدا دەجوڵێت، لە لایەکی تریشەوە پاڵەوانێکی بەزەیی‌و دادپەروەری‌یە کە پەرۆشیە مرۆڤانەکەی بەرامبەر هاوڕێکانی ڕزگاری دەکات لە خراپی‌و ناشرینی‌و وە هەر ئەمەش ئەو خاسیەتە دەبەخشێتە ڕۆمانەکە کە بریتی‌یە لە بنەما مرۆڤانەکەی.

ئەو خوێنەرانەی کە بەو ئامادە باشی‌یەوە دەست دەدەنە یۆلۆسیس، وەك ئەوەی یەکێك لە ڕۆمانەکانی سەردەمی ڤیکتۆری یاخود هەندێ ڕۆمانی سەدەی بیستەمی لۆرنس یان کۆنلاراد دەخوێننەوە، لە ڕووی ئەو شێوە گێڕانەوەیەی کە چیرۆکەکەی پێ نووسراوە، لە سەرەتادا زۆر سەرسام دەبن.

جۆیس ئاگایی کەسێتی‌یەکانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەخاتە ڕوو، بەبێ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر ئاماژەو ڕوونکدنەوە بۆ دیاری کردن‌و جیاکردنەوەی ئاگایی‌و هەستی ئەم کەسێتی لەوی تر (ئەمەش بریتی‌یە لە شەپۆلێ ئاگایی) – Stream- of (consciousness. ڕەنگە لە هەمان پەرەگرافدا جووڵەیەکی جێگۆر بکات بەڵام بەبێ ئەوەی پێشتر بڵێت کە ئەیەوێت ئەم جووڵەیە بکات لە وەسف کردنی کردارەکانی کەسێتی‌یەکەوە، بۆ نموونە: پیاسەکردنی ستیڤن بە کەناری دەریاداو چوونی بلوم بۆ چێشتخانە، بۆ ووروژاندنێکی کاردانەوەی کەسێتی‌یەکان بۆ ئەم جووڵەیە.

کاردانەوە هەمووکات دوولایەنە: بەشێکی لە ئامادە بوونی ئەو کاتەی کەسێتی‌یەکە لە دەورویەردا، سەرچاوە دەگرێت. وە بەشێکی تری لەو هەڵوێستە ئاڵۆزەوە کە مێژووی کۆنی کەسێتی‌یەکە لە خودی کەسێتی‌یەکەدا درووستی کردووە.

لە پێناوی باشتر خستنە ڕووی ئەم دوو لایەنی‌یە، جۆیس شێوازەکان دەگۆڕێت، لە نا جدی بوونەوە بۆ جدی بوون، یان لە وەسف کردنێکی واقعی‌یەوە بۆ ژمارەیەك لە وێنەو ئاماژە کە ئەو لایەنە دەردخات کە دەشی پێی بووترێت تۆنی گشتی ئاگایی کەسێتی‌یەکان.

ڕابردوو و ڕانەبردوو لە داڕشتنی پەخشانەکەدا تێکەڵ دەبن لەبەر ئەوەی لە داڕشتنی خودی ئاگایی‌یەکەدا تێکەڵن، وە ئەم تێکەڵ بوونە ئەشێ لە ڕێگەی بەکارهێنانی بەلاغی‌یەوە دەربخرێت.

بە چوونی لەناکاو لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی نوێتر لە نووسین یاخود جۆرێکی نوێ لە بابەت‌و فێڵی هونەری وا دەکات خوێنەر بە جێگیری بمێنێتەوە لە چاودێری‌کردنی بەردەوامی‌دا بۆ گۆڕانەکان، هەمە چەشنی‌و گۆڕاوی سروشتی ئاگا بوونی مرۆڤ.

لە پاش ئەزموونێکی کەمەوە، خوێنەر فێردەبێت‌و تێ دەگات لە مانا قوڵەکانی ئەو گۆڕان‌و جووڵەیەی کە جۆیس دەیکات لە ڕەفتارو ناوەڕۆکدا، تەنانەت لە تێگەیشتن لەو پەرەگرافەش کە لە یەکەم تێڕوانینەوە سەرسوڕمان درووست دەکات، ئەویش (پرۆتیەس)* ە، ئەو بەسەرهاتەی کە ستیڤن تیایدا بەڕاستی سەردانی ماڵی مام‌و پوری ناکات بەڵکو لە کاتی ڕۆیشتنیدا بەو ڕێگەیەدا کە دەوچێت بۆ ماڵی مامی، بیر لەو گفتوگۆیە دەکاتەوە کە لەوانەیە ڕوو بدات ئەگەر سەردانی ماڵی مامی بکات وە پاشان کە دەگەڕێتەوە ماڵەوە ئەوشتانەی ڕوویان داوە بگێڕێتەوە.

یۆلۆسیس ناکرێت وەها تەماشا بکرێت کە ڕۆمانێکە بە شێوازێکی باو نووسراوە.

هەموو بڕیاردانێکی پێش وەخت پێویستە وەلابنرێت.

دەبێت شوێن ئەو شتە بکەوین کە نووسەر بەرەو ڕووی ئاڕاستەمان دەکات وە ڕێگە بە زمان بدەین ئەوەی هەیەتی پێمانی بڵێت بە بێ گوێدان بەوەی کە ئایا زمان بەڕێك‌وپێکی بەکار هاتووە یان نا.

سەرچاوە: The Norton Anthology of English Literature/III P. 2369-2371

لە (٢٣٦٩ تا ٢٣٧١)/لاپەڕە

* پەراوێز/ (Proteus) ناونیشانی بەسەرهاتی جوامە لە یۆلۆسیس‌دا وە هەمان ناونیشانیشە لە ئۆدیسادا، جۆیس ناوی لە بەشەکان نەناوە لە نوسیندا بەڵکو تەنها لە کاتی قسەکردندا لەگەڵ هاوڕێکانیدا وەهای ناوناون.

# لەئەدەبی گەلانەوە



شیعری یۆنانیی هاوچەرخ



شیعری فارسیی هاوچەرخ



نابەزن (چیرۆکی سۆمەرست موم)

# شیعری یۆنانیی هاوچەرخ

## - یانیس ئیوفانتس -

● و: شێرزاد حەسەن

### ستراني شاد

(۱)

ئەوە دەنگی منە دێ.. "با" ی ئەبەدییەت
ئەوە دەنگی منە دێ.. بارکراو بە ئەستێران
"با" یەو تۆویی نێرینە هەڵدەگرێ
دێو.. گوڵی نێو کەللەت دەپشکوێنێ

(۲)

من لەوێوە هاتووم..
لە بازنەکانی نێو سەرمەدییەت-وە
کەوڵێکم لەبەرداو.. پڕم لەشادی
تۆزی تریفەیەکیش وا لەسەر تەوێڵم
شەپیورێکیشم وا شۆڕ کردۆتەوە..
بەکەلەکەم
شاخی کەڵەکێوی‌یەک بۆتە کەمەربەندم

یادگارەکانیشم تێکەڵە لە گڕو لەشەختەبەند
من لەوێوە دێم.. لە سنوورەکانی شتێ لە ئەبەدییەت
جێ پێیەکانیشم جێماون لەسەر تەنگە توێژاڵی تیشلەو..
روناهیدا
گەنجینەی ئاو تاڵان دەکەم..
لە تەمبەڵییەکی پڕ لە خۆشنووسیدا..
خۆ لوول دەدەم
منم "با" کان بەخێو دەکەم
دەنگەکانیش نەرم دەکەم
من تا ئەوپەڕی خۆشنوودی گورگێك دەژیم
لەنێو بەفرو لەنێو گڕدا
من لەوێوە دێم.. لەبازنەکانی ئەبەدییەتەوە
من لەوێوە دێم.. لە بیابانەوە..!

(٣)

لەوێوە.. لە بیابانی ژێر جریوەی ئەستێرەکانەوە
من بە تەنیا دێم رادەبوورم..
ئایندە وەلا دەنێمو جێی دەگرمەوە
کانیاوەکانی وەهم وشك دەکەن..
هەموو شتێ لەتینوێتیدا دەخنکێ
لم ئەبارێ.. ئاە.. تەنها خۆڵەو ئەبارێ
فەزایەك.. ئاە.. فەزایەکم گەرەکە بۆ خەیاڵی قووڵ
تێفکرینی ورد
فەزایەك بۆ تێڕامان. بۆسەربەستی
فەزایەك بۆ بەتاڵیو.. بۆ ئاگر
من لەو شوێنەوە دێم کە تۆ هەنگاوت تیا هەڵهانی
من لەوێوە.. لە بیابانی ئەفلاکەوە دێم
وەك خۆرێکی سەرخۆشو تەنیا
بەسەر قەفرای دونیادا هەڵدێم
بارگرانم بە تۆویی حیکمەت.

## گوزەرێکی تەنگەبەر

گوزەران دەنێو حەکایەتی جنۆکان
دەنێو ئایینەکان
تێپەڕبوون بەنێو هەرای داستانەکان
شارەکان.. کەسەکان
من لەمەڕ ئەو پردەش بیستوومە
کە هەر بەقەد دەمە گوێزانێك بەرینە
دەڵێن: گەر بتەوێ بگەیتە روناهی.. هەتاو
گەرەکە بەسەر ئەو پردەدا تێپەڕی
وەلێ حەکیمانەترین قسە ئەوەیە:
تەنها ئەوکاتە بەسەر ئەو پردەدا تێ دەپەڕیت
کە خودی خۆت روناهی بیت..!
"نوێژی شاعیر"

(١)

هەروەکو "ئیزیس" کە پارچە پارچە
لەشی پەرش‌و بلاوی "ئۆزیرس" ی..
کۆکردەوە
شاعیرەکەش هەر ئاواهی وشە بەوشەی جەستەی خۆی کۆکردەوە

(٢)

پێویست ناکات پارچە پارچە تۆ من کۆ کەیتەوە
تەنها ناومت بەیاد بێتەوە، ئیزیسە، ئەوسا..
زۆر ئاسان.. زیندووم دەکەیتەوە...
دەمهێنیتەوە نێو ژیان.

(٣)

چۆن هەر هەموو شتەکان لەنێو ئەڤیندا
سادە دێن بەدەستەوە
وشەکان هەر لە خۆیانەوە دێن
وشەکان بە دەوری ناوکو جوغزی خۆیاندا.

دەخولێنەوە
دەخولێنەوە هەروەك ئەستێرە گەڕۆکەکان..
بەچوار دەوری خۆردا.
کەمن عیشق ناکەم.. ئەوە من چیتر خۆر نیم
کە من عیشق ناکەم.. سێنتەری خۆ دەدۆڕێنم
شیرازەی هەر هەموو شتەکان تێك دەچن
شتەکان پەرشو بڵاو.. شتەکان لێکدی دەبن..
هیچ شتێك هەر لە خۆوە نابێ.. هەروا ناقەومێ
(٤)
وەختێ کە عیشق ناکەم.. بێ جوغزو ناوەڕاستێکم
وەختێ کە عیشق ناکەم.. لەسەد لاوە لەتو پەت دەبم
پیت بە پیت، برگە بە برگە، وشە بە وشە..
پارچەکانم کۆکەرەوە
"ئیزیس" وەرەو جارێکی دیکە جەستەم بەرەوە
سەر لەنوێ لەبەرەبەیانی شتەکانم غەرقکە..
بمشۆرەوەو.. دەرم بێنە.

---

*سەرنجی شاعیر: ئەری بە راست، پاش ئەو هەموو نووسینە، تۆ بڵێی ناوی خۆم وتبێ؟

*ئیزیس: خوداوەندی دایکایەتیو پیتو بەرەکەت لە میسری کۆندا

*ئۆزیریس: یەکێکە لە خوداوەندە کۆنەکانی میسر.

__کتێبی گەردوون__

بە تەنها یەك کتێب نوسراوەتەوە
نەك بە وشە.. بەڵکو بە شتەکان
بە تەنها یەك کتێب نووسراوەتەوە
گەردوون دەنێو گەردوون بۆ گەردوونی نووسیوەتەوە
گەردوونی کتێبی گەردوونە
گەردوون نەسەرەتای هەیەو نە کۆتایی
وەڵێ وەختێ شاعیر پەردە لەسەر گەردوون لادەدا
وەك ئەوە وایە سەر لەوێ گەردوونێك بخولقێنێ

بە تەنها یەک کتێب هەیە بخوێنرێتەوە
ئەویش کتێبی گەردوونە
کە بنووسیت.. بە واتا کتێبی گەردوون بخوێنیتەوە
هەر هەموو نوسینەکانم چین جگە لە چەند ژێر دێڕێک..
لەناو کتێبەکەی گەردووندا
هەر هەموو نووسینەکانم چین جگە لەچەند سەرنجێ نەخشێلە..
لە پەراوێزی لاپەڕەکانی گەردووندا
نووسینی چی‌یە لە دەست نیشان کردن
چی‌یە جگە لە بەشداری.. بەشداری خەڵکانێک
بەشداری جوانی.. ترس و تۆڵێن کە لەسەر لاپەڕەکانی
کتێبەکەی گەردووندا دەیانخوێنمەوە
چونکە کەس بە تەنیا بۆی ناکرێ.. هەرگیز
کتێبەکەی گەردوون وەخوێنێ..

<u>میسین</u>

نیوەڕۆ بوو گەیشتین.. سەرکەوتین
ڕووەو کۆشکەکانی "ئاگامێمنون"
ڕووەو ئافووەو حەوزو دیوارە دێرینەکان
لە دەرگای "شێرەکان" چوومە ژوورەوە
وەک هەمیشەو بۆ دواجار
وای لە ئارەمانە قەبەو بەردینەکان
کەچی "دەرگای بەری ڕۆژهەڵات" پێی دەوتم:
پاڵەوانانی ئەو سەردەمە قەت لەمن گەڵەگەتر نەبوون
نەموویەک کەمتر.. نەزیاتر
ئۆو.. ئەی خۆر، ئەی دەمامکی زێڕینی من لە زوودا
من لە ڕووخساری خۆمت دادەماڵم..
هەنگاوێ دەنێم ڕووەو ئەو هەزارە هەزنە
دەڕۆم بەدەستەراستدا دەروازەیەکی دیکە..
دەدۆزمەوە

کەمێ نەوی‌و تەنگەبەرتر
دەوەستمو.. خۆ لەئاوێنەدا دەبینم..
دەنێو تاریکی‌دا نوقم دەبم..
تاریکی‌و بەس..

**١٩٨٦**

● میسین: شارێکی دێرینە لە باشووری یۆنان، شارستانیەتی —ئیجی— تیا گەشەی کردووە، لەنێوان سالانی (١١٠٠–١٤٠٠) بەر لەزایین.

## کردەی رۆح

لە شەقامی "هێرمس"
لە کتێبخانەکەی "پرۆمئیۆس"
من کتێبێکم دزی
من هیچ پەشیمان نیم
چونکە وەك دەزانن
"هێرمس" و پرۆمئیۆس"
هەردووکیان دز بوون

لە ئەفسانەی یۆنانی‌دا "پرۆمئیۆس" ئاگر لە خواوەندەکان دزی تا بیدا بە مرۆڤ "هێرمس" گامێشەکانی (ئەپۆلۆ" ی دزی، هەروەها پارێزەری ئەدەب بوو.

## خۆناسین

لە ئاوێنەی دەریا دەڕوانم
ماسیمو.. خۆ دەبینم
لەئاوێنەی ئاسمان دەڕوانم
من (خۆر) مو.. خۆ دەبینم
(قەوزەی نێو دەریا هەورەو خۆریش ماسی)
لە ئاوێنەی ئاسمان دەڕوانمو..
خۆم وەك پۆلە ئەستێرەیەك دەبینم

ئەستێرەکانیش چەند ڕووبارێکن لە ئاسمان
دەنێو ئاوی ئەستێرەکان من تەنها ماسی‌یەکم
دەنێو ئەو ئاوەدا بە ڕەنگی (III) سێ نووکەوە..
من ڕاو دەکەم.
خۆ ڕاو دەکەم.

() لە زمانی یۆنانیدا ئەم پیتە (III) یەکەمین پیتی وشەی ماسی‌یە کەوا دەنووسری (api III)، شێوەی ئامێرە سێ‌کوچکەیی‌یەکەی دەستی خوداوەندی دەریای هەیە کە لەلای یۆنانی‌یەکان ناوی (پۆسایدن)ە، هەروەها ئەو ڕەمەبە کە ماسیگرەکان بەکاری دێنن..!

<u>ئاوێنەکان</u>

لە چاوی زۆربەی پیاوان خۆت دەبینی
هەروەك بڵێی چاویان شووشەیەکی تاریك بێ
بەرانبەریك کە هەمیشە لەبەردەمتا
چەند ئاوێنەیەکی تاڵخ یان شکاو دەوەستن..
یان ئەوەتا بە بەردەمتا تێ دەپەڕن
من وابزانم کە ئامادەکی خودا
لەو ڕۆژەی کەپێی دەڵێن قیامەت
هیچ شتێك نی‌یە جگە لەوەی
کە تۆ لەبەردەم ئاوێنەیەکی ڕوون و گەورەدا..
لە تەوقی سەرتەوە تا کەلەموستی پێ
خۆت ئەبینی
بە ماهیەتی بوونی خۆت چەندەما شاگەشکە دەبیت
ڕوون و پاك... کریستاڵی..

١٩٨٦

<u>ئەوەش واتا</u>

ئەنوکە ئەو دەرگایانە دەکەمەوە کە بەتەنها هی منن
ئەنووکە هەرکەسەو دەرگای خۆی دەکاتەوە
ئەنووکە هەر کەسەو..

[redacted]

شتەکانی خۆی دەبینێ
گەڕماتو خۆمان لەبەردەم هەمان ئەو شتانەدا بینی
ئەوە ئێمە هەریەکەو بە ڕەنگو شێوەی جیا..
شتەکان دەبینین
هەتا گەڕماتو بەهەمان ڕەنگو..
بەهەمان شێوە ئەو شتانەمان بینی
نەک لەهەمان شوێندا کە هەن
نەک لەهەمان جێگاوە کە لێی دەڕوانین
نەک لەهەمان ساتدا
خۆ گەڕ ماتو هەمان ئەو شتانەمان بینی..
لە هەمان ئەو شوێنەی کە هەن
لەهەمان ئەو جێگایەوە کە لێیان دەڕوانین
هەر بە هەمان ڕەنگو..
هەر بە هەمان شێوە
دەقاو دەق. لە هەمان ئانو ساتدا
ئەوەش واتا..
واتا.. کە ئیدی ئێمە دوا دەرگامان.
خستۆتە سەر پشت..!

١٩٧٨

## پێناسە

ئەوەتام لێرە.. لەو شوێنەی کە "عەدەم"
بە ئازارەوە..
بە کەفو کوڵێکەوە..
قەپ لە کلکی خۆی گیر دەکا
من ئەوەتام لێرە..
لەناوەڕاستی ئەبەدییەت
لە قووڵایی سەرمەدییەت
لەسەرەتاوە.. لە کۆتاییم..!

## من دێم

بۆ "ئیڤان موودی"

من نازانم کامیان بوو "ریتسۆس" بوو.. یان "هۆمیرۆس"

کامەیان قایلی کردم بچمە نێو، ئەسپەکەی "تەروادە"

جگە لە شمشێرو ئاوێنەیەك هیچی ترم پێ نەبێ.

من لە بیابانێکەوە دێم کە تیایدا لم..

پاشماوەی وردوخاش بوونی هەر تەنێکو.. شێوەیەکە.

من لەوێوە دێم.. لە "ئورسای"

گوێنی‌یەکم وا بە بەکۆڵەوە: پڕ لە ئەستێرە

دەمامکی مانگێکیش وا بە دەستمەوە

من لەنێو کوختێکەوە دێم رۆشن‌و رازاوە بەچڵو چێو

من لە ماڵێکەوە دێم: هەر هەمووی ئاوێنەبەند

لەنێو چیاکانەوە.. بەو رێیانەدا دێم کە وەك شمشێر کەوانەیین

نیوەی بەفرو نیوەی گوڵ داپپۆشیون

لەوێوە هاتووم.. لە کەناری ئەو رووبارانەی وا دەنێو شاخانن

کەلەوێدا رەبەنە خەڵوەتکێشەکان-تاڤگەکان

دەنێو گۆزە لەبەرد داتاشراوەکان..

لەسەر پێ وەستاون

من لەباکوورەوە دێم.. دوو لەتە مانگم وا لە پێدا

دوو کەرتی مانگ وەك دوو کەوشی خلیسکێن

سێ هەزار ساڵ دەبێ بەسەر بەفرەوە..

بەردەوام.. لە خلێسکێن نەکەوتووم

من لەگەڵ هێرشی "تەتەرەکان" هاتم..

من ئەو سەربازەم کە "عەتار" ی سەربڕی

من "عەتار" خۆیم..

من ئەو چەقۆیەم کە سەری ئەمیان پێ بڕی

من لە هەسارەی رەشی مێروولەکانەوە هاتووم

ئەو مێروولانەی هەروەك پەپوولەیەکی مردوو رادەدەن

بڵێی گەمی‌یەکی چارۆکەداری فریشتەیەك بێ

یان وەکو "ئیکارۆس" بێ لەپاش کەوتن.
من لە (یۆنان) ەوە دێم..
کە بەدەستە پێلپۆنی‌یەکانی دورگەکانی بەچوار دەوری..
خۆی‌دا بڵاو کردەوە
تاوەکو بە تەنیا دەنێو دەریادا نەمێنێتەوە
من لە درزی درەختێکی کلۆرەوە هاتووم..
کەماڵی من بوو..
من سیپاڵی هەنگێکی کێویلە..
یاوەخود بەرگی پەپوولەم لەبەردا بوو..!
من لە کازیوەی بەربەیانی "ئیسالی" یەوە وەڕێ کەوتووم
لەوێ‌دا ڕەوە گرێکم
بۆ ماوەی هەزار سال دەلەوەڕاند..!
من لەنێو لاپەڕەکانی کتێبەکەی "ئاناکسیماندرۆس"وە..
هاتووم
بۆ هەرکوێ بچم. من هەر وا لەوێم.
لێیان پرسیم کە من لەکوێوە هاتووم
چی‌یان پێ بڵێم؟
خۆکەسیان تیم ناگەن
پاشانیش..
بە قۆڵ بەست کراوی رامدەپێچن..
لەبەردەم دەروونناسێك رامدەگرن.
پێیان دەڵێم: زۆر هاکەزایی..
من لە "ئەگرینیۆ" ەوە هاتووم
تا بۆم بکرێ خۆ لەو وشەیەدا دەشارمەوە
لە ڕەگی "ئەگریۆس" لە "نی"..
لە هەمووان زۆرتریش لە "ئۆم"
کە هەر دەڵێی چاڵێکە.. یاوەخود تەڵە،
کە هەمدیس ماڵەکەمە..
ئاوێنەیەکەو.. توونی بابا..

*توونی بابایەك كە دەرچوونی تیا نی‌یە..*

*هەرچەن سانا دیارە..*

*هەروەك بڵی‌ی بازنەیەك بێ*

*بازنەیەكو بەس.*

١٩٩٤

یانیس ئیوفانتس:

شاعیرێكی هاوچەرخی یۆنانی‌یە.

- لە ساڵی (١٩٤٩) داو لە (–راینا– ئاگرینیۆن) لە دایك بووە.
- هەنووكە لە (ئیسالونیكی) دەژی‌و لە ساڵی (١٩٦٧) ەوە لەوێ نیشتەجێ‌یە.
- تەمەنی (٢٢) ساڵ بوو كە كۆلیژی یاسای جێهێشت تاخۆی لـە قوتابخانـەی ژیـان‌دا نـاونووس بكـات وەك خۆی وتوویەتی.
- ئەم كتێبانەی بڵاو كردۆتەوە:
- مانپرا سپێنا (١٩٧٧)
- نهێنی‌یەكانی رۆژهەڵات (١٩٨٢)
- "ئیدی" پیر (١٩٨٣)
- ئاوێنەكانی پروس (١٩٨٦)
- ئاماژە نەمرەكانی یادەوەری (١٩٨٦)
- نەخشو نیگای شیعر لەسەر پێستی شەیتان (١٩٨٧)
- پەرستگای جیهانێكی چكۆلە (١٩٨٨)
- شیعری شاعیرە كۆنەكانی (كلاسیك) یۆنانی وەرگێراوەتە سەر زمانی هاو چەرخی یۆنانی.
- شیعرەكانی وەرگێردراون بـۆ: ئینگلیزی، فەرەنسی، رووسی، ئیسپانی، سـویدی، عـەرەبی، فنلـەندی، بۆلغاری.. هتد.
- لە بواری رۆژنامەگەری‌یو ئیستگەدا كارامەیە.
- لە ساڵی (١٩٩٥) دا پاداشتی (كافافی) وەرگرت، لەشاری ئەسكەندەریە/ میسر.
- بەشداری‌یەكی چالاكی لە كۆنفرانسی ئەدەبی جیهانی (موكولا) دا هەبوو لە وڵاتـی فنلـەندو دۆسـتێكی زۆر نزیكی كوردانە.

# شیعری فارسیی هاوچەرخ

## - بیژەنی جەلالی -

● و: نەجیبە ئەحمەد



بێژەنی جەلالی لە ساڵی (١٩٢٧ ز) لە تاران لە دایک بووە. قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی‌و ئامادەیی لەتاران بەسەر بردووە. پاش تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی‌و وەرگرتنی دیبلۆم رووی کردە فەرەنساو بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەوێ خەریکی خوێندنی "زانستی سروشتناسی" بوو. کە گەڕاشەوە بۆ ئێران لەزانکۆی ئەدەبیات بەکالۆریۆسی لەزمانو ئەدەبیاتی فەرەنسی وەرگرتووە. یەکەمین کتێبی لە ساڵی ١٩٤١ دا چاپ کرد. روزانەها پێنجەمین کتێبی کە بریتیە لە هەشت بەش بەم ناوانە:

١- خەمی رۆژانە.
٢- ئاسمانی وشەکان.
٣- پردێك ئەبینم.
٤- هەر شیعرێکی چاك .
٥- دووپات بوونەوەی لقەکانی درەخت.
٦- وەرزێکی نوێ لە شیعردا بکەینەوە.
٧- پارچە جیاجیاکان.
٨- دوایین دەست.

ئەوەی شایانی وتنە شاعیری‌جوانەمەرگ خانمە ژیلانی حوسەینی چەند مانگێك بەر لە مەرگی هەندێ لە شیعرەکانی بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی وەرگێڕا لووە سەر کوردی. ئەوەش لەم کتێبەدا لەبەرچاوە، ئەوەیە کەتێکڕای کتێبەکە هیچ نیشانەیەکی پرسیارو سەرسوڕمانو خاڵو دێرگوڵێکی نەگرتووەتە خۆی.

دەفتەری یەکەم

خەمی ڕۆژانە

چما دەڵێن وتەکان
لێك دەترازێن و
بە نیگا لەچاو دەگەین و
بە قامك
تیشك نیشان دەدەین

□

چۆن دەشت
بە ئاوازی ئاوابوون
ڕام ئەبێ و
شەو ئەخاتە سەر
شانە ڕووتەکانی خۆی
ئاوا منیش وڵامی
ئاوازی مەرگ ئەدەمەوەو
لەماڵی جەستەی خۆمدا
جێی ئەکەمەوە.

□

لە ئاوێنەی مەرگدا
جارێکی د خۆمان بڕوانین
بەر لەوەی مەرگ
بماندۆزێتەوەو
لەگەڵ وێنەی ناو ئاوێنەکەدا
ببین بەیەك

□

تەقدیر بارتەقای
قورسایی جیهانە
ئەوەندەی لە فڕینا بەسەر باڵی باڵندەکانەوە
قورسە
لە خەویشدا بە کۆڵی ئێمەوە

□

بەسەر کام خاکدا دەڕۆین
پشتمان چەماوەو
سەرمان قورس
بە کامەزمان
دوعایەك ئەخوێنین
بۆ بانگهێشتنی بە هەشتو
دەرکردنی دۆزەخ

□

جیهان چۆن چۆن ئەبینن
خەریکە ئەخنکێ
جیهان بەچی ئەزانن
ئەویش دەمرێتو
لەنێوان تاریکیو نوردا
دەستو پەل ئەکوتێ

□

بە پەلە
لە سەعاتو لەسەتاکان
ڕائەکەین
کەچی سەعاتو ساتەکان
بازەیی ئەخولێنەوە

□

کامە دەستە
کە نەردی چارەنوس
لەگەڵ مندا ئەدۆڕێنێ و
من شەشدەرم
بەڵام ئەمجارەیان دۆڕاو ئەوە
چونکە منی وەها ئەوێ
براوەبم
لە ئاسۆدا
مردووەکان
کە نەزومانێکیان هەیەو
نەقسەیەك
بەڵام سیحری بێدەنگیو تاریکی

من بۆ لای خۆیان
بانگهێشت ئەکەن

□

هەندێ جار لە خۆمان
قوڵتر دائەچین‌و
بێهودە بانگ لە خۆمان ئەکەین‌و
بە سەختی بە لێواری
تیژ خەمدا دێینە سەرێ
کە بەخۆشمان گەیشتین
سەرەگێژەی گێژاویش
بۆلای خۆیمان بانگ ئەکا

□

هەرچی رۆژە
تۆزی مردن‌و
جاری واشە زۆر مردن
بۆ وەی زیندوو بین

□

هەرکاتێ
دەستم بە زانستێک گەیشتووە
مەزنتر لە شادی‌و
لە خەم
بەڵام قەت قەت هیچم نەزانیوە
چونکە زانین کاری من نەبووە

□

ئاوێتەی خەون‌و خولیای جیهان
ببین
بی ئەوەی بزانین
کی‌یە کە خە بە دنیاوە ئەبینێ

□

رۆژان
مێشکمیان گسک داوەو
رووبارەکان
لە دەنگی خۆیانیان پڕکردووە
شەوەکانیش
بۆ جێگایەکی دوور دەستیان بردووە
کە خۆشم نازانم کوێیە

□

پامان چەند قورسە
ئەڵێی لە خۆڵ یان
لە خشتە
چەند لەسەر خۆ ئەڕۆین
ئەڵێی بە نیازین
ببینە خۆڵ

□

من ئیدی
لەو دوورە دەستانەوە
نزیکەکانیش لە دوورەوە
ئەبینم

□

دەست لە هەموو شتێک
بسوین
بەڵکو ببینین
بەڵکو بزانین
ل تاریکی رۆحی خۆماندا
هەموو تشتێک بچێژین
بەڵکو هەرگیز جیهان
فەرامۆش نەکەین

□

ژیان مۆڵەتێکی دوایی هاتووەو
یاریەکی دۆڕاو بوو
ئەوەشی رابورد
دڵەراوکەو چاوەڕوانییەك بوو
خەریکە بنەبڕ ئەبێت

□

مەرگ لە جەستەمدا
شپرزەو بێقەرار
هەڵات هەڵاتێتیو
من لە خەمو
شپرزەییەدا
خۆم بەهاوبەشی ئەزانم
بە مەرگ
کۆتایی بە وەهمەکانمان
ئەهێنین
وەك وەهمێکیش
پێ بەپێی مەرگ ڕێ ئەکەوینو
ڕەنگە بشکەڕێینەوە
بۆ دنیای وەهمەکانمان

□

ڕۆشتنو نوستن
لەژێر خاکی وشلو
تینوو
ڕەگەکان بۆلای خۆ
بانگکردن
بە دڵۆپە ئاوانەی
کە لە لەشماندایە
ئێمە ئەبین بە بەردو
ڕێگایەکی دووریش نییە
بەڵام تا دوبارە دێتن
تا دووبارە وتن
چ ڕێگایەکی دوورە

□

ئەگەر ڕۆیشتوییەك
ئەهاتەوەو
باسی مەرگی بۆ ئەکردین
ئیدی ئەو ڕۆیشتوو نەبوو
چونکە بە زمانی زیندووان
دوابوو

□

لەولایەوە
کەدێو
کە لەوێوە دێت
لەکام لاوەیە
مەرگ کەدێت

□

ڕۆژەکانو کارەکانو
کارەکان بەدوای یەکدا دێن
هەروەکو دانە تیژەکانی مشار
یان دانە وردەکانی بڕبەند
ئێمەش هەر کەم ئەکەینو
ئەسوێین

□

لەگەڵ مردن
دووبارە لە خاکدا ئەوەستینو
هەڵایژێین
لەسەر ڕاستەڕێی خاکیشدا
دەیئاژوین
هەر لەو شوێنەدا کە هەین
هەر لەوێدا کە خەوتووین

□

پێکەوە تانخوبی گریان
ئەڕۆین
وەلێ ناگرینو
دووبارە تامەزرۆی خەم
ئەگەڕێینەوەو
دووبارە ئاوات بەگریان ئەخوازین

□

هەموو شتێك
لە بێدەنگیدا ئەمرێ
گرکانی "با"
ئاگادار کەن

□

خەم چ قوڵاییەکی لەبن نەهاتووی
هەیە
ئەڵێی زەیایەکە
شەپۆل ئەداتو
تاشە بەردێك بۆ تێکشکاندنی خۆێ
نادۆزێتەوە

□

بەکوڵ بگرین
بەسەر ئەوەیدا کە هەیە
چونکە بێجگە لە بوون
چارەیەکی تر نەبووەو
بێجگە لە رۆیشتن
چارەیەکی نییە

□

مەرگ
وەك بەرد
بێئەوەی بزانین بۆچی
بێدەنگو سادە
بێئەوەی چاکی بناسین

□

بیرو هزرم
چیتر نافڕێ
بەڵکو دائەکەوێ
ئیدی باڵندە نییە
بەردێکە دائەکەوێ

□

دەستی خاك
چەند درێژە
بۆ هێنانو بردنمان

□

ئەوی شادیو خەم بێ
با هەمووی ئەبا
هەروەك پووشو پەڵاش
دەستی رۆژگار
بیرەوەریەکانم گسك ئەداتو
نیش یادێك لەخۆم
خۆم ب فەرامۆشی ئەسپێرم

## دەفتەری دووەم

### ئاسمانی وشەکان

تۆ بەسەر ئاوەکانەوە
ئەرۆیشتی
وەکو گوڵ کە دوایی هاتبێ
یان ئارەزوویەکی ناتەواو

□

لە ساتەکانی خەمو
تەنیاییدا
لەگەڵ رۆحی خۆمدا
بووم بەیەك
ئیدی بوار نەما
تا لە ساتەکانی عەشق بێخەیاڵیدا
لەگەڵ جەستەمدا ببم بەیەك

□

بە پلیکانەکانی بیرەوەریدا
سەرکەوین
تا قوڵایی خەم
وەك فوارەکان
کە هەڵئەچنو سەرنگون
ئەبنەوە

□

جگە لە نور ڕێگایەکی ترمان
نییەو
دەبێ بەهەمان خێرایی بڕۆینو
باکمان نەبێت
لەوەی ئەوسەری
کاکێشانەکان تاریکن

□

شیعر ئیقلیمگیرە
وەکو مژی بەیانیان
هەموو شتێکیش تا ئاستانەی
خەون ئەباو پاشان
شنەیەك ئەیرەوێنێنەوە

□

ئاوەڕوانییەکین
وەکو سێبەرێك لەئاودا
ئاوات بە شنەیەك ئەخوازین
بمانفڕێنێو بمانداتەوە
بەئاو و بە ڕووناکی

□

فڕکردنی شیعر
لە ڕۆخی جیهاندا
وەکو ڕێبوارێك
لە ڕێیەکی دوورەوە هاتووەو
لەکەنار دێیەکدا
کانیەکی دۆزیوەتەوە

□

لەسەر وشەکان ئەخزێم
وەکو لەسەر پانتایی
ئاوێك
یان ڕووناکیو
خۆم لە وشەکان جیا ناکەمەوە

□

هاتبووم
تا گوڵێ بچنم
یان درەخت بڕوێنم
بەڵام وەرزی بەهارو خەزان
رابوردوونو
دەستەکانی منیش لە
نوسینی ناوی درەخت گوڵ
سواوە

□

هەرگیز دیدار سیانا نابێت
چونکە وێنەکان لە
ئاوێنەکاندا زۆرنو
دەبێ زۆر بڕۆین
بۆ نەگەیشتن
بە دوایین وێنە

□

لە هەر نیگایەکدا
ئەڵێی جیهان بەخەو
ئەبینینو
لەگەڵ هەر هەناسەیەکیشدا
قوڵتر دائەچین لە خەودا

□

وتەیەك وەکو ڕۆح
دوو باڵی لە وشە
وتەیەك وەك شیعر
دوو باڵی لەهیوا
بێ بڕانەوە
هەڵفڕین

□

دەرفەتی جیهان
هەر ئەوەندەیە

پەپوولەیەك لەسەر گوڵێکەوە
بچێتە سەر گوڵێکی تر
وەڵێ تەمنی جیهان چەند درێژەوە
دەرد چەند بێ بڕانەوە
ئەنوێنێت

□

ئەگەر بۆ درەختەکان
بنوسم
کێ قسەکانمان پێئەگەێنێ
کەواتە چاکترە
هەروەکو درەختەکان
بێدەنگ بهو
جلی سەوز بپۆشم

□

کاتی ئەوە هاتووە
لە بێدەنگیدا
سەیری سەمای لقەکان کەم
تەماشا فڕینی گەڵاکان
کاتی ئەوە هاتووە
ئەوی ئەیبینم بیزانم

□

ئاوەکان چەند بە ئەسپایی
ئەخوێنن
ئەڵێی لە خەودان
یان پێ لەشوێن پێی
ئاوازەکانی دوێنێ
دائەنێن

□

ئەم ئاوانە
بەژێر کام پرددا دەڕۆن
ئەم پردانە دەستی کامە ڕۆخ
لە دەستی ڕۆخی دی دەنێن

ئەی خەمە چۆنو ا ئەڕوا
کە دەنگی نییە

□

هەموو ساتێك
خەڵاتێکە
پڕە لە دنیا
کە دەبێتە هیچ
دیسان ساتێکی ترە
پڕ لە دنمیاو
خەڵاتێکە

□

ئەوەی کە دنیا هەیەو
دوا منیش هەر ئەبێ
چ شادیەکی مەزنەو
چ خەمێکی بێ کۆتایی

□

ئێمەش بۆ ساتێك
وەك دڵۆپە ئاوێ
کە تیشکی خۆری بەرکەوتووە
ئەدرەوشێنەوەو
پاشان تەواو ئەبین

□

لە شیعر ورد ببینەوە
ئەڵێی ئاسمانێکە
پڕ لە ئەستێرە
باسی ئاسمانو ئەستێرەش بکەین
ئەڵێی شیعرێکی جوانە

□

ئیشراق
کە بە کۆتایی خۆمان ئەگەینو
وەك ڕۆژ ئەسوتێین
لە ئاستانەی خۆردا

کامه پەردە لادراوە
وا ئەم هەموو نیگاو دەنگو
رەنگو گفتوگۆیانە
دەرکەوتوون
کام خۆرەتاو
نیگاو دەنگکانی رووناك کردووەتەوەو
رەنگەکانی دەرخستووە

□

لە چاوی شیعرەوە
بڕوانینە شیعر
یانی ئاوێنەیەك
لە بەرانبەریدا رائەگرین
بۆ وەی بە رووناکی ئاوێنەو
تیشکی هەتاودا بیناسینەوە

□

ئێمە لە گوڵێ یزاتر
چ نین
ئەو دەمەی لێو هەڵئەمێنینو
ئەدوێین
ئاسمانیش بزەی گوڵو
قسەی ئێمە
وەك یەك ئەبینێ

□

وشەکان
لە خاکی دڵدا ئەچێنین
بۆ ئەوەی لە خاکا
یان لە ئاسمانا
گوڵێکی لێ بپشکوێ

□

جیهان هەیە
بەڵام ئێمە
جارێکی دی دەیڵێنەوە
بۆ وەی جیهان
زۆرتر لەوەی هەیە ببێو
ئێمەش ببین
زۆرتر لەوەی کە هەین

□

دوو باڵمان لە وشەگەرەکە
بۆ هەڵفڕینو
ئاسمانێ لەوتن
بۆ بونی خۆمانو دنیاش
دەبێ قسەمان هەبێ

□

کەناریەکەم
لەرکەی زەماندا دەخوێنێ
کاتێ منیش باڵندەیەکی باڵ رەنگینە
کە دەخوێنێ

□

ئێمە ناوئەبەینو
جگە لە ناو
هیچی تر نامێنێتەوە
لەوەی کە هەیە

### دەفتەری سێیەم

پردێك ئەبینم
ئەو ئاوانەی کە ئەڕۆن
باسی تۆ ئەکەن
چونکە شوێن تۆ کەوتونو
ئەگرین
ئاخ تۆ لە زمانی
ئەوانەوە ئەبیستم
ئەو ئاوانەی ك ئەڕۆنو
ئیتر ناگەڕێنەوە

□

هەموو چاو بوو

هیچم بۆ وتن نەبوو
بۆیە بەبا
لەسەر ئاو ئەمنوسی‌و
سەیری ئاسمانم ئەکرد

□

سێڵاوە نهێنییەکانی
عەشق
کە ئەستێرەو پەڕەی گوڵەکان
ئەبەن
سێڵاوێکە بە هاریەکانی
کە بێقەراراە گۆڕانی
ئەڵێن

□

دەستەکانم ئاوەڵە کردبوو
نەمئەزانی
ئۆقیانوس هاتبوو
لە ئامێزی مندا پلی ئەدا
ئێمە لە گۆڕانیەکدا
دەستمان دابووە دەستی یەکترو
بە ئاوازێ ئەڕۆیشتین
ڕێگای بیر بردبوینەوەو
چاڵاوی دووریش

□

ئەگەر پێی ڕۆیشتم بوایە
لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا
بە رووی دنیادا ئەکەنیم
ئەگەر دەرفەتی مانەوەشم بوایە
جێگایەکم بۆ خەمی خۆم
ئەدۆزمەوە

□

ئەڕۆم
چاو لە ڕێگاو
پێشم بە شوێنی دڵمدا
ئەڕوا
ئەو دڵەی ئەیەوێ
لە هەموو ڕێگاکاندا ون بێ

□

نەمئەزانی
لەشوێن پێتدا
سەوزایی شین ئەبێ‌و
گوڵ دەئەخات
گەر ئەمزانی
تۆم سەرگەردانتر ئەویست
ئەوی ئاوی ڕەوان
ئەگەر ناوی خۆت بردبوو
شیعرێمک بە زمانی ئێمە
وتبو
ئەگەر ناوی ئێمەشت بردبوو
خواوەندێك بوون‌و
شوێنت کەوتبوین

□

ریشەکانم
لەگەڵ ڕەگی گشت گیاکان
لە خاکدایەو
دەستەکانیشم
لەگەڵ دەستی هەموو گیاکان
لەبەر بایە

□

ڕووناکیەکان
بۆلای خۆیانم کێش ئەکەن
چما منیش پەپوولەیەکم
یان ڕووناکیەکان وەکو ئاو
لەشم سوک ئەکەن

□

درەختەکان
ئەڵێی رکاسێکی فرمێسکینیان
لەبەردایەو
بێدەنگ ئەگرین
بێدەنگ ئەگرین
ئەو کاتەی خاکی پاییزی
بەگەڵاکانیان ئەڕەنگێ
دڵی من سەما ئەکاو
لەبادا ئەڕوا
هەروەکو گەڵایەك
یان گەردیلەیەك
کە لەتیشکی خۆردا
دەستو پێکی گوم کردبێ

□

درەختەکان بێننەوە
ئەوکاتەی با
لە دەستمانی ئەفرێنێ
هەورەکانیش بگێڕنەوە
ئەو دەمەی کە زریان
بەرەو ئاسۆییاند
رادەدن

□

رۆژ
دەست لەناو دەستی بادا
لەسەر هەموو گەڵایەك سەمای ئەکرد
دەنگی پاییز ئەهاتو
گریانی هەور نزیك بوو
رۆژێکی پاییزی بوو
وەك ئاوی روونی کانییەنك

□

سیمات هەورینە
خەمێکی دێرینەی لەگەڵدایە
منیش خوڕەی باران
لەو دیو نیگاتەوە ئەبیسم

□

من چوزانم
تۆ لێرەوە رۆیشتووی
من چوزانم
تۆ بە ناوێك
بانگت کردوم
من میوانێکی غەریبو ناوەخت بووم

□

چاوم بڕیوەتە سپێتی کاغز
لەچاوەڕوانی هەڵقوڵێنی
کانییەك
یان فڕینی باڵندەیەك
هەر لە سپێتی ئەویشەوە
چاوەڕوانی موعجیزەیەکم

□

دەستی ئەستێرەیەکی
دوور بوو
کەوشەی لە دەمی تۆ فڕاند
یان با بو
بەسەماوە هات
تا گوڵێ لەزارت بکاتەوە

□

ئەی رۆژ
تۆ بۆ ساتێ
چاوەکانت نوقانو
ئێمەت لە خەودا بینی
بەڵام ئێمە هاتینو
خێار رۆشتین

□

* لە دیوانی (روزا نەها) وەرگیراوە

# نـــــابـــــەزن

■ چیرۆکی: سۆمەرست موم

● و: ئەکرەم قەرەداغی

گەڕایەوە بۆ موبەقەکە، پیاوەکەی کە ئەم لێی دابوو هێشتا لەسەر زەویەکە بوو، دەمو چاوی خوێناوی بوو بەدەم ئازاریشەوە ئەینالاند، ژنەکە پشتی دابوو بەدیوارەکەوە و بەدووچاوی پڕ لە مەترسیشەوە ئەیڕاونیە (ویلی)ی هاوڕێی، کە ئەو گەڕایە ژوورەوە، ژنەکە بەکسپەوە دەستی کرد بەگریان، ویلیش لەبەردەم مێزەکەدا دانیشتبوو دەمانچەکەی بەدەستەوە بوو بەتەنیشتیەوە شوشەیەکی نیوە بەتاڵی شەرابی لێ بوو. (هانس) کە لەمێزەکە نزیك بوەوەو پەرداخەکەی لێ پڕ کردو بەیەك قوم نای بەسەریەوە.

– (وادێتە بەرچاوم هەروەك لەگێچەڵێکدا بیت وایە، هاوڕێ گەنجەکەم) (ویلی) ئەمەی بەزەردەخەنەیەکی درێژەوە وت.

دەمووچاوی هانس خوێناوی بوو، بەئاسانی ئەتوانرا جێگەی پێنج نینۆکی تیژی پێوە ببینرێ بەهێواشیو زۆر ئاگاداریەوە دەستی برد بۆ روومەتی وتی:

– (ئەگەر بیتوانیایە، قەحبەیە ئەیویست چاوم دەربهێنێت، ئەبێت برینەکە بەیۆد بسڕم وابزانم ئێستا باشترە، بچۆرە ژوورەوە بۆ لای).

– (نازانم، واهەست دەکەم درەنگ بووە).

– (بێ عەقڵ مەبە، تۆ پیاوی، وانییە؟! بادرەنگیش بێت، ئێمە رێگامانون کردووە).

هێشتا رووناك بوو، تیشکی خۆر خەریك بوو بەرەو ئاوابوون دەچوو، لەپەنجەرەکانی موبەقەکەی خانووە کێلگەییەکەوە ئەهاتە ژووری، (ویلی) بۆ ساتێك دوو دڵی کرد، کورتە بالایەکی دەمو چاو تۆخێکی لاواز بوو، لەکاتی ئاشتیدا لەنەخشەدانانی جلو بەرگدا کاری دەکرد، ترسا لەوەی کە (هانس) بەنێرەمووکی دابنێت، بۆیە هەستاو بەرەو ئەو دەرگایە چوو کە(هانس) لێوەی هاتە دەرەوە. کاتێك دایکەکە ئەوەی دی قیژاندیو بەقەڵەمباز بەرەو رووی چوو: و بەهەموو دەنگی هاواری کرد:

– (نا.. نا... نا..).

(هانس) بەیەك هەنگاو گەیشتە بەردەمیو هەردوو شانی گرتو بەهەموو هێزی بەرەو دواوە پاڵی پێوەنا، ئەویش بەم لاولادا هاتو کەوت، خۆشی دەمانچەکەی (ویلی) هەلگرتو بەفەرەنسیەکی نیمچە ئەڵەمانی هاواری کرد.

– (هەردوکتان لەجێگای خۆتان بوەستنو مەجوڵێن)و بەسەریشی ئاماژەی بەرەو دەرگاکە کردو بە(ویلی) وت:

– بچۆرە ژوورەوە خۆم ئاگاداری ئەمان ئەکەم).

(ویلی) ڕۆیشت بەڵام پاش کەمێك جارێكی دی گەڕایەوەو وتی:
- (کچەکە بوراوەتەوە).
- (جا بابورابێتەوە).
- (ئاخر ناتوانم، باش نیە).
- (بێ عەقڵ، تۆ هەر ئەوەیت، تۆ ئافرەتیت؟!).
(ویلی) خوێن ڕژایە دەمووچاویەوە وتی:
- (واباشترە بەرەو ڕێگاکەی خۆمان بڕۆینەوە)
(هانس) بەگاڵتە پێ کردنەوە شانی جووڵاندو وتی:
- (بالەپێشا شووشە شەرابەکە تەواو کەم. ئەوسا ئەڕۆین).
- (هانس) هەستی بەجۆرە حەسانەوەیەك ئەکردو پێی خۆش بوو زیاتر بمێنێتەوە، لەبەیانیەوە کاری ئەکرد،و پاش ئەو هەموو سەعاتە زۆرەش بەسواری ماتۆڕەکەیەوە، پەلەکانی تەواو ئازاری ئەدا، لەبەختی خۆشیان سۆیسۆنس (Soissons) کە سەربازگەکەیان بوو، زۆر دوور نەبوو، هەردە پانزە کیلۆمەترێك دەبوو. (هانس) ئاواتی ئەوەبوو جێگایەکی بدیایە، تالەسەری بنوێت، بێ گومان کارەساتەکەش رووی نەئەدا ئەگەر کچەکە نەفام نەبوایە، خۆیو (ویلی) ڕێگاکەیانون کردبوو، گوندیەك کە لە کێڵگەیەکدا کاری دەکرد وەستانیانو دەربارەی ڕێگاکە پرسیاریان لێ کرد، ئەویش بەئانقەست لێی ون کردن، ئیتر خۆیان لەڕێگایەکی لاوەکیەوە دیەوە، کاتێك گەیشتنە کێڵگەکە، وەستان بۆ ئەوەی دەربارەی ئاراستەی ڕێگاکە بپرسن،و زۆر بەئەدەبەوە پرسیان، چونکە فەرمانیان واپێ کرابوو کە مامەڵە لەگەڵ خەڵکە فەرەنسیەکاندا بەچاکی بکەن،و خۆشیان ڕەفتاریان زۆر باش بێت، دەرگاکەیان لەلایەن کچێکەوە بۆ کرایەوە کە پێی وتن نازانێت ڕێگای سۆیسۆنس لەکوێوەیە.
خۆیان بەپاڵ چوونە ژوورەوە، ئەوکاتە ژنەکە ڕێگاکەی پێ وتن، (هانس) زانی دایکی کچەکەیە، هەرسێکیان، جوتیارەکەو ژنەکەو کچەکەی ئەوکاتە لەنان خواردنی ئێوارە ببوونەوە، تانەو ساتەش شووشە شەرابەکە لەسەر مێزەکە بوو، (هانس) بەشەرابەکەدا بیری کەوتەوە کە وەك شەیتان تینویەتی. ڕۆژ زۆر گەرم بوو، ئەویش لەنیوەڕۆوە هیچی نەخواردبووەوە، داوای شوشەیەك شەرابی لێ کردن، ویلیش پێی وتن کە بەباشی پارەکەی ئەدەن، (ویلی) پیاوێکی باش بوو، بەڵام نەرم بوو،


سومرست موم
بەقڵەمی: گراهام سوترلاند

لەپاشدا ئەی ئەوان سەرکەوتوو نین؟ کوا لەشکری فەرەنسیەکان؟ تەفروتونا نەبوون؟ ئەی ئینگلیزەکان یان شتەکان لەپاش بەجێ نەماو وەك کەروێشك لەترسا بەرەو دۆرگەکەیان نەبوونەوە؟ لەشکری سەرکەوتوەکان بۆی هەیە هەموو شتێك بۆ خۆی بەرێ جا وانی‌یە؟ بەڵام (ویلی) لەیەکێك لە ماڵەکانی جلوبەرگدا لەپاریس کاری کردبوو، ئەو کارەش فێری فەرەنسیەکی باشی کردبوو، لەبەر ئەوە خستبویانە ئەو ئیشەی ئێستایەوە. ئای کە قەومێکی بۆگەنن، بۆ ئەڵەمانیەکان واچاکە لەناویاندا ئەژین.

ژنی جوتیارەکە دوو شوشە شەرابی بۆ خستنە سەر مێزەکە. (ویلی) بیست فرەنکی لەگیرفانی دەرهانیو یایە، ئەویش هیچورتەیەکی لەدەم دەرنەهات تەنانەت سوپاسیش.

(مانس) وەك (ویلی)ی هاوڕێی فەرەنسی باش نەئەزانی. بەلام ئەیتوانی ئەو شتانەی ئەیەوێت تیان بگەیەنێ. هەندێك جار بەیەکەوە لەگەڵ (ویلی) هاورێیدا بەفەرەنسی ئەدوان، ویلیش هەڵەکانی بۆ چاك ئەکردەوە، (ویلی) زۆر بۆی چاك بوو، هەر لەبەر ئەمەش بوو کردبووی بەهاوڕێیو ئەشیزانی کە ویلی پێوەی موعجیبە. پێوەی موعجەب بوو، چونکە بالا بەرزو باریكو ناوشان پان بوو، هەروەها قژێکی زەردباوو دووچاوی شینی هەبوو. (مانس) هەمیشە هەوڵی ئەدا بۆ ئەوەی زمانە فەرەنسیەکەی تاقی بکاتەوە ئێستاش ئەیویست قسە بکات، بەلام ئەو سێ فەرەنسیە، نیوەی رێگاکەشیان بۆ خۆش نەکرد، پێی وتن ئەویش کوڕە جوتیارەو هەر کاتێك جەنگ تەواو بوو ئەگەڕێتەوە بۆ کێلگەکەی خۆی، کەسوکاری ناردویانەتە قوتابخانە لەمیۆنیخ، چونکە دایکی ئەیویست لەبازرگانیدا کار بکات. بەلام ئەم حەزی لەبازرگانی نەبوو، کاتێك قوتابخانەی تەواوکرد چووە کۆلێژی کشتوکاڵ.

کچەکە وتی: (ئێوە هاتوون بۆ ئەوەی دەربارەی رێگاکە بپرسن، ئەوا رێگاکەتان زانی، دەفەرموون، شەرابەکەتان بخۆنەوە لێرە دەرچن).

لەوەپێش سەیری کچەکەی زۆر نەکردبوو، بەلام ئێستا سەرنجی دایە، جوان نەبوو، بەلام دووچاوی رەشی جوانو لوتێکی قنجی راستی پێوە بوو، دەمو چاوی بێ رەنگ دیار بوو، کراسێکی ساکاری لەبەردا بوو، شێوەی دوور لەخۆی دەنواند، شێوەیەکی تایبەتی دەنواند، لەو کاتەوە کە شەڕ دەستی پێ کردبوو، زۆر شتی دەربارەی کچە فەرەنسیەکان بیستبوو، ئەیان وت: مرۆڤ، ئەو شتەی لای کچە فەرەنسیەکان ئەی بینێ، لای کچە ئەڵەمانیەکان هەرگیز دەستی ناکەوێت، (ویلی) وتی، ئەو شتەش چەلەنگی (شیکی)یە کە ئەو لێی پرسی مەبەستی لەمە چییە؟ ویلی تەنها ئەوەندەی وت کە پێویستە خۆت بەچاوی خۆت بیبینیو تێی بگەیت، هەروەها گەلێك قسەی تری بیستبوو کە کچە فەرەنسیەکان هەموو خزمەتێك لەپێناوی پارەدا دەکەن، و زۆر ساردو سڕو رەقن هەروەك نینۆك، لەدڵی خۆیداو

وتی: هەرچۆنێك بێت هەفتەیەکی دیکە لە پاریس دەبنو بەچاوی خۆی هەمووی ئەبینێ، ئەشیان وت: سەرۆکایەتی فەرماندە،ماڵی تایبەتی ئامادەکردووە بۆ پیاوە ئەڵەمانیەکان تابچن بۆی.

ویلی وتی: (شەرابەکەت تەواو کە بابڕۆین). بەلام مانس هەستی بەجۆرە حەوانەوەیەك ئەکردو حەزی نەئەکرد خێرا بکات، بەکچەکەی وت:

– (تۆ لە کچە جوتیار ناچیت)

کچەکە وتی: (جا ئەمە چییە؟).

دایکەکە وتی: (مامۆستایە)

مانس وتی: (کەواتە تۆ رۆشنبیرییەکی باشیشت هەیە) کچەکە بەگاڵتە جاریەوە شانی جوڵان.

مانس کە ئەو کاتە سروشتی باشتر بو بو بەزمانە فەرەنسیە خراپەکەی وتی:

– (پێویستە ئەوە بزانیت کە ئەمە چاکترین شتە بەسەر گەلی فەرەنسیدا هاتبێت، ئێمە شەرمان دەست پێ نەکرد، ئێوە شەڕتان دامەزراند، ئێستاش ئێمە وا لەفەرەنسا دەکەین کە ببێتە ولاتێکی خاوەن شکۆو مەزن، ئێمە یاسای بۆ دائەنێین، فێری کارکردنتان ئەکەین، ئێوەش مانای ئیتاعەتو یاسا فێر دەبن).

کچەکە توند دەستی خۆی گوشی، چاوەکانی لەرقدا رەشتر بوبون، سەیری کرد، بەلام هیچی نەوت. ویلی وتی: (مانس تۆ سەرخۆشیت).

– (من ئاگام لەخۆمە وەك قازی، و تەنها راستیشم پێ وتن، باشتریشە بۆیان ئەو راستیە لە ئێستاوە بزانن).

– (ئەو راست ئەکات) کچەکە قیژاندیو توانای نەما زیاتر دان بەخۆیا بگرێ. (تۆ سەرخۆشی بڕۆ دەرەوە) برۆ دەرەوە هەر ئێستا).

– (نا، کەواتە تۆ ئەڵەمانیش ئەزانیت وانیە؟، زۆر باشە من ئەڕۆم بەلام تۆ لەپێشەوە ماچێکم بەرێ) کچەکە هەنگاوێك چوە دواوە بۆ ئەوەی لێی دوورکەوێتەوە بەلام ئەو توند مەچەکی گرت، کچەکە قیژاندی:

– ( بابە.. بابە..)

– باوکەکە خۆی هەڵدایە سەر ئەڵمانیەکە، مانس لەکچەکە بووەوەو بەهەموو هێزی زلەیەکی سرەواندە دەموو چاوی پیاوەکە، پیاوە فەرەنسیەکە بەزەویدا کەوت، بەهەردوو دەست توند کچەکەی راپسکاند، پێش ئەوەی رابکات، کچەکەش بەهەموو هێزی خۆی

زلەیەکی سەرەوانده دەمووچاوی هانس، ئەویش پێکەنی و دانەکانی ریچ کردەوەو وتی: (ئاوا رەفتار ئەکەی کە سەربازێکی ئەڵەمانی ئەیەوێت ماچت بکات؟!) ئەبێ نرخی ئەم کردارەت بدەیت.) توند دەستی گرتو بەهەموو هێزی رای کێشایە دەرەوەی ژوورەکە، بەڵام دایکی کچەکە بەدوایدا رایکردو جلەکانی گرتو ویستی رای کێشێتەوە بۆ ناوەوە، ئەوکاتە بەدەستێکی توند کچەکەی گرتو بەدەستەکەی دیکەی توند پاڵی نا بەدایکەکەیەوەو کێشای بەدیوارەکەدا. ویلی قیژاندی: (هانس.. هانس.. هانس وس بە نەعلەتت لێ بێ).

– هانس توند دەستی خستە سەر دەمی کچەکە بۆ ئەوەی هاوار نەکاتو هەڵی گرتو بردیە دەرەوەی ژوورەکە ئائەمە رویدا، تۆش لەو بڕوایەدای کە کچەکە خۆی کارەساتەکەی بەسەر خۆیدا هێنا، یاپێویست وابوو زلەکەی نەوەشاندایە، ئەگەر ماچەکەشی بدایەتێ، ئایا بەکاری خۆیەوە ئەڕۆیشت؟!!).

هانس، سەرنجێکی گرتە جوتیارەکە، ئەوکاتەی لەسەر زەویەکە کەوتبوو، هەڵنەسابووەوە، بەهەزار حاڵ، بەهۆی دیمەنی دەمو چاوە سەیرەکەیەوە، خۆی بۆ گیرا، پێنەکەنێ، هەروەها زەردەخەنەیەك لەچاوەکانیەوە ئەبینرا، کەسەیری ژنەکەی کرد هێشتا لەترسا بەدیوارەکەوە نوسابوو، ئایا ئەترسا؟

ئەیزانی دەوری ئەویش هاتووە؟ نەخێر، ئەم کارە زۆر دوورە، پەندە فەرەنسیەکەی بیرکەوتەوە کە ئەڵێت: (هیچ شتێك نیە، تازە، پیرێژنێك بۆی بگری)

ئەوەی روویدا، ئەبوایە رووی بدایە، ئێستا، یاهەر کاتێکی دیکە، دەستی برد بۆ گیرفانی پانتۆڵەکەی و جزدانەکەی دەرهێنا: (تەماشاکە ئەمە سەد فرەنکە بامادمۆزێل کراسی نوێی پێ بکڕێت، کراسە کۆنەکەی دڕاوە.) پارەکەی خستە سەر مێزەکەو خودەکەی کردەوە سەری بەهاوڕێکەی وت: (بابڕۆین..).

چوونە دەرەوە،و دەرگاکەیان بەقایم پێوەیاو سواری ماتۆڕەکە بوونو بۆی دەرچوون، ژنەکە چووە ژووری دیوەخانەکەو تەماشای کچەکەی کرد لەسەر سەکۆکە راکشاوە، هەروەك چۆن بەجێیان هێشتووە، ئاوەها، و بەخەمباریەوە ئەگریا.

سێ مانگ تێپەڕی، هانس جارێکی دیکە خۆی لە سویسۆنس بنینەوە، لەپاریس لەگەڵ لەشکری سەرکەوتوودا مابووەوە، بەماتۆڕەکەیەوە بەژێر کەوانی سەرکەوتن (Arc de triomphe)دا ڕۆیشتبوو، هەروەها لەگەڵ لەشکرەکەیدا بەرەو تۆر، ئەوسا بەرەو بۆردۆکس چوو بوو، شەڕێکی کەمی دیبوو، دەربارەی سەربازی فەرەنسی لەدیلی زیاتر نەبوو، گەشتەکەی زۆر بەتامو خۆش تر بوو لەوەی بەبیریا دەهات، پاش ئەوەش کە شەڕ وەستان لەنێوان ئەڵەمانیاو فەرەنسادا بڵاوکرایەوە، مانگێکی دیکە لە پاریس مایەوە، هەندێك پۆستکارتی بۆ کەسو کاری لەباڤاریا ناردو دیاری زۆری بۆ کڕین.

ویلی لەپاریس مایەوە، چونکە لەبەری دەستی خۆی زیاتر شارەزای شارەکە بوو، بەڵام ئەو لەگەڵ پاشماوەی (کتیبە)کەی بەرەو سویسۆنس رەوانە کرا بۆ ئەوەی بگەنە لای ئەو هێزەی دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرتبوو شارێکی خنجیلانەی جوان بوو، زۆر دڵی بەخواردنو مانەوە تیایدا دەکرایەوە. خواردن تیایدا زۆر بوو، شەمپانیاش زۆر هەرزان بوو، شوشەیەك مارکێکی لەپارەی ئەڵەمانی کەمتر بوو، کە فەرمانی رۆیشتنیشیان بەرەو سویسۆنسی پێ سپێردرا. بیرێکی خۆش بەمێشکیا هات، بۆ نەچێتو چاوێکی بەکچەکە بکەوێتەوە، جوتێك گۆرەوی ئاوریشمی بۆ ئەبات بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە هیچ جۆرە هەستێکی خراپی بەرامبەری نیە، جێگاو رێگاکانی زۆر باش ئەزانی، لەبەر ئەوە بێ ئەرك ئەتوانێت کێڵگەکە بدۆزێتەوە.

دەمەو ئێوارەیەك کە ئیشی نەبوو، گۆرەویە ئاوریشمەکانی خستە گیرفانیەوەو سواری ماتۆڕەکەی بوو، رۆژێکی خۆشی پایز بوو، زۆر بەزەحمەتیش پەڵە هەورێك چیە بەئاسمانەوە ئەئەدۆزرایەوە، بەرەو ناوچە لادێییە پێچاوپێچە جوانەکە رۆیشت، بەهۆی ئاو هەوا خۆشەکەیەوە، ناوچەکە هێشتا تەڕ نەبوو، لەگەڵ ئەوەی لەمانگی ئەیلولیش دابوون، تەنانەت درەختە ژاڵەکانیش ئەوەیان دەرنەئەخست کە هاوین لەکۆتایی دایە، بەهەڵە خۆی کرد بەرێگایەکی سەختدا، هەندێك کاتی لەکیس چوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەنیو سەعات کەمتر گەیشتە جێگاکە.

کە بەرەو دەرگاکە چوو، سەگێکی بچوکی دوورەگی لێ وەڕی، لەدەرگاکەی نەدا. کێلونەکەی باداو چووە ژوورەوە، کچەکە لای مێزەکەوە دانیشتبوو، پەتاتەی پاك ئەکرد، کە پیاوەکەی

بەجلی سەربازیەوە دی، هەستایە سەرپێو هاواری کرد:

– (چیت ئەوێ.؟!!) ئەوسا ناسیەوەو بەرەو دیوارەکە گەڕایەوە، چەقۆکەی توند گرتو وتی: (تۆیت، بێ شەرەف، تۆیت..).

– (تووڕە مەبە، عەزیەتت نادەم، سەیرکە هەندێك گورەوی ئاوریشمم بۆ هێناوی).

– (بیبەو خۆشت لەگەڵیا بڕۆ، نامەوێت فەسالت ببینم).

– (بێ عەقڵ مەبە، چەقۆکە فڕێ دە، پەلەپەل مەکە، بائازارت نەبێ، لێم مەترسە).

کچەکە وتی: (من لەتۆ ناترسم) وازی لەچەقۆکە هێنا کە بکەوێتە سەر زەوی، ئەویش خوزەکەی داکەنو دانیشت، قاچی درێژ کردو چەقۆکەی پێ نزیك کردەوە وتی: (ئەتەوێت لەپاکردنی پەتاتەکەدا یارمەتیت بدەم؟!)

کچەکە هیچ وەڵامی نەدایەوە، چەمایەوەو چەقۆکەی هەڵگرتو پەتاتەیەکی لەقاپەکەوە بەرزکردەوەو دەستی کرد بەپاککردنی، بەڕوویەکی گرژو تێڕوانینێکی دوژمنانەوە سەیری کرد، بەڵام ئەو بەڕوویەکی کراوەو زەردەخەنەیەکی خەم لابەرەوە سەیری کرد.

– (بۆ بەڕقەوە سەیر دەکەی؟ من گوناهم چییە؟ هەروەك ئەزانیت دەمارەکانم لەهەڵچوون دابوو، وەك دەماری هەموومان، زۆرمان دەربارەی لەشکری فەرەنسی بیستبوو، ئەو لەشکرەی هەرگیز نابەزێت، هەروەها دەربارەی هێڵی ماجینۆ...) ئەم رستەیەی بەپێکەنینەوە تەواو کرد، (جگە لەوەش شەرابەکە حەشری پێ کردم، لەوانە بوو خراپترت بەسەر بهاتایە، ژنان پێیان وتوم کە من ناشیرین نیم..).

کچەکە لەژێرەوە بۆ سەرەوە بەرقێکی پڕ کینەوە سەیرێکی کردو وتی: (بڕۆ دەرەوە..).

..... (بڕۆ دەرەوە لێرە..).

– (تاخۆم نەمەوێت ناڕۆم).

– (ئەگەر نەڕۆیت، باوکم ئەچێت بۆ سۆیسۆنس لای ژەنەراڵ شکات ئەکات).

– (ژەنەراڵ، هیچ ناکات، فەرمان بۆ ئێمە وایە کە هاوڕێیەتی لەگەڵ دانیشتواندا پەیدا کەین، ناوت چییە؟!).

– (ئەوە کاری تۆ نیە).

– ڕوومەتەکانی سوور هەڵگەڕانو ڕق لەچاوەکانیەوە ئەباری، لەوکاتەی کە لەپێشدا بینیبوی، جوانتر دەرئەکەوت، هەرچۆنێك بێت زەوقی خراپ نەبوو، ڕەفتاری زۆرتر لەوەی لەکچە لادێییەك بچێت، لە کچە شارییەك دەچوو، ئەوەشی بیرکەوتەوە کە دایکی پێی وت: مامۆستایە، ئارەزووی زیاتر بوو بە تایبەتی کە زانی ڕۆشنبیرە، هەستی بە تەندروست باشیو هێزی کرد، دەستی بەسەر قژە زەردە لولەکەیدا هێنا، لەدڵی خۆیدا تێر پێکەنی، بەبیریاهات، زۆر کچ ئاوات ئەخوازن بۆ ئەوەی کە بۆ ئەم کچە ڕێکەوتوە، تابۆ ئەوان ڕێ بکەوتایە. دەمووچاوی بەهۆی بەرکەوتنی تیشکی خۆری هاوینەوە تەواو ئەسمەر بوو بوو، بۆیە چاوەکانی شین ئەیان نواند.

– "باوكو دایکت لەکوێن؟!"

– "لەکێڵگەکەدا کار دەکەن.

– برسیمە پارچە نانێكو تۆزێك پەنیرو پەرداخێك شەرابم بەرێ، پارەکەی ئەدەم"

کچەکە بە پێکەنینێکی تەوسەوە وتی:

– "سێ مانگی تەواوە، پەنیرمان نەدیوە، ئەوەندەشمان نان نیە برسێتیەکەی خۆمان نەهێڵێت، پێش ساڵێك فەرەنسیەکان ئەسپەکانیان بردین، ئێستاش سەربازە ئەڵەمانیەکان مەڕوو ماڵاتو بەرازو مریشکەکانمانو هەموو شتەکانمان ئەبەن."

– "باشە، خۆ پارەکەیان بۆ بژاردوون"

– "ئایا ئەتوانین ئەو پارچە کاغەزە بێ نرخانە بخۆین کە دایاننێ؟!" ئیتر دەستی کرد بە گریان.

– (تۆ برسیتە؟!)؟

– (نە ء.) بەداخێکی زیاترەوە، وتی: (ئەتوانین وەك مەل لەسەر پەتاتەو نانو قەڕنابیتو کاهوو بژین، باوکیشم سبەینێ ئەچێت بۆ سۆیسۆنس، بۆ ئەوەی بزانێت گۆشتی ئەسپی دەستدەکەوێت تابۆمان بکرێت؟!).

– (خاتوو، گوێ بگرە، من هاوڕێیەکی خراپ نیم، هەندێك پەنیرتان بۆ ئەهێنم، هەوڵیش ئەدەم پارچە گۆشتێکی ڕانە بەرازیشتان بۆ بهێنم).

– (دیاری ئێوەم ناوێ، حەز ئەکەم لەبرسا بمرمو ئەو خواردنەی لێتان دزیوین، نایخۆم، بەرازینە).

بەزمانێکی نەرمەوە وتی: (بابزانین...)و خودەکەی کردەوە سەریو هەستایە سەرپێیو بەفەرەنسی

وتی: (ئۆریڤێر مادمۆزێل) خوا حافیز خاتوونەکە)و چوە دەرەوە.

ئیتر کارەکانی ڕێگای ئەوەی نەئەدا بۆ پیاسە بچێتەوە بۆلادێ، لەبەر ئەوە ئەبوو چاوڕێ بکات تابەکارێکی گرنگ ئەنێرێت بۆ ئەوێ،و ئەوسا سەر لەکێڵگەکە بدات.

ئەمە پاش دە ڕۆژ رووی‌دا، بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت وەك جارەکانی دی خۆی بەماڵەکەدا کرد، جوتیارەکەو ژنەکەی لەچێشتخانەکە بینی، کات نزیکی نیوەڕۆ بوو، ژنەکە خەریکی تێکدانی خواردنێك بوو لەناو مەنجەڵەکەی سەر ئاگرەکە، بەڵام پیاوەکە لای مێزەکەوە دانیشتبوو. کە چووە ژوورەوە هەریەکەیان سەرنجێکی تێ گرت، بەڵام سەریان سوڕ نەما، بێ گومان لەوەپێش کچەکە دەربارەی هاتنەکەی بۆ باوکو دایکی دوابوو، هیچ قسەیان نەکرد، ژنەکە هەر خەریکی چێشتەکەی بوو، پیاوەکە بەڕوویەکی مۆنو گرژی پڕ لەکینەوە تەماشای نایلۆنی سەر مێزەکەی ئەکرد، بەڵام ئەم شتانە لەوە ساکارتر بوون کاریکەنە سەر سروشە خۆشەکەی هانس بۆیە بەفەرەنسی وتی: "بۆنژۆ.. لاکومپاجن "رۆژتان باش هاوڕێیان" بەڕووخۆشترەوە وتی: "دیاریم بۆ هێناوون" ئەو پێچراوەیەی بەدەستیەوە بوو کردیەوە، پارچەیەکی گەورە لەپەنیری گرۆیێرو پارچەیەکی دی گۆشتو دوو قوتو گۆشت ماسی دەرهێنا، ژنەکە ئاوڕێکی بۆ دایەوە، ئەویش هەر کە چاوی بەچاوە برسیەکانی کەوت، زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوی، بەڵام پیاوەکە بەڕوویەکی گرژو مۆنەوە تەماشای خواردنەکانی کرد، هانس بەخۆشیەوە زەردەخەنەیەکی بۆ کردوو وتی: "من زۆر بەداخەوەم بۆ ئەو لەیەك تێ نەگەیشتنەی کە لەنێوانماندا رووی‌دا کە یەکەم جار هاتم بۆ ئێرە، بەڵام تۆ ئەبوایە خۆت نەخستایەتە مەسەلەکەوە.

لەم کاتەدا کچەکە هاتەوە، بەدەنگێکی بەرز قیژاندی:

– "لێرە چی ئەکەیت؟" ئەوسا چاوی بەو شتانە کەوت کە هێنابوی، هەمووی کۆکردەوەو بۆی هاویشتە بەردەمی‌و وتی: "بیبەرەوە.. بیبەرەوە" بەڵام دایکی بەرەو رووی چوو وتی:

– "ئەنێت، تۆ شێتی؟!!.

– "من دیاری ئەوم ناوێ"

– " ئەمانە خواردنی خۆمانە کچم، ئەوان لێیان دزیوین، تەماشای قوتوە ماسیەکە بکە، ماسی بۆردۆکە."

ژنەکە شتەکانی هەڵگرتەوە، هانس بەچاوە شینەکانی تەماشایەکی گاڵتەپێ کردنی کچەکەی کردو وتی:

– "کەواتە ناوت ئەنێتە وانیە؟!" ناوێکی جوانە، بۆ دایكو باوکت لەتۆزە خواردنێك بێ بەش ئەکەیت؟!. تۆ وتت سێ مانگە دەمتان لەپەنیر نەداوە، داخەکەم ئەم توانی پارچەیەك گۆشتی لەمە چاکترم دەستکەوێ.. "

ژنە جوتیارەکە، پارچە گۆشتەکەی گرت بەدەستیەوەو نوساندی بەسنگیەوە، واهەست ئەکرا، هەروەك بیەوێ ماچی بکات، فرمێسك بەچاوەکانی ئەنێتدا هاتە خوارەوە بەسوێوە وتی: "ئاخ.. ئەمە شورەییە،.. ئەمە عەیبە.." هانس وتی:

– "ئەبێ شورەیی چی بێت لەپارچەیەك گۆشتو پەنیردا؟!" ئەوسا دانیشتو جگەرەیەکی داگیرسان، پاکەتی جگەرەکەشی بۆ پیاوەکە درێژ کرد، جوتیارەکە بۆ ماوەیەك دوو دڵ بوو، لەپاشدا خۆی پێ نەگیرا، جگەرەیەکی هەڵگرتو پاکەتەکەی بۆ گەڕانەوە، هانس وتی:

– "هەڵیگرە، ئەتوانم زۆرم دەستکەوێ"

جگەرەیەکی نابەدەمیەوە، مژێکی قووڵی لێ‌داو دووکەڵەکەی لەکونە لوتەکانیەوە هێنایە دەرەوەو وتی:

– "بۆ نەبینە هاوڕێ، ئەوەی ڕۆیشت، ڕۆیشت، شەڕە شەڕە، تۆ ئەزانیت من چی ئەڵێم، من ئەزانم ئەنێت کچێکی رۆشنبیرە، حەز ئەکەم بیرێکی باشی دەربارەم هەبێ، وەك بزانم ئێمە بۆ ماوەیەکی زۆر لە سۆیۆنس ئەمێنینەوە، ئەتوانم جارە جارە، هەندێك شتتان بۆ بهێنم، تایارمەتیتان بدەم، تۆ ئەزانیت ئێمە زۆر هەوڵ ئەدەین، تاهاوڕێیەتی لەگەڵ دانیشتوە فەرەنسیەکاندا پەیدا کەین، بەڵام ئەوان یارمەتیمان نادەن، نەك هەر ئەمە، بەڵکو کە لەرێگادا ئەڕۆین حەز ناکەن هەر سەیریشمان بکەن، هەرچۆنێك بێت ئەوەی کە جاری یەکەم لەگەڵ ویلی هاوڕێمدا هاتم بۆ ئێرەو رووی‌دا، بەڕێکەوت بوو، پێویست ناکات ئێوە لێم بترسن، من رێزی ئەنێت وەك خوشکم ئەگرم"

ئەنێت هاواری کرد: "بۆ ئەتەوێت بێیت بۆ ئێرە، بۆ وازمان لی ناهێنیت؟!.

بەڕاستی ئەویش، خۆشی نەی ئەزانی بۆ حەزی ئەکرد دان بەوەدابنێ کە پێویستی بەهاوڕێیەتی

هەیە، ئەو رقو کینەیەی لە سۆیۆنس دەوری دابوون، دەمارەکانی گرژ دەکرد، زۆر جار حەزی ئەکرد، هەروەك هەر نەبێ، تیرو پەری لێ بدات، یائەم رقو کینەیە وای لێ کردبوو، زۆر جار حەزی ئەکرد تێر تێر بگری، شتێکی خۆش ئەبوو ئەگەر لایەکی بوایەو جارە جارە رووی تێ بکردایەو بەخێرهاتنیان بکردایە، ئەو خۆی راستی ئەکرد کە ئەیوت حەزی لەئەنێت نیە، چونکە ئەنێت ئەو کچە نەبوو کە ئەم خەیالی پێوە خەریك بوو، ئەم حەزی لەکچێك بوو بالای کەلەگەتو مەمکەکانی قوتو چاوەکانی شینو قژی زەرد بێ وەك خۆی، حەزی لەکچێك بوو، بەهێزو پرو تێکسمراوو گۆشتن بێ.

ئەگەر ئەو رەوشتە پاکەی ئەنێت نەبوایە کە هیچ گومانێکی لێی نەبوو، یالوتە تەنکەکەو چاوە رەشەکانیو دەمو چاوە زەردو درێژەکەی، کەهەمووی دەربارەی کچەکە ئەیان ترسان، یائەگەر ئەو رۆژە، هەوای سەرکەوتنە گەورەکانی لەشکری ئەلەمانی لەکەللەی نەدایەو ئەوەندە هیلاكو لەهەمان کاتدا، دڵخۆش نەبوایە،و ئەوەندە بەسکی ناشتا شەرابی نەخواردبایەتەوە، هەرگیز ئەوەی بەخەیالدا نەئەهات توخنی ئەو کچە بکەوێت.

چواردە رۆژ تێپەری، هانس نەیتوانی سەر لەکێلگەکە بداتەوە، گۆشتو پەنیرو ماسیەکەی بۆ ماڵەکە بەجێ هێشت، گومانی لەوە نەبوو کە پیاوو ژنەکە تائێستا هەموویان ماشیوەتەوە، خۆزگەی ئەخوارد کە ئەنێتیش لێی بخواردایە، لەوانەیە ئەویش هەر کە ئەم رۆیشتووە، لەگەڵ باوكو دایكیدا دەستی کردبێت بەخواردنیان، بیری لەوە ئەکردەوە کە ئەم فەرەنسیانە هەرگیز ئەو شتانە رەت ناکەنەوە کە بەخۆرایی دەستیان دەکەوێت، زۆر لاوازو پاشکەوتوون، ئەنێت زۆر رقی لێیەتی ئای خوایە کەرقی لێیەتی، بەلام ناتوانێت رقی لەپەنیرو گۆشتەکە بێت، هەرچۆنێك بێت، ئەم زۆر بیری لەکچەکە ئەکردەوە، ئەو رقە زۆرەی کچەکە بەرامبەری هەبوو، زۆر ئازاری ئەدا، وافێر ببوو کە ئافرەت هەمیشە خۆشی بووێت، چی ئەبێت ئەگەر لەم رۆژانەدا کچەکە بکەوێتە خۆشەویستی ئەمەوە؟!

ئەم ئەبێتە یەکەمین خۆشەویستی، زۆر جار گوێی لێ بووە کە خوێندکاران لەمیۆنیخ بەدەم بیرە خواردنەوە وتوویانە "خۆشەویستی ئافرەت هەمیشە بۆ خۆشەویستی یەکەم جارە" هەر کاتێك هەولی بۆ کچێك دابێت، هەرگیز لەهەوڵەکەیدا زێر نەکەوتووە، هانس لەدڵی خۆیدا پێکەنیو لەچاوەکانیا تروسکەی تێڕوانینێکی پڕ لەمەگری تیا ئەبینرا.

جارێکی دی هەلی بۆ رێکەوتو توانی سەرێکی دی لە کێلگەکە بداتەوە، هەندێك پەنیرو کەرەو شەکرو تەنەکەیەك سۆسەجو قاوەی لەگەڵ خۆیدا بردو بەپایسکلەکەی چوو، بەلام ئەم جارە ئەنێتی نەدی، لەگەڵ باوکیا لەکێلگەکە کاری ئەکرد، ژنە پیرەکە لەحەوشەکەدا بوو، هەر کەچاوی بەپێچراوەکەی دەستی کەوت، رووی گەشایەوە، و لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ موویەقو دەستی کرد بەکردنەوەی پێچراوەکەو بەهێواشی دەستەکانی لەگەڵیا ئەلەرزی، هەر کە چاوی بەو شتانە کەوت کە هێنابووی، چاوەکانی پڕ بوون لەفرمێسكو وتی: "تۆ پیاوێکی زۆر باشیت" ئەویش بەرێزەوە پێی وت: "ئەتوانم دانیشم؟!"

- "بێ گومان"، سەیری پەنجەرەکەی کردو ئەو وەلامەی دایەوە، هانس زانی بۆ لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد، بۆ ئەوەبوو بزانێت کە ئەنێت هێشتا نەهاتۆتەوە.
- "پەرداخێك شەرابت بۆ بهێنم؟!"
- "زۆر پێ خۆشحاڵ ئەبم پێی"

هانس زۆر زیرەك بوو، ئەیزانی زۆر حەز کردنی ژنەکە، لەخواردن،وردەوردە ئەگەر نەشیکات بەهاورێی خۆ هیچ نەبێت ئەیگەیەنێتە ئەوەی لەیەکتری بگەن. ئەو سەیرکردنەی ژنەکەش لەپەنجەرەکەوە بۆ دەرەوە، دەیکاتە هاویەشی پلانەکەی لێی پرسی: "گۆشت بەرازەکە باش بوو؟!".

- "زۆر چاك بوو"
- "هەوڵ ئەدەم جارێکی دی کەهاتم زیاترتان بۆ بهێنم، ئەنێت حەزی لێ بوو؟!".
- "دەمی لەهیچ لەو شتانەی کە تۆ بەجێت هێشت نەداو وتی حەز ئەکات لەبرساندا بمرێت"
- "بێ عەقڵە"
- "منیش هەر وام پێ وت، وتم خواردنەکە لەوێدایە، نەخواردنی هیچ کەلکێکی نیە".

ئەوسا، بێ گرێ، دەستیان کرد بەقسەکردن. کە هانس شەرابەکەی ئەخواردەوە، بۆی دەرکەوت ژنەکە ناوی (مادام پێرێ)یە. لێی پرسی ئایا کەسی

تریان لەخێزانەکەدا هەیە؟ ژنەکە شامێکی هەڵکێشاو وتی: (نەخێر)، کاتی خۆی کوڕێکی هەبوو، بەڵام لەدەستپێکردنی شەڕەکەدا نەکوژرا، بەڵکو تووشی سیل بوو، و لەنەخۆشخانەی نانسی مرد.

هانس وتی: "بەداخەوە".

ژنەکە وتی: "لەوانەیە مردنەکەی لەزۆر ڕووەوە لەژیانی باشتر بێت، لەئەنێت نەچوو، ئەگەر بژیایە، نەیئەتوانی شەرمی هەرەس هێنانەکە هەڵبگرێت) جارێکی دی شامێکی هەڵکێشا، وتی: "ئای هاوڕێ هەژارەکەم، ئێمەیان خەڵەتاندووە."

- "بۆچی ویستیان لەپێناوی پۆلەندیەکاندا شەڕ بکەن؟! ئەوان چی ئێوەن؟!"

- "تۆ ڕاست ئەکەی، ئەگەر ئێمە ڕێگای سەرۆکەکەتان هێتلەرمان بدایە پۆلەندە بگرێت، ئەوا حەقی بەسەر ئێمەوە نەبوو" کە هانس هەستا بۆ ئەوەی بڕواتەوە، وتی بەم زوانە سەریان لێ ئەداتەوەو وتی: "گۆشت بەرازەکەم لەبیر ناچێت".

لەجارێکی دیکەدا، هانس هەڵێکی باشی بۆ هەلکەوت، کارێکیان خستبووە سەر شانی، ئەبوایە هەفتەی دوو جار بچێت بۆ شارێك کە نزیك بوو لەدێیەکەی ئەوانەوە. لەبەر ئەوە بەئاسانی ئەیتوانی سەر لەکێڵگەکە زوتر بدات، زۆر مەبەستی بوو کە بەدەستی بەتاڵ سەریان لێ نەدات، بەڵام نەیتوانی لەگەڵ ئەنێتا ڕێگا بکاتەوە، هەوڵی دا پەیوەندی خۆی لەگەڵیا خۆش بکات، بۆ ئەمەش پەنای بردە بەر هەموو ئەزموونێکی خۆی لەگەڵ کچاندا. بەڵام ئەمانە وای لەکچەکە ئەکرد قیزی لێ بکاتەوەو بەسەرنجێکی دڵڕەقانەوە تەماشای ئەکرد، هەروەکو شتێکی گڵاو، و زۆر جار ئەمەندە هانسی تووڕە ئەکرد، حەزی ئەکرد توند قۆڵی بگرێتو ئەوەندە ڕایوەشێنێت تاگیانی دەرئەچێت، جارێك بەتەنها دی، کچەکە هەستا بڕوات، ئەمیش ڕێگاکەی پێ گرتو پێی وت:

- "لەجێگای خۆت بوەستە، ئەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم"

- "قسە بکە، من ئافرەتم هیچ چەکێکی پارێزەرم پێ نییە؟

- "ئەوەی من ئەمەوێت بیڵێم ئەمەیە، من لەوانەیە بۆ ماوەیەکی درێژ لێرە بمێنمەوە، ئێوەی فەرەنسیش حاڵتان لەمە باشتر نابێت، بەڵکو لەوانەیە خراپتریش ببێت، من بۆ ئێوە زۆر کەڵکم ئەبێت، تۆ بۆ وەك باوكو دایکت بەعاقڵی لەشت ناگەیت؟!"

ڕاستە، باوکە پیرەکە وای لێ هاتبوو، لەشت ئەگەیشت، بەڵام ئەت ئەتوانی بڵێت هەڵوێستی دڵسۆزی بوو، بەڵکو هەر ساردو رەق بوو، لەگەڵ ئەوەی بەڕەوشتەوە هەڵسو کەوتی لەگەڵدا ئەکرد، جارێکیان داوای لەهانس کرد کەمێك توتنی بۆ بهێنێتو هەر کە هانس پارەکەی وەرنەگرتەوە، ئەو سوپاسی کرد، هەروەها زۆر دڵخۆش بوو بۆ هەواڵەکانی سۆیۆنسو بە پەرۆشەوە پەلاماری ئەو ڕۆژنامەیەیدا کە هانس بۆی هێنابوون.

هانس کوڕی جوتیار بوو، لەبەر ئەوە بەباشی ئەیتوانی باسی کاروباری کێڵگە بکات، کێڵگەکەیان کێڵگەی چاك بوو، مام ناوەندی بوو، پڕ لەئاو بوو، جۆگەیەکی گەورەی پیادا تێپەڕ دەبوو، درەختیشی زۆر بوو، لەگەڵیا زەویەکی کێڵراوی باشو لەوەرگایەکی چاکیشی تیا بوو، هانس بەسۆزێکی زۆرەوە گوێی بۆ پیاوەکە شل کردبوو کە داخی دڵی خۆی بۆ هەڵئەڕشت دەربارەی کێڵگەکەی کە چۆن کرێکاری نیەو بێ پەینەو خزمەتی نیە، ئەگەر وابڕوات خاپوورو وێران دەبێت، ئەنێت وتی: "لێم ئەپرسیت بۆ وەك دایكو باوکم بەعەقڵەوە لەشتەکان ناگەم؟!" کراسەکی ڕاکێشاو لەشیو سکی خۆی پیشاندا، هانس بڕوای بەچاوەکانی نەکرد، ئەمە هەڵچونێکی دەروونی وای بۆ پەیدا کرد کە هەرگیز شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو، خوێن پەڕیە ڕوومەتەکانیو وتی:

- "تۆ سکت پڕە"

کچەکە بەپشتدا خۆی دا بەسەر کورسیەکەداو دانیشتو سەری خستە سەر هەردوو دەستیو دەستی کرد بەگریان وەك دڵی خەریك بێت پارچە پارچە بێتو وتی: "ئەی لەو حەیا چوونە.. ئەی لەو شورەییە"

هانس بەخێرایی بەرەو پیری چوو بۆ ئەوەی بەدەستی بەرزی بکاتەوەو قیژاندی "شیرینەکەم" بەڵام ئەو بازیدا بەخۆیو خۆی دوورخستەوەو وتی: "دەستم تێوە نەدەی.. بڕۆ.. بڕۆ.. بەس نیە.. ئەو دەردە سەریەی تووشت کردم، بەس نیە؟!!"

بەخێرایی لەژوورەکە چووە دەرەوە، ئەویش بۆ چەند خولەکێك بەتەنها لەژوورەکەدا مایەوەو تەواو شڵەژابوو، بیری پەشۆکابوو،... بەهێواشی گەڕایەوە

بۆ سوێۆنس، لەناو جێگاکەیدا تاچەند سەعاتێك خەوی لێ نەئەکەوت، هیچ شتێکی دیکەی بەبیردا نەئەهات ئەنێت نەبێت و سکەپڕەکەی، دیمەنەکەی کەلای مێزەکەوە دانیشتبوو ئەگریا پڕ لەبەزەیی بوو، ئەو منالەی لەمنالدانیایە منالی ئەوە، هەستی کرد خەو ئەیگرێت، بەلام لەپڕ هۆشی بۆ هاتەوەو بیرێکی بەمێشکدا هات، بیرێکی وا وەك گولەیەکی بەرکەوتبێت، بۆی دەرکەوت خۆشی ئەوێت، بیرەکە ئەوەندە سەرسوڕماوی و ئەوەندە راچەنەر بوو، نەی ئەزانی چۆن لەبەردەمیا خۆی رابگرێت، لەگەل ئەوەی لەوەپێش زۆر بیری لەکچەکە ئەکردەوە، بەلام هەرگیز بەم شێوەیە نەبوو، هەستی کرد ئەوپەڕی گالتەجاڕییە ئەگەر توانی کچەکە بخاتە ناو خۆشەویستی خۆیەوەو سەرکەوتنێکی گەورەشە ئەگەر ئەوکاتە بێت و کچەکە لەخۆیەوە بۆی بێتە پێشەوە نەك وەك جاری پێشوو بەهێزی بازوو، لەگەل ئەوەدا بۆی دەرکەوت کە ئەو کچە زۆر ئاساییە، وەك هەموو ئەو کچانەی ناسیونی، ئەو جۆرەی ئەو حەزی لێ ئەکرد ئەوە نەبوو زۆر جوان نەبوو، هیچ شتێکی جیاوازیشی نەبوو، ئەی ئەم هەموو هەستە سەیرە چییە بەرامبەری هەیەتی؟! هەستێکی دلخۆشکەر نیە، بەلکو ئازاراوییە، بەلام ئەیزانی هەستەکە خۆشەویستییە، هەستی بەگوشادییەکی واکرد کە لەژیانیا هەستی پێ نەکرد بوو، ئەیویست بیگرێتە باوەش و دەست بکاتە ملی و ئەیویست چاوە پڕ لەفرمێسکەکانی تێر ماچ بکات، بیری کردەوە، حەزەکەی ئەم وەك حەزی هەموو پیاوێك نیە لەئافرەت، بەلام ئەیویست وای لێ بکات دلنیا بێت، ئەیویست وای لێ بکات زەردەخەنەی بۆ بکات، سەمەرە لەوەدا بوو هەرگیز بەزەردەخەنەوە نەی دیبوو، ویستی چاوەکانی ببینێت، دووچاوی جوانی واکە دلسۆزیان لێ ئەبارێت.

سێ رۆژ نەی توانی سوێۆنس بەجێ بهێلێ، بەدرێژایی سێ شەوو سێ رۆژ بیری لای ئەنێت و ئەو منالە بوو کە هەلیگرتبوو، ئەوسا توانی بچێتە کێلگەکە، حەزی کرد مادام پیرێ بەتەنها ببینێ، لەمەدا بەختی هەبوو، چونکە لەسەر ڕێگاکە کەمێك دوور لەخانووەکەیانەوە بینی، ژنەکە لەلای ڕێگاکەوە چیلکەی کۆئەکردەوەو ئەگەڕایەوە بۆ مالەوەو بەچەپکێك چیلکەوە ماتوڕەکەی وەستان، ئەیزانی ئەو دۆستایەتیەی پیشانی ئەدات تەنها بەهۆی ئەو شتانەوە بوو کە بۆی ئەهێنان لەگەل خۆیدا، بەلام گوێی نەدایە، بەس نیە بەڕەوشتەو ئامادەیە هەرواش بمێنێتەوە، مادام ئەتوانێت چەند دیارییەکی لێوە دەستکەوێت.

پێی وت: ئەیەوێت قسەی لەگەلدا بکات و داوای لێ کرد چیلکەکان داگرێتە سەر زەوی، ژنەکەش وای کرد، رۆژێکی پڕ لەهەوری چلکن بوو، بەلام سارد نەبوو، وتی:

- "من دەربارەی ئەنێت ئەزانم"
- ژنەکە تەزوییەکی گەورەی پیاهات و وتی:
- "تۆ چۆن ئەمەت زانی؟ ئەو بڕیاری دابوو لەتۆی بشارێتەوە؟!"
- "ئەو خۆی پێی وتم"
- "ئەوە کارەساتێکی گەورەبوو تۆ ئەو ئێوارەیە قەومانت".
- "من ئەمەم نەئەزانی، بۆ تۆ زوو پێت نەوتم"

ژنەکە دەستی کرد بەقسەکردن بەلام بەناخۆشییەوە نا، و هیچ لۆمەیەکی ئەویشی نەکرد، بەلکو تەنها هەروەك کاەساتێك بێت و سروشت بۆی هێنابن، وەك مردنی گوێرەکەیەك لەکاتی لەدایکبوونیدا، یاوەك بەستنی دنیا لەبەهاراندا کە ببێتە هۆی فەوتان و نەمانی بەرەکان" کارەساتێکی وا کە مرۆڤ دەستەوسان ئەوەستێت بەرامبەری، پێی وت کە پاش ئەو شەوە تۆقینەرە ئەنێت چەند رۆژێك لەجێگادا مایەوەو تایەکی زۆری لێ هاتبوو، وایان ئەزانی کە شێت بووە، چونکە تاماوەیەکی زۆر هەر هاواری ئەکرد، و لەو نزیکانەش هیچ پزیشکێکی لێ نەبوو، پزیشکی گوندەکەش بۆ سەربازی بانگکرابوو، تەنانەت لە سوێۆنیسیش تەنها دوو پزیشك مابوونەوە ئەوانی دیکە هەموو بۆ سەربازی رۆیشتبوون، ئەو دوانەش پیر بوون، ئەی ئەوان چۆن ئەیان توانی بێن بۆ گوندەکە؟ بابشیان ناردایە بەشوێنیاندا، چونکە ڕێگایان نەئەیان شارەکە بەجێ بهێلن، ئەنێت پاش خاوبوونەوەی تاکەشی هەر نەیتوانی جێگاکەی بەجێ بهێلێت، لاوازو رەنگ زەرد بوو بوو، وابوو مرۆڤ بەزەیی پیا دەهاتەوە کارەساتەکە زۆر بۆی تۆقێنەر بوو، کەمانگێك تێپەڕی، لەپاشدا مانگێکی دیکەش، و تەندروستی باشتر بوو، وای لێ هات زۆر شل و شێواو بوو، مادام پێری یەکەم کەس بوو گومانی هەبوو کە شتێکی ناخۆش ڕووی داوە، بۆیە لەئەنێتی پرسی، هەردووکیان تۆقابوون، بەلام بەتەواوی نەیان ئەزانی

کەراستەو لەو بارەیەوە هیچیان بەباوکەکە نەوت، هەر کە مانگی سێیەم داکەوتەوە، ئیتر هیچ گومانێك لەمەسەلەکەدا نەمایەوە،و ئەنێت سکی پڕ بووە، ئۆتۆمبیلێکی (ستروین)ی کۆنیان هەبوو، مادام پیری پێش جەنگ لە هەفتەیەکدا دوو بەیانی پێی دەچوو بۆ بازاڕو بەرووبوومە کشتوکاڵیەکانی پێ دەگوێزایەوە بۆ سۆیۆنس بەڵام هەر کە ئەڵەمانیەکان وڵاتەکەیان داگیرکردن، هیچی وایان بۆ نەمایەوە کە بیفرۆشن، لەبەر ئەوە ئەو جۆرە هاتوچۆیانە زۆر ئەکەوت لەسەریان بەتایبەتی کە بەنزینیش دەست نەئەکەوت بەڵام ئەو رۆژە هەردوکیان بەئۆتۆمۆبیلەکە چوون بۆ شار، تاکە ئۆتۆمبیلێك بوو کە لەشارەکەدا ئەرۆیشت، جگە لە ئۆتۆمبیلە سەربازیە ئەڵەمانیەکان نەبێت، سەربازە ئەڵەمانیەکانیش بێ کار لە شەقامەکاندا پیاسەیان دەکرد، هێما ئەڵەمانیەکان لەشەقامەکاندا ئەبینراو لەسەر بینا گشتیەکانیش ئاگاداری‌و بەیان نامەکان بەزمانی فەرەنسی لەلایەن سەرۆکایەتی سەربازی ئەڵەمانی ناوچەکەوە هەڵواسرابوو، گەلێك لەدووکانەکانیش داخرابوون، چوون بۆ لای ئەو پزیشکە پیرەی کە ئەیان ناسی، ئەوەی لێی ئەترسان پزیشکەکەش پێی وتن، بەڵام لەبەر ئەوەی کاپولیکیەکی ئاینی بوو هیچ یارمەتیەکی نەدان، هەر کە ئەوان گریان، ئەم شانی راوەشان وتی:

- "ئێوە یەکەمین کەس نین ئەمەتان بەسەر هاتبێ، پێویستە تەحەمولی بکەن" شوێنی پزیشکەکەی دیکەشیان ئەزانی، لەبەر ئەوە چوون بۆ بینینی، زەنگی دەرگاکەیان لێدا، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر هیچ وەڵامێك نەبوو، لەپاشدا لەلایەن ژنێکی مەلولی جل رەشەوە دەرگاکە کرایەوە، هەرکە پیان وت ئەیانەوێت پزیشکەکە ببینن، دەستی کرد بەگریان، چونکە لەلایەن ئەڵەمانیەکانەوە گیرابوو لەبەر ئەوەی لەگروپی نهێنی‌دابوو، وەك بارمتە (رهینە) دانرابوو، بۆمبایەك لەیەکێك لەو چایخانانەی ئەڵەمانیەکان بەهەمیشەیی بۆی ئەچوون تەقابوەوەو دوانیان لێی کوژرابوو و چەندانێکیشیان بریندار بوون، ئەگەر ئەوان فەرەنسیە تاوانبارەکان لەرۆژێکی دانراودا تەسلیم نەکەن، ئەوا ئەمان پزیشکەکە گوللەباران دەکەن، ئافرەتەکە دڵنەرم دیار بوو،

بۆیە مادام پێری کارەساتەکەی خۆیانی بۆ گێڕایەوە ژنەکە وتی:

(ئەی درندە).

لەپاشدا ژنەکە سەیرێکی ئەنێتی کردو بەبەزەیی پیاهاتنەوەیەکەوە وتی: "منالە کلۆڵەکەم" ئەوسا ناونیشانی مامانێکی شاری دانی‌و پێی وتن کە بڵێن لای ئەوەوە هاتوون، مامانەکەش چەند دەرمانێکی دانێ، ئەنێت بەو دەرمانانە ئەوەندە نەخۆش کەوت تاوای زانی خەریکە ئەمرێت. دەرمانەکان هیچ کەڵکێکیان نەبەخشی‌و ئەنێت سکی بەپڕی هەر مایەوە، ئەمە بوو ئەو چیرۆکەی مادام پێری بۆ هانسی گێڕایەوە، هانس ماوەیەك بێ دەنگ بوو، لەپاشدا وتی:

- "سبەینێ یەك شەممەیەو من هیچ ئیشم نیە، یەم بۆ ئێرەو لەو بارەیەوە قسە ئەکەین‌و هەندێك شتی باشیش لەگەڵ خۆمدا ئەهێنم".
- "پێویستمان بەدەرزی هەیە، ئەتوانیت لەگەڵ خۆتدا چەند دانەیەك بهێنیت؟!"
- "هەوڵ ئەدەم".

مادام پێری چیلکەکانی هەڵگرت‌و خستیە سەر پشتی‌و رێگاکەی خۆی گرتەبەر، هانسیش گەڕایەوە سۆیۆنس، ترسا لەوەی ماتۆڕەکەی بەکار بهێنێت بەڵکو بۆ رۆژی دوایی پایسکلێکی هەوایی بەکرێ گرت‌و پێچراوەیەکی خۆراکی بەست بەکورسیەکەی دواوەی، پێچراوەکەی ئەم جارەی لەوانەی پێشوتر گەورەتر بوو، چونکە بوتڵێك شەمپانیاشی پێوە بەست، کەگەیشتە کێڵگەکە، تاریکی خەریك بوو ئەهات، هەموو لە ئیش گەڕابوونەوە ماڵەوە، چووە موبەقەکەوە کە ئەوکاتە زۆر گەرم‌و خۆش‌و بێ دەنگ بوو، مادام پیرێ چێشتی لێ ئەناو، مێردەکەشی رۆژنامەی (پاریسی ئێواران Paris soir)ی ئەخوێندەوە و ئەنێتیش گۆرەوی ئەچنی، هانس کە پێچراوەکەی کردەوە، وتی: "ئەنێت بڕوانە دەرزیم بۆ هێناون، چەند شتێکیشم بۆ تۆ هێناوە".

- " من شتی تۆم ناوێت"
- "ناتەوێت؟! تۆ پێویستە ئیتر دەست بکەیت بەئامادەکردنی شتی منالەکە".

دایکی‌وتی: "ئەنێت ئەوە راستە ئێمە هیچمان نیە". ئەنێت هیچ سەری لەسەر درومانەکەی لانەبرد، چاوە برسیەکانی مادام پیرێ بەسەر ناوەرۆکی پێچراوەکەدا تێپەڕ بوو، وتی: "ها.. بوتڵێك شەمپانیا؟!"

هانس لەژێرەوە بزە گرتی وتی: "هەر ئێستا پێتان ئەڵێم کەچی بەو شەمپانیایە ئەکەین، من بیرێکم بەمێشکدا دێ" بۆ خولەکێك وێستەیەکی کردوو کورسیەکەی راکێشاو بەرامبەر ئەنێت دانیشتو وتی:

- "بەڕاستی نازانم چۆن دەست پێ بکەم، من زۆر داخ ئەخوازم بۆ ئەو رەفتارەی ئەو شەوە نواندم، ئەنێت گوناحی خۆم نەبوو، گوناحی دەوروبەرەکەم بوو، ئایا لێم خۆش ئەبیت؟!"

کچەکە بەرقەوە سەیری کردو وتی:

- "نەخێر، هەرگیز، بۆ تەنها بەجێم ناهێڵیت ئەوەندە بەس نیە کە هەموو ژیانمت تێکو پێك شکاند؟!"
- "باشە، بەلام من ژیانی تۆم تێك نەدا، من کەزانیم تۆ سکت هەیە، هەستێکی سەیرم بۆ هات، بەلام ئێستا هەموو شتێ جیاوازە، من ئێستا زۆر شانازی پێوە ئەکەم"
- "شانازی.؟!!" کچە ئەمەی بەسەیرکردنێکیوردی ناشیرینەوە وت.
- "من ئەمەوێ تۆ منالت هەبێ ئەنێت، من زۆر بەختیارم کە لەباری خۆتت نەبردووە"
- "چۆن جورئەتی قسەی وائەکەی؟!"
- "گوێم لێ بگرە. من هەر کە بەوەم زانی، بیرم لەهیچ شتێکی دیکە نەکردەوە، جەنگ لەدەوریەری شەش مانگی دیکەدا تەواو دەبێت، سەر بەئینگلیزەکان دائەنەوێنین، چونکە هیچیان لەبەردەمدا نەماوە، سەرشۆڕکردن نەبێت، منیش بەسەربازی نامێنمەوە، ئەوسا مارەت ئەکەم"
- "تۆ، بۆچی؟!"
- هانس لەتەریقیدا سوور هەلگەڕا، نەی توانی ئەوەی لەدڵیدایە بەفەرەنسی دەری ببڕێت،و ئەیزانی کچەکەش ئەڵمانی ئەزانێت بۆیە بەئەڵمانی وتی:
- "چونکە من تۆم خۆش ئەوێ"
- مادام پیرێ وتی: "ئەڵێت چی؟!"
- "ئەڵێت منی خۆش ئەوێت!!"
- ئەنێت سەری بردە دواوەو پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی کرد،و بۆی نەئەوەستایەوە،و ئاو بەهەردوو چاوەکانیا ئەهاتە خوارێ، مادام پیرێ دوو زلەی لەهەردوو رووومەتیداو بەهانسی وت:
- "گوێ مەدەرێ، ئەوە هێستریایە بەهۆی بارە تایبەتیەکەی خۆیەوەیە، هەروەك ئەزانیت"

بەکتوپڕی ئەنێت لەپێکەنین وەستایەوەو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، هانس وتی: "من بوتڵێك شەمپانیام هێناوە بۆ ئەوەی بەبۆنەی نیشانەکردنمانەوە ئاهەنگ بگێڕین.."

ئەنێت وتی: "ناخۆشترین شت ئەوەیە کە ئێمە کۆمەڵە نەفامێك بەسەرماندا زاڵ بووە، ئەم کۆمەڵە نەفامە!!"

هانس بەئەڵمانی لەسەر قسەکردن بەردەوام بوو:

- "من تائەو رۆژەی زانیم کە تۆ بەرەو منال بوون ئەچیت، نەم زانی تۆم خۆش ئەوێت، ئەو رۆژە هەروەك بروسکە لێی دابم وابوو، من واهەست دەکەم لەیەکەم ساتەوە خۆشم ویستبێ"

مادام پیرێ لێی پرسی: "ئەڵێ چی"

- "هیچی گرنگی نەوتووە" هانس دەستی کردەوە بەفەرەنسی قسەکردنو ویستی باوكو دایکی ئەنێت تێی بگەن چی ئەڵێت: "من هەر ئێستا مارەت ئەکەم، تەنها ئەوان رێگام بدەن، بەلام وانەزانیت من هیچ نیم، باوکم دەوڵەمەندە، ئێمە لەشوێنی خۆماندا ناسراوین، من کوڕە گەورەی خێزانەکەمانم، تۆ لەسەر هیچ شتێك پەکت ناکەوێت"
- مادام پیرێ لێی پرسی: "تۆ کاپولیکیت؟!"
- "بەڵێ من کاپولیکیم"
- "ئەمە شتێکی چاکە"
- "ئەو ناوچەیەی ئێمە لێی ئەژین شوێنێکی جوانە، و زەویەکەشی باشە، چاکترین زەویە کە کەوتبێتە نێوان مێونیخو ئەنزەبرەکەوە، وەی خۆشمانە، باپیرم لەپاش جەنگی حەفتاوە کڕی، هەروەها ئۆتۆمۆبیلو رادیۆشمان هەیە،و تەلەفۆنیشمان بۆ راکێشراوە".
- ئەنێت رووی کردە باوکیو بەگاڵتەپێ کردنو بەدەنگی بەرز وتی: "ئەم پیاوە بەرزە، هەرچی شتی چاکی ئەم دنیایە هەیە، هەیانە!!"
- " من جێگایەکی پڕ شکۆم ئەبێت، کچێکی بێگانە لەوڵاتێکی ژێر کەوتوودا، سکی پڕ بووبێ پێش مارەکردن ئەوە دەرگای بەختیاریم بۆ ئەکاتەوە، وانیە؟! بۆلوانێکی چاکو باش نیە؟!"
- پیرێی باوك کە خۆی کەم دوو بوو بۆ یەکەمین جار چەندوشەیەك دووا، "نەخێر من وابیر ناکەمەوە کە ئەو بۆچوونەی تۆ راست بێ، من

لەشەڕی گێتی یەکەمدا بەشداریم کرد، و ئێمە هەموومان زۆر شتمان کرد کە هەرگیز لەکاتی ئاشتیدا نەمان ئەکرد، چونکە سروشتی مرۆڤ هەر سورشتی مرۆڤە، بەڵام ئێستا کە تاکە کوڕەکەمان مردووە، ئەنێت هەموو شتێکی ئێمەیە ناتوانین ڕێگای بەین بڕوات"

هانس وتی: "من ئەم زانی تۆ وائەڵێیت، بەڵام وەڵامیشم بۆی هەیە، من لێرە ئەمێنمەوە"

ئەنێت سەیرێکی خێرای کرد، مادام پیری لێی پرسی: "مەبەستت چیە؟!".

- "من برایەکی دیکەم هەیە، ئەو لەوێ ئەمێنێتەوەو یارمەتی باوکم ئەدات، من حەزم لەم وڵاتەیە، ئەگەر مرۆڤ گیانی دەستپێشخەریووزەی تیا بێت ئەتوانێت ئەم کێڵگەیەی ئێوە بکاتە شتێکی چاک، کەشەڕ کۆتایی هات ژمارەیەکی زۆر لەئەڵەمانیەکان لێرە ئەمێننەوە، ئەوە شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئێوە لەفەرەنسادا ژمارەی تەواوی پیاوتان نیە کە لەزەویەکانتاندا کار بکات، ئەمە لەیەکێك لەو وتارانەوە فێربووین کە لەسوێێنس بۆیان ئەدان، ئەو پێی وتین کە یەك لەسەر سێی کێڵگەکان پیاو نیە کاریان تیا بکات".

پیرێو ژنەکەی، هەریەکەیان سەرنجێکی گرتە ئەوی دیکەو لەهەمان کاتدا ئەنێت، هەستی کرد بەشتێکەوە دوو دڵن، ئەوەش ئەوە بوو کە ئەیانویست لەوەتەی کوڕەکەیان مردووە، زاوایەکیان ئەویست پتەوو بەهێز بێو کاری کێڵگەکە ببات بەڕێوە، پاش ئەوەی ئەوان پیر ئەبن، مادام پیرێ وتی: "ئەمە مەسەلەکە ئەگۆڕێت، ئەمە کارێکە هەڵئەگرێت بیری لێ بکرێتەوە"

ئەنێت بەرقەوە هاواری کرد: "دان بەزمانتا بگرە" ئەوسا بۆ پێشەوە چەمایەوەو چاوە ئاگراویەکانی بڕیە ئەڵەمانیەکەو وتی: "من دەستگیرانی مامۆستایەکم کە لە قوتابخانەی کوڕاندا، لەوشارەی تیایدا دەرس ئەڵێمەوە کاری ئەکرد، وارێککەوتووین کە پاش جەنگ بمهێنێ، ئەو وەکو تۆ زۆر زل نیە، هەروەها جوانیش نیە، بەڵکو بچوکو لاوازیشە، هەموو جوانیەکەشی زیرەکیەکەیەتی کە لە دەموو چاویا پرشنگ ئەداتەوە، هەموو بەهێزیەکەشی وا لەمەزنی گیانیا، بەڵام کێوی نیە، شارستانیە، شارستانیەتی هەزارەها ساڵی بەدواوەیە، من خۆشم ئەوێ، خۆشم ئەوێ بەهەموو دڵو گیانمەوە".

هانس دەمووچاوی بەرەو تووڕە بوون گۆڕا، هەرگیز بەبیریا نەئەهات کە ئەنێت یەکێکی دیکەی خۆش بووێت"

- "ئێستا ئەو لەکوێیە؟!"
- "تۆ تەسەور ئەکەی لەکوێ بێت؟!"

لەئەڵەمانیایە، گیراوە، برسیە، لەکاتێکدا ئێوە خێرو بێری وڵاتەکە ئەخۆن، چەند جاری دیکە بڵێم رقم لێتە؟! تۆ داوای لێ خۆش بوونم لێ ئەکەی بەڵام من هەرگیز لێت نابورم، تۆ ئەتەوێت لەبرێتی زیان پاداشتم بەیتەوە، تۆ بێ ئەقڵیت" کچەکە سەری بۆ دواوە چەمایەوەو بەدەمو چاویەوە بێ ئارامیو ئازار خۆیان نواندو ئەوسا وتی: "تۆ ژیانی منت داوەشان، بەڵام ئەو لێم ئەبووریێ، زۆر دڵ نەرمە، بەڵام ئەوەی نیگەرانم دەکات ئەوەیە، ئەترسم رۆژێك لەرۆژان ئەوەی بەبیرا بێت کە من ئەو شتەم بەزۆر پێ نەکراوە، بەڵکو بەئارەزووی خۆم بووە، لەوانەیە وابۆی بچێ کە بۆ کەرەو پەنیرو گۆرەویو ئاوریشم، خۆم بەتۆ داوە، من لەمەدا تەنها نیم، دوای ئەوە، چارەنووسمان چی ئەبێت بەم منداڵەوە، منداڵی تۆ، منداڵێکی ئەڵەمانی وەك تۆ زل، وەك تۆ قژ زەرد، وەك تۆ چاوشین، ئاە خوایە بۆ ئەوەندە من بناڵێنم؟!"

ئیتر هەستاو بەخێرایی بەرەو موبەقەکە چوو، بۆ ماوەیەك سیانەکە بێ دەنگ مانەوە، هانس بەماتیەوە سەیری بوتڵە شەمپانیاکەی بەردەمی کرد، هەناسەیەکی هەڵکێشا، هەستایە سەرپێ، کە چووە دەرەوە، مادام پیرێ لەگەڵیا رۆیشتو بەدەنگێکی هێواش لێی پرسی: "تۆ بەڕاستت بوو کە وتت ئەتەوێ بیخوازیت؟!"

- "بەڵێ هەموو وشەیەکم بەڕاست بوو، من خۆشم ئەوێ"
- "دەتۆ لەگەڵ خۆتا نایبەی،و لێرە ئەمێنیتەوەو لەکێڵگەکەدا کار دەکەیت؟!"
- " من سوێندت بۆ ئەخۆم"
- "گومان لەوەدا نیە کە پیاوە پیرەکە زۆر نازی، تۆ لەماڵی خۆتان، هاوبەشی براکەت ئەکەیت، بەڵام لێرە کەس لەگەڵتا هاوبەش نابێت"
- "بەڵێ ئەمە وایە"
- "ئێمە هەرگیز حەزمان لەمە نەبوو ئەنێت شوو بەو مامۆستایە بکات، بەڵام ئەو کاتە کوڕەکەمان لەژیاندا بوو وتی: "ئەگەر ئەنێت خۆی حەز ئەکات شوی پێ بکات بۆ نەی کا؟!

- ئەنێت بۆی شێت بوو بوو، بەڵام ئێستا کە کوڕەکەمان مردووە، کوڕە بەسەزمانەکەمان، مەسەلەکە جیاوازە، تەنانەت ئەگەر بیشیەوێ شووی پێ بکات، چۆن ئەتوانێت بەتەنها لەکێڵگەکەدا ئیش بکات؟ فرۆشتنی کێڵگەکەش شورەییە، من ئەزانم مرۆڤ چەند زەویەکەی خۆی خۆش ئەوێت".

ئەوکاتە گەیشتبوونە سەر ڕێگاکە ژنەکە دەستی گرتو بەکەمێك گوشینەوە پێی وت:

- "زوو وەرەوە". هانس ئەیزانی ژنەکە لەسەر ئەمە، دڵی بەمە خۆش بوو، کاتێك بەرەو سۆیۆنس ئەبوەوە شتێکی ناخۆش بەردڵی گرتبوو، کەزانی ئەنێت یەکێکی دیکەی خۆش ئەوێت، بۆ بەختی ئەم ئەو کەسەش بەندە، لەوانەیە ماوەیەکی زۆری پێ بچێ، منداڵەکە لەدایك ئەبێ، و هێشتا ئەو بەر نەبووە!! لەوانەیە ئەمە ڕەفتاری کچەکە بگۆڕێت، ئافرەت کەسێکی پڕ ئەمو مژە، ناتوانرێت بزانرێت چییە، لەدێیەکی ئەواندا ئافرەتێك هەبوو، مێردەکەی خۆی زۆر خۆش ئەویست، تاتەنانەت گەیشتبووە ڕادەی گاڵتەجاڕی خەڵکی، بەڵام هەر کە منداڵێکی بوو، وای لێ هاتبوو بەهیچ شێوەیەك چارەی مێردەکەی نەئەویست، باشە ئەی بۆ پێچەوانەی ئەمەش روونەدات؟! ئێستا ئەم وتی ئەیهێنمو هەر چۆنێك بێت، کچەکە ئیتر ئەزانێت کە ئەم پیاوێکی باشە، خوایە، چەند دیمەنەکەی خەماوی بوو کەسەری بۆ دواوە چەماندبوەوە، چەند جوان قسەی ئەکرد، چ زمانێك بوو، کچە ئەکتەرەکانی سەر شانۆ هەرگیز لەو جوانتر ناتوانن ناخی خۆیان دەربڕن، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێك سروشتی بوو، تۆ پێویستە ئەوە بزانیت کە فەرەنسیەکان باش ئەزانن بدوێن، بەڵێ کچێکی زیرەکە، تەنانەت کەزمانیشی بەتاڵی لێ کردەوە، گوێ گرتن لێی شتێکی خۆش بوو، ڕۆشنبیری ئەمیش خراپ نیە، بەڵام لەچاو کچەکەدا هەر بەراورد ناکرێت، ڕۆشنبیری ئەوەیە کە ئەو هەیەتی، کە پایسکیلەکەی لێ ئەخوڕی بەدەنگێکی هێواشەوە وتی: "من کەرم" کچەکە پێی وت کە لەش زلو بەهێزو قۆزە، ئەوانەی بۆ وت ئەگەر مەبەستێکی نەبوایە؟! هەروەها دەربارەی منداڵەکە وتی: قژ زەردو چاوشین ئەبێ وەك ئەو، ئەگەر ئەمانە هەمووی ئەوە نەگەیەنێ کە سەرنجی ڕاکێشاوە کەواتە ئەم کەرو بێ ئەقڵە پێ کەنیو وتی: "کاتو دان بەخۆدا گرتن بەس بۆ ئەوەی سروشت هەموو شتێك جێ بەجێ بکات.

چەند هەفتەیەك تێپەڕی، قومانداني سەربازگەی سۆیۆنس پیاوێکی بەساڵاچووو زۆر خۆش نوود بوو ئەیزانی بەهار چی بۆ سەربازەکانی هەڵگرتووە، لەبەر ئەمە زۆر ئەرکی لەوکاتەدا ئەخستە سەریان، ڕۆژنامە ئەڵەمانیەکان ئەیان نوسی کە ئینگلتەرە ئەوەندەی نەماوە هەرەس بهێنێ بەهۆی بۆردومانەکانی هێزی ئاسمانی ئەڵەمانەوە (لوفت واف)و خەڵکیش لەوێ زراویان چووە لەترسا، ژێر دەریاکانیش توانیویانە ژمارەیەکی زۆر لەپاپۆڕەکانی هێزی دەریایی بەریتانی نقوم بکەن، و ئەوەندەی نەماوە وڵاتەکە بکەوێتە برسێتیەکی زۆرەوە، و خەریکە شۆڕشی تێدا بەرپا ببێ. پێش هاوین شەڕ کۆتایی دێتو ئەڵەمانیەکان دەبنە سەرۆکی هەموو جیهان.

هانس، نامەیەکی بۆ کەسوکاری لەئەڵەمانیا نارد، پێی وتن کە خەریکە کچە فەرەنسیەك ئەهێنێت کە خاوەنی کێڵگەیەکە، و پێشنیاری کرد بۆ خێزانەکەی خۆشی کە براکەی پارە قەرز بکاتو بەشەکەی ئەم لەکێڵگەکەیان بکڕێتەوەو پارەکەی بۆ بنێرن. تابتوانێت لەفەرەنسا زەویەکانی زۆر بێت، بەتایبەتی ئێستا بەهۆی شەڕەوە زۆر هەرزانەو پارەی بێگانەشی زۆر لەئاڵو گۆڕدا نیە، زەوی بەپارەیەکی کەم ئەکرێت.

مەسەلەی کێڵگەکەی لەگەڵ پیرێ باس کرد، پیاوە پیرەکە زۆر بەبێ دەنگی گوێی بۆ گرت، کاتێك کە هانس بیرەکانی خۆی بۆ باسکرد، کە کێڵگەکە پێویستە نوێ بکرێتەوەو لەبەر ئەوەی ئەم ئەڵەمانیە، ئەوا هەموو شتێکی چنگ ئەکەوێت، تراکتورەکە کۆنە، پێویستە یەکێکی نوێی لەئەڵەمانیاوە بۆ بهێنێت، هەروەها ماتۆڕێکی کێلەریش بۆ ئەوەی والەکێڵگەکە بکرێت پارەیەکی باش پەیدا کات. پێویستە نوێترین داهێنراوەکان بەکار بهێنن، لەپاشدا مادام پیرێ پێی وت: کە مێردەکەی وتوویەتی بەڕاستی کوڕێکی باشەو زانیاری زۆرەو ئێستا پەیوەندیشی لەگەڵا بەهێزبووە، و زۆر داوای لێ کرد کە ڕۆژانی یەك

شەموان بۆ نیوەڕۆ بەشداری نان خواردنیان بکات، ژنە بەفەرەنسی ناوی کوڕەکەی نا (جان) کوڕە هەموو کاتێك ئامادە بوو دەست درێژ بکات، کە ڕۆژەکان زۆرتر تێپەڕیوون، ئەنێت ئیتر وای لێ هات توانای ئیش کردنی نەما، بەتەواوی پێویستیان بە پیاوێك بوو کارەکەیان بۆ ڕاپەڕێنێت، هانس لەهەموو ئیشێکدا یارمەتی ئەدان. بەڵام ئەنێت هەر بەشێوە دوژمنایەتیەکەی خۆی مایەو، ئەگەر ئەو پرسیارێکی ڕاستەوخۆی لێ نەکردایە، ئەم هەرگیز قسەی لەگەڵدا نەئەکرد، هەر بیتوانیایە یەکسەر بەرەو ژوورەکەی خۆی ئەچوو، وەڵامی نەئەدایەوە،و ئەگەر نەیتوانیایە بڕوات بەهۆی ساردی ژوورەکەیەوە، ئەوا بەتەنیشت ئاگرەکەوە دادەنیشت و خۆی بەخوێندنەوە یان بەدرومانەوە خەریك ئەکرد،و هیچ گوێی نەئەدایە، هەروەك لەوێش نەبوایە، تەندروستی زۆر باش بوو، ڕوومەتەکانی سووربوون، لەچاوی هانسدا جوانی ئەنواند، سکەکەی جۆرە ڕێزێکی بۆ پەیدا کردبوو، هانس کە سەیری ئەکرد، هەستی بەجۆرە بەختیاریەك ئەکرد، ڕۆژێك لەکاتێکدا بەڕێگاوە بوو بەرەو کێڵگەکە، چاوی بەمادام پیرێ کەوت، دەستی بۆ ڕاوەشان بۆ ئەوەی بوەستێت: ئەمیش یەکسەر پایسکیلەکەی وەستان و ژنەکە پێی وت: (سەعاتێکە چاوەڕێت ئەکەم، وام هەست ئەکرد ئیتر هەرگیز نایەیتەوە، پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ سۆیۆنس، پییەر مردووە"

- "پییەر کوێیە؟!"
- "پییەر گافین، ئەو مامۆستایەی ئەنێت ئەیویست شوی پێ بکات."
- هانس دڵی داچڵەکا، چەند بەختدارە، ئەوا ئێستا هەلی بۆ هەلکەوت.
- "ئەنێت دڵتەنگە؟!"
- "ناگری، بەڵام هەر کەویستم شتێك بڵێم، خەریك بوو سەرم بخوات، ئەگەر ئەمڕۆ بت بینێ بەدووری مەزانە بەرچەقۆت بدات."
- "من چی بکەم، ئەو مردووە؟ ئێوە چۆنتان پێ زانی؟!"
- "لە بەندییەکەوە، لەیەکێك لەبرادەرەکانیەوە کە لەڕێگای سویسرا ڕای کردووە، نامەیەکی بۆ ئەنێت ناردووە، ئەم بەیانییە گەیشت، لەبەندیخانەکەیاندا مان گرتن ڕووی داوە، چونکە نانی تەواویان نەداونەتێ بیخۆن و دوایی تەقەیان لەسەرۆکەکانی مانگرتنەکە کردووە، پییەر یەکێك بووە لەوان".

- هانس بێ دەنگ بوو، تەنها بیری لەوە ئەکردەوە کە ئەوەی بەسەر پییەر هاتووە حەقی خۆیەتی، لەبەندیخانەی لەشکر چی چاوەڕێ ئەکەن، قابیلە ئوتێلی رتز Ritz بێت؟!

مادام پیرێ وتی: "ماوەیەك واز لەئەنێت بێنە تابەسەر کارەساتەکەیدا سەر ئەکەوێت، هەر کاتێك هاتەوە سەر خۆی من قسەی بۆ ئەکەم و خۆم نامەیەکت بۆ ئەنوسم کە کەی جارێکی تر بێیتەوە بۆلامان".

- "زۆر باشە، تۆ یارمەتیم ئەدەی وانیە؟!"
- "تۆ لەو بارەیەوە دڵنیابە، خۆم و مێردەکەم ڕازین، لەو بابەتەوە قسەمان کردووە، گەیشتووینەتە ئەو ڕایە کە هەر ئەبێ بەو بارەی تێیدا ڕازی بین، مێردەکەم بێ ئەقڵ نیە، ئەڵێت چاکترین هەل لەبەردەم فەرەنسادا ئەوەیە کە هاوکاری لەگەڵ ئەڵەمانیەکاندا بکات، هەرچی چۆنێك بێت من ڕقم لێت نیە، گومانم لەمەدا نیە کە تۆ مێردێکی زۆر باش ئەبیت بۆ ئەنێت، لەمامۆستاکە چاکتر، ئەبێ هاتنی منداڵەکەش پێویستە بیری لێ بکرێتەوە".
- "ئەمەوێت کوڕ بێ".
- "کوڕ ئەبێ- من لەوە دڵنیام، من لەفنجانی قاوەدا خوێندمەوە هەروەها لەکاغەزی یاریشدا هەموو کاتێك وەڵامەکە کوڕ دەرئەچوو".
- "شتێکم لەبیر چوو، ئەمە چەند ڕۆژنامەیەکە بۆم هێناون" هانس ئەمەی وت و پایسکیلەکەی وەرگێڕا، خۆی ئامادەکرد بۆ سواربوون و سێ ژمارە لەڕۆژنامەی (پاریس سۆیر) -پاریسی ئێواران- ی دایە.

مستەر پیرێ، هەموو ئێوارەیەك ئەیخوێندەوە، تیایدا ئەیخوێندەوە کە فەرەنسیەکان پێویستە دان بەڕاستیدا بنێن و ڕازی بن بەو یاسا نوێیەی هیتلەر بۆ ئەورووپای داناوە، هەروەها خوێندیەوە کە ژێر دەریاییەکانی ئەڵەمانی بەرەو هەموو دەریاکان ئەچن، دیسانەوە خوێندیەوە کەسەرۆکایەتی گشتی پلانێکی فراوانی داناوە بۆ ئەو هێرشە سەربازیەی کە چۆك بەبەریتانیا ئەداو ئەمەریکاییەکانیش ئامادەی جەنگ نین، و هەموو لەناو خۆیاندا ناکۆکن و کەسیان

ئامادە نین یارمەتی یەکتر بدەن، هەروەها خوێندیەوە کە لەسەر فەرەنسا پێویستە ئەم هەلە گەورەیە لەدەست خۆی نەدات کە لە ئاسمانەوە هاتووەو دەست بخاتە دەستی رایخەوە (Reich) وەشکۆمەندیو پایە بەرزی خۆی لەئەوروپای نوێدا بهێنێتە دەست، ئەم نوسینانە ئەڵمانیەکان نەیان نوسی بوو، بەڵکو فەرەنسیەکان خۆیان نوسیبویان، سەری رەزامەندی چەمانەوە هەر کە خوێندیەوە پلۆتۆکراتیەکان لەناو دەچن،و بێ دەرەتانانی فەرەنسا خۆیان کار دەگرنە دەست، ئەو پیاوە زیرەکانە زۆر راستە کە دەڵێن فەرەنساوڵاتێکی کشتوکاڵیەو بڕیرەی پشتیشی جوتیارە کۆڵنەدەرەکانیەتی، ئەمە تێڕوانینێکی زۆر تەواوە.

ئێوارەیەک، کاتێك خەریکی دەست هەڵگرتن بوون لەنانی ئێوارە، پاش تێپەربوونی دە رۆژ بەسەر بیستنی مردنی پییەر کاڤیندا، مادام پیرێ بەرێك خستن لەگەڵ مێردەکەیدا بەئەنێتی وت:

- "پێش چەند رۆژێك لەمەوبەر نامەیەکم بۆ هانس نارد تیایدا داوام لێ کرد کە سبەینێ بێت بۆ ئێرە"
- "سوپاست دەکەم بۆ ئەم ئاگادارکردنەوەیەم، من لەژوورەکەمدا ئەمێنمەوە."
- "گوێ بگرە کچم، کاتی بێ ئەقڵی بەسەر چووە، پێویستە دان بەراستیدا بنێیت، پییەر مردووە، هانسیش خۆشی ئەوێیت، ئەیەوێت بتهێنێ، کوڕێکی قۆزە، هەموو کچێك بەئاواتەوەیە شووی پێ بکات، چۆن ئەتوانین کاری کێڵگەکە بێ یارمەتی ئەو راپەڕێنین؟ بەپارەی خۆی تراکتۆرو ماکینەی تۆو وەشێن ئەکرێت، رابوردوو باهەر رابوردو بێت."
- "تۆ بەخۆڕایی خۆت هیلاك ئەکەی، دایە، من توانیومە نانی خۆم پەیدا بکەمو بژیم، لەمەولاش هەر ئەتوانم، من رقم لێیەتی، رقم لەخۆ بەزل زانینو کەشو فشەکەیەتی، بەدەستم بوایە ئەم کوشت، کوشتنەکەش دڵم ئاو نادات، ئەمەوێت ئازاری بدەم، وەك چۆن ئەو ئازاری منیدا، من وابیر ئەکەمەوە لەخۆشیانا ئەمرم ئەگەر توانیم بریندااری بکەم وەك چۆن ئەو بریندااری کردم".
- "تۆ زۆر نەفامیت- مناڵە بەسەرزمانەکەم"
- باوکی وتی: "دایکت راست ئەکات کچم، ئێمە بەزیوین، پێویستە سەر شۆڕ کەین بۆ ئەنجامی بەزینەکەشمان، ئێمە لەوان زیرەك ترین، گەر باش یاریمان بەکاغەزەکانمان کرد، ئەوا دێینەوە سەر لوتکە، فەرەنسا خراپەی تیا بڵاوبۆتەوە، پلۆتۆ کراتەکان وڵاتەکەیان دابێژا. رۆژنامەکان بخوێنەوە بەچاوی خۆت ئەیبینی".
- "تۆ لەو بڕوایەدای من یەکوشە چییە لەو رۆژنامانە بڕوای پێ بکەم، تۆ نازانی بۆ بۆی هێناوی بۆ ئێرە، چونکە بەئەڵمانیەکان ئەفرۆشرێ، ئەوانەی تیایدا دەنوسن، خایەنن، خایەنن، ئاخ، خوایە، حەز ئەکەم بژیمو بیان بینم چۆن بەدەست خەڵکەوە پارچە پارچە ئەکرێن، خۆیان فرۆشتوە، هەموو خۆیان فرۆشتوە بەرازانە بەپارەی ئەڵمانی".

مادام پیرێ رقی هەڵساو وتی:

- "تۆ بۆ دژی ئەو ئەوەستی؟! راستە، ئەو، بەزۆر ئەوکارەی پێ کردیت، بەڵام ئەوکاتە سەرخۆش بوو، ئەمە یەکەم جار نیە، شتی وا بەسەر ئافرەتدا هاتبێتو دواجاریش نابێت، ئەی لەباوکتی نەیاو وەك بەراز خوێنی لێ نەڕژی؟ بەڵام باوکت هیچ رقێکی خستە دڵەوە بەرامبەری؟!"

پیرێی باوك وتی: "ئەوە روداوێکی زۆر ناخۆش بوو، بەڵام من لەبیر خۆمم بردۆتەوە".

ئەنێت دایە پرمەی پێکەنینێکی گاڵتەپێکردنو وتی: "تۆ ئەبوایە کاهن (Priest) بویتایە تۆ ئیهانە پێ کردنت بەگیانی پیاوێکی ئاینیەوە زوو لەبیر ئەچێتەوە".

مادام پیرێ بەتوورەییەوە وتی: "جا ئەمە چ عەیبێکی تیایە؟ ئەی ئەو هەموو شتێکی نەکرد بۆ بیرکردنەوە لەوەی کردویەتی؟ باوکت لەکوێ جگەرەو توتنی دەست ئەکەوت لەم مانگانەی دوایدا ئەگەر ئەو نەبوایە؟ کە ئێمە هەستمان بەبرسێتی نەکردووە هەمووی بۆ ئەو ئەگەڕێتەوە".

ئەنێت وتی: "ئەگەر ئێوە کەمێك نەفس بەرزیتان هەبوایە، ئەگەر تۆزێك هەستان بەکەرامەتتان بکردایە ئەوا دیاریەکانتان ئەکێشایەوە بەدەمو چاویا"

- "تۆش کچم، تۆش کەلکت لێ دیوە".
- "نەخێر، نەخێر.. هیچ کەڵکێکم لێ نەدیوە"
- "ئەوە درۆیە، خۆشت باش ئەزانی تۆ کەرەو پەنیرو ماسیەکانت نەخوارد، بەڵام ئەو شۆربایەی ئەو خوارد، هەروەك خۆت ئەزانیت من لەو گۆشتەم تێ ئەکرد کە ئەو ئەیهێنا، هەروەها ئەو زەڵاتەیەش کە

ئەم ئێوارەیە خواردت بەو ڕۆنە کردم کە ئەو هێنابووی، تۆ بەووشکی نەت ئەخوارد، چونکە ئەو ڕۆنی بۆ هێنابووم"

ئەنێت هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو بەدەستەکانی چاوی سڕی‌و وتی: "من ئەزانم، هەوڵم دا نەیخۆم، بەلام نەم توانی، من زۆرم برسی بوو، ئەمزانی گۆشتەکەی ئەو بوو لەناو شۆرباکەدا، ئەم زانی زەلاتەکە ڕۆنی ئەوی تێ کرابوو، ویستم نەیان خۆم، بەلام زۆر حەزم لێ کردن، بەشێوەیەك ئەوەی خواردنەکەی خوارد من نەبووم، بەلکو ئەوەی خواردنی ئەو گیانەوەرە بەپەرۆشە بوو کە لەناخمایە."

- "ئەم قسانە هیچ کەلکیان نیە، گرنگ ئەوەیە تۆ خواردت".
- "چەند شوورەییە.. چەند شوورەییە. لەپێشدا بەتانك‌و فرۆکەکانیان هێزیان شکاندین، ئێستاش کە بێ بەرگری ماوینەتەوە بەبرسێتی سەرمان پێ شۆڕ ئەکەن‌و چاو بەرەو ژێرمان ئەکەن".
- "بەلام بەم شێوە زۆر لەخۆکردن‌و شانۆگەریە هیچ بەهیچ ناکەی کچم، وەك ئافرەتێکی ڕۆشنبیرەفتار ناکەی، تۆ ئەقڵت نیە، رابوردوو لەبیر خۆت بەرەوە، باوکێك بدە بەمناڵەکەت، ئەمە جگە لەوەی کە زۆر بەهێزەو ئەتوانێت ئیشی دوو کرێکار لەکێڵگەکەدا بکات، ئەمەیە ئەقڵ کچم!!"

ئەنێت بەوەرسیەوە شانی راوەشان‌و هەموو بێ دەنگ بوون.

بۆ ڕۆژی دوایی، هانس هات، ئەنێت بەمۆنیەوە سەیری کرد، بەلام نەقسەی کردو نەرۆیشتیش، هانس زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- "سوپاست دەکەم، چونکە رات نەکرد"
- "دایکم‌و باوکم داوایان لێ کردیت کە بێیت بۆ ئێرە،و ئێستا ئەوان چوون بۆ گوندەکە، ئەمە بۆ من رێکەوتوە، ئەمەوێت چەند قسەیەکی ئاشکراو بێ گرێت لەگەلا بکەم، دانیشە.."

هانس، چاکەتەکەی داکەنی‌و خودەکەی داگرت‌و کورسیەکەی راکێشا لەنزیك مێزەکەوە لەسەری دانیشت.

- "دایك‌و باوکم ئەیانەوێت من شوو بەتۆ بکەم، تۆ بەزیرەکی، بەهۆی دیاریەکان‌و پەیمانەکانت توانیوتە کاریان تێ بکەی‌و بەتەواوی بڕوایان هێناوە بەنوسینەکانی ئەو ڕۆژنامانەی بۆت هێناون، ئەمەوێت پێت بلێم کە من هەرگیز شوو بەتۆ ناکەم، هەرگیز ئەم ئەزانی کە ئەتوانم رقم بێتەوە لەیەکێك بەقەدەر ئەوەندەی رقم لەتۆ ئەبێتەوە".

هانس وتی: "رێگام بدە بەئەلەمانی قسە بکەم چونکە تۆ باش تێ ئەگەی چی ئەلێم."

- "بەلێ تێ ئەگەم، من بەدەرس وتومەتەوە، دوو ساڵ من پەروەردەکەری دوو کچی بچوك بووم لەشتوتگارت".
- "من هەر ئەوە نیە بەتەنها خۆشم بووێیت بەلکو موعجەبیشم پێتەوە، بەلێ من زۆر موعجەبم بەو روخسارەی کە تایبەتە بەخۆت، تۆ شتێکت تیایە کە من تێی ناگەم.. من رێزت ئەگرم، ئەزانم تۆ ناتەوێت شوم پێ بکەی تەنانەت ئەگەر ئەو شوکردنەش ئاسایی بێت بەلام پییەر مردووە."

کچە بەهەمو هێزی قیژاندی "ناوی مەهێنە تۆ بۆت نیە بەهیچ شێوەیەك ناوی بهێنی"

- "من تەنها ئەمەوێت ئەوە بلێم، خەفەت بارم بەمردنەکەی".
- "بەئەسیری لەلایەن ژەندرمە ئەلەمانیەکانەوە بەر گولە درا".
- "لەگەل تێپەربوونی ڕۆژەکاندا، وردە وردە لەبیرت ئەچێتەوە، هەروەك ئەزانیت، مرۆڤ کێ کەسێکی خۆشەویستی ئەمرێت وائەزانێ کە هەرگیز لەبیری ناچێتەوە، بەلام هەر بیری ئەچێتەوە، ئەی ئەوە باشتر نیە کە مناڵەکەت باوکی هەبێ."
- "تەنانەت ئەگەر لەنێوانیشماندا هیچ نەبێ، تۆ لەو بڕوایەدای کە من ئەوەم لەبیر ئەچێت کە تۆ ئەلەمانیت‌و منیش فەرەنسیم؟ ئەگەر وەك هەموو ئەلەمانیەکانی دیکە ئەو گێلیەت نەبوایە، باش ئەزانی کە ئەو مناڵە بەدرێژایی ژیانم بۆم ئەبێتە مایەی سەرشۆڕی، تۆ لەو بڕوایەدای هاوڕێم نیە، کەس نام ناسێ؟ چۆن ئەتوانم سەیریان بکەم لەکاتێکدا من مناڵم لەسەربازێکی ئەلەمانی بووە؟! من تەنها تکایەك کە لە تۆی ئەکەم ئەوەیە بەتەنها بەجێم بهێڵە بەکۆستەکەمەوە، بڕۆو توخوا جارێکی تر مەیەرەوە ئێرە ئیتر".

- "بەڵام ئەوە منداڵی منیشە، منیش ئەمەوێت"
کچەکە بەسەرسوڕماوییەوە هاواری کرد: "تۆ؟ منداڵێك چی تۆیە کە بەرهەمی کاتێکی سەرخۆشیو کێوییتیە؟!"

- "تۆ تێ ناگەیت، من زۆر شانازی ئەکەمو بەختیارم ئەوکاتە زانیم کە تۆم خۆش ئەوێت کەمەستم کرد سکت پڕە، یەکەم جار بڕوام نەکرد، بۆ من زۆر کتوپڕو سەرسوڕماوی بوو، تێ ئەگەی چی ئەڵێم؟! ئەو منداڵەی کە لەدایك ئەبێ بۆ من هەموو شتێکی ئەم جیهانەیە، ئاخ.. نازانم چۆن هەستی خۆم دەربڕم، ئەو منداڵە هەستێکی وای تیا دروست کردوم، خۆشم لەخۆم ناگەم."

ئەنێت سەیرێکی قوڵی کردو لەچاوەکانیا پریشکێکی سەیر ئەدرەوشایەوە، چاوەکانی سەرکەوتنی ئەگەیان بەپێکەنینێکی کورتەوە وتی:

- "نازانم لای من کامەیان زیاتر نەفرەت لێ کراوە. دڕەندەیەتیەکەتان، یادڵنەرمیو سۆزە جادوییەکەتان، ئەڵەمانیەکان."
- وادەرکەوت هەروەك گوێی لەوتەکانی کچەکە نەبوبێت وتی: "من هەمیشە هەر بیری لێ ئەکەمەوە"
- "تۆ مێشکی خۆت واڕاهێناوە کە کوڕ ئەبێ؟!"
- "من ئەزانم کوڕە، من ئەمەوێت بیگرمە باوەش. ئەمەوێت فێری ڕۆیشتنی بکەم، کە گەورەتریش بوو فێری هەموو ئەو شتانەی ئەکەم کە ئەیان زانم، فێری سواربوونی ئەسپو نیشانەگرتنەوەی ئەکەم، ماسی لەجۆگەکانتانا هەیە؟! فێری راوە ماسی ئەکەم ئەبمە بەختیارترین باوك لەم جیهانەدا"

ئەنێت سەیرێکی دڵ ڕەقانەی کرد، و دەمو چاوی گرژو مۆن بوو، بیرێك لەمێشکیا خەریك بوو دروست دەبوو، بیرێکی تۆقێنەر، هانس زەردەخەنەیەکی دڵنیایی بۆ کردو وتی:

- "لەوانەیە کە بۆت دەرکەوت من چەند منداڵەکەمانم خۆش ئەوێ، ئەو کاتەی تۆش منت خۆش بوێ، من بۆت ئەبمە مێردێکی چاك، شۆخەکەم".

ئەنێت هیچی نەوت، بەڵکو هەر بەرقەوە سەیری ئەکرد، هانس وتی: "تۆ یەکوشەی خۆشت نیە بەمنی بڵێیت".

دەمو چاوی سورهەڵگەڕاو بەقایم دەستەکانی یابەیەکداو وتی: "لەوانەیە هەندێك رقیان لێم بێتەوە، بەڵام هەرگیز کارێك ناکەم کە خۆم قێزم لەخۆم بێتەوە، تۆ دوژمنمیتو هەر بەدوژمنیش ئەمێنیتەوە، من بەتەنها بۆ ئەوە ئەژیم کە سەربەستی فەرەنسا ببینمەوە، هەر ئەو ڕۆژەش دێت، و لەوانەیە ئەوە لەساڵی ئایندەدا نەبێت، یا لەساڵەکەی دواتریشدا، لەوانەشە زیاتر لەسی ساڵی پێ بچێت بەڵام هەر ئەو ڕۆژە دێت کەسانی تر چی ئەکەن بابیکەن، بەڵام من هەرگیز نابمە تاقمی ئەو کەسانەی وڵاتەکەم داگیر ئەکەن، من رقم لێتە، رقم لەو منداڵەش کە داوتمێ، بەڵێ ئێمە شەڕمان دۆڕاند، بەڵام پێش تەواوبوونی جەنگ ئەیبینیت، کە ئێمە هەر نەبەزیوین، ئێستا بڕۆ من مێشکی خۆم لەمەدا چەسپاندوە، هیچ هێزێکیش نیە لەسەر ئەم ئەرزی خوایە بم گۆڕێ."

هانس بۆ چەند ساتێك بێ دەنگ بوو، لەپاشدا وتی: "دەربارەی منداڵ بوون خۆتت پیشانی پزیشك داوە؟ چی پارەی تێ ئەچێ ئەیدەم"

- "تۆ لەو بڕوایەدای ئێمە شوورەییەکانی خۆمان لەبەردەم خەڵکیدا بڵاویکەینەوە" دایکم هەرچی پێویست بکات جێ بەجێی ئەکات"
- "بەڵام ئەگەر ڕوداوی دیکەی بەدوادا هات؟"
- "تۆ بۆ بایەخ بەکارو باری خۆت نادەی، چیتە بەسەر خەڵکیەوە؟!"
- هانس ئاخێکی هەڵکێشا،و هەستایە سەرپێ، کە دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە داخست، ئەنێت سەیری کرد لەکێڵگەکە دوورکەوتۆتەوەو بەڕێگا باریکەکەدا ئەڕوات کە ئەگاتە سەر ڕێگا سەرەکیەکە بەتووڕەییەکی زۆرەوە هەستی کرد هەندێك لەو قسانەی هانس کردی هەستێکی تایبەتی تیادا دروست کردبوو کە هەرگیز لەوەپێش هەستی پێ نەکردبوو،و هاواری کرد: "خوایە.. خوایە، هێزم بەرێ"

هانس لەوکاتەدا بەڕێگاکەدا ئەڕۆیو سەگەکەیان کە سەگێکی پیر بوو، دەمێك بوو لەگەڵیاندا ئەژیا بەوەڕینەوە ڕێگاکەی پێ گرت، چەند مانگێك بوو هانس ئەیویست سەگەکە رابێنێ، بەڵام سەگەکە وەڵامی نەبوو بۆی، هەرچەندە بیویستایە دەستی بۆ بەرێ، سەگەکە ئەوەڕیو کەڵبەکانی دەرئەخست، بەڵام ئێستا سەگەکە بەرەو رووی رای کرد، ئەویش بەدڵ شکاویو توڕەیی خۆی دەری بڕی، هانس یەك

شەقی بەهێزی کێویانەی تێ سرەواندو هەڵیدایە ناو درەختە بچوکەکانەوەو بەشەلەشەلو وەڕینەوە رای کرد، ئەنێت هاواری کرد:

- "درندە، درندە.. درۆزن، درۆزن، درۆزن، من لاوازبووم ئەوەندەی نەمابوو بەزەیم پیاتا بێتەوە".

لەدیوارەکەی تەنیشت دەرگاکەوە ئاوێنەیەك هەڵواسرابوو، ئەنێت سەیرێکی خۆی کرد، کە خۆی دی زەردەخەنەیەك گرتی، بەڵام زەردەخەنەکە زۆرتر لەدەمو چاو گرژکردنێکی شەیتانانە دەچوو.. ئەوکاتە مانگی مارت بوو، شاری سۆیۆنس بەسەریازگەی ئەڵەمانیەوە جەنجاڵ بوو، پشکنینو مەشق کردنێکی چڕ بەردەوام بوو، پڕوپاگەندەیەکی زۆر لەناودابوو، گومان لەوەدا نەبوو کە بەرەو شوێنێك ئەچوون، تەنانەت ئەفسەرو سەریازەکان خۆشیان نەیان ئەزانی کە مەبەست لەمەچییە، هەندێك لەو بڕوایەدا بوون کە خۆ ئامادەکردنێکە بۆ داگیرکردنی ئینگلتەرە، هەندێکی دیکە ئەیان وت رەنگە بیان نێرن بۆ بولقان، کەچی هەندێکی تر لەبارەی ئۆکرانیاوە قسەیان دەکرد.

هانس لەو کاتانەدا زۆر پڕ کار بوو نەی ئەتوانی بچێتەوە بۆ کێڵگەکە، تادوای نیوەڕۆی رۆژی یەك شەممەی دواتر، رۆژێکی تاریكو ساردبوو، چلورە هەموو لایەکی گرتبو، ئاسمان لەوە دەچوو کە ئێستا یاتاوێکی دیکە بەفرێکی زۆر بەباوە دەنێرێت، گوندەکەش تەواو ناخۆشو مات بوو، کە هانس چووە ژوورەوە، مادام پیرێ هاواری کرد "ئەوە تۆی، وامان زانی مردویت".

- " نەم توانی لەمە پیشتر بێم، ئێمە بەم زوانە ئەمان بەن، نازانین بۆ کوێ".
- "منالەکە ئەم بەیانیە لەدایك بوو،... کوڕ بوو"
- هانس خەریك بوو لەخۆشیا دڵی لەسنگیەوە دەربچێ بەهەردوو قۆڵی باوەشی بەژنە پیرەکەدا کردو هەردوو روومەتەکانی ماچ کرد.
- "منالی رۆژی یەك شەممە بێ گومان بەختدار دەبێ، باشووشە شەمپانیەکە هەڵپچڕین، ئەنێت چۆنە؟!"
- "زۆر باشترە لەوەی چاوەڕوان ئەکرا، بەئاسانی لەدایك بوو، دوێنێ شەو هەستی بەئازار کرد، و سەعات پێنجی بەیانی هەموو شتێ: کۆتایی هات".

پیرێی پیریش لەنزیك ئاگرەکەوە پاپەکەی ئەکێشا کە پەرۆشی هانی بۆ منالەکە دی

بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: "منالی یەکەم کاریگەریەکی زۆری لەسەر باوك هەیە".

مادام پیری وتی: "قژی زۆرە وەك خۆشت قژ زەردە، چاوەکانیشی وەك چاوەکانی خۆت شینن، هەروەك خۆت وتت، لەژیانما منالی واجوانم نەدیوە، هەر لەباوکی ئەچێ".

هانس هاواری کرد: "خوایە، من زۆر بەختیارم، گێتی چەند خۆشە، ئەمەوێت ئەنێت ببینم".

- "من نازانم ئایا ئەیەوێت بت بینێ یان نا؟ من نامەوێت نیگەرانی بکەم لەبەر شیری منالەکە"
- "نا.. نا.. لەبەر من نیگەرانی مەکە ئەگەر نایەوێت بم بینێ، وازی لێ بێنە، بەڵام ئەمەوێت تەنها یەك خولەك منالەکە ببینم.
- "هەوڵ ئەدەم ئەوەی لەتوانامدایە بیکەم، هەوڵ ئەدەم منالەکە بهێنمە خوارەوە بۆ ئێرە".

مادام پیرێ رۆیشت، دەنگی پێیەکانی گوێ لێ بوو کە بەسەر پلیکانەکاندا سەرئەکەوت، ساتێکی کەم تێپەڕ نەبوو کە گوێیان لێ بوو بەخێرایی دابەزیو بەپەشۆکاوی خۆی کرد بەموبەقەکەدا:

"کەس لەوێ نەبوو، لەژوورەکەی خۆی نەبوو، منالەکەش دیار نیە".

پیریو هانس بەیەکەوە هاواریان کرد، بێ ئەوەی بزانن چی ئەکەن، بەخێرایی بەپلیکانەکاندا سەرکەوتن تیشکی زستانە سەختەکە دەکەوتە سەر کەلووپەلە کۆنەکانو قەرەوێڵە ئاسنەکەو دۆلابە هەرزان بابیەکەی جلەکانو مێزە چەمکەجەبیەکە، ژوورەکەش تەواو پیسو دڵتەنگ بوو، هیچ کەس لەژورەکەدا نەبوو،.. مادام پیرێ هاواری کرد:

- "لەکوێیە؟!" و بەرەو ڕاڕاوە تەسکەکە رای کردە دەرگاکانی کردەوەو بەهەموو هێزی هاواری کچەکەی کرد: (ئەنێت.. ئەنێت، ئاخ ئەمە چ شێتیەکە.."
- "لەوانەیە لەکەلەگیەکەبێ"
- بەخێرایی بەرەو قاتی خوارەوە دابەزینو بەرەو کەلەگیە بەجێ هێڵراوەکە رایان کرد، هەر کە دەرگاکانیان کردەوە، هەوایەکی سارد بەرەو رویان هات، ئەوسا دەرگای گەنجینەکەیان کردەوە، مادام پیرێ وتی: "چۆتە دەرەوە، شتێکی تۆقێنەر رووی‌داوە".

هانس ئەوەنەی نەمابوو خەفەت بیکوژێ وتی: "چۆن توانیویەتی دەرچێ؟!"

- "بێ ئەقڵە لەدەرگاکەی پشتەوە.."

پیرێ بەرەو دەرگاکە چوو تەماشایەکی کردو وتی: "راستە دەرگاکە کراوەتەوە" مادام پیرێ هاواری کرد "خوایە ئەمە چ شێتییەکە، ئەم چوونە دەرەوەیە ئەی کوژێ".

هانس وتی: "پێویستە بۆی بگەڕێین" بەخێرایی بەرەو موبەقەکەو دەرگاکەی پشتەوە چوون، ئەو ڕێگایەی کە هەمیشە لێوەی ئەهاتە ژوورەوە، ئەوانیش دوای کەوتن، هانس وتی: "بەرەو کوێ بچین" ژنە پیرەکە بەخێرایی وەڵامی دایەوە: "بەرەو ڕووبارەکە".

هانس لەجێگای خۆی وەستا، هەروەك بوبێت بە بەرد، و زۆر ئەترساو تەماشای ژنە پیرەکەی ئەکرد کە ڕەنگی پەڕیبوو.

مادام پیرێ قیژاندی: "من ئەترسم. من ئەترسم"

هانس دەرگاکەی خستە سەر پشت، لەوکاتەدا ئەنێت هاتە ژورەوە، هیچی لەبەرا نەبوو کراسەکەی شەوی نەبێت، رۆبێکی تەنکی شایلۆنی پەمەیشی دابوو بەسەریا، کە گوڵی شینی زەق زەقی تیا بوو، هەموو گیانی تەڕ بوو قژیشی کە پڕ بو بوەوەو بەشێکی نووسابوو بەسەریەوەو بەم لاولایدا هاتبووە خوارەوە، وەك ئەگریجەی بڵاو بڵاو، ڕەنگی سپی بوو بوو، وەك مردووی لێ هاتبوو، مادام پیرێ بەرەو روی چوو و باوەشی پیاکرد وتی: "لەکوێ بوویت؟ کچە کلۆڵەکەم هەموو گیانت تەڕە، تێك چووی؟!"

ئەنێت پاڵێکی پێوەناو سەیرێکی هانسی کردو وتی:

- "تۆ لەکاتی خۆیدا هاتی"
- مادام پیرێ هاواری کرد: "کوا مناڵەکە"
- "ئەبوایە هەر ئەمەم بکردایە، ترسام ئەگەر کەمێکی تر بیهێڵمەوە ئیتر دڵم نەیەت".
- "ئەنێت چیت کردووە؟"
- "ئەو کارەم کردووە کە ئەبوایە بم کردایە، بردم بۆ ڕووبارەکەو لەژێر ئاوەکەدا گرتم تامرد.."

هانس هاوارێكو قیژەیەکی زۆر بەرزی کرد هاوارێکی وا وەك گیاندارێك کە بریندار ئەکرێت بۆ مردن، بەهەردوو دەستی دەموچاوی خۆی داپۆشیو ئەیناڵاند، وەك سەرخۆشێك فڕێ درابێتە دەرەوە، بەتل لەدەرگاکە چووە دەرەوە ئەنێتیش خۆیدا بەسەر کورسیەکەدا ناوچەوانی خستە سەرهەردوو دەستی، دەستی کرد بەگریانێکی زۆر بەکوڵ:

**سەرچاوە:**

W. Somerset Maugham: "Collected short stories"

Vol: one – pan book – 1975 . london

"The uncongured" . PP 307- 334

# گفتوگۆ لەگەڵ كارل پۆپەردا

● و: ئازاد بەرزنجی

**لەنێو ئەو چاوپێكەوتنانەدا كەكارل پۆپەر لەدوا ساڵانی تەمەنیدا ئەنجامی داون. ئەم گفتوگۆیە كەیەكێكە لەتایبەتیترین گفتوگۆكان؛ كەمتر ناسراوە.**

**ئەم گفتوگۆیە؛ هونەرمەندو وێنەگری بەناوبانگی ئەڵمانیایی، خانم هیرلیندە كولبل (He r l inde koelbl) لەگەڵ پۆپەردا سازیداوەو لەكتێبێكدا بلاَویوەو كەجگە لەوەی كۆمەڵێك گفتوگۆی كورتی لەگەڵ چەند كەسێتییەكی زانستیو كۆمەڵایەتیو رۆشنبیریو هونەریی جیهانیدا… وێنەی سەرنجراكێشی ئەو كەسێتیانەی لەخۆگرتووە. ئەمانە كەزۆربەیان جوولەكەن یان بەبنەچە جوولەكەن، لەقۆناغێكی دیاریكراودا چارەنووسێكی هاوبەشیان هەبووە، هەریەكەیان پەرجوو ئاسایانە توانیویەتی لەساڵانی ترسناكی سەردەمی دەسەڵاتی شوومی نازیزمدا ژیانی خۆی قوتار بكات، ساڵانێك كە تیایدا ترس باڵی بەسەر بەشێكی گەورەو فراوانی ئەورووپادا كێشابوو، هەروەها كارەساتی گەورەی جەنگی جیهانیی دووەمو كوشتنی بەكۆمەڵی جوولەكەكان مۆری شووورەیی بەناوچەوانی ((مرۆڤایەتیی شارستانی))ەوە نابوو.**

**كاریگەریی ئەم قۆناغە لەسەر بیروبۆچوونی پۆپەر، هەورەها بینینی ئەنجامی ئەو سیاسەتە ترسناكانەی كەبەناوی ماركسیزمەوە لەبەشێكیتری ئەورووپادا پیادەدەكران، زەمینەیان بۆ نووسینی یەكێك لەبەناوبانگترین كتێبەكانی ئەو خۆش كرد، واتە كتێبی ((كۆمەڵگای كراوەو دوژمنەكانی)).**

* جەنابی پرۆفیسۆر پۆپەر، ئێوە لەقۆناغی خوێندندا، وازتان لەقوتابخانەی ئامادەیی هێناو بڕیارتان دا بەبێ مامۆستاو بەپشت بەستن بەخۆتان زانست بخوێنن بۆچی؟

– كەشو هەوای قوتابخانە دەبووە مایەی بێزاری بۆمن. من هەرگیز لەژیانمدا هەستم بەبێزاری نەكردووە، تەنها لەقوتابخانە نەبێ. بەكورتی قوتابخانە بۆمن جارسكەرو بێزاریهێنو تارادەیەك ئازار بەخش بوو. بێگومان ئەمەش تاقە هۆ نەبوو بۆ وازهێنانی من لەئامادەیی؛ ناكۆكیی فرە لەنێوان منو مامۆستاو قوتابییەكاندا هەبوو كەپەیوەندییان بەمەسەلەی ئاشتیخوازیەوە لای من هەبوو. ئەمەی كەباسی دەكەم لەساڵی ١٩١٨دا بوو، واتە رێك دوای جەنگی جیهانیی یەكەم. بەلاَم لەمەزیاتر حەزناكەم باسی ئەم مەسەلەیە بكەم.

* ئێوە دوانزدە ساڵان بوون كەبۆیەكەمجار كتێبێكتان دەربارەی مەسەلە سیاسیەكان خوێندەوەو بوون بەهەواداری ماركسیزم، بەلاَم لەهەڤدە ساڵاندا بوونە ئەنتی ماركسیست. چ شتێك بووە هۆی ئەوەی كەهەر لەسەرەتای لاوێتیتانەوەو لەدیدگایەكی وا رەخنەییانەوە دەست بدەنە مەسەلە سیاسیەكان؟

– نازانم ئێوە ئەو زانیاریەی خۆتان لەكوێوە هێناوە سەبارەت بەوەی گوایە من لەدوانزدە سالێدا كتێبێكی وەهام دەربارەی مەسەلە سیاسیەكان خوێندووەتەوە؟ من خۆم لەمە بێئاگام. لەوانەیە مەبەستتان كتێبە سەیرو سەمەرەكەی نووسەری ئەمریكایی ئیدوارد بلەیمی Edward Belamy (١٨٥٠ – ١٨٩٨) بێت كەرۆمانێكی خەیاڵییە بەناوی ((تێڕوانینێك لەساڵی ٢٠٠٠وە بۆ ساڵی ١٨٨٧))، لەقەڵەمدانی ئەم كتێبە بەكتێبێكی ((سیاسی)) وەك ئەوە وایە كتێبی ((بەدەوری جیهاندا لەهەشتا رۆژدا))ی نووسەری فەرەنسایی ((ژۆل ڤێرن))یش بەسیاسی لەقەڵەم بدەین. بەلاَم ئەوەی وای لەمن كرد هەواداری مەسەلە سیاسیەكان. جەنگی جیهانیی یەكەم بوو لەساڵی ١٩١٤دا. ئەندامانی خێزانەكەمان هەموو ئاشتیخوازبوونو ئەوە بەلای منەوە شتێكی ئاشكرا بوو كەجەنگ، بەتایبەتیش لەچاخی ئێمەدا، بەناچاری بێبەزەییانەو نامرۆییانە دەبێ. هەربۆیە لای من ئەو لایەنگریو پێشوازییەی كەلەو دەمەدا لەجەنگ دەكرا، زۆر چەوتو ترسناك بوو. من لەسەرەتاكانی ساڵی ١٩١٩دا بووم بەكۆمۆنیست. چونكە كۆمۆنیستە رووسەكان لە((بریست لیتۆوسك))[1] لەگەڵ هاوپەیمانەكاندا رێككەوتننامەی ئاشتییان مۆركرد.ئیدی چۆن دوای دە هەفتە بووم بەئەنتیماركسیست، ئەمەم لەژیاننامەكەمدا باس كردووە[2]

* جەنابی پرۆفیسۆر پۆپەر، دەڵێن ئێوە رۆژنامە ناخوێننەوە، سەیری تەلەفزیۆن ناكەنو گوێ لەرادیۆش ناگرن. هۆی ئەمە ئەوەیە كەحەزتان بەسیاسەت نەماوە، یان لەو بڕوایەدان كەوا باشترە خۆتان لەمەسەلە سیاسیەكانی رۆژ دوورە پەرێزبگرن؟

– من تەنها كاتێك وتاری رۆژنامەكان دەخوێنمەوە كەیەكێك لەهاوكارەكانم یان هاورێكانم خوێندبێتیەوەو بزانێ كەخوێندنەوەی

بۆ منیش پێویستە. هەربۆیە من لەهیچ ڕۆژنامەیەکدا بەشداریم نەکردووە، تەنها چەند گۆڤارێکی زانستی - پسپۆڕیم بۆدێ. تەلەفزیۆنیشم نییەو لەوانەیە لەماوەی دووساڵدا یەک دووجار گوێ لەرادیۆ بگرم. دەزانیت بۆ؟ لەبەرئەوەی بەمجۆرە هەم کاتێکی زۆرم بۆ دەگەڕێتەوە، هەم تاڕادەیەکی زۆر خۆم لەدەردەسەریو نائارامی دەپارێزم. ئەمەش پەیوەندیی بەدووره پەرێزی لە((مەسەلە سیاسیەکانی ڕۆژ))ەوە نییە، چونکە من هەرگیز بەشداریم لەو جۆرە مەسەلانەدا نەکردووە. من لەڕێی هاوڕێکانمەوە دەزانم چی ڕوودەداتو چی ڕوونادات.

* ئێوه سەرەوەختێك وتووتانە لەنێو تەواوی ئایدیا سیاسیەکاندا، لەوانەیە ئەوەی لافی بەختەوەری بۆ مرۆڤایەتی لێدەدات لەهەموویان خەتەرناکتر بێت. نزیکەی نیوسەدە لەمەوبەر ئەمەتان وتووە. ئایا ئێستاش هەر لەسەر ئەو رایەی خۆتانن؟

– بەڵێ، دیارە کەتائێستاش هەر لەسەر ئەو رایەم. بێگومان دەبێو دەکرێ بۆ ژیانو گوزەرانی باشی کەسان هەوڵبدرێ، بەڵام نەك بۆ ((بەختەوەریی مرۆڤایەتی)). من ئەوکاتە ئەوەشم وتووە کەهەوڵو کۆششی بۆ دامەزراندنی بەهەشت لەسەر زەوی هەمیشە ڕێی بەرەو دۆزەخ خۆشکردووە. ئەو کەسانەی وادەزانن دەتوانن مرۆڤایەتی بەختەوەر بکەن، کەسانێکی خەتەرناکن.

* بۆچی ئێوە لەو باوەڕەدان کەئەمجۆرە کەسانە خەتەرناکن؟ ئادەمیزاد خۆی لەخۆیدا ئومێدی بەبەختەوەری هەیەو خەون بەژیانێکی باشترەوە دەبینێ.

– بەڵام خەونی دروستکردنی بەهەشت لەسەر زەوی خەونێکی خەتەرناکە. چونکە ئەمە بەوە دەشکێتەوە کەئەو کەسانە پاش ماوەیەك دەگەنە ئەو قەناعەتەی کەمافی خۆیانەو ڕەوایە بۆیان کۆمەڵێك لە خەڵکی بکوژن تاخەڵکێکی دی بەختەوەر بکەن. ئامانجی گەورە پاکانە بۆ بەکارهێنانی هەموو جۆرە وەسیلەیەك خۆش دەکات.

* لەو بڕوایەدان کەئەو خەونە بەناچاری ڕێ بۆ دۆزەخ خۆش دەکات؟

– ئەو خەونە ئەگەر بێتەدیش، دیسانەوە هەموان گلەیی دەکەن. ئەم دونیایەی ئێمە بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی تائێستا هەبووە، دونیایەکی باشە، بەهەشتی سەر زەوییە. بەڵام کەس دان بەم ڕاستییەدا نانێتو هەموو سکاڵا دەکەن، ڕاستییەکەی ئەوەیە کەنوێنەرانی ئاینو ڕۆشنبیرە دەسەڵاتخوازەکان بەردەوام خەڵك فریو دەدەن. مەبەستم ڕۆژنامەکانو مۆیەکانی تری ڕاگەیاندنە کەبەردەوام ئەوە دووپات دەکەنەوە کەئێمە لەچ دونیایەکی خراپدا دەژین، ئەوە زۆر ڕاستە کەژینگەکەمان لەبەردەم هەڕەشەدایە؛ بەڵام چارەسەرەکەی هەراو زەنا نییە.

* لەو بڕوایەدانین کەسەرەتا دەبێ ئاژیرێك (وریاکەرەوەیەك) هەبێ تازانست بیر لەچارەسەرێك بکاتەوە؟

– بەڵێ .. ئاژیر، بەڵام نەك هەراو هوریا.

ئێوە هەمیشە یەکێك بوون لەنەیارانی ئایدیۆلۆژیاو بەرامبەر بەئامانجە گەورەکانیش بەدبین بوون. ئایا ئەقڵانییەتیش لەریزی ئەم ئامانجە گەورانەدا نییە؟ ئایا تائێستا بەناوی ئەقڵەوە کاری بەدو ترسناك ئەنجام نەدراوە؟ ئەگەر ئەمەمان پێقبووڵ بێت، ئایا نابێتە بەڵگەیەك دژ بەئەقڵانییەت؟



– بەڵێ، من لەنەیارانی ئایدیۆلۆژیاکانم، بەڵام بڕواناکەم بۆ تەنها ساتێکیش بەرامبەر بەئامانجە گەورەکان بەدبین بوویم. من بەرامبەر بەئامانجە گەورەکان بەدبین نەبووم، بەڵکو بەرامبەر بەراگەیەنەرانو مژدەدەرانی ئەو ئامانجە گەورانە بەدبین بووم؛ بەرامبەر بەکەسانێکی وەکو ((فیشتە))و((هیگل))و ئامانجگەرایانی ترو ناسیۆنالیستە پۆست ((کانت))ییەکان. لەڕاستیدا ئەو تاوانانەی کە((ڕۆبسپێر)) بەناوی ئەقڵەوە ئەنجامی داون گەلێ ترسناكو دزێوبوون. بەڵام من لەبنەڕەتدا بەڕاستی نازانم ئەمانە بە((بەڵگەیەك دژ بەئەقڵانیەت)) لەقەڵەم بدەین.

* ئێوە راتان وایە کە((هەموو جۆرە سەرچاوەیەکی مەعریفە هەیە، بەڵام سەرچاوەی متمانە پێکراوو باڵادەست بوونی نییە)) ئایا بەلای ئێوەوە دەسەڵاتو توانای مرۆییش نییەو نەبووە؟

– من پێم باشترە بڵێم کە ((سەرچاوەکانی مەعریفە جۆراوجۆرن، بەڵام هیچیان لەوی تریان باڵادەستترو بەتواناتر نییە)).

تەنانەت لەماتماتیکیشدا توانایەکی واناببینینەوە. ئێمە هەموو مرۆڤینو مرۆڤیش بێ هەڵە نییە، ئەوەتانێ کەلەم دواییەدا لەتیۆرەکانی ((کۆرت گودل)) (٣)دا کۆمەڵێك هەڵە، گەرچی بێبایەخیش بن، دۆزراوەتەوە.

* تۆماس مان سەرەوەختێك وتوویەتی، هونەر دەخوازێ بگۆڕێ بۆ مەعریفە. ئەوەندەی من ئاگاداربم ئێوە لەم دەساڵەی دواییدا بۆ یەکەمجار هەندێ راوبۆچوونتان سەبارەت هونەر خستۆتەڕوو. ئایا ئێوە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان هونەرو مەعریفەدا دەبیننەوە؟

– نازانم ئایا دەکرێ بەشێوەیەکی گشتی ئەمە بگوترێ؟ بەڵام ئەگەر پەیوەندییەکیش هەبێت، بەوجۆرەیە کە لەباسە زانستیەکاندا شتێك هەیە ئەشوبهێتە سەر لایەنە هونەرییەکانی

مەعریفەو رۆڵی هەیە. بەڵێ.. بەمجۆرە، نەك بەپێچەوانەوە. ((گۆتە)) سروشتناس بوو، بەڵام ((شیللەر)) فەیلەسووف بوو.

هەروەکو پێشتریش وتوومە من مەیلم بەلای تۆماس مان دا نییە، نەبەلای کەسی خۆیو خەریکبوو بڵێم نەبەلای نووسینە لاوازەکانیشیدا. خوێنەری کارەکانی ئەو بەردەوام لەنووسینەکانیدا دەنگی ((گەورەترین شاعیری هێشتا زیندوو)) دەبیستێت.

* ئایا فەیلەسووفان بەرپرسیاریی ئەخلاقیو سیاسیی بیروڕا فەلسەفیەکانیانو هەروەها کاریگەرییە شیاوو ئەنجامە کردەییەکانیشیان لەئەستۆدایە؟

– بەڵێ، بێگومان.

بیروبۆچوونە فەلسەفیەکانی ئێوە بەکۆمەڵێك پرەنسیپی ئەخلاقیی دیاریکراوەوە پابەندە؛ شتێکی وەکو ((ئەخلاقی لێکۆڵینەوەی زانستی)). ئایا ئەم پرەنسیپانە ژیانیشتانی گرتۆتەوە؟

مەبەستم ئەوەیە ئایا یەکەیەك لەنێوان بۆچوونەکانتانو کەسێتیی خۆتاندا هەیە؟

– بەڵێ، ئەوە شتێکی بەلگەنەویستە. بەڵام ئەوەی پێی دەڵێن ((فەلسەفەی من)) پتر کۆمەڵێك ئایدیای ئەخلاقی لەخۆدەگرێ نەك ئاکاری حەقیقەتخوازی، کەبێگومان ئەمەی دووەمیان لەجێی خۆیدا گرنگیەکی زۆری هەیە.

لەنەریتی فەلسەفیی ئەڵمانییدا فەلسەفە پەیوەندییەکی لاوازی بەو کەسەوە هەیە کەنوێنەرێتیو لایەنگیریی لێدەکات. سەبارەت بەئێوەش وادێتە بەرچاو کەبنەما فەلسەفیەکانتان شتێکی جیابێت لەخۆتان؛ شتێك کەلەئێوە جیابۆتەوەو سەربەخۆیانە ڕێی خۆی دەگرێتە بەر. لەم رووەشەوە بەلاتانەوە گرنگ نییە کەدەربارەی خۆتان قسەبکەن. ئایا بۆچوونەکەم لەم بارەیەوە راستە؟

– لەراستیدا من ئایدیا – یان باشتر وایە بڵێم کار– لەکەسەکە خۆیەوە بەنزیك دەزانم، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو کارە، کارێکی هونەری بێت. بەڵام بەبڕوای من ئەو کەسەی کارەکەی خۆی بەلاوە گرنگە، کاریگەرییە عەینیەکانی کارەکەی لەکەسی خۆی پێگرنگترە.

* ئێوە بەماوەیەکی زۆر بەر لەئێستاو لەشوێنێکدا ئەم گوتەیەی ((کانت))تان وتۆتەوە: (دووشت هەن کەبەردەوام دەبنە مایەی ئافەرینو رێزی من: ئاسمانی پڕ ئەستێرەی ژوور سەرمو یاسای ئەخلاقیی ناوناخم)). بەڵام دواتر زانیوتانە کەئەم گوتەیەی کانت زۆرجار لای کەسانێك رافەی هەڵەی بۆکراوە.

– ئەوەی دەبووە مایەی خراپ حاڵیبوون– لەکاتێکا هەرکەسێك سەرەتای (ئەنجامی)) دووەم رەخنەی کانت(٤)ی خوێندبێتەوە لایەنگیری لەوە دەکات– ئەوەیە کەئەو کەسانە نەیانزانیوە کەمەبەستی کانت لە((ئاسمانی پڕ ئەستێرە)) تیۆرەکەی ((نیوتن))ە نەك کۆمەڵێك ئاماژەی هەستی؛ یان وەکو کانت خۆی دەڵێت ((جۆشو خرۆشی هەستەکان)). لەروانگەی ((کانت))ەوە ئاسمان سیمبولی رێکوپێکیی جیهانە. بۆ سەلماندنی ئەمە ئەوەندە بەسە کەبچینەوە سەر راوبۆچوونەکانی نیوتن. ئەو ئاماژەیەی کانت بۆ نیوتنە. لەراستیدا مەبەستی کانت ((یاسای گرانیش نیوتن))ە. کانت ئەم یاسایە بەهاوتا دادەنێت لەگەڵ ئەوەدا کەخۆی پێی دەڵێت (یاسای ئەخلاقی).

– دەبینین کەلەڕێی بەیەکەوە دانانی ئەم دووانەوەیە گوتەکەی کانت مانا پەیدا دەکات، لەکاتێکا بەتەنها وەسفکردنی ئاسمانی پڕ ئەستێرە هیچ مانایەکی نییە.

لەیەکێك لەنووسینەکانتاندا هاتووە: ((دەبێ ئەوەمان لاروون بێت کەئێمە لەدۆزینەوەو راستکردنەوەی هەڵەکانماندا پێویستمان بەئادەمیزادیتر هەیە..)) ئێوە خۆتان زۆرترین شت لەکێوە فێربوون؟ باشترین رەخنەگری ئێوە کێبووە؟

– بەو مانایەی کەئێوە مەبەستتانە، لەهەموو کەسێك زیاتر لە((ئەلفرید تارسکی))ەوە(٥) فێربووم. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە بۆ ناوبردنی هەموو ئەو کەسانەی کەمن شتیان لێوە فێربووم، پێویست بەلیستێکی درێژ دەکات کەلەپێشەوەی ناوەکاندا ناوی هاوسەرە کۆچکردووە کەشمی تیایە. لەنێو قوتابییەکانی جارانیشمدا ((دیڤید میللەر)) زۆرترین هەڵەی تیۆرەیی منی دەدۆزییەوەو راستی دەکردنەوە.

* ئایا بەلای ئێوەشەوە شتێك هەیە وەکو ((جوولەکەیی من))؟ یان ئەمە بەلاتانەوە شتێکی بێ بایەخە؟

– من یەکێکم لەنەیارانی چەمکی وەکو ((ئەڵمانێتی))و((جوولەکەیی)). هەندێ لەئەڵمانییەکانو یان هەندێ لەپەیرەویکارانی ئایینی وەکو ئایینی مەسیحی مەسیحسەت، جوولەکە، ئیسلام خزمەتی گەورەیان کردووە، هەروەك هەندێ لەفەرەنساییەکانو ئینگلیزەکانو ... یان ئەوانەی باوەڕیان بەنازانمگەرایی (اللا أدرية) هەیە. بەڵام من هەموو جۆرەکانی ناسیۆنالیزم بەجۆرە خۆپەرستیەکی بەدکارانەو یان ئاوێتەیەك لەساویلکەییو ترسنۆکی لەقەڵەم دەدەم. مرۆڤی ناسیۆنالیست لەراستیدا مرۆڤێکی ترسنۆکە، چونکە پێویستی بەوە هەیە عەوام بەرگریی لێبکەن، جەسارەتی ئەوەی نییە بەتەنیایی لەسەر پێی خۆی بوەستێت. نەزانینو ساویلکەییشی لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کەخۆیو ئەوانەی وەك خۆین، لەخەڵکی دی بەباشتر دەزانێت.

پەراوێزەکان:

١. Brest - Litowsk ، مەبەست لەرێکەوتنامەی ئاشتیی ((بریست لیتۆوسك))ە کەلەسەردەمی لینین دلو لەسێی ئاداری ١٩١٨ز دا، لەنێوان رووسو هاوپەیمانانی جەنگی جیهانیی یەکەمدا مۆرکرا.

٢. واتە کتێبی ((بنەمای ژیانی فیکریی من)) کارل پۆپەر.

٣. Kurt Jodel (١٩٠٦ – ١٩٧٨) لۆژیکناسو ماتماتیکناسی بەناوبانگی نەمساوی.

٤. واتە کتێبی ((رەخنە لەئەقڵی کردەیی)) ئەمانوێل کانت.

٥. Alfred Tarski (١٩٠١ – ١٩٨٢) لۆژیکناسی ئەمریکایی بەرەچەڵەك پۆڵەندی کەلەڕێی کتێبە بەناوبانگەکەیەوە ((ماناناسی)) کاری کردە سەر بیروبۆچوونەکانی کارل پۆپەر.

٦. کارل پۆپەر لەخێزانێکی جوولەکەدا هاتە دنیاوە، بەڵام دواتر بوو بەپەیرەویکارێکی ئایینی پرۆتستانتی مەسیحی.

* لەگۆڤاری ((بخارا))وە کراوە بەکوردی، ژمارە (١) مانگی ٩، ١٠/١٩٩٨

# فایلی ژمارە
# ڕۆمانی نوێی فەرەنسایی

ڕۆمانی نوێ بۆ؟

ڕۆمانی نوێی فەرەنسایی

کەسێتی لەڕۆمانی نوێی فەرەنسی‌دا



ناتالی ساروت



ئالان ڕۆب گرێ



میشیل بۆتۆر

کلۆد سیمۆن

# فایلی رۆمانی نوێ بۆ؟

رۆمانی نوێ زاراوەیەکە بۆ ئەو شێوە ئەدەبیە تازەیەی رۆمان کە سالی ١٩٣٩ بە کتێبی هەلچوونەکان (تروپیزم) ی (ناتالی ساروت) لە پاریس دەستی پێ کردوو. بە رۆمانی (پاکژکەرەکان) ی ئالان رۆب گریێ ناویانگی دەرچوو، ئەم جۆرە رۆمانە -بەپێچەوانەی رۆمانی کلاسیکی‌یەوە- هیچ بایەخێك بەو رەگەزە سونەتی‌و باوانە نادات کە رۆمانی پێش خۆیان بە بنەمایان دەزانی، وەك کەسایەتی‌و وێنەگرتنی واقیع‌و رووداوە هەرە باوەکان. لە رۆمانی نوێدا کەسایەتی (شەخسیەت) هەندێك جار دەبێتە وشەیەك یان پیتێك یان راناوێك، مێژوو لە رۆمانی نوێدا یان نیە یان بەکەمێك گۆرانەوە دووبارە دەبێتەوە. بۆ نموونە لە رۆمانی (پلە) ی ((میشیل بوتور)) دا سێ کەسی بێ هوودە لەگێرانەوەی سەعاتێکی وانەی مێژوودان. نووسەرانی رۆمانی نوێ بابەتی هاویەشیان هەیە، وەك گەشتو گەرانو سووسەکردنو هەلاتنی پۆلیسی، بەلام لە هەندێك شتی تردا جیاوازن. بۆ نموونە ((بوتور)) بە قوولی لە رەوان شناسی دەروانێت، کەچی رۆب گریێ وێنەی شت دەگرێت. ((کلود سیمون)) وەسفی دەکات جێگاو دیاردەکان وەك خۆیان باس دەکات، بۆیە دەتوانین بلێین رۆمانی نوێ زیاتر لە دیاردە شناسیەوە نزیکە.

رۆمانی نوێ قوتابخانەیەکی ئەدەبی نیە، بزووتنەوەیەکی بێ بەرنامەو تا ئەندازەیەك دیاردەیەکی کوتو پڕ بوو کە چەند نووسەرێکی بە یەکتر گەیاند، دوای بلاوبونەوەی بەرهەمەکانیان هەستیشان کرد شێوەی نووسینیان لەیەکدی دەچێتو هیچ پەیرەویەك لە رەگەزە عادەتیەکانی بەرهەمی پێش خۆیان ناکەنو گیانی نوێ خوازیان لە گەشانەوەدایە.

سالی ١٩٥٦ ناتالی ساروت (سەردەمی بەدگومانی) چاپ کرد، ئالان رۆب گری سالی ١٩٦٣ (بۆ رۆمانی نوێ) ی بلاوکردەوە، سالی ١٩٦٣ میشیل بوتور (پەیامێك دەربارەی رۆمانی نوێ). (ژان ریکاردو) بەنووسینی (مەسەلەی رۆمانی نوێ) سالی ١٩٦٧ و (بۆ تیۆری رۆمانی نوێ) سالی ١٩٧١ و بە چەند باسێکی تری درەنگ تر لەوان پەیوەندی پێوە کردن.

رۆمان نووسانی نوێی فەرەنسا بانگەشەی ئەوە ناکەن کە نوێ هێنەرێکی موتلەقنو تەواوی پەیوەندیان بە رابردوی رۆمانەوە براوە، بە تایبەت ئەوان خۆیان بە قەرزاری مارسیل بروستو جێمس جۆیس دەزانن. ساروت کافکاو دۆستویفسکی دێنێتەوە یادی خوێنەرو رۆب گری لە کتێبی (پەرچ دانەوەی ئاوێنە) دا ستایش لە (نامۆ) ئەلبێرکامۆو (هێلنج) ی سارتەر دەکات.

ڕەخنەگران ئەوسا بەدوای ناوێکدا دەگەڕان لەو جۆرە ڕۆمانەی بنێن (ناوی دژە ڕۆمان) و (قوتابخانە مینویی) چونکە ڕۆمانەکان لە بنکەی بلاوکردنەوەی مینوییەوە بڵاودەکرانەوە– و (ڕۆمانی نوێ) لەو ناوانە بوون کە بۆ ئەو مەبەستە دەست نیشان کران. لای گەلێك لەو ڕەخنەگرانە ڕۆمانی نوێ بێزار کەرەو گەورەیی مرۆڤی تیا فەرامۆش کراوە.

ئێستا– وەك خودی نووسەرانی ڕۆمانی نوێ دەڵێن– ئەو جۆرە ڕۆمانە بۆتە بەشێك لە مێژووی ئەدەبی فەرەنساو دیاردەیەکی لەبەرچاو گێراوە بۆ کاتو شوێنی خۆی، بەڵام ئێستا هیچ شوێنەوارێکی وا لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتووە کە پەیڕەوی لێ بکرێت، تەنانەت خودی نووسەرە هەرە دیارەکانی وازیان لەو شێوەیە هێناوە. ئەوەی ماوەتەوە وەك (ساروت) دەڵێت تەنیا نووسەرەکانیەتی. تەنانەت هەندێکیان گەڕاونەتەوە سەر نووسینی چمکی کلاسیك. بۆ نموونە ناتالی ساروت لە دوای سالی ١٩٧٠ وە چیرۆکە ژیانی خۆی لە کتێبی (دەورانی منداڵی)دا نووسی. ئالان ڕۆب گری دەستیدایە نووسینەوەی یاداشت. ئەوسا ڕۆب گرێ بڕوای وابوو کە ڕۆمانی نوێ ڕۆمانی زمان حاڵە کەچی پاشان لەڕۆمانی (جنەکان) دا باس لە ڕابردوو دەکات.

ئەم فایلەی گۆڤاری (سەردەم) لەسەر ڕۆمانی نوێ ڕەنگە تەنیا پێناسەیەك بێت بۆ ئەو بزوتنەوە ئەدەبیەی کە نزیکەی (٣٠) ساڵێك شوێنی مشتو مڕو تەقاندنەوەیەکی کوتو پڕی ناوەندنی ئەدەبی نێو فەرەنسا بووبێت، هەروەها ناساندنی ئەو نووسەرە دیارانە بێت کە بە هەمان توندو تیژیو یاخی گەریەتی لەدابو نەریتی کۆنی ڕۆمان چ بە نوسینی دەقی ئەدەبی یان هەوڵدان بۆ تیوریزە کردنی دیاردەکە بونە درەوشاوە ترین ناوی بزوتنەوەکە. بێگومان کتێبخانەی کوردی بەگشتی ئەدەبو کلتوری ئێمە کەمتر بەر گزنگی ئەو خۆرانە کەوتووەو، مەگەر بە دەگمەن ئاوڕ لەو بابەتانە درابێتەوە، چ قوتابخانە ئەدەبیو فیکریەکانی دنیاو چ ئەم جۆرە بزوتنەوانە. دیارە تەنیا ئەم چەند وتارە ناتوانێت ببێتە چوارچێوەی فرەگیری ئەو بابەتە ئەدەبیە. بە تایبەت کە وتارەکان لەسەرچاوە ڕەسەنەکانی خۆیانەوە کە زمانی فەرەنسیە وەرنەگیرانو ڕەنگە هەندێکیان بەڕێگای دوو زمانی ترەوە گەیشتبنە ئێمە. بەڵام ئەمە هەنگاوێکەو هیوامان زۆر بەهاوکاری ئەو نووسەرانەی کە لەزمانە زیندووەکان دەزانن تاجارێکی تر ئاوڕ لەم بابەتە بدەینەوە.

● سەردەم

# رۆمـــانـــی نـــویّ

■ ریمۆن ژان

● و: م. خالید

سیفەتی نویّ، لەناخی خۆیدا نەلـە سـیفەتێکی تـر باشترەو نەخراپتر، بەڵکو خۆی لەخۆیدا دەلالـەت لـە هیچ ناکاو لەمێژە ئەزانین کە ئەم سیفەتە لە ئـەدەبیاتی ئێمـەدا بـە هـەموو ئـەو بەرهەمـە گەورانـەی پێشـوو وتـراوە کـە پیشاندەری ئـەم گۆڕانکارییـە بـەردەوامو پێویستەی فـۆرم بـوون . ئـەو گۆڕانکاریـە کـە بـەبێ ئـەو، هونـەری چـیرۆك نووسینو بەگشتی هونەر ناتوانی بـەرەو پێش بـڕواو بـژی. (بەرهەمـەکانی ئێسـتانداش بـە ئـەندازەی بەرهەمـەکانی پرۆسـت "نـویّ" بـوون). بـەلام ئەگـەر ئـەم سـیفەتە لەسەرەتای پەنجاکاندا تەنها بۆ دەستنیشانکردنی جۆرێکی تایبـەت لـە رۆمـان بـەکار بـراوە، کـە لـە فۆرمێکـی پێچەوانـەوەی نـەریتی بـاو دابـوون، بێگومـان ئـەبێ هـۆی تایبەت بووبێ، کە تەنها لەسایەی رەگـەزی بەرهـەمو چـەن رەگەزێکی تردا ئەتوانین بەو هۆیانە پەی بەرین.

## ١- چوار چێوەی تیۆریو باوەڕی

نابێ لە هەندێ دراوە ((Data) ی کەم بایەخ غافڵ بین. ئەگـەر بڵاوکـەرەوەیێکی گـەنج بـەناوی "ژێـرۆم لینـدۆن Jerome Lindon" بەرپرسیاریەتی بنکەی بڵاوکردنـەوەی (مینۆیت MINNUIT) (نیوەشـەو) ی نەگرتایەتـە ئەسـتۆو هاوکات لەگەڵ چالاکی سیاسـی بێ پەروایانـە، زنجیرەیێك کتێبی نامۆو سەیری بڵاونەکردایەتەوە کە بڵاوکـەرەوەکانی خۆیـان لـەچاپ کردنیـان نەئـەدا، رەنگـە هـەرگیز "رۆمـانی نویّ" دروست نەبوایە. رەنگـە ئـەم نـاوە ئـەو بۆچوونـەمان لادروست بکا کە دەستی گروپێ یان بزافێكو قوتابخانەیـەك لەکاردایە. بـەلام بۆچوونـی وا هەڵەیـە، چونکـە بەرهـەمی نوسـەرانی رۆمـانی نـویّ هیچیـان لەیـەك نـاچن، بـەلام زنجیرەیێك هەلومـەرجی مێژوویـیو کۆمەلایـەتیو ئـابووری چەسپاندنی ئەم بۆچوونەیان بەهێزکردووە.

(لوسیەن گۆڵدمـەن LUCIEN Goldman) - (١٩٧٠-١٩١٣) لـەکاتی لێکدانـەوەی ئـەم هەلومەرجانـەدا، ئـەم گومانەی لادروست ببوو کـە ئـەم شێوە تـازەی چیرۆك لـە ئەدەبیاتدا لە سەردەمێکدا پەیدا بووە کە گۆڕانکارییـەکانی کۆمەلگا، سەرهەڵدانی دیاردە نوێکانو قابیلی گۆران بوونی رۆژ لـە دوای رۆژی خـەڵك لـە سیسـتەمێکی بـەکارهێن (مەسرەفیدا) ئـەبووە هـۆی ئـەوەی کـە شـتەکان بایـەخو گرنگـی زیاتریـان پێبـدرێ لـە مـرۆڤ (گەڕانـەوە بـۆ شـت چەشنایەتی Reification کە لوکاچ باسیکردووە) گۆڵدمـەن بەم روانگە تازەوە، هەواڵی سـەرهەڵدانی ریالیزمێکی نوێی داوەکە تێیدا "شت" سەرتر ئەبێ. لە راستیدا وادیـارە ئـەو لە فەرامۆشی کردووە کە مەسەلەی "رۆمانی نویّ" رەنگـە لە پلەی یەکەمدا مەسەلەیێکی دەلالەتی (Signifiant) بـێو

ئەگەر شۆڕشێکیش روویداوە، لە پلەی یەکەمدا ئەنجامی دەسکەوتی ئاگایی بەرەبێك لە نوسەرانە لە رۆڵی فۆرمە کەلامیەکانو شێوە راگەیاندنەکان، کە هێزی "ئافراندنی" نوسراوەو زمانی هەموو ئافرێندراوە چیرۆکیەکانە.

گومان لەوەدا نیە کە ئەم ئاگاییانە دژی ئەگزیستانسیالیزم بووە کە لە ئەدەبیاتدا مافی لە پێشتر بوونی بە "پەیام" دابوو و جۆری لە گفتی پابەندی پەسەند ئەکرد کە لە پەنجاکاندا بە توانایێکی لاوازەوە پێی نابووە گۆڕەپانی کارتێکدرن لە مێژوودا. (رۆمانی نوێ هاوکات بوو لەگەڵ شەڕی جەزایرو گەڕانەوەی ژنرال دۆگۆل بۆ دەسەلات). پاشەکشێی ئەگزیستانسیالیزم شتێکی بەرچاو بوو، و هەر چەن کە شێوازی نوسینی سارتەرو کامۆ مایەی پەندو ئامۆژگاری بوون، (سەرەرأی ئەمەش "رۆب گریێ" هەر رەخنەی لێ ئەگرتن" و نوسەران لەدرێژدادڕیو "باوەڕەکان" و فرەوێژی دوور ئەکەوتنەوە: پەنابردنە بەر شتەکانو دیمەنە وەسفیەکان دەرمانی ئەم نەخۆشیەو دەربڕینی جۆری بێ متمانەیی بەئەوانە بوو. هەروەها وایان بەباشتر ئەزانی کە لەوە بەدوا، پشت بە بەرهەمە گەورە ئەدەبیەکانی جیهانێك ببەستن کە نوسەرەکانی لەنیوەی یەکەمی سەدەدا. لە بونیادو فۆرمی بەرهەمدا گەلێ بەرزەفڕییان لە خۆیان پیشان دا، و لە هەمان حاڵدا، واتاێکی نوێیان بە پێکهاتەو دیدی چیرۆکی بەخشی بوو: جۆیس، ڤاکنەر/ کافکا/ ویرجینیا وولفو نەختێك دواتر بورخسو لەرەوتی فەرەنسایشدا پرۆست.

نوسەرانی رۆمانی نوێ لەیەك لایەندا هاوبەشن ئەویش ئەوەیە کە ئەم کاریگەرییانەیان زۆر بە خەستی کرد بە شتێکی دەروونی. پێویستە ئەمەیش بڵێم کە، سینەما، ئەم هونەرە سەرەسەدەی بیستەمیش -هەروەها کە هەندێك لەدەقە سەرەتاییەکانی تیۆریەکانیان پیشانیداوە- لەسەر نوسراوەو بۆچوونەکانیان لەمەڕ چیرۆك کاریگەریی هەبووە.

کۆی ئەم هەلومەرجانەو ئەم کارتێکردنانە جۆری لێکۆڵینەوەی لێ کەوتەوەو هەر زۆر خێرا بوو بەکۆششێ بۆ جێگیرکردنی زمانێکی حەکایەت خوانانە- کە لە پلەی یەکەمدا لە ئاستێکی رووکاریدا "کاری ئەکرد" لە بری رۆمانی کۆن.

"رۆلاند بارسیس Roland Barthes" (۱۹۸۰- ۱۹۱۵) لە گوتارە بەناوبانگەکانیدا کە هاوکات بوون لەگەڵ یەکەم کتێبەکانی ئالان رۆب گریێ (لە ساڵەکانی ۵۵- ۱۹۵٤دا) و راڤە رەخنەییەکانی بۆ ئەم جۆرە ئەدەبە ساوایە گرنگیێکی دیاریکەریان هەبوو، ئەوانەی بە ئەدەبیاتی بەرجەستە (Objective) یان ئەدەبیاتی سەرزمانی (Litterate) ناونەبردو لەوەی کە ئەیدی ئەم جۆرە ئەدەبە ئەیەوێ "تەنانەت فۆرمی چیرۆکیش پاکژی بکا" و رەنگە بتوانێ هەلومەرجی "مەرجی نەبوونی خوێنەر لەبەرامبەر هونەری ماهیەتگەرای بورژوایی‌دا دەستەبەر بکا" گەلێ خۆشحاڵ بوو.

## ٢- رێگاکان، بەدگومانیەکان، توێژینەوەکان.

بەراستی ئەم ئەزموونە لە بۆشاییەوە سەری هەڵنەدابوو. لە دەساڵ لەوەو پێشەوە رێگا گەلێکی تازەکرابۆوەو گەلێ زەمینەی نەناسراو دۆزرابوویەوە.

بەبێ ئەوەی بەرهەمەکانی "بیکیتو ناتالی ساروت" کە لە چلەکاندا ئافرێندرانو رێگایان بۆ لێکۆڵینەوەکانی داهاتوو کردەوە بێنینەوەیاد، ناتوانین لەسەر رۆمانی نوێ بدوێین. سامۆیل بیکیت نوسینی وات (Watt) ی لەساڵی ۱۹٤۵ دا تەواو کردو مۆرفی (Murphy) شی ساڵی ۱۹٤۷ بڵاوکردەوە، ئەو کە بەرهەمەکانی بەدو زمانی فەرەنسیو ئینگلیزی ئەنووسی، لە هەردو زماندا جۆرێ زمانی چیرۆکی داهێناوە کە تێیدا تەوسی ئەبڕلەندایی‌و گاڵتەجاڕی بە خێرایی لەکەنار جۆری زمانی تراژیدیکی نوسراودا، جێگای خۆی ئەکاتەوە. بەلام ئەبێ چاوەڕێی بڵاوبوونەوەی مۆلۆی (Molloy) لە ۱۹۵۱ دا بکەین تا رەهەندە راستەقینەکانی بەرهەمەکانی ئەومان بۆ دەرکەوێ. ئەم کتێبە خوێنەر ئەخاتە سەرسوڕمانەوە، رایەچڵەکێنێ. و پەرێشانی ئەکا، بەلام وەك دیاردەیەکی نوێو بێ پێشینە خۆی ئەسەپێنێ. بەرنارد پینگۆد (Bernard Pinggaud) کە ئەم مەسەلەی بەجوانی هەست کردووە ئەڵێ: ((لە ساڵی ۱۹۵۰ وە مەسەلەی بنەڕەتیی ئەدەبیات، مەسەلەی "پوچی" یە، ئەمە شتێکە، کە یەکەم خوێنەرانی مۆلۆی بەتەواوی دەرکیان کردووەو ئینسان مەگەر کوێربێ، ئەم رەتکردنەوە بنچینەییە کە کاریەدەستی ئەم رۆمانەیە نەبینێ. یەکێك ناوی "ئۆدیسەی هیچ گەرایی" لێ ئەنێ، یەکێکی تر ناوی ئەنێ "روداوە نوسینی گەندەڵی‌و هەول" سێیەمیان بەناڕەزاییەوە باس لە "هەوڵێك بۆ بێمتمانەکردنی ئینسان" ئەکا (......) بیکیت هەڵناچێ (یاخی نابێ) پێشکەش ئەکا. ئەو بۆ ئەوەی دادوەری لەسەر پوچی بکا، لەدەرەوەی راناوەستێ، لەناخی پوچیدا ماڵ ئەکاتەوە، بە مەیلی خۆی نوقمی بێهودەیێك ئەبێ کە پاڵەوانەکانی ناتوانن لێی رزگاربن. بەلام چونکە وشەکان، لەهەر حاڵدا، دەلالەت لەسەر شتێك ئەکەن، لێرەدا ئەگەڕێنەوە بۆ خودی زمان. بۆیەکم جار، لە مۆلۆیدا، ئەدەبیات هەوڵ ئەدا کە تەنها خۆی پیشان بدا، و کاتێ کە ماکس پۆل فۆچە (Max. Pol, Fouchet) باسی "قەواری شاعیرانە" ی

بەرهەم ئەکا، بەکردەوە بایەخ بە نوێیەتی حەقیقیو غەریب بوونی بەرهەم ئەدا. واتە ئەم داستانە گاڵتە ئامێز"ە لە پلەی یەکەمدا داستانی زمانو بەسەرهاتی وشەکانە."

بیکیت لە کتێبەکانی دواتریدا: مالۆن ئەمرێ (Malone Meurt) (١٩٥١) ناوهەڵنەگر (innommable) (١٩٥٣) و چۆن چۆنیە؟ (Commentcest?) (١٩٦١) لەوێنەکردنی چەشنێك "مرۆڤ داشکاندن" دا زێدەڕۆیی ئەکاو ژمارەی کەسایەتیە (کاراکتەر) خزۆکەو پەك کەوتوو و پەژوەند (سخیف) کە نوقمی قسەبی سەرویەرەکانی خۆیانن، زیاتر ئەکات. لەهەمان حاڵدا، بیکیت لەشانۆکەی خۆیدا جۆری ژیانو بوونی نمایشی یان پێ ئەبەخشێ، بۆ نموونە لە "چاوەڕوانی گۆدۆ" (١٩٥٢).

بەڵام لەم ناوەدا کاری کەلام کارێکە دیاریکەرە: کەلام بەرەو ویرانیو بێدەنگیو مەرگ ڕێیەراتی ئەکا، بەڵام تەقریبەن بناغەی چیرۆکەکەو هەوێنە چیرۆکی بنەڕەتی کتێبەکە پێك ئەهێنێ. بەم شێوەیە قۆناغێك تێپەڕیوە.

جۆرێکی تازەو نوێ لە رۆمان- هەرچەن کە بەشێوەیێکی خەمناکانە مەنتیقیکی گاڵتەئامێزی هەبێ- کە ناتوانێ دوو رلە "کارکرد" ی زمانو بونیاد حیکایەتخوانانە وجودی هەبێت.

ناتالی ساروت (١٩٠٣)یش زۆر زووتر، بیری لەمەسەلەی رۆمانی نوێ کردوەتەوە. هەر لە ساڵی ١٩٣٩ وە کە ناونیشانی "ترۆپیزم" Tropism (کاردانەوە) ی بۆیەکێك لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی خۆی هەڵبژارد، بەم کارە وشەیێکی داهێنا کە بۆ وەسفی جۆرێ لە سوسەوگەڕانی "رەوانی- نوسراوەیی" - بە نوسینێکی ناسکو جموجوڵی بێ هەستی ویژدان کە نوسەر خۆی ئەدا بەدەمیەوە- بڵاوبووەوەو پەرەی سەند بێجگە لەوەیش، سارتر کە لە ١٩٤٩ دا پێشەکییکی بۆ یەکەم رۆمانی ساروت بەناوی "وێنەی نەناسراوێك" نوسی، لەحاڵێکدا کە ناونیشانی دژە رۆمان- ی پێدابوو (ناونیشانێك کە ئەیتوانی، بەواتایەك، رۆمانی نوێ لەقەڵەم بدرێ) سەرەنجی خوێنەری بۆ ئەو نارەزاییانە راکێشا کە لەم رۆمانەدا هەبوو. هەروەها خودی ناتالی ساروتیش لەکۆمەڵە گوتارێکدا کە بەناونیشانی "سەردەمی بەدگومانی" ئامادەی کردبوو، بە روونی مەبەستو یان باشتر بڵێین "پرسیارەکانی" خۆی خستبووە روو. ئەی وت کە "بەدگومانی" دۆزینەوەی جۆرێ گومانی خراپی دولایەنەیە لەنێوان نوسەرو خوێنەردا، لەمەڕ راستییا متمانەی هەندی لە چەمکەکان (بە تایبەت چەمکی "کەسێتی") کە جاران زۆر بە باشی کارامە بوون کەچی ئێستا داوەشاون.

کەواتە هەست بەو پێویستیە ئەکرا کە شێوەیێك فۆرمی نوێ لە چیرۆکدا جێگیر بکرێ کە هەمان فۆرمی "رۆمانی بالزاك" نەبێ. ساروت بەبەشی خۆی جۆرە بەکاربردنێکی برگەبرگەو پوختەو کوتو مت زمانی حکایەتخوانێکی پێشنیاز ئەکرد کە توێی دارشتەی پتەوی گفتوگۆکانو "پەیڤە شاراوەکان" دا (کە ئێڤی کامپتن بۆرنێت Ivy Compton Burnett "١٨٦٤- ١٩٦٩" نوسەری بەریتانی ئەو هەستەی تێدا درووست کردبوو) رووبەڕووبوونەوەیێکی بەترەف (لەرادەبەدەر) و زبریو توندێکی بەردەوام کە گەوهەری ژیانی ویژدانی مرۆڤن، دوویارە سازی بکاتەوە. ساروت بەژەکفەری (صبر) وتاقەتو زۆر بە چاکی، لە رشتەیێك کتێبدا لە بازنەی سەرکەشی بێهودەکانی بورژواییو خێزانیدا، کۆمەڵێك لە ترۆپیزمەکانو (قالب) ە کورتو لێك ئاڵاوەکان فەراهەم ئەکا: مارتریۆ Marterau (١٩٥٣)، ئاسمان نوێن Leplanetarium (١٩٥٩)، میوە زێرینەکان Les, Fruits dor (١٩٦٣)، لە ساڵانی دواییدا گوێت لە دەنگیانە؟ Vous Les Entendez? (١٩٧٢) و منالی Enfance (١٩٨٢) ئەمانە رۆمانگەلێکن کە بەشێوازی تایەبت بە خۆیان، بەڵگەیێکی کۆمەڵایەتی دەربارەی جیهانێکی سنوریەند کراوەوە بەدەستەوە ئەدەن کە ناتالی ساروت ئەوانە زۆر باش ئەناسێ. -(هەروەها کە پرۆست جیهانی خۆی ئەناسی)-

بەڵام بە تایبەت، ئەو هەلە بۆ زبریو توورەیی شاراوە لە هەموو زمانێکدا کە بە پلەیێکی دیایکراوی پێگەیشتن گەیشتبێ ئەرەخسێنێ کە لە چوارچێوەی "خانە" کانی چیرۆکدا بەشێوەیەکی نوێ بەیان بکرێ. کەواتە باسی جۆرێ رۆمانی توێژینەوەیی لەئارادایە، بەڵام نەك لە جۆری لابراتۆرییەکەی، کە لەو جۆرانەدا ریالیزمی کۆمەڵایەتیو سایکۆلۆژی لەبەرامبەر رووداوە ئازادەکانی هێزی خەیاڵ لە چیرۆکەکەدا لەناو ناچن. بەڵکو توێژینەوەیێك کە کۆششێکە بۆ تەقاندنەوەی بینای تەقلیدو گومان لەو شێوازی چیرۆك نوسینە کە بەشتێکی بەڵێن لەسەردراو لەقەڵەم دراوە.

### ٣- وەسفکردنی دیدەیی

ئالان روب گرێ (Alin. Robbe, grillet) (١٩٢٢) دیسان ئەم گومانو بێ متمانەسازیەی بەشێوەیێکی کاریگەرتر بەکاربرد، ئەگەر ناوی ئەو بەشێوەیێکی گشتی پەیوەندییێکی توندوتۆڵی لەگەڵ ئەندێشەی رۆمانی نوێدا هەیە، لەم رووەوەیە کە هیچ کەس لەوباشتر هەستی بەنوسینێکی نوێو ئەو دابڕانەی کە ئەم نوسینە قبوڵ ئەکا، نەکردووە. ئەو، ئەم مەسەلەی لە گوتارە تیۆرێکە سەرەتاییەکانیدا بەروونی لاێکداوەتەوە. ئەم گوتارانە

سەرەڕای شێوازی ئەزمونی بوونیان وێنەگەری خودئاگاییێکی پەسەتێندراوی ڕۆمانی نوێن. ڕێبازێك بۆ ڕۆمانی دوارۆژ (une, voie, pour. Le Roman) (١٩٥٦) هەموو ئەو ئەدەبیاتەی کە لەسەر بنەمای "لە پێش بوونی سایکۆلۆژی" و "قووڵایی دەروون" دانراونو دادگایی ئەکاو ئەو میتافیزیکە ئینساگەرایانەی ئەم ئەدەبیاتە پشتی پێ بەستووە ئاشکرا ئەکاو ئەی زڕێنێ، ئالان ڕۆب ئەڵێ: جیهان ئەواتا دارەو ئەبێ واتا؛ تەنها (ئەتوانین بڵێین) یە، و سەرنجڕاکێشترین شتیش هەر ئەمەیەو بەس. و ئەم کاوییە گورزێکی هێندە بە هێزمان لێ ئەوەسێنێ کە امبەریدا توانای هیچ کاردانەوەیەکمان نامێنێ. لە پڕ ئەو کۆشکە جوانەدا ئەروخێ: کاتێ کە چاو وە جارێکی تر گورزی ئەم ڕاستیە سەرکەشە کە – پیشان دابوو کە گوایە لەبەرامبەریدا خۆڕاگر مان ئەکەوێتەوە. لە دەورویەرماندا شتەکان بەبێ کۆمەڵە سیفەتە گیانگەرایانە یانماڵیانە پێمان هەر لەجێی خۆیاندان. ڕوویەریان سافو لووسو ژاکاوو بێ وشەییێکی گوماناوی یان زوڵاڵێکە" ڕۆب گریلە ئەوا ئەنجامگیری ئەکا کە پێویستە بە نوسینێکی دەلالەتگەرو وەسفکردنی، ئەم ڕوویەرە پێناسە بکەین کە قابیلی هەستکردن بێت، نەك بچینە ناو "دڵی ڕۆمانتیکی شتەکانەوە"

لە سروشت، ئۆمانیزم، تراژیدیادا پیشان دراوە کە نوسینێکی لەم بابەتە، بۆ هەموو ئەو گوتراوە چیرۆکیانەی کە سەرشاری "ئەنترۆپۆمۆرفیزم Anthropomorphise" ن (ئەنترۆپۆمۆفیزم بەمانای تەنها بیرکردنەوە لە چەشنی ئینسانەو ئەگەر بیر لە شتی تریش بکرێتەوە ئەوا ڕێگایەکی بۆ ئەدۆزنەوە کە بیبەستن بە ئینسانەوە–ی) خوازە دەسەڵاتدارە بەسەریاندا، وەك تۆشاتر (دژە ژەهر) ێکی زۆر پێویست وایەو کامۆو سارتریش نەیانتوانیوە نەکەونە داویەوە. بەڕای ئەو بەسسس "تراژیدیاکردنی" جیهان بنەمای نوسینی لەم بابەتە بوو،و ڕزگار بوونیش لە دەستی ئەستەم بوو مەگەر بەچاوپۆشی لە هەندێ "چەمکی لەباوکەوتوو" وەك کارەکتەرسازی، بەسەرهات، پابەندبوون، یەکسانی لەنێوان قاڵبو ناوەڕۆکدا، و ملکەچ بوونی دیسیپلینی وردی وەسفکردنی سیفەتی دیدەنی، سیفەتێ کە بە "ئەندازەگرتن، دەسنیشانکردنی هەلومەرجو شوێن، سنوریەندیو وەسف قایل بێ ئەبێ ڕێگای دژواری هونەری چیرۆکی نوێ" دەست نیشان بکات.

ڕۆب گرێ هەوڵی داوە تاکو کارامە بوونی ئەم "وەسفکردنە ئافرێنەر" ە کە ژان ریکاردۆ Jean Ricardo (١٩٣٢) پاشتر تیۆری بۆدانا، لەبەرهەمەکانی خۆیدا پیشان بدا. لەیەکەم بەرهەمیدا بەناوی "خاوێنکەرەوەکان Les Gommes (١٩٥٣) هەرچەندە پابەندی چەشنە دارشتەییێکی ڕۆمانی پۆلیسی بووە کە هێماگەرایی‌و نمونەهێنانەوەیشی تیا بەدی ئەکرێ، هەر لە سەرەتاوە زیتمێکی نوێو نائاسایی پەیدا ئەکا کە خوێنەر ناچار ئەکا بچێتە مەیدانی دەرکی ئەوانەی بۆی وێنەکراونو هەروەها ملکەچی جۆرێ مەودا دانان لەگەڵ دەقو "دیدێکی بیرمەندانە" بێ (بۆ بەیادهێنانەوە: ناونیشانی "وێنەی خێرا" بۆ کەمەڵێ لە کورتە چیرۆکەکانی خۆی دانابوو "١٩٦٢" لە دوو بەرهەمی بینەر (Le Voyeur) (١٩٥٥) و ئیرەیی (La Jalousie) (١٩٥٧) دا گەلێ وردتر ئەو ئامانجانەی کە دوای کەوتووە بە ئەنجامی گەیاندووە. بەڵام وەك لایەنی بونیادێکی ئاڵۆزو تەرتیباتێك لە بەرامبەر خیاڵاوی بوونی دەستوری ڕۆمانەکان، ڕاست وەك یەك سیستەمی دژی خیاڵاوی بوون ڕەفتار ئەکا، وەك لیستەکردنی وشکو بەرجەستەی وێنەکانو شتەکان، کاری بەزۆر لە ملی نیگا دیالیکتیکی حازرو غایب، تێکەڵاوکردنی زەمەنی یەك لەدوای یەك بەپێی بەرنامە، بێ لایەنیی ڕووتی زمان، هەموو ئەمانە دەست بەدەست یەکەوە ئەدەنو نووسین لەحاڵەتی باوی خۆی دوور ئەخەنەوە. "لە هەزار توێدا Dans Ie Labyrinthe" ١٩٥٩٠) جۆرێ زیندەخەوە لەوشیاریدا. (سەریازێکی وون بووە هەتا ئەڕوا شت زیاتر ئەبینێ، وێنەکان لەبەرچاویدا ونو لێڵ ئەبنو وەك وەهمو خەیاڵێکی پەری ئاسایان لێ دێ) بەڵام لە درێژەی کارەکەیدا ڕۆب گرێ بەشێوەییێکی زۆر نوێو چاوەڕوان نەکراو، هەمان کۆششە سەرەتاییەکانی خۆی بەیارمەتی جۆری نەفسانیەتی دارێژراو درێژە پێ ئەدا کە تێیدا نیگاو "مەودا" (دوورایی) ڕۆڵی بنەڕەتییان هەیە: نەفسانیەتێکی وازی ئاسا کە بینەر بەشێوەیەك پێشەنگ بوو، و (جێ ژوان (vous–La Maison de Rendez (١٩٦٥) و (پلانێك بۆ شۆڕش لە نیۆیۆرکدا Projet Pour une Revolution a New york) (١٩٧٠) لە چوارچێوەی گۆڕانکارییێکی دڵخوازداو لە دارشتەی قاڵبی ڕۆمانە پڕ کارەساتەکان لەگەڵ توندوتیژیی هەندێ لە ئوستورەکان یان وەسوەسەکانی جیهانی مۆدێرن وێنەکراون. ئەم وازی لەوە ئەچێ بە شتێکی پوچ بێتە بەرچاو، بەڵام ڕۆب گرێ لەوکاتەوە کە خووی دایە کاروباری سینەما، بە تاییەتی هۆگری ئەم وازیە بوو. ئەو بە نوسینی سەناریۆی (ساڵی رابردوو لە مارین بادا L Annee Derniere a Marienbad) (١٩٦٠) بۆ یەکەم جار چووە ناو جیهانی سینەماوە. ئەم کارە یەکێکە لە هەڵکەوتووترین

بەرهەمەکانی‌و پیشاندەری زەوقی داهێنانی ئەوە لە بواری دیمەنی هونەریدا. پاش ئەویش رۆب گرێ نەك هەر دەستی لە سینەما هەڵنەگرت بەڵکو کامێراشی بە دەستەوە گرت. جاویدا نە (L,Immortelle) و بەهەشتو پاشان (L,Eden et Apres) و چەندین فیلمی تری دروست کرد، هەروەها نوسینی جۆری لە ئەدەب بەناوی (سینە- رۆمان) ی درێژە پێدا، کە بەرهەمی ئەم بوارە بریتیە لە: هەڵخلیسکانە رو لە زیاد بوونەکانی لەرزەت (Glissements Progressifs duplisir) (١٩٧٤). لەگەڵ ئەویشدا کاری رۆمانی پەك نەخستووەو چەند رۆمانێکی نوسیوە، وەك: (شوێن ناسی شاری تارمایی Topolgie dan cite Fantome) (١٩٧٦) ، ·بیرەوەریەکانی سێگۆشەی زێڕین (Sourenirs du Triangle) (١٩٧٨) بە تایبەت (جین Djinn) (١٩٧٨) کتێبێکی سەرنجراکێشەر کە لەسەر داخوازی زانکۆیێکی ئەمریکی بۆ مەبەستی فێرکردنی پلە بە پلەی دژوارەیەکانی زمانی فەرەنسی نوسیویەتی، لەم کتێبەدا شێوازی وازیو وازی لەگەڵ گۆڕانکاریە قاڵبیەکان پیشانی ئەدا کە رۆب گرێ شێوازی سەرەتایی خۆی لەدەست نەداوەو پاراستوویەتی.

بەرهەمەکانی رۆب گرێ، هەرچەندە ئەو کێشو یەکگرتوویەکی سەرەتای خۆی تارادەیەك لەدەست داوە، بەڵام بەهۆی سازشت هەڵنەگریو هەستی توندی وازیە دیدەبیەکانو تەکنیکە ئافرێنەرەکانی زمانەوە، لە باشترینی نمونەکانی رۆمانی نوێن.

**٤- قاڵبەکان، زەمەن (کات)، بونیادەکان (ستراکچیرەکان)**

میشل بوتۆر (Michel Butor) (.....-١٩٢٦) یش، هاوکات لەگەڵ رۆمانەکانی خۆیدا، ئەندێشەی رەخنە لەمەڕ رۆمانەوە بلاوکردوەتەوە. بێگومان بۆتۆر یەکەم کەس بووە کە رۆمانی وەك بابەتێکی لێکۆڵینەوە لەقەڵەم داوەو لەسەر ئەم ئەندێشەیش پێی داگرتووە کە ((رۆمان تاقیگەی، گێڕانەوەی چیرۆکە)) ئەم بابەتە بەشێوەی جۆراو جۆر لە گوتار گەلێکدا سێ بەرگی بەناوی پێرستەکان (Repertoirs) ی لێ کەوتەوە، بە وردی باسکراوە. لەم بەرهەمە فەرهەنگیە رەنگالەیەدا، بە ئەزمونێکی دەوڵەمەندەوە لە بابەتی لێکۆڵینەوەدا، وەلامدەری پرسیارێکی (تەکنیکی) هەمیشەییە لەمەڕ ئەدەبیاتەوە، و دیارە لەچوارچێوەی بەرهەمگەلێکی ئافرێنەردایە کە بوتۆر پیشانی ئەدا کە رۆمان چۆن ئەتوانێ (قەڵەمرەوی دیاردە ناسیێکی سەرترو هەڵوێستگەیێکی سەرتربێ، بۆ روونکردنەوەی ئەم خاڵە کە چۆن واقعییەت بۆ ئێمە ئاشکرا ئەبێ یان چۆن ئەتوانێ ئاشکرا بێ). لەیەکێك لەیەکەم کتێبەکانیدا بەناوی بازاڕی میلان (Passage de Milan) (١٩٥٤) کە تا رادەیێك بونیادێکی کۆنی هەیە، هەوڵیداوە لە کۆنسێترپوەن (Contrpoint) و هاوڕوودایی (Simultaneisme) دا پەیوەندیی ئاڵۆزی نێوان کەسایەتیەکان کە لە حاڵو هەوای کۆشکێکی پاریسیدا جێگیرە، دوبارە سازی بکا. بە پێچەوانەوە، لە حاڵو هەوای شارێکدایە -شاری بلستۆن (Blestone) ی ئینگلتەرا- کە بوتۆر پاڵەوانو حکایەتخوانی رۆمانی کات بەسەر بردن (Emploi du Temps) (١٩٥٦) لە گەڕانێکی سەیر لە رابردووو ئێستایدا لە دوتوێی واقعیەتێکی بە رواڵەت هەست پێکراوو بەرجەستە بەلام لێك دابڕاوو گوماناوی، کە حسابی زەمەنەکانی لە دەست دەرچووە، ئەنێرێتە مەیدانی چالاکیو جوڵەوە.

دیسان رەنگە کات بێ، کە چوارچێوەی سەرەکیی رۆمانی (گۆڕانکاری La Modification) (١٩٥٧) - بەناوبانگترین رۆمانی بوتۆر- ی پێك هێناوە. لەم رۆمانەدا، چەن کاژمێرێ لە لە ژیانی پیاوێك لە شەمەنەفەرێکدا، بەوپەڕی وردیەوە لە چیرۆکێك بەشێوەی مخاگب -دووەم کەسی کۆ- ئێوە) بە هەموو وردەکارییەکانیەوە دووبارەسازی ئەکرێتەوە، تا ئەو ئاستەی کە دڵنیا بوونی بڕیارێکی دەروونی ئاشکرا ئەکات.

رۆمانی پلەکان (Deyres) (١٩٦٠) هەوڵێکی بۆ لێکدانەوەی وردی ئەو رووداوانەی کە لە ماوەیێکی کورتدا لە دواناوەندیێکی گەورەدا رووئەدا، ئەمەیش بەشێوەی جۆرێ بڕشتی گشتیو چەند ئاوازیی لە کاتدا، ئەم کتێبە، دوایین رۆمانی راستەقینەی بۆتۆرە. پاش ئەوە، بۆتۆر بەکەڵك وەرگرتن لە شێوازی (مونتاژ) و (کولاژ) و دارشتەی ((ئستریۆگرافیك)) خەریکی بەرجەستە کردنی چەند شوێنی جیاوازو هەڵکەتووی جیهان بوو: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە موبایل (Mobile) (١٩٦٢)، کڵیسەی گەورەی سامان مارکوی ڤینی. لە کتێبی وەسفی سان مارکو (Drscription de San Marco) دا (١٩٦٣)، تاڤگەی نیاگارا لە کتێبی ٦١٨٠٠٠ لیتر ئاو لە چرکەیەکدا (618000 Liter deau par secohde) دا (١٩٦٥). دوای ئەمانە بوتۆر پتر خەریکی توێژینەوە لە جۆری ئیستاتیکیو بابەتی شیعری بوو. بەلام هەمو ئەم بەرهەمانە لایەنێکی هاوبەشیان هەیە: حاڵەتێکی تایبەت بۆ دەسەڵاتدارێتی بەسەرکاتو شوێندا لەڕێگەی وەسفو بونیا پێ بەخشینیان لەگەڵ رێکخستنی ((چەند ئاوازیی)) روایەت یان دیمەنی ئەم لێکۆڵینەوە وردو یەکگرتووە لە تایبەتمەندیە بێ پێشینەکانی بەرهەمەکانی

بوتۆری رۆمان نوسن. بەلام میشل بۆتۆر لە دوای رۆمان نوسینو لە دوایین بەشی بەرهەمەکانیدا وەك: رۆشنگەری ١و٢و٣و٤ (illastration I II III II)/ مادەی خاوی زیندەخەوەکان ١و٢و٣و٤ (Matiere de Reves I II III II) ، دوراییەکان (intervalles) ، گولی با (La Rosedes Vents)، سەرنجەکان (Travaux d Approche) خووی دایە لیکۆلینەوە لە بواری جیاجیادا -دەقی کراوە، شێوازی حیکایەتخوانی، شیعر، کار لەگەڵ شێوەکاراندا، گفتوگۆکان، سەفرەو شتی جۆراو جۆر..

خوێندنەوەی ئەم بەرهەمانە سیمایەکی نوێی بوتۆر بە خوێنەر ئەناسێنێو پیشانی ئەدا کە ئەو بە واتای راستەقینەی وشەی شاعیر، شاعیرێکە جیهانیترینو ئازادترین شاعیر. تەنانەت گوتارە رەخنەییەکانی لە زنجیرەی پێرستەکاندا ئەم لایەنە لە سیمای بۆتۆر ئەسەلمێنن.

کاکلەی ناوەندیی کتێبەکانی کلەود سەیمۆن (Claude Simone) (٠٠٠- ١٩٣٢) یش هەر (کان) پێکی هێناوە، بەلام بەشێوەیێکی جیاواز. ئەم نوسەرە هەوڵی داوە هەمیشە لەسەر یەك مادە چیرۆکی کاریکا، مادەییك کە بەشی بیرەوەری - (لە زنجیرەی ماوەییکی زەمەنی کە بە توندی لە لایەن هەستەکانەوە قابیلی دەرك بێ) - بابەتی سەرەکیەتی. ئەم تایبەتمەندیە رەنگە لە نوسراوە سەرەتاییەکانی ئەودا وەك: قوپی باز (ساختەچی) (Le Tricheur)، گالیڤەر (Gulliver)، پەرستنی بەهار (Le Secre du Printemps) هێندە بەرچاو ناکەوێ، بەلام لە با (Levent) (١٩٥٧) و گیا (L,herbe) (١٩٥٨) دا کە نوسینەکان ئەکەونە سەر رێگەی ((دووبارەسازی)) رووداوی پارێزراو لە بیرەوەریدا، ئەو تایبەتمەندیە بە روونی دیارو ئاشکرایە.

کلەود سەیمۆن بە رۆمانی شەقامی فلاندەر (La Route Flander) (١٩٦١) ئەم بابەتە سود وەرگرتن لە دووبارەسازییەی تابەرزترین ئاست پەرەپێدا: ئەسکێك لە کتێبی شکستی جەنگ (١٩٤٠) ئەم هەلەی بۆرەخسان کە چیرۆکی چەند کارەکتەرو لەوەیش بالاتر، خێزانێك، لە تۆرێکی پەستێندراو بە بیرەوەیو وەهمو وێنەدا بگونجێنێ کە دێنە ئاستی ئاگایی سەرەوەو لە توێی ئالۆزیەکانی بیر (ژاکرە) دا سەرهەڵ ئەدەن تاکو بچنە ناو سیستەمی زمانەوە. پرۆستو فاکنەر کاریگەریی ئەوتۆیان لەسەر سیمۆن هەبووە، بەلام بەردەوام ئەزموونەکانی خۆی قووڵترو کەسی تر کردووە، چ لەسەر بنەمای بەشێکی مێژووی دیاریکراو- بەوجۆرە کە لە رۆمانی کۆشك (Le Paluce) (١٩٦٢) هاتووەو باسی ساتەوەختێکی شەڕی ئیسپانیا ئەکات- و چ بەشێوەی دووبارە سازیی پارچە پارچەی رووداوەکانی ژیانی خۆی، بەوەبیرهێنانەوەی ئەو شتانەیوا لە یاد دا ماون. و ئەمە ئەو رێگایە کە کلەود سەیمۆن پاش رۆمانی مەزنی چیرۆك (Histoir) (١٩٦٧) بە رۆمان جەنگی فارسال (La Bataille de Pharsale) (١٩٦٩) و مادە ئاراستەکەرەکان (Les Corpe Conducteurs) (١٩٧١) پێی تێ ناوە.

ئەم بەرهەمانە باسی توانای ئافراندنو بلیمەتیی ئەو ئەکەنو پیشانی ئەدەن کە بەوردبوونەوە و ژەکڤەری (صبر) و تێکۆشان لەکاری نوسیندا، گەلێ جار ئەنجامی درەوشاوەی لێ ئەکەوێتەوە. شێوازی نوسینی سەیمۆن یەکێکە لە سودبەخشترین شێوزەکانی نوسین کە رۆمانی نوێ پێی گەیاندووە: نوسینێکی پر گەلاو چلو پێچەلاو پلۆچ کە لەقەکانو رەگەکان هەموو جێگاییکیان تەنیوە، و تۆرەکانی بەبیرهێنانەوەیان بەردەوام لە زیادبووندایە، هێزی خەیاڵ ئەوەی کە بتوانێ لەیادی (ذاکرة) هەلبگوزێ، بەکاری ئەبا. توندترین شەکانەوەکانی نەفسانیەتو ئارەزووەکان تۆمار ئەکات، فایلی قالبەکانو وێنەکان بەشێوەیێکی ماندووی نەناسانە لەیەك ئەکاتەوەو کەرەستەییکە بەکاریگەریی و رەگازوییکی سەرسورهێنەرەوە. چەندین کتێبی پرپایەخی پێکهێناوە کە هەموویان لەدەوری جۆرێ روایەت کۆئەبنەوە، دوای تریپ تۆك (Tryptioque) (١٩٧٣) و زاستی شتەکان (Lecon de chose) (١٩٧٦)، رۆمانی مەزنی جوتیارەکان (Georgique) (١٩٨١) ئەم هەستی کامڵبوونو یەکگرتووییەی پتەو بەتواناتر کرد.

### ٥- رێبازەکان

رۆمانی نوێ لەکوێوە دەست پێئەکاو لەکوێدا کۆتایی پێدێ؟ وەلامی ئەم پرسیارە زۆریش ئاسان نیە. گەلێ کتێب هەن کە لە رۆمانی نوێوە نزیکنو لەهەمان کاتدا لەگەڵ ئەودا جیاوازن، یان لە هەمان کاتدا کە رێبازێکی تریان گرتووەتەبەر، کاریگەریی رۆمانی نوێیان پێوە دیارە. بۆ ئەو بەرهەمانەی لە چەشنی بەرهەمی ((رۆبێر نەپژێ))ن کە لەسە ربناغەی داهێنانی ئاوازو زمانی تایبەت دارێژراون، یان بەرهەمەکانی (بیکێت) تێیاندا دوبارە بوونەوەی وردەکاریی دیالۆگ (و گەلێ جار دیالۆگی گالتەجارو تەوس ئامێز) زێتر لەکارکردی دیدەیی دەوریان هەیە، ئەبێ جێگەیێکی تایبەت لەبەرچاو بگیرێ. لەبەرهەمەکانی کلەود ئۆلیەردا (Claude Ollier) (٠٠٠- ١٩٢٢) وەك: میزانسن (Miseen SEENE) (١٩٥٨)، پاراستنی دەستوور

(Maintien de Lordre) (١٩٦٢)، و شكستی نۆلان (Echec de Nolan)، هەمان شێوازی ڕۆب گرێ ڕەچاو ئەکەین، هەڵبەت بە نەختێك كاریگەریی (بورخس) ەوە لە هەڵبژاردنی جۆری چیرۆكو هەروەها مەیلی سەرنجدان بەكارەساتی وڵاتانی تر، یان دارشتەی پۆلیسی وێرای لە بەرچاوگرتنی جیاوازیی (دەق).

سەرەنجام بەرهەمەكانی ژان ریكاردۆ، وەك رەسەدخانەی كان (observatoire de canne) (١٩٦١)، و سەركەوتنی كونستانتەین (La Prise de Constantinople) (١٩٦٥)، و شۆڕشە بچوكەكان (Revolutions Minuscules) كە لەوانیشدا یەكیەتی شانبەشانی نێوان كار لەسەر نوسراوەو لێكدانەوەی تیۆرێك بەرچاو ئەكەوێ. لە بەرهەمە تیۆریكەكانی ریكارودۆیشدا كە لە ناساندنی رۆمانی نوێدا بایەخێكی گرنگی هەیە، ئەم یەكیەتیە ئەبینین: وەك كێشەكانی رۆمانی نوێ (Probleme de Nouveau Roman) (١٩٦٧). و دەرگایێك بۆ تیۆریی رۆمانی نوێ (Pour une Theorie da Nouveau Roman) پێویستە رێبازەكانی تریش بەم رێبازانەی لە پێشاندەری كاریگەریی رۆمانی نوێن لەسەر شێوازە جۆراوجۆرەكانی نوسین، زیاد بكەین. لەبەرهەمگەلێكی تەواو جیاوازدا وەك بەرهەمەكانی ژان كرۆل (٠٠٠-١٩١١) بە تایبەت لەم ساڵانەی دواییدا، و كلەودمۆریاك (Claude Moriac) كە لە ماوەیێك لەمەو پێشەوە بەلای قوتابخانەی (نیگا) دا چووەو شێوازی ئەو قوتابخانەی گرتوەتە بەر، نانی نێوارە لەشار (Lediner en Ville) و ئەگرەندسیمەنت (Agrandissement)، بەرهەمەكانی مارگریت دۆراس (Marguerite Durase) (١٩٩٦- ١٩١٤) كە بە تایبەت لە رۆمانی شەیدایی لول فنستین (La Revissemnt de Lol, V. Stein) (١٩٦٤) ەوە هەتا نەخۆشی- ی مەرگ (La Maladie dela Mort) ١٩٨٢) بایەخێكی یەكجار زۆری پەیدا كردووە.

بەرهەمەكانی ژی. م. ژل كلێزیۆ (J. M.G. Le Clezio) (٠٠٠- ١٩٤٠) هەر لە شایەتنامچە (Proce Verbal) (١٩٦٣) ەوە هەتا بیابان (Desert) (١٩٨١) سەرەنجام جۆرج پەرەك (Georges Perec) (١٩٨٢- ١٩٣٦) كە بەرهەمەكانی بەناونیشانی ژیان، رێگەی بەكارهێنان (Lavie Mode D. Emploi) (١٩٧٨) یەكێكە لەسەرسوڕهێنەرترین نمونەكانی توانای جۆراوجۆری رۆمانی نوێن.

هەروەها شایانی وەبیرهێنانەوەیە كە هەموو جۆرەكانی ئەدەبیاتی پێشرەو لەشەستەكاندا پەیوەندییەكی راستەوخۆیان (ئەگەر بەشێوەی دژایەتیش بێ) لەگەڵ ئەزموونی رۆمانی نوێدا بووە.

چ لە رێبازی كاركردن لەسەر (فۆرم) و چ لە رێبازی لێكۆڵینەوە گەلێك لەكاری (دەق) دا كە گروپی گۆڤاری (telQuel) بە تایبەت خەریكی ئەوەبوون.

لەم ناوەدا بەرهەمەكانی فلیپ سۆلەرز (Philippe Solars) (٠٠٠- ١٩٣٦):

(پارك "Leparc" (١٩٦١) دراما "Drame" (١٩٦٥)، ژمارەكان "Nombers" (١٩٦٨)، یاسا "Lois" (١٩٧٢))، جین ثیبودۆ (Jean Thibaudeu) ، ژان لویی بۆدری (J. L. Baudry)، ژان پیەر فای (J. P. Faye) (٠٠٠- ١٩٢٥): (شكاوی (La Cassure) ترپە (Bottement)، لەمپەر (Ecluse) (١٩٦٤) ترۆیاییەكان (Les troyens) (١٩٦٩))، موریس رۆش (٠٠٠- ١٩٢٤): (پەستێندراو (Compact) (١٩٦٦)، مەیدان (Ciscus) (١٩٧٢) گرنگیێكی شایانی سەرنجیان هەیە. بەڵام ئەگەر هەموو ئەم بەرهەمانە ببینە خانەی رۆمانی نوێوە، لام وانیە كارێكی راست بێ، چونكە ئەم بەرهەمانە چ لەزەمینەی برواو بۆچوونەوە چ لە بابەت توێژینەوە لەمەڕ شێوازی نوسینەوە، زۆر لەوە زیاتر چوونەتە پێشەوە. بەم حاڵەیشەوە، هێشتا بەرهەمگەلێك هەن كە لەسەر هەمان رێبازی پەنجاكانە، وەك بەرهەمەكانی مونیك ویتیگە (M. Wittig) ، (ئۆپۆپۆناكس، ژنانی خەباتگێڕ (Opopnax. Les Guerilleres) )كە ئەوەمان بۆ ئەسەلمێنن، هێشتا ئەم رێبازە وەلا نەنراوەو بە فۆرمی نوێوە خۆی ئەنوێنێ. بە گشتی بەرگرتنی پرۆسەی رۆمانی نوێ لەو شتانەدا كە باسمان كردن روون ئەبێتەوە.

ئەتوانین بڵێین، ئەو بەرهەمانەی بەم ناونیشانەوە پێشكەش كراون، سەختگیرو خۆویست بوونو خوێنەرانی نوێگەرایشیان بووە. ئەو جۆرەی كە ئەم بەرهەمانە سەرنجی خەڵكیان لە فەرەنساو هەروەها وڵاتانی تر ورووژاندووە، لێكۆڵینەوەو لێكدانەوەیەكە كە ئیلهامی پێ بەخشیون، (راچەنین)ێكی مەزنی تیۆرێكو زمان ناسانە كە بە دوای ئەم پرۆسەدا پەیدا بووە، و ئەو كارە بەرجەستانەی كە لەسەر (دەق) كراوە، و سەرەنجام بوونە هۆی پچڕانێك لە زەمینەی ئایدۆلۆژیدا، دەری ئەخەن كە ئەم بەرهەمانە لە سەرەتای نێوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا ئەدەبیاتی فەرەنسایان بە تەواوەتی خستووەتە ژێر كاریگەرییەوە.

ئەم گوتارە وەرگێراوی بەشی F بابەتی (رۆمان) لە دوایین چاپی ئەنسكلۆپیدیا یونیڤێرسال، چاپی پاریس ١٩٩٢ز.

# کەسێتی لە ڕۆمانی نوێی فەرەنسیدا

■ سیامەند هادی

بێگومان ڕۆمان وەك بەرهەمی بەرەوپێش چوونی شارستانی مێژووی سەرهەڵدانی نزیکەو لەماوەیەکی زۆر کورتدا -بەپێی بەراورد لەگەڵ ژانرەکانی دیکەی ئەدەب- گەشەی کردووەو توانیویەتی کۆنترۆڵی زۆربەی لایەنە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بکاتو، ببێتە هەڵگری کۆمەڵێك گرفتی گەورەو چەندین بابەتی جیاواز لەخۆیدا کۆبکاتەوە. بەم فرە ڕەهەندییەش توانی سەر بە هەموو دەلاقەکانی ئایینو ئایدۆلۆژیو ڕامیاریو گرفتی خودو کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا بکاتو دەست بەسەر ئەندێشەی مرۆڤدا بگرێت.

بەڵام ئەگەر ئێمە چاو لەو ڕوانینە دوور بە دوورە هەڵبگرینو بەرەو قووڵاییو پێکهاتەی ڕۆمان هەنگاو بنێین، ئەوا دەبنین ئەم ژانرا باڵایەی ئەدەبیش لەنێو خۆیدا خاوەنی کۆمەڵێك لایەنی هونەریو یاسایتایبەتی خۆیەتی، کە ئەم هونەرەیان لەسەر پێی خۆی ڕاگرتووە. هەر بۆیە دەبنینین پێکهاتەی ڕۆمان لەسەر چەند لایەنێکی هونەری وەستاوەو بەڕێوە دەچێت، وەك ((کاتو شوێن- کەسێتی- گرێچن- بونیاد- بابەت- وێنەو سیمبول- پەیڤینو.. هتد)).

کە ئەمانەش بوونەتە بەردی بناغەی ڕۆمانو بە لە دەستدانی یەکێکیان هونەری ڕۆمان دەشێوێتو بەرەو لاوازی دەڕوات. لەبەر ئەوە هەر یەکێك لەو پێکهاتانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، بۆخۆی تەواوکەری ئەوانی دیکەیە دەتوانێت بۆشاییەك پڕبکاتەوەو ئێستاتیکای دەقەکە بەڕێوە ببات.. ئەوەی لێرەدا جێگەی مەبەستە وەستانە لەسەر (کەسێتی ڕۆمان))، کە وەك لایەنێکی گرنگی ئەو پێکهاتەیە دەتوانێت تانو پۆی ڕۆمان پێکەوە گرێ بداتو ببێتە ئاوێنەی ڕوانینی ڕۆماننووس لەبەردەم خوێنەردا..

## کەسێتی ڕۆمان

کەسێتی ((الشخصية- Charpacter)) یەکێکە لە ڕەگەزە هەرە گرنگەکانی ڕۆمان، کە ڕۆماننوس بەهۆی چەند ڕێگەیەکی جوداوە دەتوانێت ئاشکرایان بکاتو ڕوانینی خۆی لەگەڵ جولانەوەی کەسێتی نێو دەقەکە ئاوێتە بکات. ئەم ڕەگەزەش بەهۆی کۆنترۆڵی تانو پۆی دەقو پشت بەستن بەچەند هۆکارێکی دیکە، دەتوانین بیکەینە داینەمۆی بەڕێوەبردنی دەق. ئەم ئەرکە گەورەیەی کەسایەتیش وایکردووە، کە ماهییەتی ڕۆمان لەسەر چۆنیەتیمامەڵەو خستنە ڕووی کەسێتی دەقەکە بوەستێت. هەر بۆیە ڕۆماننووسەکان بە درێژایی مێژووی ڕۆمان، ئاوڕێکی پڕبایەخیان لەکەسێتی داوەتەوەو هەوڵیانداوە بەشێوەیەکی دەستکردو میکانیکی لای خوێنەر دەرنەکەوێت. جگە لەوە ڕەخنەگرانیش زیاتر لەسەر ئەم ڕەگەزە گرنگەی ڕۆمان دەوەستن، لێهاتوویی دەدەنە پاڵ ئەو ڕۆماننووسانەی کە توانیویانە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە کەسێتی نێو ڕۆمان بخولقێنن.

هەربۆیە دەوترێت ((ڕۆماننووس بەرپرسیارە بەرامبەر بە چاودێری پێگەیشتنی کەسایەتییەکانی، لە هەمان کاتدا بەرپرسیاریشە بەرامبەر دابەشکردنیان-٩/٦٧)). واتە لەسەر ڕۆماننووس پێویستە کە بەتەواوی ئاگاداری دانانو بە ڕێوەچوونی کەسایەتیەکانی دەقەکە بێت، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی.. بێگومان هێنانو دانانی کەسایەتیش لەسەر شێوازو جۆری مامەڵەو پێویستی هونەریی ڕۆماننووسو دەقەکەی دەوەستێت، کە ئەویش زۆرجار لە ئەبوونەوە دەیانهێنێتو لە ڕۆمانەکەدا ئامادەیان دەکات، یان ڕاستەوخۆ لە واقیعەوە دەیانگوێزێتەوە بۆ نێو دەقەکە، یان کەسێتی واقیعی وەردەگرێتو بەپێی مەبەستو خواستی ڕۆمانەکە گۆڕانکاری بەسەردا دێنێت.. لێرەشەوە پێویستە ئاماژە بەوە بدەین، کە ڕاستە کەسێتی لەلایەن ڕۆماننووسەوە ئامادە دەکرێت، بەڵام ئەم ڕێگایانە چین کە بە هۆیەوە کەسایەتییەکان دەردەکەونو ڕۆماننووس بەچ شێوەیەك هەوڵی ئاشکراکردنو خستنە ڕوو کەسێتییەکانی دەدات..؟

لە ڕۆماندا چەند جۆرێك کەسێتی دەردەکەوێت، کە بە پێی ئامانجی ڕووداوەکان داخراون. هەر بۆیە ڕۆماننووس دەتوانێت بە چەند هۆکارێکی جیاواز کەسایەتییەکانی نێو دەقەکەی بەرجەستە بکات. هەرچەندە ((پیرسی لۆبوك)) لە کتێبی ((بونیادی ڕۆمان)) دا بەشێوەیەکی کلاسیکی دوو جۆر لەهەوڵی خستنە ڕووی کەسێتی دەقی ئاشکرا کردووە، کە ئەویش ((هەواڵ)) و ((خستنە بەرچاو)) ە، کە پێت ڕادەگەیەندرێت، یان دەخرێتە بەرچاوت. بەڵام ئێمە دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی ئاماژە بەچەند ڕەهەندێکی وێنەگرتنی کەسێتی بدەین، ئەوانیش وەك:

١-وەسف/ Description

٢-کردار/Action

٣-لەڕێگەی بیرۆکەو گفتوگۆی کەسێتی دەقەکەوە/ Speechand Dialogue

٤-لەڕێگەی ئەو ڕەمزو وێنانەی کە لە پێناوی دەرخستنی کەسایەتییەکاندا دەخرێتە ڕوو/Symbol and Image

هەریەك لەم ڕەهەندانەش هەڵدەگرێت بە درێژیو بە قووڵی لەسەری بوەستین، بەڵام لێرەدا جێگەی مەبەست نییەو تەنها دەتوانین ئاماژەیان پێبدەین.. بۆ چۆنیەتی گوێزانەوەی کەسێتی، چەندین بیرورای جیاواز هەیەو هەریەك بەپێی ڕوانینی خۆیو ئەزموونو خواستی خۆی بەڕەوای دەزانێت کەسێتی بەو شێوازە لە ڕۆماندا دابنرێت کە ئەو پێی باشە. هەروەك ((هنری جیمس)) لە وتاری هونەری ڕۆماندا دەڵێت: ((ڕۆمان بە ناساندنێکی کراوە ڕاستەوخۆ گوزارشت لە دەربڕینی هەستی کەسێك دەکات بۆ ژیان لەسەرەتادا، گەورەو بچوکی نرخی ئەو بەرهەمەش لەسەر بەهێزی بیروڕاکان وەستاوە-٢/٣٩)). کەواتە بیروڕاکانی خاوەن دەق جۆری خستنەڕووی کەسایەتییەکانیش دیاری دەکاتو بەئارەزووی خۆی دەیچەسپێنێ. هەر بۆیە جیاوازی شێوازی ئەو گوێزانەوەیەش، لە جودایی تێڕوانینو بیروراکانەوە سەرچاوە دەگرێتو ڕۆماننووس لێرەدا زۆر بە وردی لەسەر ئەم پێکهاتە گرنگەی ڕۆمان دەوەستێت. لەبەر ئەوە ئامادەکردنی کەسێتی، بە تەواوی بوونی ڕۆمان دەگەیەنێت. وەك دەبینین ((جون برین)) دەڵێت: ((ئەگەر تۆ کەسایەتییەکانت لابێت، ئەوا بە دووری مەزانە چیرۆکێکت لادروست دەبێت-٣٩/٤)). کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کەسایەتی ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە دروستکردنی بنەمایەکی پتەوی پێکهاتەی ڕۆماندا و دەتوانێت هەموو ڕوانینو ئامانجەکانی دەقەکە لە خۆیدا کۆبکاتەوە.. لێرەشەوە دوای ئەوەی کە ڕۆڵی کەسایەتیمان ئاشکرا کرد، پێویستە بچینە سەر مەبەستی لێکۆڵینەوەکەو باس لە گۆڕانکاری دانانی کەسێتی بکەین لە ((لە ڕۆمانی نوێی فەرەنسی)) دا. بەڵام پێش ئەوەی بچینە سەر کەسێتی، پێویستە وەك ناساندنێکی کورت ئاماژە بەسەرهەڵدانی ڕۆمانی نوێی فەرەنسی بدەین..

## ڕۆمانی نوێی فەرەنسی

ڕۆمان نوێ ((الروایە الجدیدە –Naureau Roman)) ی فەرەنسی، بە فۆرمەڵە بوونو یەکگرتنەوەی ئەو تەوژمو بزووتنەوەیە دەوترێت کە لە نزیك بوونەوەی چەند ڕوانینێکی هاوبەشەوە سەرچاوەی گرتو لەنێوان ساڵانی ١٩٥٤–١٩٦٤ دا بەرجەستە کراوە بەهۆی لێکچوونی زۆربەی گۆڕانکارییەکانەوە ئاوێتە بوونو لەسەر دەستی چەند ڕۆماننووسێکی ناوزەدکراو بە کۆمەڵەی ڕۆمانی نوێی فەرەنسی هاتە ئاراوە، ئەوانیش ((ئالان ڕۆب گریێ- A.Robbe Grillet)) و ((ناتالی ساروت –N.Sarraute)) و ((کلۆد سیمۆن- C.Simon)) و ((میشیل بوتۆر- M.Butor)) و ((روبیر بنجیە)) بوون. ئەم یەکگرتنەوەیەش بەهیچ شێوەیەك لە بەرئەنجامی نزیکی پەیوەندیو دروست بوونی گروپەوە سەرچاوەینەگرتووە، بەڵکو ئەم فۆرمەڵە بوونە دەربڕینو خستنەڕووی چەند گۆڕانکارییو هێنانەکایەی تازەبوونەوەیە کە لە هونەری ڕۆماندا، بێ ئەوەی ئەم چەند کەسە لە سەرەتادا بە هیچ شێوەیەك

ئاگاداری یەکدی بکەنەوەو هێڵێك بۆ ئیش کردنیان بکێشن. خۆشیان بە تەواوی دانیان بەوەدا ناوە. وەك دەبینین ((میشیل بوتۆر)) لەوەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بەوەی کە دەتوانرێ ڕۆمانی نوێی فەرەنسی وەك قوتابخانەیەك تەماشا بکرێت، دەڵێت: ((لێرەدا قوتابخانەیەك بۆ ڕۆمانی نوێ نابینرێت، ئەمە وەك بزووتنەوەیەکی ئەدەبییە لە ڕاستیدا، چونکە قوتابخانە مامۆستاو قوتابی هەیە-١٦/٨))، هەروەها ((ئالان رۆب گرێ)) ش دەربارەی چۆنیەتی کارکردنیان دەڵێت ((ئێمە وەك کۆمەڵێك کارمان کردووە، چونکە زۆر ئەستەم بوو لەنێوان ساڵانی ١٩٥٤-١٩٦٤ دا باس لەبوونی قوتابخانەیەك بکرێت-٤٣/٨)). بە هەمان شێوەیش ((ناتالی ساروت)) لە وەڵامی هەمان پرسیاردا دەڵێت: ((بەرهەمەکانی ئەم کۆمەڵەیە جیاواز بوو لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دی، بەلام لەئاقارو هەڵوێستماندا هاوبەش بووین-٥٢/٨)). هەروەها ((کلۆد سیمۆن)) یش بۆ هەمان مەبەست دەڵێت: ((ناتوانین بڵێین قوتابخانەیە، بەلام دەتوانین وەك بزووتنەوەیەك تەماشای بکەین، چونکە قوتابخانە تیۆری هەیەو پراکتیکی ئەو تیۆرە دەکات، ئەمەش لە ڕۆمانی نوێدا ڕووی نەداوە-٦٢/٨)).. کەواتە لێرەشەوە ئەوڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، کە ڕۆمانی نوێی فەرەنسی بە هیچ شێوەیەك سەرهەڵدانی قوتابخانەیەك نەبووە، تاکو ڕابەرانی خاوەنی میتۆدێکی هاوبەش بنو هەوڵەکانیان بۆ بە ئاکام گەیاندنی ئەو میتۆدە بخەنەگەڕ، بەڵکو وەك لە بیروڕای کۆمەڵەی ڕۆمانی نوێی فەرەنسییەوە بۆمان دەرکەوتو بە تەواوی دانیان بەوەدانا، کە ئەوان بە مەبەستو ئامانجی دروستکردنی قوتابخانەیەك ئیشیان نەکردووە، بەڵکو هەریەك لەوانە خاوەنی بیروڕاو ڕوانینی خۆی بووەو کەسیان خۆیان بە هیچ یاسایەکی داڕێژراوەوە نەبەستۆتەوە. وەك دەزانین پێکهێنەرانی ئەم بزووتنەوەیە خۆیان بە تەواوی لەسەر ئەوە کۆکن کە هەوڵو مەبەستەکانیان بێ ئاگایی یەکدی بووەو بەشێوەیەکی نەخشەکێشان کاریان نەکردووە. ئەم ڕۆماننووسانەش زۆریەی بەرهەمەکانیان لە (چاپخانەی نیوەشەو) ی پاریس بڵاوکردۆتەوە، کە ((ئالان رۆب گرێ)) ڕاوێژکاری ئەو چاپخانەیە بوە.. دوای ئەوەی کە تیشکمان خستە سەر ڕۆمانی نوێی فەرەنسی، پێویست دەکات پێش ئەوەی بچینە سەر چۆنیەتی دانانی کەسێتی لە ڕۆمانی نوێدا، چاوێکی خێرا بە کەسێتی لە ڕۆمانی فەرەنسیدا بگێڕین، لە پێش کۆمەڵەی ڕۆمانی نوێی فەرەنسییەوە. تاوەکو بتوانین بە تەواوی هەست بەو گۆڕانکاریو جوداییە بکەین کە ڕۆمانی نوێی فەرەنسی بەسەر کەسایەتیدا هێناویەتیو هەموو جیاوازییە هونەرییەکان ئاشکرا بکرێت، چونکە پەی بردن بەو جیاوازیانە قووڵبوونەوەو وردبینی زۆری دەوێت. لەبەر ئەوەی ڕۆمانی نوێی فەرەنسی قوتابخانەیەك نییە، تاکو میتۆدی ئەو قوتابخانەیەك لەبەردەستدا بێت، بەڵکو تەنها دەبێت لە ڕێگەی بەرهەمو بیروڕاکانیانەوە ئەو جیاوازیانە وەك دەرئەنجامێك ئاشکرا بکەیت. هەر بۆیە نابێت بەو شێوەیە تێ بگەین کە ڕۆمانی نوێ سەر لەنوێ کەسێتی لە نەبوونەوە هێناوەو لە بنەڕەتەوە گۆڕیویەتیو نموونەی لەو جۆرە بەرچاو ناکەوێت، بەڵکو گۆڕانکارییەکان زیاتر لە هونەری دانانو چۆنیەتی بیروڕاو ڕوانینیانەوە فۆرمەڵە دەبێت. دەبینین ((جیریمی هۆسۆرن)) دەڵێت: ((گۆڕانکاری لەوێناکردنی کەسێتی نێو ڕۆماندا گۆڕانکاری لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر نییە، تەنها هەندێك گۆڕانکاری هونەری نەبێت کە ڕۆماننووسەکان تیایدا فێری خوڵقاندنی کەسێتیو بەرچاوخستنی دەبن-٧٨/٥))...

## کەسێتی لە ڕۆمانی فەرەنسیدا

ئەوەی لێرەدا دەخرێتە ڕوو شێوەیەکی گشتی دانانی کەسێتییە لە ڕۆمانی فەرەنسیدا، پێش سەرهەڵدانی ((ڕۆمانی نوێی فەرەنسی)). بێگومان ئەو ماوەیەش ماوەیەکی درێژەو چەندین ڕۆماننووس تیایدا دەرکەوتوون. بەلام ئێمە لێرەدا ناتوانین بە تەواوی لەسەر هەموو قۆناغو ڕۆماننووسەکانی بوەستینو ئاماژە بە گشت جوڵانەوەکان بدەین، بەڵکو تەنها ئەو هەوڵانە دەخەینە بەرچاو کەزیاتر دەرکەوتوونو گۆڕانکارییان لە کەسێتی ڕۆماندا بە ئەنجام گەیاندووە. تاوەکو بتوانین بە تەواوی کۆنترۆڵی چۆنیەتی دانانی کەسێتی بکەین لە ڕۆمانی فەرەنسیدا. ئەگەرچی گەلێك ڕۆماننووس لە پێش ڕۆمانی نوێی فەرەنسیدا دەرکەوتوون، بەلام کاتێك بە شێوەیەکی گشتی باسیان لێوە دەکرێت، دەوترێت لە ((بەلزاك)) ەوە بۆ ڕۆمانی نوێی فەرەنسی.

بەو پێیەش کە ڕەوشو ئاستی ڕۆمانی فەرەنسی لەو سەردەمەدا لە نموونەی باڵاو ئەفراندندا دەگاتە بەلزاك. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێت بە تەواوی لە بەلزاکەوە بچینە سەر ڕۆمانی نوێی فەرەنسی، چونکە ئەوە دەبێتە تێپەڕاندنێکی گەورەی بەرهەمی گەلێك لە ڕۆماننووسە دەرکەوتووەکان، هەر بۆیە بەپێی پێویست بەشێوەیەکی خێرا لە هەندێك وێستگەدا پشوویەك دەدەین.. ((هنری دی بەلزاك-H.Balzac -١٧٩٩-١٨٥٠) یەکێکە لە ڕۆماننووسە بەناوبانگەکانی فەرەنسا، کە ئەفراندنێکی

ورەی لە بواری رۆماندا بەرجەستە کردووەو بۆتەئاوێنەی واقیعی سـەردەمەکەی. بە تایبـەتی لـە پێشـەکی شـاکاری ((کۆمیدیای مرۆڤایـەتی -١٨٤٢- Humaine Comedie)) دا دەبێتە مێژوو نوسـی ئاکاری سەردەمو باسی پـاریسو هەرێمەکانی دیکەو رەوشی بۆرژوازییـەکانو سـەربازو رۆڵـی چاپەمەنیو بڵاوکراوەکـانیش دەکـات. کـە دەتوانـین بڵێین بـەلزاك نمونـەی بـالآی سـەردەمی خـۆی بـووە. کەسـایەتییەکانی بـەلزاك هـەمان کەسـێتی واقیعـی سـەردەمەکەنو زۆر بـە وردی هـەموو بنەمایـەکیان بـۆ دارێـژراوەو خـاوەنی شوناسـێکی تایبـەتی خۆیـانن. کـە ئەمەش وایکردووە تایبەتمەندی کەسێتی لای بـەلزاك ببێتـە زاراوەو رەخنـەگران بـە ((کەسێتی بـەلزاکی- الشـخصیە البلزاکیە)) ناوی ببەن. کە بۆ ناساندنی ئەمـەش دەوترێت (کەسێتی بـەلزاکی نـاوێکی تایبـەتی هـەلگرتووەو خـاوەنی خێزانو رابردووە، کەسایەتییەکە لـە رووی کۆمەڵایەتییـەوە ناسـراوەو خـاوەنی پیشـەو کەرەسـتەیەو لـە شـوێنێکی دیاریکراودا دەژیو بەهۆی پەیوەندییـەوە پابـەندە بەچـەند کەسـانێکەوەو دیمـەنێکی سـنورداری هەیـە-٦/١٢٥)). کەواتـە دەبینـین کەسایەتییەکانی بەلزاك بە تـەواوی لـە واقیعەوە هێنراونو خاونی شوناسێکی تایبەتی خۆیانن، کـە گشت پەیوەندیو هەڵسو کەوتو روانینەکان لە چواردەوری ئـەو شوناسـە دەسـوڕێنەوە. چونکـە بـەلزاك لـە سـاتی دەرخستنی کەسـایەتییەکیدا بـە تـەواوی وێنـەی هـەموو چواردەورو رابردووی ئـەو کەسـایەتییە دەکێشـێو بـە هیچ جۆرێك کەسـایەتییەکی دابـڕاوت ناخاتـە بەرچاو. هـەروەك (پێرسی لوبوك)) دەڵێت (بـەلزاك نـاتوانێت کەسـایەتییەکی دابڕاو لە خانوویـەکیش بە خـەیاڵیدا بهێنێ. دروستکردنی مرۆڤێکی خـەیاڵی لای بـەلزاك، خـەیاڵی دابڕانـی شـارێك دەگەیەنێت-١١/١٩٩)). هـەر بۆیـە دەتوانـین ((کۆمیدیـای مرۆڤایـەتی)) بـەلزاك بکەینـە نمونـەی بـالآی ئـەو کۆمەڵـە رۆمانەی کە بە ((رۆمـانی رووبـار-The roman fleuve)) نـاودەبرێت. کـە ئـەم زاراوەیـەش بەسـەر ئـەو رۆمانانـەدا چەسپی کە رووداوی مەئلوفـو کەسێتی دوبارە کراویـان لـە واقیـعـەوە دەگوێزایـەوەو بەرهەمـەکانیان گـەواهی رەوشـی ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیان بوون.. جگە لـەوەش ((گوسـتاف فلۆبـیر- G.Flaubert)) ی خـاوەنی رۆمـانی ((خـاتوو بۆڤاری)) ش، کە یەکێکە لـە رۆماننوسە دەرکـەوتووەکانو گەلێك تازەگەری بەسەر هونەری رۆماندا هێناوە، بە هـەمان شێوە لە رووی دانانی کەسایەتییەوە زیاتر پابەندی واقیعەو بەرهەمەکانی ئاوێنەی سەردەمەکەیەتی.. لای بـەلزاك گـەل بە بەردەوامی ئامادە بوونی هەیە، بەڵام لای رۆماننوسـێکی وەك ((ئـەمیل زۆلا- E.Zola)) لـە کۆتـاییدا جۆرێـك یـاخی بوون دەبینینو دەتوانین بڵێین کە رۆمان لـە بەلزاکـەوە بـۆ زۆلا، هەنگاونان بوو بۆ قوتاربوون لەو ئەفسانە وەسـتاوەی جیهانی داگـیر کردبـوو. بەشـێوەیەکی گشـتی سـەدەی نۆزدەهەم چەند ململانێیـەك بـو بوونـە بابـەت لـە رۆماندا، وەك ململانێـی نێـوان بـۆرژوازیو ئەرستۆکراتیدا، لـەنێوان دەوڵەمەندو هەژاردا، لـە نێـوان بازرگـانی بچوکو گـەورەدا، لـەنێوان سـەرمایەدارو کرێکـاردا، بەشـێوەیەکی گشـتی ململانـێ بـوو لـەنێوان پاڵـەوانو جیهاندا. بـەڵام کـاتێك لـە ((زۆلا)) وە دەچینـە سـەر ((پرۆسـت- Proust)) کەسـایەتییەکی قووڵـترو بـەئاگاتر بـەدی ئەکـەین، کەسایەتییەك کە شوناسی فریادڕەسێکی هەڵنـەگرتووە بـۆ قوتـارکردنی جیهان، بـەڵکو بەشـێوەیەکی کـورت راڤـەی هـەموو چەمکـەکانی ژیـان دەکـاتو بـە قووڵـی لەسـەریان دەوەستێت. هەروەك دەربارەی کەسـێتی رۆمـانی ((گـەڕان بـەدوای کـاتی لـە دەسـت چـوو)) دا دەوترێـت ((کەسایەتییەکانی پرۆست ئەو پاڵەوانانـەنین کـە بیانـەوێت وەك پێشـتر لەرێگـەی شوڕشـێکەوە جیـهانی دەرەوەی خۆیان بگۆڕن، بەڵکو ئەو کەسایەتییە تێ دەگات لە جیهان دەیـەوێت راڤـەی سیمبولی هونـەرو خۆشەویسـتیو ژیـانی کۆمەڵایەتی بکات-١/١٥))..

هەر لـە سـەدەی نـۆزدەدا رۆمـانی ((سـایکۆلۆژی)) ش سەری هەڵدا، کە گرنگی دەدا بە ژیانی کۆمەڵایەتیو ئاکـارو هەڵسو کەوتی باشو خراپـی کەسـێتی، دەرکـەوتوو تـرین رۆماننووسی ئەو بوارەش ((پول بورجیە- Poul Bourget -١٨٥٢-١٩٣٥)) بوو..

دوا بەدوای ئەوەش لە سەدەی بیستدا رۆمانی وجـودی دەرکـەوت کـە لـە ((رشـانەوە-١٩٣٠)) ی ((سـارتەر)) ەوە سەری هەڵداو چەند رۆماننوسـێکی تـر لەسـەر هـەمان هێڵ درێژەیـان بـەو ئەزموونـەدا. (رشـانەوە)) ئاشـکرا کردنـی بوونە، کە لە هەموو لایەکەوە بەچەند ئایدۆلۆژییەك گـەمارۆ درابوو..

هەرچەندە لێرەدا بەسـەر ئـەزموونی رۆماننووسـی وەك ((پیرلۆتیو رۆمـان رۆلانو جـۆرجو هـامێلو بیکێتو کـامۆو دوجـاردو کۆلیـتو سـاگانو ئەندریـە مـالرۆو.. هتـد)) دا رۆیشتین، بەڵام زیاتر شـێوەیەکی گشـتی کەسایەتیمان لـە نموونـە باڵاکانـەوە خسـتە بـەرچاو، تـاکو بتوانـین دوای دەرخستنی کەسێتی لە ((رۆمانی نوێی فەرەنسـی)) دا ئـەو جیاوازییەمان بۆ دەربکـەوێت کـە رۆمـانی نوێـی فەرەنسـی گۆڕانکاری بەسەردا هێناوە..

## کەسێتی (رۆمانی نوێی فەرەنسی)

دوای ئەوەی ئاماژەمان بە چۆنیەتی کەسایەتی رۆمانی فەرەنسیدا، ئێستا دەتوانین لە کەسێتی رۆمانی نوێی فەرەنسی بدوێینو هەست بە جیاوازییەکان بکەین. گەرچی رۆمانی نوێی فەرەنسی گەلێك تازەگەریو گۆڕانکاری بەسەر هونەری رۆماندا هێناوە، بەلام ئێمە لێرەدا تەنها لەسەر چۆنیەتی گۆڕانکاری کەسێتی دەوەستین. بێگومان (نووسینی رۆمان گێڕانەوەیەکی حیکات ئامێزی ژیانی خەلکی نییە، بەلکو رۆمان گرنگییەکی گەورە بە سروشتی مرۆڤ دەدات-٣/٢٢)). ئەم شێوە گێڕانەوەیەش کە لێرەدا رەخنەی ئاراستە کراوە، لە زۆربەی رۆمانە کۆنەکاندا بە تەواوی رەنگی داوەتەوە، کەسایەتییەکی واقیعی هەلگری رووداوێکی مەئلوفەو سەرەتاو ناوەندو کۆتایی بەرێوەچوونی بۆ رێکخراوەو لە ماوەیەکی کورتدا دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەرو بە سانایی دەیناسێت. کە ئەمەش بەپێی گۆڕانکاریو روانینە نوێیەکان بۆ دانانی کەسایەتی بە خاڵێکی لاواز دادەنرێت. لەبەر ئەوەی ((رۆمان پێکهاتەی کەسایتییە، هەر بۆیە رەخنە ئاراستەی ئەو رۆماننووسانە دەکرێت کە پشت بە وەسفو کردارەکانی کەسایەتییەك دەبەستێت لە منداڵییەوە تاکو گەورە بوون-١٠/٢٣٥)).

کەسایتی لە رۆمانی نوێی فەرەنسیدا هەموو رەگەزە مەئلوفەکانی پێشتر لە دەست دەداو دەبێتە کەسێکی بێ شوناسو ئەو سنوورداریییەی کەلای بەلزاك بۆ کەسێتی دەردەکەوێت، لە رۆمانی نوێدا نابینرێت. وەك بینیمان کەسێتی لای بەلزاك لە خێزانێکەوە دێتو خاوەنی رابردووەو شوێنێکی تایبەتی داگیر کردووەو بە دڵنیابییەوە هەنگاو دەنێت، بەلام ((کەسێتی لە رۆمانی نوێدا رابردوویەکی روونی نییە، تەنها لە ساتی رۆمانەکەدا دەردەکەوێتو نازانین لە کوێوە هاتووە-٦/١٤١)). لێرەشەوەیە دەوترێت رۆمانی نوێی فەرەنسی پێش هەموو شتێك بزوتنەوەیەکی رەتکردنەوە بوو، رەتکردنەوەی ئەو شێوازەی کە پێشتر بە بالای رۆماندا بڕابوو. بەلام دواتر هەموو ئەو سنوروشێوازانە تێك شکانو لە بەرچاو ون بوون. کەئەمەش بەشێوەیەکی تەدریجی گەیشتە ئەو ئاکامەو کەسێتی لاسایی لەو رێڕەوەدا، وردە وردە هەمو شتێکی لێ سەندرایەوەو دواتر خۆیشی ون بوو. هەروەك ((ناتالی ساروت)) دەربارەی ئەو هەنگاوەی کەسێتی لە رابردووەوە بۆ ئێستا دەلێت: ((وردە وردە هەمو شتێکی لە دەستدا، بنەماڵەو خانوو کەرەستەو لەشو شێوە، هەتا گەیشتە ئەورادەیەی کە تەنها خۆی [illegible] ناوەکەشی ون کرد-٦/١٢٦)). رۆمانی نوێ کەسێتی لە هەموو ئەو کەرەستەوپێداویستیانە داماڵی، کە گرفتی خودی کەسایەتییەکەیان لەنێو خۆیاندا ون کردبوو. بەم شێوەیەش وەرگرتنەوەی ئەو شوناسە تەنها لە دەستدانی زنجیرەی پێگەیاندنی کەسێتی بوو، چونکە وایکرد زیاتر بەنێو خودی کەسایەتیدا رۆبچێتو ببێتە هەلگری ئەندێشەو گرفتی گەورەی مرۆڤو شوێنی لەناوەندی جیهاندا. رۆمانی نوێ زیاتر لەسەر هزری کەسایەتییەکان دەوەستێتو گرنگییەکی زۆر بە مەنەلۆژی ناوەوە دەدات. دەبینین ((جیریمی هۆسورن)) یش پێی وایە کە ((رۆمانی نوێ جەخت دەکاتە سەر وێنەیەکی نموونەیی، هەموو ئەو حاڵەتو کردارانەی کە گفتوگۆی نێو هۆشی کەسایەتییەکانە، زیاتر لەوەی جەخت بکاتە سەر رووداوەکانی جیهانو دنیای دەرەوە-٥٤٥)).

هەر بۆیە ئەستەمە بە سانایی لە کەسایەتییەکی رۆمانی نوێ بگەیت، چونکە رۆمانی نوێ بە سادەیی کەسایەتیەکانت ناخاتە بەرچاو، بەلکو خوێنەر خۆی دەبێت لەرێگەی هەستی کەسایەتیەکەوە بچێتە نێو قولایی و دەرئەنجامێك بەدەست بهێنێ. رۆمانی نوێ بە هیچ شێوەیەك مۆر لە کەسێتی نادات، بەلکو سەرنجی ئەو گۆڕانکاریانە دەدات کە لەو کەسایەتییەدا روودەدات. کە ئەمەش گرنگییەکان دەکاتە خاڵێكو لە خودی مرۆڤدا کۆی دەکاتەوە. هەر بۆیە ((ئالان رۆب گرێ)) دەلێت ((رۆمانی نوێ تەنها گرنگی بە مرۆڤو شوێنی لە جیهاندا دەدات-٢/٢٧٥)).

لێرەشەوە دەتوانین بلێین رۆمانی نوێی فەرەنسی بە تەواوی کەسێتی بەلزاکی تێکشاند، ئەم تێکشاندنەش لە گۆڕانکاری جیهانو جیاوازی سەردەمەوە سەرچاوەی گرتووە. سەردەمی بەلزاك مرۆڤ دڵنیا بوو لە خۆیو شوێنو خێزانی، بەلام دواتر بەهۆی گۆڕانکاریو پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە، مرۆڤ پێناسەی تەواوی خۆ لەدەست داو تاکو ئێستاش بە بەردەوامی لەنێو گومانو دڵەڕاوکێدا هەنگاو دەنێتو لە هەوڵی دۆزینەوەی خۆیدایە. هەر بۆیە دەبینین رۆماننووسێکی وەك ((ئالان رۆب گرێ)) هەمیشە لە رۆمانەکانیدا بەدوای خۆیدا دەگەڕێت، کە ئەمەش نامۆبوونو ونبوونێکی تەواو دەگەیەنێت بەرامبەر تەکنەلۆژیاو گۆڕانکارییەکانی جیهان. ئەم جیاوازییەش لە سەردەمی بەلزاکەوە بۆ سەردەمی رۆمانی نوێی فەرەنسی، وا لە رۆماننوسی گەورە ((ئالان رۆب گرێ)) دەکات کە بلێت: ((ئێمە پێش کردنەوەی گەردوون، ئەژیانو دڵنیا بووین لەمانای کۆتایی بوونی مرۆڤو شوێنی لەناوەندی جیهاندا =٦/١٥٦). واتە ئێمە پێش ئەمە کە جیهان بەم

شێوەیەی ئێستا بگرێتەوە دڵنیا بوون لەبوونی ڕاستەقینەی خۆمان و لەگەڵ هەبوونی فەرەنسایەکدا بەشێکی گرنگمان لەجیهان دڵگیر کرابوو. بەڵام ئێستا بەهۆی ئاڵۆزی جیهان و لەدەستدانی بەهای ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە، مرۆڤ تووشی نامۆیی بوو لە چواردەوری دواتر خۆشی ون بوو، ئەمەش وا دەکات کە هێندێ جار ئەم ڕاستییە لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەکەی خۆیدا شوێنێکی تەواویەوە، چونکە ا،

دەتوانین بڵێین لە ڕابردوودا ڕۆمان کرابووە، ئاکاری باوی کۆمەڵ و هەموو ڕووداوە مەنلوونەکانی ئاماژەکێشراو، دەبووە ئاوێنەی سەردەم لەبەردەم خوێنەردا. ڕۆماننووس لە دەقەکەیدا کەسایەتییەکانی لەسەر هێڵی ئامانجی ئارەزووی خۆی بەڕێوە دەبردو بۆچوونەکانی خۆی بەسەردا دەسەپاند. بەڵام لە ڕۆمانی نوێدا ڕۆماننووس بە تەواوی جڵەو بۆ کەسایەتییەکان شل دەکات، تاکو بەپێی هەڵو مەرجو شوێنی تایبەتی خۆی بەڕێوە بچێت. هەروەک دەوترێت ((ماهییەتی ڕۆمان لە پشت بەستن بەشێوەی خستنە ڕووی کەسایەتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و لە ڕۆمانی نوێدا هەموو ئەو کەسایەتیانە ڕەت دەکرێنەوە کە بیرکەر ئارەزوو بەهای خۆمانی بەسەردا دەسەپێنین-٧/٧٤)).

سەرەڕای ئەمانەش کەسێتی لە ڕۆمانی نوێدا ئەو ڕۆڵە لاسایەی بۆ کرد، کەببێتە پاڵەوانی ڕێکارکەر و ئێرەی ڕووداوەکان لەسەر شانی ئەو بوەستێت، کە جاران لە ڕۆماندا ڕەنگی دەدایەوە، ئێستا لە ڕۆمانی نوێدا پاڵەوان هەر جارەی لە سیمای کەسایەتییەکی نێو ڕۆمانەکەدایەو جێگۆڕکێ دەکات و بۆ دەبێتز هەروەک دەبینی، لە ڕۆمانی ((جینا)) ی ڕۆماننووس ((ئالان ڕۆب گرییە)) دا پاڵەوان لە منداڵێکەوە دەبێتە ئافرەتێکو دواتر دەگۆڕێت بۆ ئافرەتێکی دی و پاشان ڕووداوەکان ونی دەکەن و ناگەینە هیچ ئەنجامێک.

ئەم گۆڕانکاریانەش بەرئەنجامی ئاڵۆز بوونی جیهان و ئەزموونەکانە، کەوا دەکات کەسایەتییەکی خاوەن شوناسی سەردەمی بەئازاد ببێتە کەسایەتییەکی بێ ناسنامەی سەردەمی ڕۆمانی نوێی فەرەنسی...


سەرچاوەکان

١- الرواية الفرنسية الجديدة، نهاد التكرلي -الجزء الاول -بغداد- ١٩٨٥.

٢- الرواية الحديثة الانكليزية والفرنسية، ئول ويست .... ترجمة عبدالواحد محمد، بغداد- ١٩٨١.

٣- الرواية وصنعة كتابة الرواية، ترجمة: سامي محمد-بغداد-١٩٨١.

٤- كتابة الرواية، جون برين، ترجمة: مجيد ياسين -بغداد- ١٩٩٣.

٥- مدخل الدراسة الرواية، جي بي هولثورن، ترجمة: غازي درويش عطية، بغداد-١٩٩٦.

٦- الرواية الفرنسية الجديدة، نهاد التكرلي، الجزء الثاني -بغداد- ١٩٨٥.

٧- نظرية الرواية- علاقة التعبير بالواقع، ترجمة د. محسن جاسم الموسوي، بغداد- ١٩٨٥.

٨- حوار في رواية الجديدة، روبن لافون، ترجمة د. نزار صبري، بغداد-١٩٨٨.

٩- الرواية العربية المعاصرة .... جاسم اسد، بغداد-١٩٨٨.

١٠- الريف في الرواية العربية، د. محمد حسن عبدالله، الكويت- ١٩٨٩.

١١- صنعة الرواية، بيرسي لوبوك، ترجمة عبدالستار جواد- بغداد- ١٩٨١.

# ناتالی سارۆت‌و ڕۆمانی نوێ

• و: سەهەند

(خانم ناتالی سارۆت (Nathalie Sarraute) بە یەکێك لە پێشڕەوانی ڕۆمانی نوێ دەژمێردرێ. ساڵی ١٩٠٢ لە شاری ئیڤانۆڤۆ کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی مۆسکۆوە لە دایك بووە، هەر بە منداڵی دەچێتە فەرەنساو لە پاریس نیشتەجێ دەبێ‌و هەر لەوێ خوێندن تەواو دەکات‌و لە ئەدەب‌و لە حقوقدا لیسانس وەردەگرێ. جگە لە ڕووسی‌و فەرەنسی‌و زمانی ئەڵمانی‌و ئینگلیزیش فێردەبێ. ساڵی ١٩٣٨ یەکەمین کاری خۆی چاپ دەکات کە ئەویش (هەڵچوونەکان)ە، پاش ئەو کارەی چوار ڕۆمانی دی دەنوسێ کە یەکەمیان (وێنەی نەناسێك)ە کە لە ساڵی ١٩٤٨دا لە چاپی دەدات‌و فەیلەسوفی فەرەنسایی (ژان پۆل سارتەر) پێشەکی بۆ دەنوسێ، ئینجا ڕۆمانی (مارتیرۆ) ١٩٥٣، ڕۆمانی (هەسارە) ١٩٥٩، (میوەی ئاڵتوونین) ١٩٦٣ کە خەڵاتێکی ئەدەبی جیهانیی پێ وەردەگرێ‌و پێشتر هەمان خەڵاتیش دراوە بە سامۆێیل بیکیت. جگە لەمانە ساروت کتێبێکی تیۆری لە بواری تیۆری ڕۆمانی نوێدا هەیە کە بەناوی (چاخی بەدگومانی) یەوەیەو دەکرێ بە یەکەمین ناسێنەری تیۆری ڕۆمانی نوێ لە قەڵەم بدەین‌و کاریگەرییەکی قووڵی کردە سەر نووسەرە ئەورووپاییە لاوەکان، ئەم گفتوگۆیەش ساڵی ١٩٩٤ لە لایەن (رامین جهانبگلو)ەوە لەگەڵیدا ئەنجام دراوە – و–)

* بەلای کەسانێکی زۆرەوە ئێوە هەمیشە یەکێك بوون لە نوێنەرانی ڕۆمانی نوێ، چۆن دەڕواننە بەسەرهاتی ڕۆمانی نوێ؟ ئایا بەلای ئێوەوە ڕۆمانی نوێ بووە بە بەسەرهاتێکی کۆن یان لەو باوەڕەدان کە هێشتا زیندوێتی خۆی لە دەست نەداوە؟

– من لەو بڕوایەدام کە بزاڤی ڕۆمانی نوێ گەلێ سوود بەخش بوو، بەڵام گەلێ پەرەوازە بوو. بەڕای من بزاڤی ڕۆمانی نوێ ساڵی ١٩٥٧ بە کتێبەکەی من (چاخی بەدگومانی) دەستی پێ کرد. بەڵام دەبێ ئەوەش بگوترێ کە کۆمەڵێك نووسەر لە فۆرمۆلە کردنی ئەم بزاڤەدا بەشدار بوون‌و هەر یەکێك لەم نوسەرانە ڕێگایەکی جیاوازی بۆ خۆی گرتبووە بەر، هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئەم نووسەرانەدا نەبوو تەنها ئەوە نەبێ کە دەبێ ڕۆمان وەك هەر شێوەیەك لە شێوەکانی تری هونەر بەردەوام نوێ بێت.

• ئێستا لە ڕۆمانی نوێ چی ماوەتەوە؟

– لە ڕۆمانی نوێ جگە لە نوسەرەکانی هیچی تر نەماوەتەوە، واتە کەسانێکی وەك کلۆد سیمۆن یان ئالان رۆب گرێ‌و یاخود خۆم کە تا ئێستا لە نوسیندا بەردەوامم.

* میشێل بۆتۆر دەیوت: ڕۆمانی نوێ قوتابخانەیەك نی‌یە، بەڵکو بزاڤێکی مێژوویی‌یە، تۆ لەم بارەیەوە ڕات چی‌یە؟

– من لەگەڵ میشێل بۆتۆردا هاوڕام، ڕۆمانی نوێ قوتابخانەیەك نی‌یە بەڵکو هەروەکو وەکو دەڵێت لە کۆمەڵێك نووسەر پێك هاتووە کە بە ڕای من لە چاخی بەدگومانی‌دا بۆچوونەکانیان وەك یەك بووەو دەیانویست ڕۆمان نوێ بێتەوە؛ ئەو نوێیەتیەی کە لە هەر شێوەیەکی‌تری هونەردا هەیە. لە ڕاستی‌دا ئالان ڕۆب گرێ یەکەمین کەس بوو بیری لە پێکهێنانی بزاڤێك بۆ بەرەنگاری ئەدەبیاتی تەقلیدی کردەوە. وەختێ ((چاخی



بەدگومانی)) بڵاو بووەوە ئەو لەگەڵ ژروم لەندۆندا سەرپەرشت دەزگای بڵاوکردنەوەی ((مینۆی))یان دەکرد. کتێبەکەی من زۆر سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو، بۆیە هەر لە ساڵی ١٩٥٧دا سەرلەنوێ کتێبی ((هەڵچوونەکان))ی لە چاپ دایەوە کە لە ساڵی ١٩٣٨دا لای لاوێك بەناوی (ڕۆبرت دۆنۆیل) لە چاپم دابوو، ئەو دەمە زۆر سەرنج ڕاکێش نەبوو، بە لەچاپدانەوەی هەڵچوونەکانو چاخی بەدگومانیو بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی (ئیرەیی) غیرەی ڕۆب گریێ، هەراو زەنایەکی زۆر لەلایەن ڕەخنەگرە تەقلیدیەکانەوە نرایەوە. ئەمیل هانریۆHenriot هێرشی کردە سەرمانو کارەکانی ئێمەی بۆ نموونەی ڕۆمانی نوێ هێنایەوە. ئالان ڕۆب گریێ لە گۆڤاری کریتیك Critiqueدا بە ووتارێك دەربارەی ((چاخی بەدگومانی)) وەڵامی دایەوەو بەم جۆرە ناوبانگێکی بۆ ڕۆمانی نوێ پەیدا کرد، بەڵام لە ڕاستیدا کارەکانی نووسەرانی ئەم بزاڤە لە یەکدی زۆر جیاواز بوون.

* ئایا پەیوەندیتان لەگەڵ نووسەرانی تری (ڕۆمانی نوێ)دا ماوە؟

– لە ڕاستیدا من هەرگیز پەیوەندیم لەگەڵیاندا نەبووە، چاوپێکەوتنیش نەبووە لە نێوانماندا. ڕۆمانی نوێ بریتی نەبووە لە گروپێك وەکو سوریالیستەکان پێکەوە کار بکەن زۆر کەم یەکتریمان دەبینیو هەرکەسەو بۆ خۆی دەنووسی. هەڵبەتە من دەربارەی ڕۆمانی نوێ قسەم کردوە، نوسەرانی تری ڕۆمانی نوێش وەکو ئالان ڕۆب گریێ چەندین وتاری دەربارەی ڕۆمانی نوێ نووسیوە، بەڵام هیچ کاتێ ئێمە وەك گروپێکی پێکهاتوو لە ڕۆشنبیرانو ڕۆمان نووسان کارمان نەکردووە.

* ئایا دەتوانین لە نووسینەکانتاندا سەبارەت بە تایبەتمەندێتی‌یەکی ئافرەتانە لە ڕۆمانی نوێدا بدوێن؟

– بە هیچ کلۆجێك بە ڕای من شتێك نی‌یە ناوی ئەدەبیاتی ئافرەتان بێت بە مانای وردی ئەم وشەیە، هەر چۆن ناتوانین دەربارەی مۆسیقایەکی ئافرەتانە یان فەلسەفەیەکی ئافرەتانە بدوێین. هەڵبەتە دەتوانین دەربارەی نوسەری ئافرەت وەکو خوشکانی برۆنتی، یا ڤرجینیاو ولف بدوێین. بەڵام من کاتێ کارەکانی ئەوان دەخوێنمەوە بە هیچ جۆرێك هەست ناکەم نوسینی ئافرەتانە دەخوێنمەوە، من لەو بڕوایەدام وەختێ نوسەرێك دەنوسێ ((من))ی لە ئارادا نی‌یە. ئەمەش بە نیسبەت ڕۆمانی نوێوە زەقتر خۆی دەنوێنێ. لە ڕۆمانی نوێدا بابەتەکە خۆی لە خۆیدا گرنگ نی‌یە، ئەوەی گرنگە ئەو شێوەو فۆرمەیە کە ژیان بە بابەتەکە دەبەخشێ تا بگاتە خوێنەریش. بە ڕای من وەسفی شتەکان گرنگی‌یەکی ئەوتۆیان نی‌یە. بەرامبەر بەمە.ئەوەی گرنگ بێت جووڵەی ناوەوەی نووسینەکەیە، بۆیە ئەوەی من بایەخی پێ دەدەم جووڵەی ناوەوەی نووسینەکە بەردەوام ژیان دەگۆڕێ. ئیدی بڕیاری دوای ئەوە کە ڕۆمانەکە ئافرەتانە یان پیاوانەیە هیچ بایەخێکی نی‌یە، کارێکی ساویلکانەیە لە ڕووی ڕەگەزی نوسەرەکەیەوە ڕۆمان هەڵسەنگێنین.

* کەواتە ئێوە وەختێ دەنووسن بیر لە ئافرەتێتی‌ی خۆتان ناکەنەوە؟

– هەرگیز.. کاتێ کە دەنووسم بیر لەوە ناکەمەوە خۆم چیم، بەڵکو بیر لەو شتە دەکەمەوە کە دەینوسم، من هەموو تەرکیزم لەسەر کارەکەم دەبێ هەر بەشێکی ڕۆمانەکەم بەلامەوە وەکو کتێبێکی تازەیە.

* لە شوێنێکدا خوێندوومەتەوە کە ووتوتانە نوسین بە لاتانەوە کارێکی ئازار هێنە. مەبەستتان لەم قسەیەتان چی‌یە؟

– لە ڕاستی‌دا وویستومە بڵێم ئەو ئازارەی کە لە نووسیندا پەیدا دەبێ هەمان ئازاری ((بوون))ە ژیانیش بەبێ ئەم ئازارە هیچ مانایەکی نی‌یە. هەر بۆیە نقوم بوون لە نووسیندا بۆ من سەختە، چونکە هەموو جارێك هەست بە مەترسی دەکەم بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم مەترسیە بۆ من پێویستە چونکە بەبێ ئەم مەترسی‌یە من هەست ناکەم زیندوو بم.

* ئایا دەتوانین وەکو جۆرە لەزەتێك دەربارەی ئەم ئازاری نوسینە بدوێین؟

- بێگومان نوسین هەمیشە کارێکی لەزەتبەخشەو لە هەمان کاتدا ئازار هێنیشە، لە کاری نوسیندا بەردەوام رویەڕوی کۆسپەو لەمپەر دەبینەوەو ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە دەبێتە مایەی جوانیی نوسینەکە. نوسین چەند کێشەو گرفتی زیاتر لەبەردەممدا بخولقێنێ زیاتر وام لێ دەکات لەسەر نووسین بەردەوام بم.

ئایا نوسینەکانتان کارێکی زۆرتان لێ دەبات؟

- بەڵێ.. زۆر جاری وایە نوسینی کتێبێك شەش حەوت ساڵم لێ دەبات. تەماشای کتێبەکانم و مێژووی بڵاوکردنەوەیان بکە. هەڵچوونەکان ساڵی ١٩٣٩، وێنەی نەناسێك ١٩٤٩، مارتیریۆ ١٩٥٣، پلانتاریۆم، ١٩٥٩، بۆ نووسینی ڕۆمانێك شەش ساڵ تەرخان دەکەم.

• ڕۆمانە کۆنەکانی خۆتان دەخوێننەوە؟

- نەخێر.. داوایان لێ کردم تەواوی نوسینەکانی خۆم بخوێنمەوە تا هەموو پێکەوە لە کۆمەڵەی (پلیاد) چاپ بکرێن، بەڵام من هیچ دەستکارییەکی وەهام نەکردن، بەڕای من دەسکاری کردنی هەر کارێك لەو کارانە ئەستەمە، چونکە من هەمان ئەو کەسەی سی یان پەنجا ساڵ لەمەوبەر نیم کە ئەو شتەی نوسیوە بە نوسینی کتێبێك ئیدی لای من ئەو کتێبە تەواو دەبێ‌و حەزناکەم چیدی وەك خوێنەرێك لە دەرەوە لێی بڕوانم.

* بە ڕای ئێوە (خوێندنەوە) Lecture چی‌یە؟

- من (خوێندنەوە) بە جۆرە وتە ورتێکی دەرونی دەزانم لە کاتی نوسیندا، نوسینەکەم دەخوێنمەوەو بەم جۆرە گوێم لەو وشانە دەبێ کە نوسیومن، بە بۆچوونی من (خوێندنەوە)ی ڕاستەقینە ئەمەیە: گوێگرتن لە ڕیتمی دێڕەکان.

* کەواتە لە نوسینەکانی ئێوەدا ڕیتمێك هەیە

- شەست ساڵە من بەم جۆرە دەنوسم‌و ئەو ڕیتمەم ئەز بەر کردووە. من هەموو بەیانی‌یەك دەچمە کافیتریایەك‌و لەوێ دەنوسم، چونکە لە کافیتریادا دەتوانم پتر تەرکیز بکەمە سەر کارەکەم، لە هەمان کاتدا شوێنێکی زیندووشە، چونکە خەڵك لە دەوروپشتم دەبینم. لە کافیتریادا هەم لە گیروگرفتەکانی خۆم دوور دەکەومەوە هەم ڕۆحم لە هەست بە ژیان سەر شار دەبێ.

* بە قسەکانتا وا دەردەکەوێ کە ئێوە سەرتاپای ژیانی نووسەریتان بە هەمان ڕیتم بەسەر بردووە؟

- من لەو باوەڕەدام کە دوا جار هەمیشە بۆ بیرۆکەیەکی نەگۆڕ لەلام ژیاوم کە ئەویش بیرۆکەی نوسینە، هەمیشە ئەو شتە دەڵێم‌و دەنوسم کە دەبێ بیڵێم‌و بینوسم لە ڕاستی‌دا بابەتەکەی من ئەوەندە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە هەر وەکو وتیشم کاتێ نوسینەکانی خۆم دووبارە بۆ کۆمەڵەی (پلیاد) خوێندەوە، گۆڕانێکی ئەوتۆم تیایاندا ئەنجام نەدا.

* ئایا ئێستاش لەگەڵ ئەو بۆچوونانەت دایت کە لە کتێبی ((چاخی بەدگومانی))دا نوسیوتن؟

- بەڵێ.. بە تەواوەتی..

ئایا هێشتا هەمان تێڕوانینی ڕەخنەییانەی توندوتیژتان هەیە بەرامبەر بە دەروونناسی‌و ڕۆڵی لە ئەدەبیاتدا؟

- بەڵێ من لە تەواوی ئەو پۆلبەندییە دەروونناسی‌و شی کردنەوەی هەست‌و سۆزانە بێزارم کە لە ڕۆمانە گەورەکانی ڕابردوودا هەبوون‌و بەلای نوسەری مۆدێرنەوە بێ مانان، لە ڕاستی‌دا من نازانم چ سوودێکی هەیە ئێمە کەسێتیەکانی ڕۆمانێك بهێنین‌و بەپێی هەندێ زاراوەی دەرەوە ڕیزیان بکەین. ئێمە ئێستا لەسەردەمی بەلزاك‌و دۆستۆیڤسکی‌دا ناژین. ناتوانین تیپە ئادەمی‌یەکان وەکو ئەوان بە سادەیی وەسف بکەین‌و بڵێین ئەمە کەسێتی‌یەکی پیسکەیەو ئەویان بە فیزە. ئەگەر ئەمڕۆ شتێکی وەها بکەین دەکەوینە داوی ئەکادیمیەتێکی منالانەوە. من پێم وایە حەقیقەتی سایکۆلۆژیی ئێمە لە حەقیقەتی سایکۆلۆژیی ڕۆمانی کۆن ئاڵۆزترە ئەمڕۆ چیدی ناتوانین بە ئاسانی مۆر لە کەسێتییەك بدەین چونکە بەرامبەر بە ئاڵۆزییەکی فرەی کەسێتیەك هەین. بۆیە دەبێ سەرنجی ئەو گۆڕانکاریانە بدەین کە لەو کەسێتیەدا پەیدا دەبن.

- سەرەتاش دەبێ بتوانین ئەو کەسێتیە لەو فرە زاراوەیە جیا بکەینەوە کە تەقلیدی ڕۆمانی سایکۆلۆژی هێناویەتیە ئاراوە.

* لەم بارەدا چ شتێك دەخەنە بری ئەو لە دەرەوە ڕوانینەی سایکۆلۆژیای فرۆیدی تا زیانەکانی ئەو شی‌کردنەوەیە لە ئەدەبیاتدا بخەیتە بەر ڕەخنەو لە هەمان کاتدا ڕەهەندێکی قوڵتر بە کەسێتی‌یەکانی ڕۆمانەکانتان ببەخشن؟

- من وام پێ باشترە پتر سەبارەت بە ((بەر لە هوشیاری Pre – Conscient))بدوێم وەك لە ((نەست – IncosCient)) واتە لەو ((من))ە بدوێم کە هەم لە نەزمی لۆژیکێکی هوشیاری هەڵدێ‌و هەم لە وەسفی سیستماتیکی نەست. لێرەدا کە ((من))ی فرە ڕەهەند و فرە شێوە دێتە ئاراوە کە هەوڵ دەدەم هێدی هێدی وەچنگی بهێنم. ڕێك وەکو ئەو فیلمەی کە لە دوورەوە بە هێواشی سەیری دەکەیت. تەماشای ئەو شتانە دەکەم کە بەسەر ئەو کەسێتیەدا تێدەپەڕێ‌و بە بێ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە مۆرێکی سایکۆلۆژیانەی وەکو گرێی ئۆدیپ‌و شتی تر لێ بدەم لە گۆڕانکاری‌یەکانی دەڕوانم.

* باسی (فیلم)تان کرد. حەز دەکەم ڕاتان سەبارەت بە سینەمای سەدەی بیستەم بزانم، ئایا سینەماکارانێك هەن خۆشتان بوێن؟

- من سینەما بە هونەرێکی مەزن دەزانم، هەروەکو مۆسیقا.. یان شێوەکاری بەڵام ئێستا لەبەر پیری کەمتر بۆ سینەما دەچم، سەروەختێك فیلمی زۆرم دەبینی

((فیللینی))م زۆر خۆش دەوێو بە ڕای من لە کاری خۆیدا مامۆستایەکی ڕاستەقینەیە ((هەشتو نیو))ەکەی فیللینی فیلمێکی گەورەیە.

*** ڕاتان بەرامبەر سینەماکارانی فەرەنسایی چییە؟**

– بێگومان منیش وەك هەمووان هونەرمەندە کلاسیکییەکانیان دەناسم: ڕێنوار، کارنە، دۆفیڤی.. شەپۆلی نوێش گەلێ سەرنج ڕاکێشە، بەتایبەتیش فیلمە سەرەتاییەکانی گۆدار وەکو ((هەناسە سوار)).

**ئایا هیچ کاتێ ڕوویداوە پەیوەندییەك لە نێوان نوسینەکانتانو سینەمادا درووست بکەن؟**

– هیچ کاتێ ئەوە ڕووی نەداوە، من لە نێوان هونەرە جۆراوجۆرەکاندا بەراورد ناکەم.

*** لە ژیانی ئەدەبیتاندا کام نووسەرانە زیاتر جێی بایەختان بوون؟**

– یەکەمین کاری ئەدەبی کە کاریگەری لەسەرم هەبوو نووسینی پرۆست بوو. ساڵی ١٩٢٤ خوێندنەوەی ((لای ماڵی سوان)) (کە بەشی یەکەمی ڕۆمانی ((گەڕان بە دوا زەمەنی وونبودا)) یە – و –)ی پرۆست مەیلی نوسینی تیا ووروژاندم دواتر (ئۆلیس)ی جۆیسو پاش ئەویش (خانم دالاوای)ی ڤیرجینیا وولف– م خوێندەوە، ئەمانە لە پەروەردەکردنی قەڵەمی مندا ڕۆڵێکی زۆریان هەبووە.

*** ئایا ناوبانگی جیهانی ئێوە گۆڕانێکی لە چەمکی (بەرپرسیارێتی نوسەر)دا هێناوەتە ئاراوە؟**

– بەلای منەوە شتێك نییە ناوی (بەرپرسیارێتی نوسەر) بێت من گرنگی بە بەناوبانگیش نادەمو هەر بۆیە لەسەر نوسینی ئەوەی کە دەتوانمو ئەوەی بەلامەوە سەرنج ڕاکێشە بەردەوام دەبم. دەزانیت، من ماوەیەکی زۆری ژیانم بە بێ ناوبانگ بەسەر بردووەو ژیانیشم نەگۆڕاوە، یەکەمین کتێبم ((هەڵچوونەکان)) زۆر بێ دەربەستانە تێپەڕی. تەنها یەك وتاری ستایش ئامێز نەبێ کە لەگەزەتە دۆلیژ (Gazeete De Lieje) لەسەری نوسرا. تەنانەت (وێنەی نەناسێك) کە پێگیری سارتەری لەگەڵدا بوو، هەر خۆیشی پێشەکییەکی بۆ نوسی، کەچی دەزگای گالیمار بۆی چاپ نەکردم، بارەکەم بەم جۆرە بوو. ئەم کتێبەم لەلایەن لاوێکەوە کە ناوی ڕۆبر مارن (Marin) بوو بڵاوکرایەوە، بەڵام تەنها چوارسەد دانەی لێ فرۆشراو لە کاتی بڵاوکردنەوەیدا بە تەنها وتارێکی لەسەر نووسرا، ئەویش کەسێك نووسی کە ناوی ئێرڤل (Ervel) بوو لە هەمان دەزگای روبر مارن‌دا کاری دەکرد. دوای ئەو هەموو شکستە ئیدی چی لە ناوبانگ بکەم. من لەسەر ئەو کارەی خۆم بەردەوامم کە دەبێ بیکەم.

*** ئایا لەو بڕوایەدایت کە ئەمڕۆ نوسەر دەتوانێ هەمان ئە دەورە ببینێ لە کۆمەڵگادا کە سارتەرو کامۆو مالرۆ لە کاتی خۆیدا دەمیان بینی؟**

– من هەرگیز هەواداری ئەدەبیاتی سیاسی نەبووم. بە بڕوای من ئەدەب هونەرێکە وەکو هونەرەکانی دیو هیچ پەیوەندییەکی بە کێشە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانەوە نییەو دەشێ ئەو کێشانە لە شوێنێکی تردا خۆ لە قەرەدانیان زۆر سوودمەند بێ، تاقە ئیلتیزامی من نوسینە.

*** لە حاڵی حازردا چ بەرنامەیەکتان هەیە؟ ئایا کتێبی تازەتان بەدەستەوەیە؟**

– لەسەر نوسین بەردەوام دەبم، کتێبێکم بە دەستەوەیە کە لە کۆمەڵێك پەرەگرافی کورت پێکهاتووە، نازانم کەی تەواو دەبێ.

بەڵام بۆ ئەوەی وەکو کتێبێك چاپ بکرێ، لاپەڕەکانی زۆرن، ئەم کتێبەم لەسەر هەمان شێوازی (هەڵچوونەکان) یان بەکارهێنانی زمان (Lusage de Laparole)ە.

*** وەختێ چاو بە کارو ژیانی خۆتاندا دەخشێننەوە چ هەستێکتان لا دروست دەبێ؟ لەو بڕوایەدایت کە هەندێ شت هەبوون دەبوایە بتبینیایە؟ یان هەندێ کار دەبوایە ئەنجامت بدانایەو دەرفەتی ئەنجامدانیانت نەبوو؟**

– من ئەوەندە تەماشای خۆم ناکەم، تا پێم بکرێ کەمتر دەڕوانمە کارەکانی ڕابردووم من هیچ کاتێك چاوم بە کارەکانما نەخشاندۆتەوە بە تەنها سەرگەرمی ئەو شتانە دەبم کە ئێستاو لە ساتی ئێستادا سەرنجم ڕادەکێشن. نامەوێ چاو بە کارەکانمدا بخشێنمەوە چونکە بەلامەوە بۆ کاری ئەمڕۆم زیان بەخشە.

**● ئایا نوسین بەلاتانەوە مانایەکی تایبەتی هەیە؟**

– نوسین پیشاندەری ژیانە، وەك چۆن هەمیشە ئەو کارەی ئەنجام دراوە.

# ڕۆمانی نوێو ئەدەبیاتی ئەمڕۆی خۆرئاوا

## ■ گفتوگۆیەك لەگەڵ ئالان ڕۆب گرێدا

● و: سەردەم

* ئێوە لەساڵی ١٩٢٢دا لە برست لەدایك بوون. منداڵیتان چۆن گوزەراندووە؟

– لەبرست هاتمە دونیاوە. شەش مانگ لەبروتاین دەمامەوە، شەش مانگی دیکەش لەپاریس، لەئاپارتمانێکی سادەو ئاسایی‌دا لە گەڕەکی ١٤دا دەژیاین. چونکە باوکم لەپاریس کاری دەکرد، من هەرگیز ساڵێکی تەواو لەبرست نەماومەتەوە، تەنها لەکاتی جەنگدا نەبێت.

خانووەکەمان لەبرست خانوویەکی ئێلاخی بوو. ئەوێ دەڤەرێکی سەربازی بوو، کەس مافی نەبوو خانووی تیا درووستبکات، هەر بۆیە بەتەنها چەند خانوویەکی بچکۆلەی تیابوو. بەرامبەر خانووەکەمان گۆڕەپانی مەشقەکە بوو کە شوورای نەبوو، لە دەشتێك دەچوو، لەودیو ئەویشەوە دەریا دەبینرا.

* ئایا هیچ یادەوەرییەکتان دەربارەی ئەو ڕۆژانە هەیە، ڕۆژانی جەنگی جیهانی‌ی دووەم، دایكو باوکتان‌و پەیوەندییەکانیان؟

– بێگومان، من لەساڵی ١٩٤٢دا تەمەنم بیست ساڵان بوو. باوكو دایکم لەراستە توندڕەوەکان بوون‌و وەکو تەواوی فەرەنساییەکان لایەنگیری پیتان* بوون. بەجۆرێك لەجۆران مەیلی فاشیستیشیان تیابوو. تێکشکانی سوپای فەرەنسا بۆ ئەوان کارەساتێکی بەئازار بوو. دەزانیت کە سوپای فەرەنسا بەتەواوەتی بەرامبەر سوپای ئەڵمان تێکشکاو لەناوچوو، باوکم‌و دایکم ستایشی ئەڵمانیان دەکرد، من خۆشم هەر مەیلم بەلای ئەڵماندا هەبوو. هەر بۆیە جەنگی جیهانیم باش لەیادە، هەروەها هاتنی ئەڵمانییەکانیش. بێگومان دێتەوە یادت کە من لەبەشێکی کتێبی (ناوەوەی توناوتونەکە)دا باسی ماتۆڕێك دەکەم کە دوو سەربازی ئەڵمانی‌ی لەسەرە. ئەمانە یەکەمین ئەڵمانی بوون کە من بینیمن.

* ئێوە لایەنگری ئەڵمانیەکان نەبوون..

– بۆ .. بۆ نا.. بیروباوەڕی من بیروباوەڕی باوكو دایکم بوو.. ئەوەشت لە بیر نەچێت کە بەشێکی زۆری بروتاین لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیزدا بوو، خەڵکی بروتاینیش ئینگلیزیان بەدوژمنی راستەقینەی خۆیان دەزانی. دوای شکستی فەرەنساش ئەم بارە خراپتر بوو. چونکە گروپێك لەئینگلیزەکان کارایانە لەجەنگدا بەشدارییان کردو دواتریش گروپێکی دی چوونە ناو شەڕەکەوەو لە (میرسیل کبیر)دا بەتەواوەتی هێزی دەریایی فەرەنسایان تێکشکاند.



لەم شەڕانەدا نزیکەی دوو هەزار کەس کوژران، ئەمەش تاوانێك بوو کە خەڵکی برۆتاین هەرگیز لێی خۆش نابن. لەسەرێکی ترەوە باوکو دایکی من گیانێکی تەواو ئەورووپاییان هەبوو، هەروەها خۆشم زۆر ئەورووپاییانە بیرم دەکردەوە. ئەوان بڕوایان وابوو کە ئەگەر فەرەنساو ئەڵمانیا ببن بەیەك ئەو دەمە باری ئەورووپا باشتر دەبێ.

* ئەمە بۆچوونی بیسمارکیش بوو.

– بەڵێ. هەروەها باوکمو دایکم لەو باوەڕەدا بوون کە ئەو جەنگە تەواو بێهودەیە. مەسەلەکە ئەوە بوو کە ئێمە چونکە نەمانتوانی لەگەڵ ئەڵمانیادا یەك بگرین، هەر بۆیە ناچار بووین وەکو دۆڕاوێك لەگەڵیا ببین بەیەك. دوو بۆچوون لەئارادا بوو: جەنگ دژ بەبەریتانیاو دژایەتیی کۆمۆنیزم، کە هەردووکیان بەدوو فاکتەری بزوێنی گرنگ بۆ باڵی راستیی فەرەنسا دەژمێردران.. بێگومان ئەبێ ئەوەش روون بێ لاتان کە ئێمە هیچ مەیلێکمان بەلای هیتلەردا نەبوو. ئەو بەئاشکرا شێتێکی پەتی بوو. بەڵام مەیلمان بەلای مۆسۆلینیو فرانکۆدا هەبوو. واتە بەلای ئەو کەسانەدا کە بەدیکتاتۆری ئارام لەقەڵەم دەدران و لەخۆبوردوویيان زیاتر بوو، واتە جۆرە گیانێکی باوکانەیان هەبوو. فرانکۆش وەکو پیتان باوکێکی چاکەکار بوو، لەکاتێکا هیتلەر بەئاشکرا کەسێتیەکی خوێنمژ بوو. ناسیونالیستێکی شێت بوو وەك سەدام حسێن.

* ئایا ئەو رۆژانە هیچ ئیلتیزامێکی سیاسیتان هەبوو؟

– نەخێر، تەنها جۆرە باوەڕێکی سیاسی بوو. کاتێ فەرەنساش لەژێر زەبری نازیزم ئازاد بوو ئێمە زیاتر حەقیقەتی رژێمی نازیمان بۆ دەرکەوت. منیش وەکو تەواوی ئەو لاوانەی کە لەساڵی ١٩٢٢دا لەدایك بوون دوورخرامەوە، بەڵام نەك بۆ ئۆردوگاکانی مەرگ، بەڵکو بۆ کاری بێگار، بەم پێیە ساڵو نیوێکم لەئەڵمانیادا بەسەربرد کە هێشتا لەحاڵەتی جەنگدا بوو.

ئەڵمانیا وڵاتێك بوو بەرواڵەت پاكو هێمن، تەواوی راگەیاندنی ئەڵمانیا بریتی بوو لە بایەخدان بەکار، خێزان، منداڵی بچووکی قژ زەرد کە سروودیان دەخوێندو ئەو کرێکارانەی کە بێڵیان بەسەر شانەوە بوو.

ئەم راگەیاندنە لەراستیدا پەیوەست بوو بەحەقیقەتی رژێمەوە. بەڵام ئەو شێتیەی بەسەر رژێمی ئەڵمانیادا زاڵ بوو بەرواڵەتیەوە نەدەبینرا، رواڵەتی رژێم ئارامو دڵنیایی بەخش بو، ئەوەی بەڕووکەش نەدەبینرا ئەو (رژێمە پۆلیسی)یە بوو. رژێمی هیتلەر لە (رژێمێکی پێشڕەوان – گلانعی) دەچوو کەتیایدا چالاکیی لاوان رووکەشێکی ئارامو ئاسوودەی هەبوو. لەکاتێکا دەبینرا کە لەشوورەوەی پۆلیس چی دەکات. بەڵام لەوێ نەو، لەئەڵمانیا زۆر بەوردی حسابی هەموو شتێکیان کردبوو.

* بەڵام لەدەمەی سیدا بەئاشکرا بینرا کە پۆلیسی ئەڵمانیا چیی کرد..

– بەڵێ لەسەرەتادا وابوو. واتە وەختێ هیتلەر دەسەڵاتی گرتە دەست بەئاشکرا هەست بەتوندوتیژی دەکرا. بەڵام لەکۆتایی سییەکاندا بەتەواوی ئارامی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو. میللەتی ئەڵمانی بەدڵ ناسیونال سۆسیالیست بوون. رژێمی ئەڵمانی رژێمێکی سۆسیالیس تی بوو، چونکە خاوەنی پێشکەوتووترین جۆری ئەمنیەتی کۆمەڵایەتی بوو. هیچ نیشانەیەکی بێکاریو هەڵاوسان لەئارادا نەبوو، باری ئابووریی ئەڵمانیا باش بوو. هەر بۆیە جێی سەرسوڕمان نەبوو کە ئەڵمانیەکانی دی، بۆ نموونە ئەڵمانیە نەمساویەکان حەزیان دەکرد بچنەوە ناو ئەڵمانیا، ئەو ئەڵمانیایەی کە لەوپەڕی سەرکەوتندا بوو.

* لەکەلتووری ئەڵمانیدا چ شتێك ئێوەی بەلای خۆیدا رادەکێشا، لایەنە یۆتۆپیاییەکەی؟

– ئەوەی منی بەلای ئەڵمانیادا رادەکێشا کەلتووری ئەڵمانی بوو، واتە ئەو ئەڵمانیایەی کە گۆتەو کافکاو مۆسێلی لەدامێنی خۆیدا پەروەردە کردووە، واتە ئەدەبیاتو فەلسەفەو هەروەها مۆسیقای ئەڵمانیش. من عەودالی ڤاگنەرم، هەڵبەت خۆی نالێم، بەڵکو مۆسیقاکەی. بەشێکی سەرەکی لەدونیا مۆسیقیەکەی من لەمۆسیقای ئەڵمانی پێکهاتووە.. بتهۆڤن، باخ، ڤاگنەر، مۆللەر، شوینبێرگ.. بەڵام خاڵێکی تریش هەیە: من لەمناڵیما لایەنگری حکومەتێك بووم لەسەر بناغەی سیستەم دامەزرابێ، ئەمەش لەکۆماری سێیەمی فەرەنسیدا بەدی نەدەکرا، رژێمێکی کۆڵەوار بوو. واتە سیستەمێکی بەسەر کۆمەڵگادا نەسەپاند. مانگرتن، پارتە کۆمۆنیستەکان، هەموو ئەمانە دەبوونە مایەی ترسو دڵەڕاوکێی لایەنگرانی بوونی ئەو سیستەمە. ئەسڵەن شتێك لەئارادا نەبوو ناوی دەوڵەت بێ، ئەوەی هەبوو گۆڕانی بەردەوامی دەوڵەت بوو کە لەڕێی رووداوە دروستکراوە سیاسییەکانەوە ئەنجام ئەدرا.

باشە، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە کە بۆچی فەرەنساییەکان لایەنگری پیتان بوون؟ چونکە پیتان لەهەموو کەسێکی دی پتر کۆماریخواز بوو، ئێستا دەڵێن پیتان وایکردو ئەوەی کرد، ستەمی کرد، دەنگی خەڵکی خەفە کرد، بەڵێ، کەس نکوولی لەمە ناکات. بەڵام پیتان بەڕازیبوونی خودی خۆیان دەنگی میللەتی فەرەنسای خەفە کرد. ئەنجومەن بوو کە جڵەوی دەوڵەتی فەرەنسای دایە دەست پیتان. دەوڵەتی پیتان دەوڵەتێکی قانوونی بوو. نوێنەرانی ئەنجوومەن دەسەڵاتیان دایە دەست پیتانو میللەتی فەرەنساش ئەم کارەی قبوولکردو پشتگیری لێ کرد، لەسەدا هەشتاو پێنجی خەڵکی فەرەنسا لایەنگری پیتان بوون. کۆماریی سێیەمی فەرەنسا لەدوا دواییدا بارێکی زۆر ریسوابوونەی بەخۆوە دی، دوچاری خراپترین جۆری شکست بوو. ئەو سوپایەی کە فەرەنساش بۆ جەنگ ئامادەی کردبوو، هەمان کۆماری بەفەوتیدا. فەرەنسا کەوتبووە تەنگانەوەو بەهۆی ئەو پەیمانەوەی کە بەستبووی هیچ چارێکی نەبوو جگە لەوەی کە لە جەنگدا بەرگریی لەپۆڵەنداو ناوچەکانی دی بکات. بەڵام بەچ هێزێکەوە؟ فەرەنسا هێزێکی ئاسمانی تەواو پەرتو لێکترازاوی هەبوو.

پاشان فەرەنسایان ناچار کرد لەمیونیخ دابنیشێتو رێکەوتنی خۆ بەدەستەوەدان ئیمزا بکات. لەراستیدا هەروەکو لیون بلوم دەیوت: ئەڵمانیەکانی باشووری خۆرهەڵات ئەڵمانین، ئەوانە گەر بیانەوێ بەناوی مافی مرۆڤەوە خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن، تەواو مافی خۆیانە بچنە سەر ئەڵمانیا. دواتریش پەیمانی ڤێرسای کە هەڵەیەکی گەورە بوو و تائێستاش شایەتی دەرئەنجامە زیانەندەکانین. ئامانج لەمەش ئەوە بوو کە ئەڵمانیای شکست خواردوو پارچە پارچە بکەن، کە بەجۆرە سووکایەتی پێکردنێك دەژمێردرا. هیتلەر بەرەنجامێکی پەیمانی ڤێرسای بوو، لەبەر ئەوەی هاوپەیمانانی ڤێرسای مەبەستیان ملکەچیو زەلیلیی ئەڵمانیا بوو. بەرامبەر بەمە دیار بوو کە کەسێتییەکی وەها دێتە ئاراوە.

* ئایا پەرۆشیتان بۆ سیستەم لەو قۆناغەدا پەیوەندیی بەپەرۆشیتانەوە بۆ زانست نییە؟

– لەراستیدا نازانم. چونکە من تائێستاش پەرۆشیم بۆ زانست هەیە، بەڵام بۆ سیستەم کەمتر.

* هەر لەبەر ئەمە من لەم بارەیەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەم کە ئێوە دواتر بوون بەکەسێکی یاخی، هەم لەرۆماننووسیو هەم لە هەڵوێستی کۆمەڵایەتیتاندا.

– من پاش کەوتنی رایشی سێیەم پەیم بەوە برد کە سیستم مەترسی‌یە، شێتی‌یەکی ترسناکە، هەموو وایاندەزانی کە ئۆردوگاکانی مەرگ ئۆردوگای کارن. کەس بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەو ئۆردوگایانە لەراستیدا ئۆردوگای مەرگن‌و، ئەڵمانیەکان یان لەم مەسەلەیە بێ ئاگا بوون، یاخود خۆیان لێ گێل دەکرد. هەڵبەت لەلایەکی تریشەوە ئەبێ ئەوە بڵێین کە هەرگیز لە ئەڵمانیادا (ژووری گاز) نەبووە بەڵکو تەنها لە پۆڵەندا (ژووری گاز) هەبووە.

* بەڵام هەمان زام بوو کە ئێوەی بۆ نووسین هاندا. بیر لەو دێڕەی ئادۆرنۆ دەکەمەوە کە وتبووی (دوای شڤایتس هەر هەوڵێك بۆ نووسینی چیرۆك یاشیعر کارێکی تەواو بێهودەیە).

– ڤالیری وتوویەتی: (دوو مەترسی هەڕەشە لەدونیا دەکات: سیستم‌و بێ سیستمی) تەواوی رۆمانەکانی منیش ئەمە دەخەنە روو: شەڕی نێوان سیستم‌و بێ سیستمی. جێی سەرنجە کە کلۆد سیمۆنیش لەیەکێك لەرۆمانەکانیدا ئەم دێڕەی ڤالیری تەوزیف کردووە. هەر بۆ نموونەش یەکێك لەئەدگارەکانی رۆمانی (غیرە) بوونی ئەقلیەتێکی کۆلۆنیالە کە هەوڵەدات سیستم بسەپێنێ. لەراستیدا ئەو جۆرە شێتیەکی هەیە، چونکە دارمۆزەکانی دەژمێرێ، لەکاتێکا کەسێك کە مۆز دەروێنێ هەرگیز دار مۆزەکانی خۆی ناژمێرێ. لەزەینی ئەم چیرۆکبێژە نائامادەیەدا جۆرە (عوساب)ێکی سیستم هەیەو هەرچی لەدەورو بەریشیدا هەیە بریتی‌یە لەبێ سیستمی، واتە رەشپێستەکان، سروشتی ئیستیوایی، هاوسەرەکەی، هەموو ئەمانە لەروانگەی ئەودا بێ سیستمی پێکدەهێنن. من بۆ خۆم بڕوام وایە کە لەهەموو رۆمانەکانمدا ئەم مەسەلەیە هەیە: شەڕ لەناو دەقدا، واتە شەڕی دەق لەگەڵ خودی دەق خۆیدا.

* هەر لەبەر ئەمە دەتوانین بڵێین کە ئێوە رۆماننوسێکی هیگڵین؟

– بێگومان ، تەواو وایە.

– ئایا زۆر لەژێر کاریگەریی فەلسەفەدا بوون؟

– من لەرێی سارتەرەوە فەلسەفەی ئەڵمانیم ناسی. سارتەر فەیلەسوفێکی گەورە نەبوو. ئەو بانگەشەدەرێکی گەورە بوو. لەو دەمەدا لەڕێی ئەوەوە بوو کە دەکرا سێ (ھ) H بناسیت: هیگل، هۆسێرل، هایدگەر. سارتەر کۆمەڵێك وتاری کورتی هەیە کە دەربارەی هۆسێرل بۆ خەڵکی سادەی نووسیوەو لەبەشی یەکەمی هەڵوێستەکان (situations)دا بڵاوی کردۆتەوە. من لێرەوە دەستم پێکردو ئینجا بەرەو کارە فەلسەفیە گرنگەکان چووم.

* ئایا سەرەتا بەفەلسەفە دەستتان پێکردو پاشان بەئەدەب، یان بەپێچەوانەوە، یاخود هەردووکیان پێکەوەو هاوکات لەگەڵ یەکدا؟

– من ئەدەب‌و فەلسەفەم هاوکات لەگەڵ یەکدا دەخوێندەوە. لەو بڕوایەدا بووم کە هەردووکیان دەربارەی شتێك ئەدوێن‌و لەخاڵێکیشدا بەیەك دەگەن. دواجاریش من بۆچی دەستم بەنووسینی رۆمان کرد؟ بۆ ئەوەی هەوڵبدەم تاوەڵامی ئەم پرسیارە بێ وەڵامە بدەمەوە کە من چیم‌و لێرەدا چی دەکەم؟ ئەمەش پرسیاری سەرەکیی میتافیزیکاو ئەنتۆلۆژیا (بوونناسی – وجودناسی)ە. کە: من چیم‌و لەجیهاندا چی دەکەم؟

کاتێ کەوا تەسەور دەکرا تێگەیشتن لەرۆمانەکانی من سەختە، هۆیەکەی ئەوە بوو کە لەسەرەتادا من نووسەرێکی مۆدی رۆژگار بووم. خوێنەرم نەبوو، ئەوەش شتێك بوو مایەی بڕواپێکردن نەبوو. گەلێ وتاریان دەربارەی من دەنووسی بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە من شێتم‌و کارەکانم شایانی خوێندنەوەنین. شتێکی بەڵگە نەویستیشە کە کەسانێکی وەکو رۆلان بارت‌و ژێنێت‌و بلانشۆش هەبوون کە لەم رووەوە وتاری سەرنجڕاکێشیان دەنووسی، بەڵام وتارەکانیان لەو گۆڤارانەدا بڵاودەبوەوە کە کەمترین کاریگەرییان لەسەر خەڵکە زۆرینەکە نەبوو.

هەفتەنامەکانن کە خوێنەر بۆ نووسەر کۆدەکەنەوە. تەواوی ئەو وتارانەی کە دەربارەی من نووسییان بەرادەیەك سەلبی بوون وەختێ رۆمانی (غیرە)م چاپ کرا کەسێیەمین رۆمانی من بوو هیچی وای لێ نەفرۆشرا. لەگەڵ ئەوەشدا کەتەواو ناوی دایەوە؛ کەچی لەساڵێکدا تەنها سێ سەدو پەنجا دانەی لێ فرۆشرا. لەکاتێکا کە ئێستا هەمان کتێب لەساڵێکدا پێنج هەزار دانەی لێ دەفرۆشرێ.

خوێنەران پاشان تێگەیشتن کە ئەم ڕۆمانە چییە، واتە کاتێ کە مۆدی نەمابوو. من ئێستا دەتوانم هەر بەتەنها لەڕێی نووسینەوە بژیم، بەڵام نووسەری مۆدی ڕۆژ نیم.

* لەڕاستیدا بەر لەوەی ئەو تێڕوانینە. لای خوێنەران دروست ببێ، لەنێوان ڕۆشنبیران خۆیاندا شەپۆلێك پەیدا ببوو و ڕۆمانی نوێ ببوە مۆدێك، ئایا وانییە؟

– ژان کۆکتۆ وتوویەتی کە پێویستە لەچنگی ئەو شەپۆلانە خۆمان ڕزگار بکەین‌و پاش خاوبوونەوەی شەپۆلەکان بەردەوام بین. ڕۆمانی نوێش بەم جۆرە مایەوە. نووسەرانی ڕۆمانی نوێش بەهەمان شێوە، بۆ نموونە مارگرێت دۆراس لەو نووسەرانە بوو کە نووسینەکانی قورس بوون. بەڵام ئێستا ڕۆمانەکانی ئەو لەلیستی ئەو کتێبانەدان کە زۆر دەفرۆشرێن.

* لەوانەیە هەر ئەو تێگەیشتنە هەڵانەش سەبارەت بەڕۆمانی نوێ وای لەئێوە کردبێت ناچار بن وتاری ڕەخنەیی دەربارەی ڕۆمانی نوێ بنووسن؟

– بەڵێ، ئەو وتارە ڕەخنەییانەی لەم بارەیەوە نووسیمن زۆر سادە بوون، چونکە لایەنێکی پروپاگەندانەی بەخۆوە گرت‌و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەدحاڵیبوونی زیاتر. بۆ نموونە خۆم زیاتر بایەخم بەڕۆمانەکانم ئەداو زۆر گرنگیم بەو نووسینە تیۆریانە نەئەدا کە نووسیبوومن.

بەڕای من تیۆرەی ئەدەبی، وەکو هەر زانستێکی دیکە بەجۆرە چوارچێوەیەکی تیۆریی لەقەڵەم ئەدرێ، یان جۆرێك لەگەڕان‌و پشکنین یان هزرێکی ئەبستراکت. بەڵام ناتوانێ تەواو حەقیقەتی ئەدەبمان پێ بڵێت. تیۆرەی ئەدەب لەخودی ئەدەب خۆیدایە. بۆ نموونە لەنێو کتێبەکانمدا کتێبی (دەربارەی ڕۆمانی نوێ) لەوڵاتەکانی خۆرئاوادا زۆرترین فرۆشتی هەبووە. بەڵام ئەو بەدحاڵیبوونەی لەئەنجامی نووسینەکانی ئەوانی ترەوە دروستبووە، زۆر زیانمەندتر بووە. بۆ نموونە مەسەلەی بەرچاوی (عەینیەت)، من هەر لەسەرەتاوە هەر لەساڵانی دەهەی ١٩٥٠ەوە ناتەبایی خۆم لەگەڵ عەینیەتدا ڕاگەیاندووە. من بەهیچ جۆرێك نامەوێ ـەینیەتگەرابم‌و ئەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە ـمانی نوێ بەتەنها خوازیاری بەر زەینی (زەینیەت)ە. لەریالیزمدا تەواوی چەمك‌و ماناكان تەباو یەكپارچەن: دونیا ڕێكەو، چیرۆكبێژ دەسەڵاتداری ڕەهایەو، لەئەنجامدا ئەبێتە مایەی متمانەی ڕەهای خوێنەر. بۆ نموونە وەكو بالزاك كە لە كارەكانیدا هەمان دڵنیایی‌و متمانە دەهێنێتە بەرهەم. واتە كە چیرۆكێكی دەخوێنیتەوە باوەڕی پێ دەكەیت. بەڵام لە (بێگانە)ی ئەلبێر كامۆدا ئەو متمانەیە نابینینەوە. یەكێك لەو شتانەی كە هەر لەسەرەتاوە خوێندنەوەی كاری نووسەرانی ڕۆمانی نوێ قورس دەكات ئەوەیە كە دەق بەردەوام وەكو تەڵەیەك خۆی دەخاتە ڕوو، واتە خوێنەر ناتوانێ باوەڕ بەو دەقە بكات كە دەیخوێنێتەوە. هەندێ شت ئاشكرا دەبێ‌و پاشان هەرچی شتە ئاشكرا كراوەكانە دەچنەوە ژێر پەردەی نهێنی‌و لەبەرچاو ون دەبن..

بەڵام سەبارەت بەریالیزم، ریالیزم ئایدیۆلۆژیای زانینی تەواوی ماناكانە، واتە لای ئەوان دونیا تەواو مانای هەیەو ریالیزم بریتییە لەسەر لەنوێ دۆزینەوەی ئەو مانایەو وەسفكردنی، بەڵام شتێكی بەڵگەنەویستە كە حەقیقەتگەرایی (یان ئەوەی پێی دەڵێن ریالیزم) شتێك‌و حەقیقەت شتێكی تری تەواو جیاوازو ریالیزم هیچ پەیوەندییەكی بەحەقیقەتەوە نییە. بۆ نموونە یەكێك لە تایبەتمەندێتییەكانی ڕۆمانەكانی بالزاك كاراكتەرە، واتە كەسێتیی چیرۆك. ئەم (كەسێتی)یە بەبەشێك لەریالیزمەكەی بالزاك لەقەڵەم ئەدرێ، واتە دیاردەیەكی تەباو یەكپارچەیەو دەتوانین بەتەواوی وەسفی ئەدگارەكانی بكەین. بەڵام ئەم كەسێتییە حەقیقی نییە. واتە لەواقیعدا بوونی نییە. دەتوانین بڵێین كە حەقیقەت لەسیستمی دەروونشیكارانەی جیهانەوە نزیكترە. بۆ نموونە وەختێ لەڕۆمانێكدا ناكۆكیی (كانت) یانە دەبیننەوە دەڵێن ئەمە ڕۆمانێكی ریالیستی نییە. ئەگەر وابێ، كەواتە دونیاش دیاردەیەكی ریالیستیانە نییە چونكە پڕە لە ناكۆكی، ناكۆكیی بێ كۆتایی، سەیرە كە سەدو پەنجا ساڵ پاش هیگل هێشتا هەر ئایدیۆلۆژیای ریالیستی باڵادەستە... فلۆبێر ریالیست بوو چونكە وەكو من لەبایەخدان بەوردو درشت‌و وردبینی لەوەسفدا زۆر ڕارابوو. بەڵام ئەمە هیچی ریالیستی نییە. لەچیرۆكەكانی فلۆبێردا كۆمەڵێك كەلێن هەیەو ئەمەش شتێكە لەگەڵ ریالیزمدا ناگونجێ. چونكە لەریالیزمدا زینگەی چیرۆككە ئەبێ یەكپارچەبێت. فلۆبێر چەند جارێك لەیادەوەری

نامەکانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە چ پەیوەندییەکی نادیار لەنێوان نووسینی چیرۆك‌و ریالیزمدا هەیە. فلۆبیر لەنامەیەکدا بۆ لویز کولە دەڵێ خاوەن دەزگایەکی بڵاوکردنەوە وتوویەتی دەیەوێ رۆمانی (مادام بۆڤاری) بەوێنەوە بڵاویکاتەوەو داوای لەم کردووە کە ئایا رێی پێ ئەدا بەو شێوەیە رۆمانەکەی لەچاپ بدات؟ ئەم پێشنیازە دوای دادگایی کردنەکەی فلۆبیر بوو، واتە کاتێ کە فلۆبیر بەوە پای نابێت. ئەو دەڵێ کە ئەو پیاوە دەیەوێ ئەو شتانەی من ئاشکرا بکات کە تا شاردوومنەتەوە رۆحم داوە؛ بەم پێیە، لێرەشدا ناکۆکیی پیشاندان‌و شاردنەوە دەبینینەوە.

رووبەندو هەڵماڵینی رووبەند، هەروەکو هایدگەر دەیوت، ئەمەش حەقیقەتێکە کە وەسفی ئەدەبی ئاشکری ناکات بەڵکو دەیشارێتەوە. وەسفی ئەدەبیی کڵاوەکەی شارل بۆ ڤاری لە رۆمانەکەی فلۆبیردا تەواو دژە ریالیستی‌یە. سەرەتا هەندێ هێڵ رەسم دەکرێ کە لەوەسفە بالزاکیەکانەوە ئیلهامی وەرگرتووە. کۆمەڵێك وەسفی گشتی بەبەکارهێنانی سیفاتی پڕ مانا. فلۆبیر بەجۆرە ورددی‌و دڕدۆنگیەکی شێتانەوە دەست بەوەسفی کڵاوەکە دەکات‌و بەم کارە بیرۆکەی کڵاوەکە بەرادەیەك تەشەنە دەکات کە دواجار تەواوی کەشو هەوای چیرۆکەکە داگیر دەکات. چیرۆکبێژ هەر لەبەر ئەم هۆیە لەچیرۆکەکەدا مانا پەیدا دەکات‌و ئەمەش خاڵێکە کە رەخنەنووسانی رۆمانی نوێ بایەخیان پێ نەداوەو مامەڵەیەکی جیدییان لەگەڵ ئەدەبدا نەبووە. بۆ نموونە دەڵێن کە ئێمە سەرەتا عەینیەتگەرا بووین‌و ئێستا بووین بەزیهنیەتگەرا، لەکاتێکا سی چل ساڵ ئەبێ کە من بەتەنها بایەخم بەزیهنیەت داوەو بەئاشکراش ئەوەم دەربڕیوە. ئەم بەدحاڵیبوونە زیاتر لەململانێی بەردەوامی ناو دەقەوە سەرچاوە دەگرێ. بەئاشکرا زیهنیەتگەرایی لەرۆمانی (غیرە) یان تەنانەت (نیگادن)دا دەبینرێ. بەڵام لەهەمان کاتدا، لەهەردوو رۆمانەکەدا زەین (زیهن) عەینەتگەراشە، واتە پشت بەشتەکان دەبەستێت. رەخنەنووسە فەرەنساییەکان دەربارەی دیاردەناسی (فینۆمینۆلۆژیا) ئەدوان بەڵام ئەوان بەهەڵە لەدیاردەناسی گەیشتبوون. لای ئەوان دیارە شتێکی سەربەخۆیە کە لەدەرەوەی بینەرەکەشیدا بوونی هەیە. لەکاتێکدا هۆسێرل بەئاشکرا ئەوەی روون کردۆتەوە کە دیاردەناسی بریتی‌یە لەمەبەستگەرایی کەسێك کە رەنگدانەوەی خۆی لەشتدا دەبینێتەوە. جووڵەی ویژدان لەفەلسەفەی هۆسێرلدا بریتی‌یە لەجوڵەیەك کە بەشێوەیەکی بەردەوام رەنگدانەوەی خۆی دەسازێنێ‌و جیهان دەخاتە روو. لەکاتێکدا کە جووڵەی ویژدان لەفەلسەفەی (کانت)دا جووڵەیەکە بەرەو ناوەوە. من لەوەسفی چیرۆکانەدا سوودم لەم دیاردەناسی‌یە وەرگرتووە، بەڵام بەمانا هۆسێرلیەکەی نا. واتە دواجار شت ئەبێ بەخەیاڵ، چونکە هەروەکو هۆسێرل دەڵێت، پرۆسەی مەبەستگەرایی لەهەموو بوارە مومکینەکاندا رووئەدات، تەنانەت لەدونیای خەیاڵیشدا.

*** (گۆڵدمان)یش وتارێکی دەربارەی ئێوە نووسیوە کە تیایدا ئاماژە بەم مەسەلەی عەینیەتگەراییە دەکات..**

— گۆڵدمانیش بووە مایەی درووستبوونی بەدحاڵیبوونێکی دی. ئەو تیۆرە زانێکی گەورەی مارکسیستە، بەڵام لەبواری ئەدەبدا خاوەن هەستیاری‌یەکی پێویست نی‌یە. یەکێك دەیگوت کە گۆڵدمان کتێبێکی دەربارەی راسین نووسیوە کە ناوی (خودای پەنهان)ە. لەراستیدا سەیرە کە ئەو ئەسڵەن نەیتوانیوە لەمۆسیقای شیعرەکانی راسین بگات‌و هەستی پێ بکات. ئەوەی راستی بێت گۆڵدمان بەرامبەر بەمۆسیقای شیعری راسین تەواو بێ هەست بووە. بەبڕوای من گۆڵدمان بەزیهنێکی تەواو داخراوەوە مامەڵەی لەگەڵ هەر جۆرە شێوەیەك لەشێوەکانی هونەر کردووە. ئەو هەندێ بابەتی خۆشی دەربارەی من نووسیوە..

*** لەراستیدا، مەسەلەی راستەقینەی ئەو تەنها مەسەلەی ریالیزم بوو نەك شتی تر.**

— بەڵێ زۆر راستە، جگە لەوە ئەو زیاتر لەجاران جەختی لەسەر واقیعیەتی کۆمەڵایەتی دەکرد، بۆ نموونە نووسینەکانی دەربارەی کتێبی (نیگادن) سەیرو سەمەرەیە.

*** بەڵام وابزانم هەر خۆشتان لەشوێنێکدا وتووتانە کە بوونەتە قوربانی جۆرێك لەوەهمی ریالیستی، وانی‌یە؟ بۆنموونە لە (نیگادن)دا.**

— بەڵێ شتێکی لەم جۆرە هەیە.

*** بەڵام ئاسەوارەکانی ئێوە هەرگیز دەربارەی واقیعیەتی رووت نەبوون.**

– نەخێر، بەڵکو سەر لەنوێ خولقاندنەوەی واقعیەتن.

*** لەراستیدا ئێوە حەقیقەتی دەروونشیکاریانەی خۆتان بەرامبەر بەریالیزم وادەنێن.**

– من ریالیزمەکەی خۆم بەرامبەر بەواقعیەت دادەنێم. چونکە لەو باوەڕەدام کە واقعیەت شتێکی سەیرو نەناسراوەو قابیلی پەی پێ بردن نییەو بەردەوام لەگۆڕاندایە. لەکاتێکا کە ریالیزم جۆرێکە لەمیتافیزیکا. لەراستیدا ئەم ریالیزمەیە کە جووڵە بەچیرۆك دەبەخشێت.

*** مادامەکی ئێوە ئاماژەتان بۆ پەیوەندیی رووبەندو هەڵماڵینی رووبەند لای هایدیگەر کرد، من لەو بڕوایەدام کە مەسەلەی حەقیقەت لای نووسەر جێی بایەخە، ئایا نووسەر دەبێ لەودیو واقیعەتەوە بەدوا حەقیقەتدا بگەڕێت؟**

– من بڕوام بەحەقیقەت نییە. واتە لەو باوەڕەدانیم تاقە حەقیقەتێکی پەتیو رەهابوونی هەبێو بەس. من بڕوام بەفرە حەقیقەتی هەیە، ئەو حەقیقەتانەی کە لەگەڵ یەکدا ناتەباو ناکۆکن.

لەراستیدا، لەم دونیایەدا چەمکی حەقیقەت بەکەڵکی هیچ نایەت، تەنها ستەمو چەوساندنەوە نەبێ. بەتەنها شێتترین حکومەتەکانن کە لافی ئەوە لێدەدەن گوایە تەعبیر لەحەقیقەت دەکەن. هایدیگەر باسی حەقیقەتی سروشتی کردووە.

**– سروشتی مرۆیی یان خودی سروشت خۆی؟**

– سروشت خۆیو، تەنانەت سروشتی مرۆییش هەروەکو ئەو وایە. گەر کەسێك بڕوای وابێت کە شتێکی سروشتییە پیاوان بەسەر ئافرەتاندا باڵادەست بنو ئارییەکان حوکمی جووەکان بکەن، ئەوا ئەو کەسە لەدونیای خەیاڵدا دەژیو بەم زووانە لەو دونیا خەیاڵاتییەی قوتاری نابێ.

*** ئایا ئێوە بەهەمان مەبەست لەکتێبی (رەنگدانەوەی ئاوێنە)دا ئافرەت وەکو سیمبوڵێکی سەلبیی هیگلیانە دەخەنە روو؟**

– ئافرەت بەردەوام لەئەدەبیاتی خۆرئاواو تەنانەت ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتیشدا هۆکاری بێ سیستمی بووە. بەڵام کەسانێکیش هەبوون کە چەمکێکی جیاوازیان بۆ ئافرەت خستۆتەڕوو ئافرەتیان وەکو رۆحی ئازادی پیشانداوە، بۆ نموونە میشیلە. لەروانگەی میشیلەوە سیستمی حوکمڕان بەرەنجامی نەژادی سپییەو هەرچیەك بەرەنجامی نەژادی سپی نەبێ، بەبێ سیستمی لەقەڵەم ئەدرێ. ئەو فیلمەی کە ناونیشانی (لە هەڵدێری لەززەتدا)یە بەرهەمی منە، لەراستیدا لەکتێبی (ئافرەتی سیحریان)ی میشیلەوە وەرگیراوە.

*** ئایا لای ئێوە وروژاندن شێوەیەك نییە بۆ راکردن لەریالیزم؟**

– بەڵێ، بێگومان. من زۆر حەز ئەکەم شتێك بڵێم کە نابێ بوترێ. بۆ نموونە، لەفەرەنسادا مافی ئەوەمان نییە بڵێین کە ژووری گاز نەبووە. من خۆم بڕوام وایە کە ژووری گاز هەبووە، بەڵام لەسەرێکی ترەوە پێم خۆشە بڵێم نەبووە، لەبەر ئەوەی مافی ئەوەمان نییە کەشتێکی وابڵێین. ئەسڵەن ئەمە شتێکی ئاسایی نییە کە یاسای دەربڕینی بیروڕا شتێکی وەها قەدەغە بکات.

*** لەراستیدا لەمانگی ئایای ١٩٨٦یشدا دروشمێکی لەم بابەتە هەبوو: (قەدەغەکردن قەدەغەیە).**

– بەڵێ، هەر بەڕاستی قەدەغەکردن شتێکی راچەنینهێنو سەرسوڕهێنە. دەزانیت ژووری گازی ساختەیان دروستکرد تائەوانە پیشانی گەشتیارەکان بدەن. تەنانەت بیستوومە کە فیداڵ – ناکەی مێژوونووسی جوو وتوویەتی: (بەڵێ، ئەم ژوورە گازانە ساختەن، بەڵام کەس مافی ئەوەی نییە شتی وابڵێت.) لەوە سەیرتر ئەوەیە کە ناوی سیاسەتمەدارێکیان لەلیستی هەڵبژاردنی حیزبی سەوز (لایەنگرانی پاراستنی ژینگە) سڕییەوە، چونکە وتبووی ئەو ژوورە گازە ساختانە ئەبێ لەناو ببرێن. ئادەمیزاد کە ئەم شتانە دەبیستێ هەر ئەوەیە شاخی لێ ناڕوێ.

*** بەڵام ئێوە هەمیشە پەیوەندیتان لەگەڵ مێژوودا هەبووە. لێرەدایە کە نووسەر وەکو خولقێنەری مێژوویەکی نوێ دێتە مەیدانەوە.**

– من لە (رەنگدانەوەی ئاوێنە)دا بەسەرهاتی کەشتییەکی جەنگی دەگێڕمەوە کە ناوی (Aurore)ەوە لەسان پەترسبۆرگ بەرامبەر کۆشکی زستانەی قەیسەر لەنگەری گرتووەو بەگوێرەی مێژووی رەسمیی رووسیا تەقە لەکۆشکەکە دەکات.

بەلام زۆربەی مێژوونووسە رووسەکان وتوویانە کە کەشتییەکی جەنگیی لەو جۆرە لەوێ نەبووەو لەقۆناغی شۆڕشدا ئەو کەشتییە لەگەڵ کەشتیگەلی ناو ئۆقیانووسی ئارامدا بووەو لەسەری ئەوسەری روسیادا سەقامگیر بوون. ستالین تەواوی ئەو مێژوونووسانەی بۆ تاراوگە دوورخستەوە کە ئەو راستییەیان خستە روو.

* بەلام ئێستا گەیشتووینەتە قۆناغێک کە چیدی مێژوو ناسێنەری یۆتۆپیا نییە. ئایا نووسەر دەتوانێ بەسوود وەرگرتن لەئامرازەکانی زمان وێنایەک لەیۆتۆپیا بخولقێنێت؟

– دەڵێن کە مێژوو چیدی شاری یۆتۆپیای نییە؟ بەلام ئایین هێشتا هەڵگری شاری یۆتۆپیایە. هەرگیز هەموو ئایدیۆلۆژیاکان نافەوتێن.

* دێرێکی رۆلان بارتم دێتەوە بیر کە دەربارەی مێژوو وتوویەتی: (نووسراوی ئەدەبی لەناوەوەی خۆیدا هەم هەڵگری لەخۆ بێگانەبوونی مێژووەو هەم هەڵگری روانینی مێژووە.). ئەمڕۆ کەسانێک هەن کە دەربارەی (کۆتایی مێژوو) ئەدوێن.

– من باوەڕم بەکۆتایی مێژوو نییە.

* بەلام دیارە شتێکی دژوارە بۆ نووسەرێک کە ئەمڕۆ لەکۆتایی سەدەی بیستەمدا دەنووسێ و، بیەوێ ئاکارێک بۆ نووسین پێشنیاز بکات، بەتایبەتیش کە ئێستا رووبەڕووی چەشنی جۆراو جۆری نووسین بووینەتەوە، تائاستی نووسینی رۆژنامەوانیانەش.

– لەوانەیە لەرووی کردەییەوە شتی وانەبێ، بەلام پەیدا بوونیشی شتێکی ئەستەم نییە.

– ئایا ئەم مەسەلەیە هەرگیز ئێوەی ئازار نەداوە؟

– بەهیچ جۆرێک، لەبەر ئەوەی من لەگەڵ هەموو جۆرە ئایدیۆلۆژیایەکدا ناکۆکم.

* بەتایبەتیش لەوەدا کە ئێوە مەسەلەی ئیلتیزام هەر لەرێی خودی نووسینەوە دەخەنە روو.

– ئایدیۆلۆژیای ئەدەب خودی ئەدەب خۆیەتی.

* بەلام ئایا ئەدەب تاچ سنورێک دەتوانێ بمێنێتەوەو بەرگە بگرێت، چونکە چەشنی جۆراوجۆری نووسین پەیدا بووەو تەنانەت قسە لە کۆتایی تەمەنی رۆمان دەکرێ؟

– ئەم رایە بێ بنچینەیە. دەیانوت پاش رۆمانی نوێ ئیدی هیچی دی لەئارادا نییە. بەلام وانییە. گەلێ رۆماننوس هەن کە کاری سەرکەوتوویان هەیەو رۆمانی نوێش دەنووسن، بۆ نموونە وەکو ژان- فیلیپ توسن، یان پۆڵ ئاستەری ئەمریکایی، کەهەردووکیان دوو رۆماننووسی لاوو ئایندەیەکی پرشنگداریان لەبەردەمدایە. پۆڵ ئاستەر خولیای مەسەلەی دووانەیی (double)ەو ئەمەش شتێکە کە لە توانایدایە رۆمانی مەزن بەرهەم بێنێ.

* ئایا لەنێو نووسەرانی دەرەوەدا کەسانێک هەن کە زیاتر لەوانی دی سەرنجتانی راکێشابێت؟

– من نووسەرانی بەژاوەژاوو دەم بەهەرام خۆش ناوێ، بۆ نموونە من کەیفم بەگابریل گارسیا مارکیز نایەت. ئەو لەکوبا ڤێلایەکی سوپەرلۆکسی هەیە. مناڵەکانیشی لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەخوێنن. دواجار خۆشی بەدوژمنێکی سەرسەختی ئەمریکا دەزانێ. بەرای من مارکیز نووسەرێکی گەورە نییە، بەلام بۆ نموونە کۆرتازار بەنووسەرێکی گەورە دەژمێردرێ. نووسەری دەم بەهاواری تریش هەبوون لەئەمریکا وەکو نۆرمان میللەر، ویلیام ستایرۆن. هەڵبەتە من لەگەڵ مارکیزدا هاوسۆزم، بەلام بەڕای من نووسەرێکی گەورە نییە. دوانووسەری گەورەی ئەم وەچەیە نابۆکۆف بوو. لەئێستاشدا دەتوانین ناوی پۆڵ ئاستەر بهێنین.

* ئەی ژاپۆنییەکان؟

– ناوی هەندێکیانم لەزەیندایە، یەکێکیانم زۆر خۆشدەویست کە لەم دواییەدا کۆچی دوایی کرد. ناوێکی خۆشی هەبوو.

* کۆبۆ ئابی.

– تەنانەت من نەخشەی نووسینی کتێبێکم دانابوو کە بڕیار بوو لەگەڵ کۆبۆدا پێکەوە تەواوی بکەین. قەراریوو ئەو وێنەکانی کتێبەکە ئامادە بکات.

* بێینەسەر پەیوەندیتان بەسینەماوە.

– ئەنجامدانی فیلمەکانی من بەنیسبەت بەرهەمهێنەرەکانەوە گەلێ دژوارە، چونکە زۆر گران تەواو دەبن. هەڵبەتە من جەماوەرم هەیە بەلام ژمارەیان کەمە. بەتایبەتیش ئەو فیلمانەی کە زیاتر لە بیست ملیۆنی تێ دەچێت.

* ئەی کاری تازەتان بەدەستەوەیە؟

– بەڵێ، دوو کارم بەدەستەوەیە کە تاڕادەیەکی زۆر بەرەو پێشەوە چوون. بوودجەی هەردوو کارەکەش دابینکراون، بەلام ئەم پیشەیە ئەو نرخەی جارانی نەماوە. ئەو فیلمەی کە کاتی نمایشی نزیک

بۆتەوە لەو بەهارەدا دەبووایە دەستم بەوێنەگرتنی بکردایە، بەهۆی هەڵایسانی ئاگری شەڕەوە لەکامبۆج دواکەوت. ئەم فیلمە چیرۆکئامێزە دەبێ لەکامبۆج وێنەگرتنەکەی ئەنجام بدرێ، بەڵام رووداوەکان لەوێ روونادەن. بەڵکو تەنها لەبەر دیمەنە خەیاڵئەنگێزەکانی کامبوجە کە ئەوێ هەڵبژێردراوە. فیلمی دووەم فیلمێکە مەسەلەیەك لەخۆدەگرێت، ئەکتەری سەرەکیی فیلمەکەی کامبوج (ژان یان)ە، کە هەڵبەتە بەشتێکی تەقلیدی لەقەڵەم ئەدرێ. بەڵام ئەکتەری یەکەمی فیلمەکەی تریان مایکل ئانجلۆ ئەنتۆنیۆنییە، کە ئیفلیج بووەو بۆ حەوت ساڵ دەچێت کە فیلمێکی بەرهەمنەهێناوە. لەم فیلمەدا دەوری ئەفسەرێکی سوپا دەبینێت کە بەسەختی بریندار بووەو چیدی ناتوانێ قسە بکات.

*** بۆچی ئەنتۆنیۆنیتان هەڵبژارد؟ ئایا مەیلتان بەلای کارە سینەماییەکانی ئەودا هەیە؟**

— بەڵێ، بێگومان. تەنانەت سەروەختێك دەقی فیلمێکم بۆ نووسی. هەر دوای (ساڵی رابوردوو لەمارین باد)، بەڵام نەکرا بەفیلم، راستییەکەی ئالان رینێ داوای لێکردم کە باسی فیلمەکەی بۆ بکەم. من باسی چیرۆکی فیلمەکەم بۆ نەکرد، بەڵکو باسی فیلمەکەم بۆ کرد. لەراستیدا من بەشێوەیەکی کردەیی کتێبێکم دەربارەی وێنەگرتنی سینەمایی نووسی، واتە ئەوەی کە بینەر لەقتە بەلەقتە دەیبینێت من خستمە سەر کاغەز، بەڵام لەگەڵ ئەنتۆنیۆنیدا مەسەلەکە تەواو جیاواز بوو، شتێکی دیکە بوو. ئەنتۆنیۆنی پێویستی بەکەسێکە چیرۆکی بۆ بگێڕێتەوە. وەختێ دەربارەی ئەم فیلمە قسەمان دەکرد هەمو شتێك بەرێکوپێکی بەڕێوەدەچوو و هیچ کێشەیەکمان نەبوو، بەڵام دواتر کە باسی وردەکاریەکانی کارەکەمان کرد، ئەنتۆنیۆنی قسەکانی پێ بریمو وتی: (تۆ چیرۆکێکم بۆ بگێڕەرەوە تامنیش پێت بڵێم ئەوەی پێویستە لەسەر پەردەی سینەماکە روویدات چییە؟)

منیش پێم وت: (ناتوانم، چونکە کاتێ بیر لەفیلمێك ئەکەمەوە، بیر لەوەش ئەکەمەوە کە لەسەر پەردەی سینەماکە روو ئەدات). بەڵام ئالان رینێ بەپێچەوانەی ئەنتۆنیۆنییەوە قسەکەمی قبووڵ کرد.

*** چۆن بوو کە ویستتان لەگەڵ ئالان رینێدا هاوکاری بکەن؟ من سەیرم لەمە دێ، چونکە ئێوە خۆشتان دەتانتوانی کاری وێنەگرتنەکەی ئەنجام بدەن.**

— بەڵێ، بەڵام من ئەم فیلمەم بەتایبەتی بۆ رینێ نووسی. تەنانەت هەندێ رێنومایی درێژیشم بۆ نووسیبوو؛ بەڵام رینێ سوودی لێیان وەرنەگرت، بەهەرحاڵ کاریگەریی رینێ لەم فیلمەدا ئاشکرا بوو.

*** سەرچاوەی ئەم مەیلەی ئێوە بۆ وێنەگرتن و سینەما لەکوێوە هاتووە؟**

— زۆرن ئەوانەی حەز ئەکەن لەسینەمادا کاربکەن و فیلم بەرهەمهێنەی. منیش یەکێك بووم لەوانە. بەڵام ئەوەی سەیر بوو ئەوە بوو کە بواریان بەمندا ئەم کارەبکەم. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بەرهەمهێنەی کە کاری لەیەکەمین فیلمەکانمدا کرد لەگەڵ وڵاتانی تردا رێکەوتنی ئیمزا دەکرد. من بەزۆری فیلمەکانم لەدەرەوە بەرهەمهێناوە. یەکێك لەفیلمەکانم لەئەستەمووڵ ئەنجامدا. لەوێ بوو کە من کیژۆڵەیەکم ناسیو دواتر بوو بەهاوسەرم. ئەم پەیوەندییە بەجۆرێك لەجۆران منی لەتورکیا نزیك کردەوەو پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەم وڵاتە لاوەدا لەلام دروستکرد. پاشان یەکێك لەفیلمەکانم لەبەلژیك بەرهەمهێنا، چونکە لەوێ ئیمکانیاتێکی باش لەئارادا بوو. دوو فیلمی ترم لەچیکۆسلۆڤاکیا ئەنجامدا، لەبەر ئەوەی سینەماکارانی ئەم وڵاتە زۆر حەزیان لەفیلمەکانی من دەکرد. تەنانەت فیلمی (نەمر)یان بۆ سەر زمانی سلۆڤاکی وەرگێڕا. وێنەگرتنی فیلمی دووەمیان لەتونس بوو. ئەوەش هۆکەی ئەوە بوو کە وەزیری رۆشنبیریی بورەقیبە کارەکانی منی خۆشدەویست و داوای لێکردم لەوێ وێنەگرتنەکەی ئەنجامبدرێ. بەکورتی کۆمەڵێك وڵات هەبوون کە هەلو مەرجیان بۆ دەڕەخساندم و لەبەرهەمهێنانی فیلمەکاندا هاوکارییان دەکردم، هەڵبەتە ئێستا کامبوج توانای نییە ئەم دەورە ببینێ چونکە پارەی پێویست شك نابات. سەنعەتی فیلمسازی لەکامبوج برەوی نییەو ئەبێ هەرچی پێداویستیەکانە بیگوێزیتەوە بۆ ئەوێ و ئەمەش کارێکی دژوارە.

*** ئایا هەرگیز بیرتان لەوە نەکردۆتەوە لەگەڵ گۆداردا هاوکاری بکەن؟ چونکە کارەکانی ئەو دەچنە ریزی کارەکانی (شەپۆلی نوێ)وە..**

– من نرخێکی زۆرم بۆ گۆدار داناوه بەڵام ئەو نرخێکی زۆری بۆ من دانەناوه. لەراستیدا ئەتوانم بڵێم ئەو هیچ نرخێکی بۆ من دانەناوه. سەیریش لەوەدایە هەر کە فیلمێك بەرهەم دەهێنم گۆدار یەکەم بینەرە کە تەماشای دەکات. من خۆم لەو باوەڕەدام کە ئەو جۆرە خۆڕاگرتن (تحفظ)و زۆر لەخۆکردنێکی لایە بەرامبەر بەفیلمەکانی من.

*** ئایا بەڕای ئێوه لەنێو نوێنەرانی شەپۆلی نوێدا گۆدار رادیکالترینیان نییە؟**

– هۆکەی ئەوە نییە کە ئەو رادیکالە، بەڵکو هۆکەی ئەوەیە کە ئەو سەرنجڕاکێشترین دەرهێنەری شەپۆلی نوێیە. سینەمای ترۆفۆ یاشابرۆل بەهیچ جۆرێك پەیوەندییان بەشەپۆلی نوێوه نییەو تەواو بەسینەمای کۆنی ریالیزمی تەقلیدیەوه وابەستەیە.

*** زۆر هەن رۆمانی نوێ بەشەپۆلی نوێ بەراورد ئەکەن.**

– دیارە کە کارەکانی گۆدار لەرۆمانی نوێوه نزیکە، بەڵام کارەکانی کەسێکی وەکو شابرۆل ناچێتەوە سەر رۆمانی نوێ، سینەمای ئەو زۆر تەقلیدییە، ئەرێك رۆمەر جۆرە بێهودەییەکی سینەمایانەی لایە، جۆرە چەنەبازییەکی تەواو.

*** لەدەرهێنەرەکانی دەرەوه کێت پێ باشە؟**

– بۆ نموونە، ئەنتۆنیۆنی کە تەواوی کارەکانیم پێ جوانە. هەروەها فیللینی کە بەشێکی زۆری کارەکانیم لاجوانەو لەو فیلمانەی لەم دواییەشدا لەدەرەوه بەرهەمهێنراون بۆ نمونە فیلمی (ئەورووپا) کە لەفەرەنسادا دەنگی دایەوه.

*** ئەی کارەکانی سترۆب و گاریل؟ ئەو کارانەتان لاچۆنە؟**

– سترۆب نەو. کەمێك گاریل. بەڵام سترۆب نەو، کارەکانی قورسن. سترۆب فیلمی فێرکاری بەرهەمدێنێ. بەڵام ئەو تەنزەی گۆدار شك نابات.. لەوانەیە ئێوه کارەکانی سترۆبتان پێ خۆش بێ، بەڵام من نەو.

*** بەڵێ، کارەکانیم پێ جوانە. ئەی ڤیندرس و گریناڤی؟**

– زۆر حەزم لەکارەکانی گریناڤییە، بەڵام لەو بڕوایەدام کە زۆر قسە دەکات. ڤیندرسیش.. بەڵێ، بەڵام ئەم سێ فیلمەی دوایی.. نەء.

*** واتە حەزتان لەفیلمە سەرەتاییەکانێتی؟**

– هەموو فیلمەکانی، بەتایبەتیش فیلمی پاریس– تەکساس.

*** کاری کام سینەماکار لەرۆحیەتی ئێوەوە نزیکترەو هەست بەنزیکایەتیی زیاتر ئەکەیت لەگەڵیدا؟**

– بۆ نموونە لەفیلمێکی ڤیندرسدا (تائەوپەڕی جیهان) تەواوی بەشی یەکەمی فیلمەکەم زۆر پێ خۆشە، کە زۆر لەفیلمی (هاوڕێی ئەمریکایی) دەچێت. بەڵام بەشی دووەمی فیلمەکە زۆر لەسەر رۆحم قورس بوو. وەختێ ڤیندرس دەست بەبیرکردنەوە دەکات، زۆر لەوە دەچێت کە ئەمڕۆ لەئەڵمانیادا پێی دەڵێن (فەلسەفەی ترامویی).

*** ئایا ئێوه مەیلتان بۆ شێوەکاریش هەیە؟**

– بەڵێ، پۆرترێتێکی سیلڤیا کریستلم کێشاوە. تەماشاکە، کۆلاژێکم لێ دروستکردووە. چونکە ئەم رۆژنامەیە بۆیاوی بووە، هەردوولاکەی دەبینرێ.

**– کاری کۆلاژ زۆر دەکەیت؟**

– نەخێر، هەر بۆ هونەربازییە. نیگارکێشان بۆ من تەنها وەکو جۆرە کات بەسەربردنێکە.

*** ئەی فۆتۆگراف؟**

– کاری فۆتۆگرافیش دەکەم، بەڵام کاری هونەری نا. وێنەی خەبەریم زۆر گرتووە، بۆ نموونە لەکامبوج.

*** دواپرسیار: ئایا رۆمانێکی تازەتان بەدەستەوەیە؟**

– بەڵێ، سەرگەرمی نووسینی بەرگی چوارەمی یادەوەرییەکانی خۆمم، بەڵام زۆر پەلەی تێدا ناکەم، لەبەر ئەوەی بەرگی سێیەمی کە لەژێر ناوی (دوا رۆژەکانی کورنت)دا بوو تازە لەچاپدراوە.

**هاوینی ١٩٩٢**

□

* فیلیپ پیتان (١٨٥٦–١٩٥١) مارشاڵێکی فەرەنساییە. لەشەڕی یەکەمدا ١٩١٤– ١٩١٨ سەرکردەیەکی ناودار بوو. کە لە شەڕی جیهانی دووەمدا نازیەکان فەرەنسایان داگیرکرد ئەویان دانا بەسەرۆکی حکومەت. ساڵی ١٩٤٥ حوکمی سێدارەدانی دەرکرا. بەڵام خۆی لەمەنفادا مرد.

# گفتوگۆیەك لەگەڵ میشیل بۆتۆردا

● و: ڕەووف بێگەرد

**ئێوە ساڵی ١٩٢٦ لە من ئان باروبل لە دایك بوون. بەڵام سەردەمی منداڵیو گەنجیتان لە پاریس بەسەربرد، چ یادەوەرییەكتان لەو ساڵانە هەیە؟ ساڵانی پێش جەنگی جیهانی دووەم.**

گەلێك یادەوەری پێش شەڕم هەیە، لەوانە نمایشگای جیهانی ساڵی ١٩٣٧، بەرەی میللەت، بە تایبەتیش بیرو خەیاڵ كردنەوە لە شەڕ، شەڕ نزیك دەكەوتەوە، كە دەستی پێكرد ئێمە خەیاڵمان ئاسوودەتر بوو، بەڵام تا دەست پێ كردن زۆری درێژە كێشا.

**لەو كتێبانەی ئەوسا كاریان لێ كردوویت هیچ بیرەوەرییەكتان هەیە؟**

لە منداڵیدا كتێب گەلێكم خوێندەوە كاری زۆریان لێ كردم، وەك كتێبەكانی ژۆل ورنو هەزارو یەك شەوە، پاشان لە كاتی شەڕی جیهانی دووەمدا، بەرهەمی نووسەرانی سەدەی نۆزدەو كەمێكیش بەرهەمی نووسەرانی سەدەی بیستی فەرەنسام خوێندەوە. بەڵام لەكاتی داگیركردنی نازیەكاندا بەدەست هێنانی كتێبی نووسەرانی سەدەی بیستەم دژوار بوو، ئێمە توانیمان بەشێكی گیروگرفتەكە چارەسەر بكەین، دەرفەتی ئێمە تا ئەندازەیەك لە دەرفەتی رووسەكانی سەردەمی رژێمی كۆمۆنیستەكان دەچوو، واتا ژمارەی ئەو كتێبانەی بەردەست دەكەوتن كەم بوون، بەڵام ژمارەیەكی زۆری كتێبە قەدەغەكان، بە تایبەت دەگمەنەكان بەنهێنی دەستاو دەستی دەكرد.

**ئایا لەگەڵ هاوڕێكانتانا، وەك خوێندكارانی زانكۆ كۆبوونەوەتان هەبوو؟**

لەكاتی داگیركردنی فەرەنسادا هێشتا من خوێندكاری زانكۆ نەبووم، لەدوا ناوەندی دەم خوێند، كلاسی فەلسەفەمان هەبوو لە پێشڕەوەكانیش بووم. لەو بوارەدا زۆرم هاوڕێ هەبوون، كۆبوونەوەی وایشمان هەبوو كە لەگەڵ تێپەڕینی زەماندا بایەخی زیاتری پەیدا دەكرد.

**لەناو ئەو هاوڕێیانەدا كەسانێكی ناودار هەبوون؟**

لەناو ئەواندا نەخێر، بەڵام كە خوێندكاری زانكۆ بووم لە سۆربوون لەگەڵ كەسانێكی زۆر ناودارد دۆستایەتیم پەیدا كرد، وەلێ ئەمانە پەیوەندییان بەدوای جەنگەوەیە.

**ئایا دوای شەڕ كەوتنە خوێندنی فەلسەفە؟**

لە سەرەتادا ویستم ئەدەبیات بخوێنم، بەڵام زمانی لاتینیو یۆنانیم چاك نەدەزانی، بۆیە كەوتمە سەرینی فەلسەفەوە، لەكاتی خوێندنما لەگەڵ



**کەسانێکی ناوداری وەك ژان فرانسوالیوتارو ژیل دلوز هاوڕێیەتیم پەیداکرد.**

**مامۆستاکانت کێ بوون؟**

زۆرمان مامۆستا هەبوو، بەڵام دوانیان زۆریان کار لیٚکردبووم، یەکێکیان گاستون باشلارو ئەوی دی ژان وال بوو، باشلار لەسۆربۆن مامۆستای فەلسەفەی زانست بوو. من بایەخی زۆرم بەژان وال دەدا. ئەو داوای لیٚکردم بچمە ((کۆلیژی فەلسەفە)) لە پێشدا رازگری ئەم کۆلیژە بووەو پاشان چالاکیم زیاتر بوو.

**لەژێر کاریگەری ژان وال دابوو ئارەزووی ئاگزیستالیزمت کرد؟**

بەڵێ. دیارە دوای داگیرکردن، کەسایەتی سارتەر زۆر سەرنج راکێش بوو، لەگەڵ هەموو گیروگرفتەکاندا، کتێبی بوونو نەبوونو دوو شانۆنامە بەناوی (دەرگا داخراوەکان) و (مێشەکان) ی بڵاوکردبوەوە، ئەمە کارێکی زۆر جەسورانە بوو، چونکە لەشانۆنامەکانیدا کینایەی زۆر ئاشکرای تیایە کە باسی نازیە داگیرکەرەکانە، بەڵام

کارمەندانی سانسۆر هەستیان بە ناوەڕۆکەکە نەکردبو، بۆیە کە ماوەی داگیرکردن کۆتایی هات، سارتەر بایەخی زۆری پەیداکرد، ئەم بایەخە دوای ئازادی زیاتر بوو، ئەو ببوە مامۆستای فەلسەفەی سەرانسەری فەرەنساو، کاریگەری زۆری بەسەر هەموومانەوە هەبوو.

**هەندێك لە ئەزموونی خۆتان لە (کۆلیژی فەلسەفە) باس بکە، ئایا ئەو ئەزموونە کاریان کردە سەر ئایندەی ئەدەبیت؟**

ئەم دەزگایە لە سەرەتاوە ناوی (کۆلیژی فەلسەفە) بوو، بەلام دوای ئەوەی وەزیری پەروەردەو فێرکردن سەری کێشایە ناو کارەکەوە ناویان گۆڕی بە (سیمینارە فەلسەفیەکان) لەو ماوەیەدا کە رازگری کۆلیژەکە بووم بەشداری هەموو کۆنفرانسەکانیم دەکرد. لەگەڵ کەسانێکی ناوداری هەرگرۆیەك دۆستایەتیم پەیدا کردو زۆریان فێرکردم.

**کەسانی وەك سارتەریان گابریل مارسیل هاتو چۆی کۆلیژی فەلسەفەیان دەکرد؟**

وەك سارتەر نەخێر، ئەوسا سارتەر زۆر بەناوبانگ بوو، گابریل مارسیلم چاك دەناسی، لە دەورانی ئازادیدا، شەوانە لەماڵی ئەواندا بۆ باس‌و گفتوگۆی فەلسەفی دانیشتنمان ساز دەدا، من بەردەوام دەچوومە ماڵیان.

**ئایا ئێستا بەرهەمی فەلسەفی دەخوێننەوە؟**

زۆر کەم، هەندێك جار بەرهەمی فەیلەسوفان دەخوێنمەوە، بەلام وەك نووسەر ئەوەی لە بەرهەمی ەونووسەرانەدا سەرنجم رادەکێشن، شێوەی وسین‌و خەیاڵیانە.

**خوێندنەوەکانت زیاتر بەرهەمی کلاسیکن یان هاوچەرخ؟**

لە نووسەرانی هاوچەرخ زۆر ناخوێنمەوەو زۆریش لەسەرو بەندی فەلسەفەی ئەمڕۆدا نیم. دوای ئەوەی کۆتاییم بە خوێندنم هێنا لە فەلسەفە دوور کەوتمەوە، بۆیە لەناودارانی ئێستای فەلسەفە ئاگاداریەکی وام نیە. لەگەڵ هاوڕێ کۆنەکانمدا پەیوەندی دۆستانەم هەیە نەك ئەوانی دی، بۆیە لە زەمینەی فەلسەفەدا هێند خۆم بە شایستە نازانم، تەنیا جارجارە کتێبی فەیلەسوفە کۆنەکان لەباری ئەدەبیەوە هەڵدەسەنگێنم.

**لەنێوان وەرگرتنی لیسانسی فەلسەفەو چوونە نێو دنیای ئەدەبیاتەوە وەك رۆمان نووسێك چی روویدا؟**

دوای وەرگرتنی لیسانسی فەلسەفە چەند ساڵێك بۆ وەرگرتنی ئاگرەگاسیوی فەلسەفە هەوڵمدا. دوای ئەوەی ئارەزووەکانم بوونە بلقی سەر ئاو لە تاقیکردنەوەی ئاگرەگاسیویدا سەرنەکەوتم، بەو حاڵەوە لە دواناوەندی سانسدا بوومە مامۆستای فەلسەفە، پاشان چووم بۆ میسرو لە یەکێك لە دواناوەندیەکانی ئەوێدا کەوتمە وانە وتنەوە.

**بۆ ماوەی چەند؟**

بۆماوەی ساڵێك، هەڵبەت بڕیارەکە بۆ ماوەی دوو ساڵ بوو، بەلام لە کۆتایی ساڵدا ئاگاداری ئەوەکرام کە دەتوانم وەك پەروەردەییەکی دانیشگا بڕۆمە مانچستەر، دیارە ئەم جێگۆڕکێیە بۆمن زۆر دژوار بوو، بەلام بۆ پیشەکەم بایەخێکی زۆری هەبوو. لە ئینگلتەرا دەستم بە نووسینی یەکەم رۆمانم کرد کە ناوی گوزەرگای میلانە (Passagede mila)

**کام لە نووسەران تۆیان گەیاندە ئەوەی رەخنە لە شارستانیەتی فەرەنسا بگریت؟**

زۆرم لە کتێبی نووسەرە ئینگلیزیەکان خوێندەوە، هەروەها لە نووووسەرانی ئەڵمانی پاشان ئیتالی‌و ئەسپانی. بەلام لەو سەردەمەدا نووسەرێك نەبوو پێشەوای بیری من بێت. لە دەورەی خوێندنی فەلسەفەدا زۆر زۆر لە ژێر کاریگەری برگسوندا بووم، شەیدای بووم، لەکات خوێندنی فەلسەفەو دوای ئازادی ولات، واتا لە دەوروبەری ساڵی ١٩٤٦ دا ناوی سارتەر لە هەموو ناوەکانی دی بالاتر بوو، بۆ ئاگابوون لە سارتەر بەرهەمەکانی (گابریل مارسیل) م خوێندەوە، هەر ئەوسا کەوتمە خوێندنەوەی کتێبەکانی هایدگەرو هوسرل، ئەوانە ئەوسا زیاد لە کەسانی تر ناوبانگیان هەبوو. لە زەمینەی ئەدەبیاتدا سوریالیزم کاریگەر بوو، منیش زۆرم بایەخ پێ دەدا.

**لەگەڵ ئاندری بریتۆندا دۆستایەتیتان هەبوو؟**

بەڵێ، ئاشنایەتیم بە سوریالیستەکان لە رێگای ئەو کتێبانەوە بوو کە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا بە نهێنی دەکەوتنە دەستم، پاشان لەرێی هەندێك لە دۆستانەوە، جگە لەوانە کەسانێکم

دەناسی ئاشنای گرۆی سوریالیستەکان بوون، من هەرگیز ئەندامی سوریالیستەکان نەبووم، بەلام زۆریانم دەناسی کاتێك کە بریتۆن لە سەفەری ئەمریکا گەڕایەوە بینینم، بەردەوام پەیوەندی گەرمم لەگەڵیا پەیدا کرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەر نەبوومە ئەندامی سوریالیستەکان. بریتۆن لەگەڵ مندا زۆر راحەت تر قسەی دەکرد تا لاوەکانی گروپەکەی، زۆری کارتێ کردبووم. بریتۆن بووە هۆی دەرخستنی ئەو نهێنیانەی چاو نایان بینێتو وتوێژیش ناتوانێت تاڵە ناسکەکانی دەربڕێت.

لەوتو ویژێکدا بۆ پێشەکی کتێبی ((هەنگاوی پێویست)) Travauxd Approche وتووتە: ئەوەی زیاد لە هەر شتێکی تر من لە سوریالیستەکان جیادەکاتەوە گرنگی دانی منە بەو گاڵتەجاڕەی کە هەر دەمرێت، مەبەستتان لەم قسەیە چی بوو؟

شیعری سوریالیستی هەوڵێکی سەرسام هێنەرە، بەو مانایەی دەیەوێت هەڤ پەیڤینێکی نائاسایی لەگەڵ شتەکانو وشەکاندا دروست بکات، منیش هەروا، بەلام من بایەخ بەناوەرۆکی ئەو شتە ئەدەم کە لەو هەڤ پەیڤینەوە بەدی دێت، بە گاڵتەجاڕیو بێزاری، بەوەی ناچارمان دەکات بە دوای شتێکی تردا بگەڕێین.

بە باوەڕی من لەنێوان ئێوەو سوریالیستەکاندا رووبەکی جیاواز هەیە، ئاندرێ بریتۆن لە ((بەیانی سوریالیسزم)) دا رەخنە لە ((شێوەی پێڕست لە سەریەکتر دانان)) دەگرێت، بەلام لای من ئەو جۆرە وێنانە لە دیدی ئێوەدا باشن، تۆ دەتەوێت وێنەو ماناکان بە وشە دەستەبەندی بکەیت.

بەڵێ، ئەمانە زۆر دژی یەکترن، چونکە لەنێوگرۆی سوریالیستەکاندا کاری سەرەکی بەرجەستە کردن، یان نموونە هەڵگرتنەوەو پێکەوە لکاندن بوو، پێکەوە لکاندن لەسەر یەك دانانی وێنەکانی پێڕست بوو، بریتۆن زۆر کاریگەری بەسەر دەورو بەرەکانیەوە بوو، بە تایبەت بەسەر نیگارکێشەکانەوە. هەندێکی وەك ماکس ئارنست لەو باوەڕەدان کە بریتۆن زۆری کار لێ کردووم. پێکەوەلکاندن بایەخێکی زۆری هەبوو، هەر بۆیە دەبوو وێنەکانی پێڕست سەرنجی بریتۆنی رابکێشایە، بەلام لە راستیدا تەنیا لە هەندێك دەقدا سەرنجی ئەوی راکێشاوە.

من وا بیر دەکەمەوە تۆ بە هۆشیاریەوە دابو نەریتی نووسینی رۆمانی کلاسیكو جۆری دەربڕینەکان لەبەرچاو ناگریت. ئایا دەتوانین بڵێین تۆ نووسەرێکیت بەردەوام لە گۆڕاندایت؟ هەرچەندە بە رۆمان بوونی کارەکەتان حاڵەتی بەدی هاتنێکی کاتی لەخۆی دەگرێت.

بەڵێ، تەواو بەو جۆرەیە، بەردەوام ویستوومە زەمانو فەزاو، بێگومان رەفتاری مرۆڤەکانو شێوەی بیرکردنەوەیان سەقام گیر بکەم، بەڕای من نووسراوە بە توانایەو ئەمەیش زۆر گرنگە، بەلام هەموو شتێکیش لەوەدا پوخت ناکرێتەوەو، نابێتو ناتوانین تەنیا بە نووسراوە قایل بین.

نووسین بۆ تۆ چ مانایەکی هەیە؟

من بۆ نووسین پێناسەیەکی زۆر سادەم هەیە، نووسینی وشەگەلێك لەسەر کاغەز یان شتێکی دی.

بەلام ئەو دەسەڵاتەی تۆ بەسەر بزاوتی بەرهەمەکانتا هەتە، ئەوە دەگەیەنێت کە نووسەر دوور لە وێنەگرتن رابگیرێت.

مەبەستتان چیە؟

بۆ نموونە، دابەش کردنی نووسەر بە سەر راناوی (من) و (تۆ) دا، کە لە یەکێك لە کتێبەکانتا بەناوی (گۆڕان) هوە هاتووە.

بەڵێ، راستە لە دەقی کتێبی (گۆڕان)دا نووسەر راستەوخۆ دەرناکەوێت، بەلام لە کتێبەکانی تردا خۆم لەوکارە دزیوەتەوە.

ئەوکتێبانەی ناچار بووم لە خۆم بدوێم، ئەوراستیە بڵێم کە بۆچی شتەکان بەم شێوەیە یان بەو جۆرە دەبینم.

لە دوو توێی کتێبەکانمدا گەلێك نووسین دەربارەی خۆم هەیە، لە چوار رۆمانمدا راستەوخۆ ئەم کارەم ئەنجام نەداوە، بەلام لە نووسینەکانی دوایمدا ناچار بووم باس لە خۆم بکەم، نەك وەك خۆب گەورە زانین، بەڵکو بە چاکتر نیشاندانی ئەو شتەی کە دەمەوێت لێی بدوێم.

چۆن دەستت بە نووسین کرد؟

زۆر ئاسایی، بەلام زۆر لە گەڵ نووسینەکانمدا چنگاوش بووم، زۆرم نووسی. وەلێ لە نووسینی

ئەونووسینانەمدا رووبەڕووی گەلێك دژواری بوومەتەوە، ئەگەر تەماشای کتێبەکانم بکەیت دەزانیت کەسەکان بە سادەیی دەدوێن، بێگومان هەر لە بنەماوە جۆرە سادەییەك هەبووە، بە جۆرێکی دی من زۆر دەدوێمو وشەگەلێك بەکاردێنم کە لە حاڵەتی خۆمەوە نزیکن، ئێستایش کێشەی فرەم هەنو لەسەر نووسینەکانم زۆر کاردەکەم، ئەمەیش بەلگەی ئەو گیروگرفتانەیە کەریتمی وتن بەوجودی دێنێت، پێویستم بە جۆرە تەکنیکێکە کە زیاتر لە تەکنیکی شیعری کۆن دەچێت، بۆ ئەوەی یارمەتی نووسینم بدەنو وێنای خۆمی تیا بەکاربێنم، هەر لەبەر ئەمەیشە نووسینەکانم کاریان زۆر لەسەرکراوە، زۆریان چاك دەکەمو پیایاندا دێمەوە، هەمیشە وابووە، ئەمە یەکێکە لە جیاوازیەکانی منو سوریالیستەکان، منیش دەمتوانی وەك ئەوان شێوە نوویسنی ئۆتۆماتیکی لەبەرچاو بگرم، بەڵام ناتوانم شتەکان هەروا بەجێ بهێڵم، هەرنابێت، بەردەوام، بە نووسینەکانمدا دەچمەوە، هەر رۆژێك زیاتر لە رۆژی پێشوو تر، بۆیە لە نووسینەکانمدا نەخشەکێشانی زیاد هەیە، مەبەست لەو نەخشەکێشانە گەیشتنە بە حاڵەتی ئاسایی، وەلیٚ ئەم حاڵەتە دوای کارکردنی زۆر بەدی دێت.

**نووسینی کتێبێك چەندە دەخایەنێت؟**

ئەمە پەیوەندی بە زۆر شتەوە هەیە، لە سەرەتای نووسنمدا هەر کە کتێبێکم تەواو گەڵاڵە دەبوو دەستم بە یەکێکی تر دەکرد، بەڵام هەندێك لەو بەرنامانە دەساڵی دەخایاند تا دەهاتنەدی، چەند لە تەمەنم تێ دەپەڕێت ئەم کارەکانی زیاترم لیٚ دەگرێت، ئێستا لەسەر کتێب گەلێك کار دەکەم کە سی ساڵ بەسەر گەڵاڵەکەیدا تێپەڕیوە.

**زۆربەی خوێنەری فەرەنسی زمان تۆ وەك داهێنەری رۆمانی گۆڕان دەناسن کە ساڵی ١٩٥٧ خەلاتی (رونودو) ت لەسەر وەرگرت، ئێستا لە روانگەی رابردووەوە ئەو کتێبە چۆن دەبینیت؟**

ئەم کتێبە لە هەمو کتێبەکانی ترم بەناوبانگترە، کتێبێکە بۆ لاوانی دواناوەندی، زۆربەی ئەوانەی ئەم کتێبەیان خوێندۆتەوە کەسانێکی تەمەن چل ساڵەن، کە ئەم کتێبەیان لە دەورەی قوتابیەتی دواناوەندیا خوێندۆتەوە، هەندێك لە پلەدارانی دەوڵەت یان ئەندامانی ئەنجوومەنی شار کە دەم بینن دەڵێن کتێبی -گۆڕان- مان لە دواناوەندیا خوێندۆتەوە، ئەمە تاقە کتێبی منە کە ئاوا پێشوازی لیٚ کرابێت، هەڵبەتە ئەمە بۆمن زۆر گرنگە، چونکە هەندێك کتێب لە بیردەچنەوە. هەیە ئەم کتێبە بە بێزارکەر دادەنێتو هەیشە لەژێر کارتێکردنی ئەودان، هیوادارم کتێبەکانی تریشم هەمان چارەنووسیان هەبێت.

**تۆ وابیرناکەیتەوە کە چارەنووسێکی وایان هەبێت؟**

بە هیچ جۆرێك، ئەم کتێبەم پێشوازی زۆری لیٚ کرا.

**بەڵام سێیەم رۆمانتان بوو.**

بەڵێ وایە، ئێستا کتێبێکی ترم بەناوی (بەکارهێنانی زمان) ەوە وەك کتێبی وانەی خوێندن بڵاوکراوەتەوە. ئەمیان لەسەروی رۆمانی -گۆڕان- ەوەیە، ئەم کتێبە ئەمساڵ بۆ تاقیکردنەوەی ئاگرەگاسیونی ئەدەبیاتی مۆدێرن دیاری کراوە، لە دوو ساڵی ئایندەدا لە بەرنامەی کنکورد ئیختباری (فێرکردنی باڵاْ) دا دادەنرێت، ئیتر دەبێت گەلیٚ لە لاوان( بەکارهێنانی زمان) بخوێنن، لەم راگوزەرەدا هەندێك هەن پێی دلگرانن بەڵام کەسانێکی تر هەن ئەم کتێبە دەبێتە رێسایەك بۆ جۆری روانینیان سەبارەت بە شتەکان. ئەوە بۆمن خۆشیەکی زۆر گەورە بوو کە ئەو کتێبەم وا کەوتەوە، هیوادارم کتێبەکانی تریشم بەختیان یاربێت.

**کە نووسەرێك ناوبانگی جیهانی پەیدا دەکات لە خۆیدا هەست بەچی دەکات؟**

وا هەست ناکەم ئەوەندە ناودێریم، ئەشیٚ ناسراویم، بەڵام کتێبەکانم لەخۆم ناسراوترن.

**بگەڕێینەوە سەر بەرهەمەکانتان، کە رۆمانی -گۆڕان- دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت لەرووی بیرەوە لە پروست، کافکاو جولیس نزیکیت.**

وایە، دوای کۆتایی پێ هاتنی جەنگ بەرهەمی ئەم نووسەرانەم خوێندەوە. ئەوانە نووسەرانێکن بە خۆشەویستیەوە کتێبەکانیانم دەخوێندەوە. ئەوکاتە، چەند جارێك ئەو کتێبانەم خوێندەوە، تێکۆشام چەند بتوانم لە ئەزموونو زانستیانەوە تا ئەو جێگایەی دەگونجێت فێربم. لەبارەی جۆیس و

برۆستەوە وتارگەلێکم نووسی، بەڵام دەربارەی کافکا هیچ، چونکە هەرگیز ئەو هەلە نەڕەخسا، مەبەستم ئەوەیە کە کافکایش لای من گەلێك گەورەیە.

دوای رۆمانی (پله) Degre کە لە ساڵی ١٩٦٠ بڵاو بووەوە تۆ لەگەڵ تەکنیکی مونتاژو کۆلاژی پرۆژەی ئیستریوفونیك بە یارمەتی شێوە نووسینێك کە لە (خانەبەندی)ی کۆن دور بوو وازیان لە رۆمان هێنا، هەر تەواو دوای رۆمانی Mobile بە جیدی دەستتان دایە شیعر نووسین هۆی ئەم گەڕانەوەیە بۆ شیعر چی بوو؟

کە خوێندکاری زانکۆ بووم شیعری زۆرم نووسی، ئەوانەی لە شیعری سوریالیستییەوە نزیك بوونو لە هەمان کاتدا جیاوازی زۆریشیان هەبوو. کاتێك دەستم کردە نووسینی یەکەمین رۆمانی خۆم (گوزەرگای میلان) شیعر وتنم لەسەر خۆم قەدەغەکرد، چونکە ویستم تەواوی توانام بۆ رۆمان تەرخان بکەم، ئەمویست ئەوەندەی بتوانم رۆمانەکەم قووڵو شاعیرانە بێتو هەموو شتێکیشی تیا بخەمە روو، کەچی لەپڕا هەموو ئەم بڕیارانەم وەستان، چونکە بیرم کردەوە کە ((نە ء.. ئیتر لە ڕێی رۆمانەوە ناگەمە هیچ)) ئەمە بوو جارێکی تر گێڕامیەوە سەر شیعر نووسین، بە تایبەت بۆ نووسینی کتێبێك لەسەر هونەرمەندان، بۆ کارکردن لەگەڵ هونەرمەندان، ئەو دەقانەی وێنەو بۆچوونی خۆت لەسەر هونەرمەندان بەرجەستە دەکات، لە زەمینەی وەسف کردنەوە پێشکەوتنێکی بەرچاوم بەدی هێنا. وەسفی شتەکان، رەفتارو دیمەنەکانیش بۆ رۆمان فەراهەم هاتبوون، بەڵام دوای رۆمانی Mobile ئەم وەسفە زیاتر پەرەی سەند. بەرای من ئەم رۆمانە ئەوە نیشان دەدات بۆ لە شوێنە جیاکاندا بە شێوەی جیاواز بیر دەکەینەوە. یەکەمین کتێبم ناوی -بلیمەتی جێگاکان- Le Genie Deslieuxo کە دەتوانێت خۆی لەنێوان هەردوو رۆمانی گۆڕانو پلەدا. ببینێتەوە بەشێکی زۆری ئەم کتێبە تایبەتە بەباسی میسرەوە، دوای ئەوە، باسی سەفەری وڵاتە یەککگرتووەکانە کە زۆر پرسیاری بۆ دروست کردم، ئەم سەفەرە خستمیە سەر کەلکەڵەی ئەوەی بەو شێوە وەسف کردنەی رۆمانی Mobile بنووسم.

هەندێك لەو سەفەرانە بۆ من زۆر گرنگ بوون، رۆمانەکانی من دابەش دەکرێنە سەر دوو سەفەری گەورە، سەفەری میسرو وڵاتە یەککگرتووەکان، پێش سەفەری میسر چەند وتارو شیعرێکی دەورەی لاویم نوسی بوو، دوای ئەو سەفەرانە چوار رۆمانم نووسی، پاشان لە ژانویەی ١٩٦٠ دا چوومە وڵاتە یەککگرتووەکان، هەر لەو سەفەرەدا بەرگی یەکەمی پێڕست Repertoire و رۆمانی پلەم بڵاوکردەوە، پێڕستم بۆ وەڵامدانەوەی پرسیار گەلێك نووسی کە دەربارەی رۆمانەکانی ترم بەرەو رووم ببوونەوە.

لە رۆمانی Mobileدا ویلایەت بە ویلایەتی وڵاتە یەککگرتووەکان پێناس دەکەیت، کەمێك وەك جووڵەی شتەکان لە بزاوتی کالد(Calder) دا کە پارچەکان دەجولێنن بێ ئەوەی جەستەکە ئەم لاولا بکات.

بەڵێ، ناوی ئەم رۆمانە تائەندازەیەك شتەکان لەپەیکەری جوڵاودا (موبایل) دەخاتە بەر زەین، ئەم دەقە چەند پێکهاتەیەکە لەچەند بەشێکی بچووك کە دەتوانن بچنە پاڵ یەك.

لەرۆمانی (mobil)دا وەك لە رۆمانی ((٦٨١٠٠٠٠ لیتر ئاو لە چرکەیەکدا)) دەردەکەوێت کە پەیوەندییەکی راستەوخۆ لەنێوان نووسینەکانی تۆو سەفەردا هەیە، نووسراوەکە خۆی دەبێتە سەفەرێك لەناو وێنەکاندا، تا ئەندازەیەك بەشێوەی نیگارکێشی موندریان، لەوێدا چوار گۆشەیەك بەسەر دیوارەوە وێنە دەکرێتو دیسان وێنە دەکرێتەوەو چوارگۆشە دروست دەکاتەوەکە بابەتە نەقاشیەکەی تیا جی گیر دەبێت.

بەڵێ، سەفەر لە نووسینەکانمدا دەورێکی زۆر گرنگی هەیە، سەفەر بۆ میسرو وڵاتە یەککگرتووەکان، لە رۆمانەکانیشمدا بابەتی سەفەر زۆرن، لە رۆمانی بلیمەتی جێگاکاندا وەك بگێڕێك ئامادەگیم هەیە کە زۆر جەختی لەسەر ناکرێت، لە گۆشەیەکدا وەستاوەو خوێنەر خۆی لە حاڵەتی گەڕاندایە.

هەروا بەردەوام سەفەر دەکەیت؟

بەڵێ، هەمیشە لەسەفەردام، بۆ تەندورستی باشە.

لە قسەکانتەوە بۆم دەرکەوت کە نیگارکێشان (نەقاشی) لای تۆ دەوری زۆر گرنگی هەیە. ئایا خۆتان نەقاشی ئەکەن؟

بەڵێ، لەلاویدا زۆرم وێنە دەکردو حەزیشم لێ بوو ببمە نیگارکێش، کەچی لە ئەنجامدا بومە نووسەر، وا دەزانم من بۆ ئەو کارە دروست ببووم. لە نووسینەکانمدا هەمیشە جۆرێك غەمی غەریبی بە نیسبەت نەقاشیو مۆسیقاوە هەیە، واتا حەزم لێیە نیشان بدەمو بژنەوێنم. پێم خۆشە بە نەقاشیو مۆسیقا کار بکەمە سەر خوێنەر، ئەم مەسەلەیە گرنگیەکی زۆری هەیە، ئەنجامیش، نووسینەکە هەر تەنیا لە سنوورێکدا نامێنێتەوە.

**لە ((پێڕست))دا رۆمان لەگەڵ هەندێك لە تابلۆکانی سەدەی پانزەدا بەراورد دەکەیت، ئەو تابلۆیانەی پێکهاتەیەکی ئاڵۆزیان هەیەو، رەمزە نهێنییەکانی هەرگیز بە تەواوی ناکرێنەوە، لەم حاڵەدا بەرهەمەکانت لە ریشەوە لە بەرهەمی رۆمان نووسانی تری فەرەنسا، بە تایبەت لایەنگرانی رۆمانی نوێی وەك ئالان روب گریێو ناتالی ساروت جیادەبێتەوە.**

بەڵێ. نووسینەکانی من نیسبەت بە رۆمان نووسەکانی تری فەرەنساوە حاڵەتێکی کراوە تری هەیە، ئەمەت بە دڵنیاییەوە پێ دەڵێم.

**کەواتە رۆمانی نوێی ئەمڕۆ لای ئێوە چ مانایەکی هەیە؟ ئایا بە بەشێکی کۆنی مێژووی ئەدەبیاتی فەرەنسای لە قەڵەم دەدەیت؟**

رۆمانی نوێ دەمێکە بۆتە بەشێکی کۆن لە مێژووی ئەدەبیاتی فەرەنسا. بەشێکی دەوڵەمەندو زۆر سەرنج راکێش. رۆمانی نوێ پەیوەندی بە سەرەتای ساڵانی ١٩٥٠ وە هەیە تا سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ هەڵبەت پێش ئەوە رابەرانێك هەبوونو دوای ئەوەیشکەسانێك هاتن بەردەوامی بە رێگاکە بدەن. رۆمانی نوێ بەمانای ئاسایی وشە هی ئەو کاتەیە، واسی (٣٠) ساڵ بەسەر ئەو سادا تێ دەپەڕێت، زیاد لە سی ساڵە رۆمانی نوێ کۆتایی بە رێگای خۆی هێناوە، دیارە لەو بەرهەمانەی ئەوسادا شتی زۆر هەن شایستەی ئەوەن بخرێنە بەردەم باسو گفتوگۆوە.

**رۆمانی نوێ وەك قوتابخانەیەك، بزووتنەوەیەك، یان کۆمەڵە کەسێك کە یەکتریان دەناسی، چۆنی تاریف دەکەیت؟**

رۆمانی نوێ پێك گەیشتنی کەسانێك بوو لە گروی جیاوازو خوێندنی جیاوازو تەمەنی جیاواز، بەلام هەموو ئەمانە بۆ پێك هێنانی شت گەلێك کە لە چەند روویەکەوە لەیەکدی دەچوونو، بەرانبەر دیمەنە واقیعیەکانی سەردەم حەساس بوونو، لەشێوەدا لەوانی دی جیاواز بوون، بەلام هیچیان لە گروی سوریالیستەکانیان نەدەکرد. دەزانیت سوریالیستەکان هەموو رۆژێك لە دەوری یەکتری کۆدەبوونەوە، کەچی نووسەرانی رۆمانی نوێ یەکیان نەدەناسی، هەڵبەت دوای ماوەیەك ئەمانە یەکترییان ناسی، بەلام نەك وەکو گرۆیەکی گونجاوو رێکو پێك. رۆمانی نوێ قوتابخانە نەبوو، چونکە ئەگەر قوتابخانە بوایە پێویستی بە مامۆستایەکو چەند شاگردێك دەبوو. بە هەرحاڵ من لەشوێنێکی تر بووم، لەسەفەر بووم جار جارە دەگەڕامەوە پاریسو پەرۆشی بینینی نووسەرەکانی تر بووم، ئالان رۆب گریێم زۆر خۆش نەدەویست، بەلام پەیوەندیم لەگەڵ ناتالی ساروتدا خۆش بوو، ئەوم زۆر لاپەسەند بوو، هەموو نووسەرانی رۆمانی نوێ دەناسم، بەلام ماوەیەکی زۆرە زوربەیانم نەدیوە.

**هەموو ئەم شتانە لە دەوروبەری بنکەی بڵاوکردنەوە (می نوی) رووی دەدا.**

هەندێك لەو نووسەرانەی کە بەشداری بزووتنەوەی رۆمانی نوێیان کرد لە بنکەی بڵاوکردنەوەی می نوی بوون. سەرهەڵدانی بزووتنەوەکە لە مرۆیەکی زۆر یاخیەوە دەستی پێ کرد بەناوی بیکێت، زۆر کەسی گیرۆدەو پەرۆشی بوون، بە تایبەت خۆم، دوای بەرهەمەکانی ئەو، رۆمانەکانی روب گریێو رۆمانەکانی منو چەند کەسێکی دی چوونە سەر، بڵاوکراوەی بنکەی می نوی کلودسیمونیانی پەیدا کرد کە پێشان چوار کتێبی لای بڵاوکەرەوەکانی دی چاپ کردبوو، دوای ئەو ناتالی ساروتیان هێنا کە بنکەی بڵاوکردنەوەی گالیمار کتێبی بۆ چاپ کردبوو، بنکەی بڵاوکردنەوەی می نوی یەکێك لە کتێبەکانی ساروتی چاپ کردەوە بەناوی کاردانەوەکان، روبرپنژە (Pinget) یش لەو بنکەیە بوو، بەڵێ، ئەمانە لەو بنکەی بڵاوکردنەوەیەدا کۆمەڵێکیان دروست کردبوو، پاشان بنکەی بڵاوکردنەوەی می نویو رۆمانی نوێ لێك جیانەدەکرایەوە.

ئایا پێت ناخۆش بوو لە ریزی نووسەرانی رۆمانی نوێت دابنێن؟

تووڕەی دەکردم، چونکە هەستم بە نیسبەت جیاوازیەکانەوە. ناچار بووم مەسەلەکان بەراستو درووستی باس بکەمو رێگا نەدەم خەلکی دی کارم لیّ بکەن، لەلایەکەوە پێم خۆش نەبوو رەخنە لەوانی تر بگرم. بەهەرحاڵ هەمیشە بۆ تێگەیشتنی مەسەلەکان پێویستم بە زەمان هەبوو.

بیکیت لەم رووەو چۆن بوو؟ کەسێکی تەریك بوو؟

بەڵی بیکیت زۆر تەریك بوو، بەلام بایەخی زۆری هەبوو، یەکێك لەو هۆیانەی منی هاندا لە بنکەی بڵاوکردنەوەی می نوی کاریکەم ئەو بوو، بیکیت خۆی کتێبەکانی لەو بنکەیە چاپ دەکرد.

هاورێت بوو؟

ئەمناسی،بەلام هەرگیز هاوڕێم نەبووە.

کەسێکی وشلو جیدی بوو؟

وشك نەبوو، جیدیو بەبیانوو بوو، بەلام هەمیشە دەم بە پێکەنینو میهرەبان.

لە کۆتایی دیدارەکەداین، بۆیە پێم خۆشە باری سەرنجتان دەربارەی رۆمانی ئێستا بزانم، ئایا لە ئایندەی رۆمان گەش بینیت، یان لە زەمینەی ئەدەبیاتی چیرۆکدا هەست بەوەستانێك دەکەیت؟

لە ئایندەی رۆمان نەگەش بینم نەرەش بین، چونکە بەبروای من ئەوەی ئەمرۆ زیاتر گرنگە شتێکی دی جیا لە رۆمانە. ئەمرۆ بەرهەم گەلێك هەن ئەگەر چی بەرۆمانیان نێو دێر دەکەن بەلام زۆر جیاوازنو بێ کەلکیشە بە رۆمانیان ناو ببەیت.

دەتوانیت نموونەیەکمان پێ بڵێیت؟

بۆ نموونە هەندێك لە کتێبەکانی خۆم، لەرووی بازرگانیەوە دەبێت مەسەلەکە وا باس بکەین کە بڵاوکەرەوەکان مانا ئاساییەکەی رۆمانیان مەبەستە، رۆمانێك قازانجی لیّ بکەن. بەرای من ئەمە سنوورێکی هەیە، وابزانم شتی تریش لەبەرچاو گیراوە، بە تایبەت دەبێت ئاماژە بۆ ڤیدیۆ بکەم کە شایەنی سەرنج دانە.

ئایا نووسەران، نەك تەنیا رۆمان نووسان، چ بایەخێکیان دەدەیتێ؟

بەڵێ، زۆریان مایەی بایەخ پێ دانن، بەلام نازانم چۆن خانە بەندیان بکەم چونکەئەمە زەمانێکی زۆری دەوێت. ئەو شتانە گرنگن کە جیاکردنەوەیان لە یەکدی دژوارە، دەبێت لە گەڵیاندا رابێیت، چونکە ناچنە نێو دنیایەکی ئاساییەوە. بازدان بەسەر هەندێك قۆرتی رەخنەی ئەدەبی یان پەیوەندی کۆمەلایەتی کارێکی زۆر دژوارە، ئەنجام، پێناساندنی ئەو شتانەی کە بە راستی بایەخیان هەیە زۆر گرانە، ئێمە وا دەزانین لەبەر ئەوەی کەرەسەی پەیوەندی مۆدێرنمان هەیە ئیتر شت باش دەناسین، بەلام ئەمە راست نیە، ئێمە ئەوانە بەجۆرێکی تر دەناسین، چونکە لەهەندێك زەمینەدا ئانتروپوپی هەیە، بەو مانایەی قاوە قاوێك بەرەنگاری ئەو ناسینە دەکات. نموونەیەکتان پێ بڵێم:

لە تەلەفزیۆنی فەرەنساوە قسە لەسەر کتێب دەکرێت، هەڵبەت زۆرنا، هەردەبێت دەربارەی کتێب کەم بدوێن. ئەو کتێبانەی لەسەر تەلەفزیۆنەوە قسەیان لەسەر دەکرێت رێگا لەوە دەگرن لە بارەی کتێبی ترەوە قسە بکرێت. هەروەها رێگا لەوەیش دەگیرێت کە کتێب بدرێتە کتێب فرۆش.

بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی لەماوەی بەرهەمی مانگێکیدا لایەنی زۆر دە دوانزە کتێب دەست نیشان دەکات کە زوریەیان بەرێکەوت هەڵبژێراون، چونکە هیچ کەسێك دەرفەتی ئەوەی نیە بیر لە هەموو کتێبان بکاتەوەو بەراوردیان بکات، ئەم هەڵبژاردنە تا ماوەیەك رێگا لەکتێبی تر دەگرێت.

بەرنامەی کتێب فرۆشانی ئەمرۆی ئێمە بەم جۆرەیە، ئەگەر کتێبێك زوو نەفرۆشرا بەکارنایەت. کتێب بڵاو دەبێتەوە، بەلام وەك هیچ نەکرابێت وایە. بوونی کتێب نهێنیە، هەروەك چۆن لەکاتی داگیرکەرانی ئەڵمانو سەردەمی ستالیندا کەس نەیدەتوانی بیاندۆزێتەوە ئێستاش خەڵکی هەست بە بوونی کتێب ناکات.. ئەم شتە لەبارەی خۆمەوە زۆر راستی تیایە لە کەسانی دی.

زۆرکات ئەوانەی دەیانەوێت کتێبەکانیان بخوێنمەوەبۆم دەنێرن، بە ناردنی کتێبەکانیان پاساوی ئەوەیان هەیە ناچارم بکەن بیانخوێنمەوە، ئەگەرچی دەرفەتی خوێندنەوەی هەموویشیانم نیە، چونکە کتێبی زۆرم پێ دەگات، گەلێکی تریشم پێ ناگات، جا ئەمەیان یان لەبەر دەست نوقاوی بڵاوکەرەکەیە یان پێشەکی نووسەرەکەی دەزانێت

من رام چۆنە، بۆیە زۆر شتم ناگاتێو منیش تا بیست ساڵی تر دەتوانم بەردەوام بم.

راستە، هەمیشە نووسەرانێکی تایبەت لە تەلەفزیۆندا دەردەکەون.

لە تەلەفزیۆندا بەدەکان دەبینم، باشەکانیش هەردەبینم، بەڵام چاکەکان زۆرنین.

راتان بە گشتی بەرانبەر تەلەفزیۆن چیە؟ ئایا دەتوانیت بۆ سەردانی تەلەفزیۆن واز لەم خەڵوەتەی خۆت بهێنیت؟

من پەیوەندیەکی باشم لەگەڵ تەلەفزیۆندا هەیە، کێشەم بۆ سەردانی تەلەفزیۆن نیە، پاشان دەگەڕێمەو گۆشەی خەڵوەتخانەکەی خۆم.

لە کۆتایی ئەم وتووێژەدا پێم خۆشە داوات لێ بکەم رێنماییەکی نووسەرانی لاوی وڵاتەکەم بکەیت، بۆ نووسەرێکی لاو بۆ یەکەمین جار بەرهەمی تۆ دەخوێنێتەوە چ قسەیەکت هەیە؟ ئەگەر بتەوێت وەك دەستپێکردن یەکێك لە کتێبەکانت دەست نیشان بکەیت کامیان هەڵدەبژێریت؟

ئەوەندەی من بزانم هیچ کام لە کتێبەکانم نەکراونەتە فارسی، ئەگەر پێیان خۆشە بە زمانی فەرەنسی بیخوێننەوە -کە ئەمەیان چاکترە- با کتێبێك هەڵبژێرن کە خۆیان پەسەندی دەکەن، بەرای من کتێبی -گۆڕان- قسەیەکی زیاتری پێیە بۆیان، رەنگە زیاتر سەرنجیان رابکێشێت، بەڵام مەرجیش نیە لە کتێبەوە دەست پێ بکەن، با لەو کتێبە شاعیریەکانمەوە بێت. وای بۆ دەچم کتێبی -بلیمەتی جێگاکان- بۆ ئەوان زیاتر کاریگەر بێت.

١-"رامین جهانبگلو" یەکێکە لە نوسەرو بیرمەندە ناودارەکانی ئێران کە بە هەردوو زمانی ئینگلیزیو فەرەنسی دەنووسێ.

٢-ئەم دیمانەیەی لەگەڵ -میشیل بوتور- دا لە کتێبێکدا چاپ کراوە بەناوی (نقد عقل مدرن) کە بریتیە لە (٢٠) چاوپێکەوتن لە کۆی (٤٠) چاوپێکەوتن لەگەڵ بیرمەندانی ئەمڕۆی دنیا لە زەمینەی زانست، مێژوو، زانستی کۆمەڵ، سیاسەت، رەوشت، ئەدەب، بونیادگەریو.. کە لەماوەی دە ساڵداو لە دانیشتنی دۆستانەی خۆیدا سازی کردوون.

٣-ئەم دیمانەیەی لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٥دا سازداوە، لاپەرەکانی ٣٤١-٣٥٧ ی کتێبەکەی گرتۆتەوەو، حسین سامعی کردوویەتە فارسی.

سەرنج:

ئەم سێ گفتوگۆیەی لەگەڵ (ناتالی ساروتو ئالان رۆب گریێو میشیل بۆتۆر)دا سازدراون لەم سەرچاوەیەوە کراون بەکوردی: [نقد عقل مدرن: گفتگوهایی با اندیشمندان امروز جهان، رامین جهانبگلو، ترجمە: حسین سامعی، تهران- ١٣٧٦ (١٩٩٧)]

# کلۆد سیمۆن دەربارەی (ڕۆمانی نویٚ) دەدوێت

● و: فاروق هۆمەر

<u>ژیانی کلۆد سیمۆن</u>

کلۆد سیمۆن[1] لە ساڵی ١٩١٣دا لە تاناناریف لە (مەدەغشقەر) لە دایكو باوکێکی فەرەنسی لە دایك بووە. ئەو کاتەی کلۆد دەگاتە نۆ مانگی، بە ئێجگاری دەگەڕێنەوە فەرەنسا. لە دوای مەرگی باوکیەوە((لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا)) منالّی لە ناو چیاکانی برانسدا بردۆتە سەر. قۆناغی ناوەندیشی لە خوێندنگەی ستانیسلاس لە پاریس تەواو کردووە، لەو کاتەدا بایەخی بە وێنەکێشان داوە.

کلۆد هاوبەشی لە جەنگی جیهانی دووەمدا دەکاتو بە دیلی دەکەوێتە دەست ئەڵمانیا، لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٠دا هەڵدێتو دەگەڕێتەوە بۆ بربینیۆن، ئەمجا دەڕواتە پاریسو لەوێ وەك خانەدانێك تەماشا دەکرێ.

کلۆد یەکەم ڕۆمانی لە ساڵی ١٩٤٥دا بە ناوی ((فێڵباز))وە بڵاوکردەوە، لە ساڵی ١٩٦٧ یشدا پاداشی مدیسی لەسەر ڕۆمانی ((چیرۆك)) پیێ دەبەخشرێت، ئیتر لەو کاتەوە خەریکی بەجێهێنانی ئەو داوایانەیە کە بۆ وانە وتنەوە لە زانکۆکانی دنیاوە بانگێشتی دەکرێ.. ئەمەش وای لێ کردووە سەردانی گەلێ لە وڵاتانی ئەوروپاو یابانو هیندو ئەمریکا بکات.

کلۆد لە زانکۆی(ئاست ئانکلیا) لە نەرویچ دکتۆرای شەرەفی لە ئەدەبدا پیێ دەبەخشرێت.

ئەمەش ناوی ڕۆمانەکانێتی:

| | | |
|---|---|---|
| ١- فێڵباز | ساڵی ١٩٤٥ | لە چاپەمەنیەکانی ساجیتیر. |
| ٢- کۆلیڤێر | ساڵی ١٩٥٢ | لە چاپەمەنیەکانی کالمان. |
| ٣- هەڵۆ بەهارە | ساڵی ١٩٥٤ | لە چاپەمەنیەکانی کالمان. |
| ٤- ڕەشەبا | ساڵی ١٩٥٧ | لە چاپەمەنیەکانی نیوەشەو. |
| ٥- گیا | ساڵی ١٩٥٨ | لە چاپەمەنیەکانینیوەشەو. |
| ٦- ڕێگای فلاندەر | ساڵی ١٩٦٠ | لە چاپەمەنیەکانی نیوەشەو. |
| ٧- ئوتێلە گەورەکە | ساڵی ١٩٦٢ | لە چاپەمەنیەکانی نیوەشەو. |
| ٨- چیرۆك | ساڵی ١٩٦٧ | لە چاپەمەنیەکانینیوەشەو. |
| ٩- جەنگی فارزال | ساڵی ١٩٦٩ | لە چاپەمەنیەکانینیوەشەو. |
| ١٠- جەستە بەیەکگەیشتووەکان | ساڵی ١٩٧١ | لە چاپەمەنیەکانینیوەشەو. |
| ١١- ستاندی وێنەکێشان | ساڵی ١٩٧٣ | لە چاپەمەنیەکانینیوەشەو. |
| ١٢- لە شتەکانەوە | ساڵی ١٩٧٥ | لە چاپەمەنیەکانینیوەشەو. |
| ١٣- قەسیدەکانی جوتیارێك | ساڵی ١٩٨١ | لە چاپەمەنیەکانینیوەشەو. |

*** بەڕێز کلۆد سیمۆن، ئاگاداری ئەوەین کە لەبارەی تیۆریزە کردنی ڕۆمانەوە شتێکت نەنووسیوە، هەروەکو خۆت دەڵێی خۆشیت بە تەجریدو تیۆریزەکردن نایەت، لەگەڵ ئەوەشا دەمەوێ سەبارەت بە ڕۆمانەکانت بۆمان بدوێی، ئایا لات وانی‌یە ڕۆمانی نوێ[٢] بووبێتە قوتابخانەیەک‌و تۆش یەکێک بی لە نوێنەرانی؟**

– ناتوانم بڵێم بۆتە قوتابخانەیەک، بەڵکو دەکرێ بڵێم وەکو بزووتنەوەیەک هەیە، قوتابخانە مانای تیۆریزەو پراکتیزەکردن دەگەیەنێت، ئەمەش لەگەڵ ڕۆمانی نوێدا ڕووی نەداوە.

لە سەرەتادا هیچ یەکێک لە ئێمە یەکتریمان نەناسیوە، (ژروم لەندون)ی خاوەن دەزگای بڵاوکردنەوە، بەبێ یەکترناسینێکی پێش وەخت هەڵیبژاردبوین، کاتێکمان زانی هەندێ بیروبۆچووی لێکچوومان دەربارەی هەریەک لە ئەدەب‌و ڕۆمان هەیە. لە ڕاستیا ((ژروم لەندون)) بۆ زیاتر لە جارێک لە ماڵەکەی خۆیدا بۆ گفتوگۆکردن‌و بیروبۆچوون گۆڕینەوە کۆی‌کردینەوە((ئەمە بۆ پانزە ساڵێك لەمەوبەر دەگەڕێتەوە)) لە ڕێگەی دووبارە بوونەوەی گفتوگۆکانمانەوە بۆمان دەرکەوت کە هەریەکێك لە ئێمە لەسەر ڕەتکردنەوەی ژمارەیەك تێگە ((مفهوم))و بۆ چوونی تایبەت بە ڕۆمانی کۆن کۆک‌و تەباین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا کە هەر یەکێك لە ئێمە باسی ڕوانین‌و ئارەزووەکانی خۆی دەکرد بۆ ئەو کارەی کە دەیەوێ ڕاییەڕێنێت دانوومان پێکەوە نەئەکوڵا، ئەو پەڕی خۆشبەختی بوو کە ئەوە ڕووی نەدا، ئەگەر هەموومان یەك جۆر کارمان بکردایە ئەوە شتێکی ناخۆش‌و دڵتەزێن دەبوو.

*** دەڵێی ئەوەی کۆی دەکردینەوە ڕەت کردنەوەی ڕۆمانی کۆن بوو، دەکرێ هەڵوێستی خۆتمان دەربارەی نوێنەرەکانی دی بۆ باس بکەن؟**

– بەڕای من خوێندنەوەی کتێبەکانم کیفایەتە بۆ ئەوەی بە خێرایی بزانیت چی لەوانی دیم جوێ دەکاتەوە، لەوە زیاتر چی کە بڵێم؟

تێگەی ڕۆمانەکانم لە تێگەی هاوڕێکانم جوێ ترە.. ئەمەش بە پێچەوانەوە هەر درووستە لەگەڵ ئەوەشا تێگەیەکی لێکچوون بۆ شێوازی نووسین هەیە کە لە تێگە کۆنەکە ناچێت، هەرچی ئەمەی دواییانە (ڕۆمانی کۆن) داوای شتێکت لێ دەکات‌و دواجاریش دەبێ بە دەقێك گوزارشت لەو شتە بکەی.

هەموومان بیرمان لەوە کردەوەو هەستیشمان بەوە کرد – من تا ڕادەیەك بە تەم‌ومژاوی تر– کە زۆر سەختە لە واقیعا شێوەو ناوەڕۆك لێك دابڕکەین.. ئەمە بێ لەوەی کە لە ڕێگەی نووسینەوە زۆربەی ڕووداو و شتەکان ڕوو دەدەن‌و مانا یاوەخود بەشێکی مانا بەدەست دەهێنن.

*** کەواتە چۆن ڕۆمانەکانت دادەڕێژیت؟**

– ڕۆمانەکانم لەو کاتەیا دائەڕێژم کە سەرقاڵی نووسینیانم.. تۆ دەزانی هەموو شتەکان لە دەوری ئەو ئەفسانە زەمەنی‌یە خول دەخۆن کە یاسای ((گوزارشت– نواندنە)) یان کۆبوونەوەیە لە دەوریان.

ڕۆمانی کۆن هەوڵی نواندن‌و دووبارە نیشاندانەوەی حەقیقەت‌و گێڕانەوەی چیرۆك ئەدا کە لە ڕووی کۆمەڵایەتی‌و دەروونی‌یەوە دەلالەیەکی ئایدیالی هەلگرتووە. بەڵام ئەو چیرۆکە کە پێی دەگوترێ ئایدیالی بۆ خۆی ئەندێشەیە (ئەمەش هەمان پێناسەیە بۆ ڕۆمان) واتە ڕۆمان پشت بە ئیرادەی خێرخوازانەی نووسەرەکەی دەبەستێ بۆ ئەوەی لە هەر کاتێکدا بیەوێ چیرۆکەکە بۆ ئەو شوێنە ڕاگوێزێت کە خۆی ئارەزووی دەکات– بە واتایەکی دی هیچ گرنتی‌یەکی ڕاست‌و ڕەوانت پێ نابەخشێ– تەنانەت گرنتی‌یەکی ئایدیالیانەش. کەواتە دەشێ لێرەدا هەر شتێك هەڵە بێت یان ڕاست. پێم وایە ئەم جۆرە لە ئەدەب کەلکێکی ئەوتۆی نەبێ.

هەڵبەت دەکرێ بەردەوام گفتوگۆ لەسەر بیانوو هێنانەوە دەرونیەکان بەردەوام بێ، هەر بۆ نموونە: ئەمیل فاکێ پێی وایە کۆتایی ڕۆمانی (ڕەش‌و سوور)ی ستندال کە (کوشتنی خاتو ڕینالە بە دەستی ژولیان سورێل) کۆتایی‌یەکی بەتاڵە، زیاد لەوەی ڕێی پێدراوە. کەچی بە پێچەوانەوە هنری مارتینۆ دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی کە ئەمە دەکەوێتە ناو لۆژیکی کەسێتی‌یەکەوە.. ئەی بۆ نا؟ بەڵێ لەبەر چی‌و نەخێر بۆ؟

لە بەرابەریشدا پێم وایە دەروازەیەك بۆ چنگ کەوتنی ژمارەیەك ئاخاوتن واڵا بێ نەك لەبەر ئەوەی گرێدراوە بە پاڵنەرە دەروونی – لۆژیکی یان کۆمەڵایەتی‌یەکانەوە– بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەمە لە ڕێگەی لۆژیکی زمانەوە مەیسەر ئەبێ.

چونکە بڕوام وایە زمانەکان شتێکی ووشك‌و بێ تام یان مردوو نین چ جای زمانەکانی ئێمەی ئەورووپی بن یان زمانی خێڵێکی بەرایی بێ لە ئەمازۆن، هەروەها زانا ڕەگەز ناسەکانیش ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە.

زمان پێکهاتەیەکە یان ساختومانێکی حەقیقی‌یە.. دامەزراندنی مەعریفەیەکی حەقیقی دنیایە. لێرەشەوە دوو جۆر شتمان دەخاتە بەردەم کە ئەویش کەرەستەکان‌و ووشەکانن (کە هەر تەنیا لە شێوەی نیشانەدا نین بەڵکو لە شێوەی ((چەند گرێیەکی دەلالی)) دان ئەمە بە ڕای لاکان..).

مەبەستمان لە ((وێنەی ڕەوانبێژی – بلاغی)) بە شێوەیەکی گشتی خواستن‌و وێنە مەجازی‌یەکانە، واتە گواستنەوەی ماناکانە.

پوختەتر بڵێم بۆ من واخۆشترە یان لۆژیکی ترە، کار بۆ ئەوە بکەم توخمەکانی ڕۆمان لە ڕێگەی ئەو پەیوەندی‌یانەوە دابڕێژم کە لە ناو زمان خۆیدان.

هەر لە ڕێ زمانیشەوە دەکرێ بیانووەکانی خۆیان بهێننەوە. چونکە زمان دەرەنجامی ڕێکەوت نی‌یە بەڵکو بەرهەمی یان بابەتی ئەزموون‌و زانینی مرۆڤایەتی‌یە. کەواتە بە دڵنیایی‌یەوە دەڵێم زمان شتێکی مردوو نی‌یە. لەجیاتی ئەوەی هەوڵ بدەین چۆك بە زمان دابدەین بۆ مانایەکی پێش وەخت دیاری کراو وا پێویست دەکات لە ناوەوەیدا کار بکەین.. کاتێکیش کە لە ناو لۆژیکی زماندا دەجوڵێینەوە– هەوەکو چۆن لۆژیکێك بۆ زمانی بیرکاری هەیە–.

چەند مانایەکمان چنگ دەکەوێت نەك یەك مانا.. ڕۆلان بارت مانایەکی حەقیقی داوە بەم ووشەیە کە دەڵێ: کاری هونەری بە مانا ((جوڵاوە))کەیدا دەناسرێتەوە، واتە فرە مانایی، لە کاتێکدا کاری نا هونەری وابەستە دەبێ بە یەك ماناوە بەڵام لە شێوەی جیاجیادا.

*** ئایا نا ((ئاگایی)) هیچ ڕۆڵێکی لە داڕشتنی ڕۆمانەکانتا هەیە؟**

– بێ گومان.. چونکە ئەو دەمەی ووشەیەك لەگەڵ ڕستێك ووشەو وێنەی ترا کۆمەڵێك توانای پێکهاتەییم بۆ فەراهەم دەکەن

زنجیرەیەك هەڵێنجاندیشم لە پێشە. با بەو تێگەیەی لاکان ووشەی ((پەردە)) وەربگرین، دەشێ مانای پەردەی ژوور بگەیەنێ یان پەردەی شانۆ.. هتد.

کەواتە یەکێك لەو مانایانە هەڵدەبژێرم کە وشەکە بۆم فەراهەم دەکات، ئەمە کتومت وەك تیئۆرەی (کۆمەڵەکان) کاردەکات کە لە بیرکاریدا هەیە.

((بم بەخشە گەر لێرەدا کەمێك زیادە ڕۆیی بکەم))

بۆ نموونە: هەردوو کۆمەڵەی ((أوب)) یەکێك لە سێ گۆشە ڕەنگاوڕەنگەکان پێکدەهێنێت یەکێك لەم سێگۆشانە ڕەشەو ئەوانی دی بە شێوەی جیاوازن:- بازنەیی و لاکێشەیی و سێگۆشەیی..هتد.

لەم ڕێگەیەوە کرداری یەکتر برین لە نێوان دانە هاویەشەکانی هەردوو کۆمەڵەکەدا ڕوو دەدات. لەم یەکتر برینەشەوە دەچینە سەر یەککگرتنی هەردوو کۆمەڵەکە- کە لە هەموو دانە هاویەش و نا هاویەشەکانی هەر یەك لەم دوو کۆمەڵەیە پێکهاتووە.

ئیدی ئەم شێوەیە جار لە دوای جار دووبارە دەبێتەوە.. وانی‌یە؟

*** لەوە دەکات ئەم ڕێگایە بە شێوەیەکی تایبەتی بەسەر ڕۆمانەکانی ئەم دواییەتانا پراکتیزە بکرێ؟ لێرەدا بیر لە ((ستاندی وێنەکێشان)) دەکەمەوە کە کوڕێك خەریکی گەمە کردنە بە سێ گۆشەو کۆمەڵەکان ...**

- بەڵێ ئەو گرفتەی کە لە ستاندی وێنەکێشانا تووشم بوو بەم جۆرە لێی ئەدوێم: سێ کۆمەڵەی جیاوازم لەبەر دەستا بوو ((أ. ب. ج)) پوختە تر بڵێم کۆمەڵەی دێو کۆمەڵەی شارو کۆمەڵەی کەنار دەریا، بە ڕواڵەت هیچ پەیوەندی‌یەکیان لە نێوانا نەبوو، هەوڵمدا هەندێك پەیوەندی وا فەراهەم بکەم کە بۆی بکرێ ئەو کۆمەڵانە یەك بخاتو بشزانم ئەم یەککگرتنە چۆن ڕوو دەدات- هەروەکو ئەوەی لە بیرکاریدا دەبینرێت- ئەوەشمان لە یاد نەچێت زمانی بیرکاری وەکو زمانی ئەدەب تایبەتمەندی خۆی هەیە.

*** کەواتە ئەمە هەمووی ئاگایی‌یە..؟**

- دەڵێین ئەمە هەمووی ئاگایی‌یە، بەڵام ئەوە بەر لەو ڕێگایانە دەست پێ دەکات کە ووشە بە ئاڕاستەی جیاجیادا دەیخاتە بەردەستم. بێگومان لێرەوە نا ئاگاییم دەجولێ، واتە ئەو گرێو مەیلە سەر کوتکراوانەم کە بە هیچ کلۆجێك ئاگام لە بزافیان نی‌یە. وشەی ((پەردە)) وام لێ دەکات بیر لە وشەیەکی تر بکەمەوە، واتە بەهۆی یاریکردن بە لەفزەکانەوە - هەروەك لاکان دەڵێ - بێگومان هەڵبژاردنی وشەیەك لەناو وشەکاندا ئەوە دیاری دەکات کە بە پێی ئەو سیفاتو هۆکارانە بووە کە خۆم ئاگام لێیان نەبووە و ڕەگوڕیشەو سەرچاوەی ئەمەش بۆ خولیاکانم دەگەڕێتەوە.

*** لەم تێڕوانینەوە دەکرێ بڵێم تۆش وەك میشێل بۆتۆر لە بەرهەمەکانتا دان بە بەشێك لە نائاگاییدا دەنێی.. وشەیەك هەیە دەتەوێ گوزارشت لە خۆی بکات..**

- من ناڵێم ((گوزارشت)) دەبێ جارێکی تریش وریا بین و ئاگامان لەم دوو ووشەیە بێ: وشەی ((نمایش یان وێناندن)) (واتە وێناندنی سیمای جیهان) ...

وشەی ((گوزارشت کردن)) (واتە گوزارشت کردن لە سیمای خۆم) وشەی یەکەم واقعی‌یەو دووەمیشیان ڕۆمانسی‌یە. لەوە دەکات ئەم دوو حەقیقەتە لە واقیعا ناکۆك بن.

بەڵام هەردووکیان لە ئانو زەمانێکدا پشت دەبەستن بە چاودێری‌کردنی نمایش ((یان وێناندن)).. ئەم وشانە زۆر ترسناکن.

*** باشە بە چ وشەیەکیان ئاڵوگۆڕ دەکەی؟**

- با بڵێین وشەی بەرهەمهێنان.. لەوە دەچێ ئێمە ئیتر لەمەودوا بەرهەم نەهێنین، ئێمە لە ئێستادا بەرهەم دەهێنین، با کارەساتی ئینتیباعی‌یەکان بەیاد بهێنینەوە:- بۆ جەماوەر ئاشکرا بوو کە ئەمە هیچ شتێکی ئەوتۆ پێشکەش ناکات.

*** ئایا هیچ گۆڕانێك لە بابەتدا یاوەخود گۆڕانێکی پێکهاتەیی لە فرمیی ڕۆمانەکانتا ڕووی داوە؟**

- ئەوەی تایبەتە بە بابەتەکان کە من بە پلە دووی دائەنێم- کتێبەکانم ئامانجیان پێشکەشکردن و خستنە ڕووی بابەت نی‌یە - پوختر ئەمە گۆڕانێکی پێکهاتەیی‌یە - ئەم گۆڕانە لەگەڵ ڕۆمانی ((ڕەشەبا))دا دەستی پێ کردو بە شێنەییش هەستم بەمە کردو لە ڕێی ئەزموونەوە بۆم دەرکەوت کە من تیئۆریست نیم..هەموو ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە من لە ڕێی پرۆسەی نوسینەوە - بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ - ئەوەم نە گوتوە کە ویستوومە بیڵێم بەڵکو شتێکی کەم گوتوە. بە خۆم گوت: ((ئەمە چۆن ڕوو ئەدات؟))..

لە کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆوە لە پێشی کتێبخانەکەمدا دائەنیشم و لە کاتژمێر شەشی ئێوارەدا دەست ئەکەم بە نووسین، بەڵام ئەوەی کە نوسیومە ئەوە نی‌یە کە دەمەوێ بینووسم. بە پێچەوانەی زۆربەی خەڵکی‌یەوە کە دەربارەی خۆیان دەڵێن: (ناتوانم گوزارشت لە بۆچوونەکانم بکەم، ئەگەر توانیم گوزارشت لە بۆچونەکانم بکەم ئەوە شتێکی ناوازەیە).

بۆشم دەرکەوت ئەوەی کردوومەو ئەوەی ڕوو ئەدات زۆر باشترە لەوەی کە دەمویست بیکەم. بە خۆم دەڵێم ((ئەوە چی ڕوونەدات؟)).

ئیتر لێرەوە خەریك بووم بیر لەو شتانە بکەمەوە، لە دوای ماوەیەکی درەنگیشەوە بە فۆرمالیستە ڕوسەکان ئاشنا بووم کە بە باوکی زانستی زمانەوانی بونیادگەری دەژمێردرێن..

بۆ نموونە: تینا تۆف دەڵێ:

خواستەکانی بیناکردنی زمان کۆی ئازادی‌یەکانی داهێنان کە لەبەردەم نوسەردا فەراهەمن بەرەو تەنگ بوونەوە دەبات، لە واقیعا دەگوترێ: مەرامی نووسەر یان ئارەزووە بەرایی‌یەکان بێ لە مادەیەکی خام چی‌دی نی‌یە.

کەواتە بەم شێوەیە دەست پێ دەکەین((بەمەش دەگوترێ پاڵنەر)) ئەمەش لە یەك ساتا واقعی بایەخ دانی نوسەرە بە زمان و ئیلتیزام کە لە ڕۆنانی ڕستەو دامەزراندنی ئەو ڕستانەدایە کە لە کتێبەکەدان.

هەموو ئەمانە لە بەرایی نوسیندا، مەرام و ئارەزووەکانت بەرەو ئاڕاستەیەکی دی دەبات و شتێکیشی لێ دەخولقێ کە تۆ هەرگیز نەتویستوە.

*** کە بۆخۆی بە حەقیقەتێك دەژمێردرێ؟**

- بەڵێ خۆی دەبێتە حەقیقەتێك.

*** هەڵوێستت بەرامبەر بە ڕەخنە بە گشتی و ڕەخنەی فەرەنسی بە تایبەتی چۆنە؟**

- دەبێ جیاوازی لە نێوان ئەو ڕەخنەیەدا بکەین کە بۆ یەکەم جار دەڵێم ڕەخەیەکی بێ کەڵکە، (ئەگەرچی خەریکە بەرەو

پێشیشەوە دەچێ).. لەگەڵ ئەو ڕەخنەیەدا کە بە مانای وشە ڕەخنەیە.. وەك ڕەخنەکانی (ریکاردۆ - بارت - دی کی - ژێنێت - لەگەڵ هەندێ هەوڵدانی تر)) ئەمانە یاریدەیان دام بە تەواوی خۆم بناسم ((بەتایبەتی ریکاردۆ)).

*** کەواتە کەڵکت لە کۆمەڵێك ڕەخنەگر وەرگرتووە؟**

- بەڵێ.. دەمەوێ دەستخۆشی لە ڕیکاردۆ بکەم کە وای لێ کردم بە ڕوونی ئەو شتانە بینم کە بە شێوەیەکی جوان خستومنەتە ڕوو، یاوەخود وێنەم گرتوون و پێشتر بۆم نەکراوە بە باشی دایانبڕێژم.

*** زۆر جار ڕۆمانی نوێ گلەیی[٣] ئەوەی لێ دەکرێ کە بە مانای سارتەری ئیلتیزامی پشت گوێ خستووە.. بە بۆچوونی ئێوە ڕۆڵی نوسەر لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا دەبێ چۆن بێ؟**

- پێم وایە دەبێ ڕۆڵی نارەزایی و ڕەخنەگرتن بگێڕێ، بەڵام بەو بۆچوونەی بارت ئاماژەی بۆ کردووەو تیا دەڵێ: ئێمە هێرش ناکەینە سەر کۆمەڵگای بۆرژوازی بە زمانەکەیەوە. چونکە ئەوە وەهمە.

مایاکوفسکی دەڵێ ((هونەری شۆڕشگێڕی بە بێ شێوازی شۆڕشگێڕی بوونی نییە)) ڕۆڵی نوسەر ئیلتیزام کردنە بە ئەدەب و نوسینەوە.

بارتیش لێرەدا شتێکی جوان دەڵێ: لە جیاتی ئەوەی جۆرێك لە مشەخۆر بی بەسەر ئەو ئامازانەوە کە بۆرژوازیەت داهێنەریان بووە ((دروستکەری زمان بە یاوەخود نۆزەرەوەیبە)) بە بڕوای من ئەوە ئیلتیزامی حەقیقی‌یە.

*** لە کتێبی ((ژێی دەمارگیری))دا ئەم بیرۆکەیە دەخوێنینەوە:**

**((پێم وایە ئەوەی لە بەرامبەر ئەوانی ددی‌دا لە بالاترین ئاستی بۆگەنی و ناچیزەیی‌دا وەستاوە ئەوکەسەیە کە بە پێی ئارەزووەکانی جەماوەر دەنوسێ و دەدوێ و وێنە دەکێشێ نەك بە پێی ئەوەی خۆی دەیەوێ بیڵێ)).**

**ئایا ئەم بیرۆکەیە ئەوە ناگەیەنێت کە لە نوسینی ڕۆمانەکانتا خوێنەرت پشت گوێ خستبێ؟**

- ئەوە ناکرێت! نوسەری نوێخواز یان داهێنەری حەقیقی ئەو کەسەیە کە بۆ هیچ کەسێك نانوسێ. ئەگەر هەموو ئەوەی کە دەینوسێت بە تەواوی تازە بێت ئەوا هێشتا جەماوەری نییە.

*** شیکردنەوە بەناوبانگەکەی بروست کە جەماوەر یان زۆرینەی جەماوەری پێ پێناسە کردووە ئەوەیە: کە حەزیان لە دووبارە بوونەوەیە. فرۆیدیش لێکۆڵینەوەیەکی جوانی لەسەر ئەو دژە کردارە منالانەیە بە ئەنجام گەیاندووە.**

- بروست لە (خانمەکان لە هەرەتی لاویدا) شیکردنەوەیەکی جوان بۆ ((سۆناتا)) بچکۆلەکەی فنتوی دەکات و دەڵێ((کە بۆ یەکەم جار گوێبیستی بووم سەرسامی کردم.. دوایی بۆم ڕوون بۆوە کە زۆر شتی دی هەن لەوە دەچن.. دڵنیا بووم ئەوەشی کە بە دڵم نەبووە لە ئەوپەڕی جوانی و ئاسکیدا بوون)).

ئەوەی لە واقیعا سەرسامی نەکردووم و نەیترساندوم شتێکی تازەیە.. لێرەدا بروست دەڵێ کاری ئەدەبی ئەوەیە کە خۆی جەماوەر بۆ خۆی دروست دەکات. ئەگەر کاری ئەدەبی لە دەمی دەرکەوتنیا نوێ بێ ئەوا جەماوەر لێی خڕنابێتەوەو ناشکرێ جەماوەریشی هەبێت - ئەگەر گرنگیمان بە جەماوەردا ئیتر بەرەو ئەوە هەنگاو دەنێین کە وەك ((ڕۆژنامە زەردەکانی)) ئینگلتەرە یان وەك ڕۆژنامەی ((سامیدی سوار))ی فەرەنسا بنوسین. ئێمە شتی خراپ ئەنجام نادەین.. وانی‌یە؟

ئەمە لە کۆمەڵگای بەکارهێندا پێی دەگوترێ ((لێکۆڵینەوە بازاڕی‌یەکان)) ئەمەش سۆز ڕاکێشانی جەماوەرە.

*** با بگەڕێینەوە بۆ ((ستاندی وێنەکێشان)) ئەم ناونیشانەت بۆچی هەڵبژارد؟**

- لە ساڵی ڕابردوودا لە کاتی سەردانما بۆ پێشانگەی فەرەنسیس بیکۆن لە پاریس بیرۆکەی نووسینی ئەم کتێبە سەری هەڵدا، زۆر لە تابلۆکان لە ژێر ناوی ((ستاندی وێنەکێشان)دا بوون. ئەم ناونیشانە لە کاتی خۆیا سەرنج ڕاکێش بوو. لە سەرەتادا لە شێوەوە دەستم پێکرد.. ویستم کتێبێك بنووسم لە سێ ساختومان پێکهاتبێ: لە سێ چیرۆك یان لە سێ کۆمەڵە.. هەروەك چۆن ستاندی وێنەکێشان سێ پێچکەی هەیە. لە کلێساو لە زۆر شوێنی تریش ستاندی تابلۆکانم بەوجۆرە دەبینی - ئەم بابەتە دووبارە دەبۆوە - ئەمە زنجیرە مێژوویەکی هەمە جۆر بوو لە ژیانی یەکێك لە قەشەکانەوە یان لە ژیانی چەند قەشەیەکەوە یان لە ژیانی خەڵکانێك وەرگیرابوون، هەمیشەش پەیوەندی‌یەکی حەقیقی لە نێوان ئەو سێ تابلۆیەدا هەبوو.. واتە ئەگەر ڕەنگی سوور لە تابلۆی لای ڕاستدا هەبێت.. ئەمە کتوپڕ دەمانبات بۆ ڕەنگی سور لە تابلۆکەی لای چەپداو لێرەوە زمانێکی ڕوون و دەستورێکی ڕەسەن دەخوڵقێ یان ڕەسەنایەتی‌یەك کە هەموو ئەو تابلۆیانە کۆدەکاتەوە.

ئەمە ئەوشتە بوو کە هەوڵمدا جێبەجێی بکەم، کاتێك بە شێوەیەکی ڕەها شوێنێك لە شوێنەکانم جوانتر سەیر نەکردووە.. یان لە کاتی نووسینی کتێبێکدا هەست بەوە دەکەین شتێکمان لە یاد کردووە.. لێرەوە بیر لە نووسینی کتێبێکی تر دەکەینەوە. لە کتێبی یەکەمدا ((جەستە بەیەکگەیشتووەکان)) ڕۆمانەکەم بەو جۆرە نووسی، واتە چەند کۆمەڵەیەك لەبەر دەستما هەبوون بەڵام بە شێوەیەکی لەبەر چاوتر سەیری یەکێك لە کۆمەڵەکانم کرد.. واتە شەقامێکم لە شارێکی گەورەدا بە باشتر زانی کە پیاوێکی ماندوی پیا تێئەپەڕێ، ئەمە یاریدەی ڕەخنەی‌دا کە بیخەینە خانەی واقع بینی‌یەوە. ئەمە لە ((ستاندی وێەکێشان))دا نە ئەکرا چونکە هەمیشە وەهم وەکو ئەندێشە خۆی نیشان ئەدا.

*** لە یەکێك لە دیمانەکانتا کە گۆڤاری ((ئەدەبی فەرەنسی)) لەگەڵتا سازی دابوو گوتوتە ((کاتێك ڕۆمانێك تەواو دەکەم .. من دەیخولقێنم و ئەویش من دەخولقێنێ)) مەبەستت لەمە چی‌یە؟**

- ئەمە شتێکی ئاسانە.. ئەو من دەخولقێنێ.. واتە شتێکی وام بەسەر دێنێ کە خۆم ئارەزووم لێی نەبووە. لە ڕێی زمانەوە ئەم شتە ڕوودەدات.

هەروەکو تینانۆف دەڵێ (هەر لە سەرەتاوە ئارەزووەکەم دەبێتە مادەیەکی خام) کەواتە ڕۆمانەکە تەواو دەبێت بەڵام هەر بە تەنیا بۆخۆی نا.. من لە ڕێگەی کارکردنەوە لە زماندا دەیخولقێنم.

زۆرجار کاری نوسەرم بەو کەسە بەراورد کردووە کە تۆپێك بە دیوارێکدا دەکێشێ بەڵام - دیوارەکە ساف نییە - لە جێی ئەوەی تۆپەکە یەکسەر بگەڕێتەوە بۆ لای، جارێك بۆ لای ڕاستی و

جارێك بۆ لای چەپی دەڕوات. بە بڕوای من ئەوەی لێرەدا گرنگە کەوتنە شوێن ئەو پێشنیارانەیە کە زمان بۆت فەراهەم دەکات.

کەواتە ڕۆمانەکە تەواو دەبێ بەڵام وەك چۆن من خولقاندوومە ئەویش منی خولقاندووە، چونکە کاتێك کە خەریکی نوسینی ڕۆمانەکەم دەبم تەنانەت لە کاتی تەواوکردنیشیا زۆر شتی لێدەگۆڕم، سەلماندنێکی ئاشکرایە کە ئەم ڕۆمانە وەك ڕۆمانەکانی پێشووتر نی‌یە. بۆم دەرکەوت زۆر شتم لێ وون کردووە کە دەکرا ئەوشتانە زۆر جوان بن، واتە ڕۆمانیش من دەگۆڕێت. پێم وایە نوسین مانای دۆزینەوە دەدات، واتای دۆزینەوەی شتێکە، دۆزینەوەی خودی ئەو شتەیە.. هەروەها ڕووت بوونەوەی ئەو شتەیە لەبەردەم ئەوانی دیدا.

*** زۆر جار لە ڕۆمانەکانتا هەندێك هەڵقەی دەربارەی جەنگ تیایەو چەند دەربڕینێکیشی تێ کەوتووە لە زمانە بێگانەکانەوە خواستراون. ئایا هاوبەشی جەنگت کردووە؟**

– بەڵێ هەروەك چۆن کەسایەتی‌یە سەرەکی‌یەکانی ڕۆمانی ((ڕێگای فلاندەر)) دەجەنگێن منیش لە تیپی سوارەدا جەنگاوم. سەرهەنگە سەربازی‌یەکانی فەرەنسا بە گەلۆری‌و دڵڕەقیان دا دەناسرێنەوە، بە سواری ئەسپەوە ڕەوانەی شەڕی زرێپۆش‌و فڕۆکەکانیان کردین.

*** بێ لە زمانی فەرەنسی بە چەند زمانی دیکە قسە ئەکەی؟**

– زمانی ئینگلیزی بەڵام بە شێوەیەکی خراپ.. لە منداڵیمدا باشتر قسەم پێ دەکرد.. بۆ ئەگبەتی زۆر قسەی پێ ناکەم.

*** ئەی زمانی ئیسپانی؟**

– بە ئیسپانی دەخوێنمەوە.. بەو زمانە ئینگلیزی‌یە خراپەم تا ڕادەیەك دەتوانم کارەکانمی لە لەندەن‌و ئەمریکاو هند پێ ڕایی بکەم.

*** پرسیارێکی گرنگ هەیە خەریك بوو لە یادم بچێ: یادەوەری چ ڕۆڵێکی لە ڕۆمانەکانتا هەیە؟ چونکە ئێستا ڕەخنەگرەکان لە بارەی یادەوەری‌یەوە دەدوێن..**

– من خۆم لە بارەیەوە دواوم‌و بۆم دەرکەوت شتی بێکەڵکم گوتوە ... لە کۆتایی‌دا تێگەیشتم ئێمە شتێك نانوسین یاوەخود باسی شتێك ناکەین کە لە ڕابردوودا ڕووی‌دابێ. ئێمە لە بارەی ئێستاوە دەنووسین.. بە مانایەکی تر لە بارەی ئەو پاشماوانەوە کە شتەکان لە ئێمەدا جێیان هێشتووەو ئیدراکیش بە ئارەزووی خۆی شێواندویەتی. ئیدراکمان بە تەواوی پێنەگەیشتووە چ لە ڕووی دەروونی‌یەوە بێ یان لە ڕووی جەستەیی‌یەوە. چاوەکانیشمان بێ لە چەند شتێکی کەم ڕێگەی بینینمان پێ نادەن – ئەمە بێ لە تواناکانی دی– لە دوایی‌دا یادەوەری دۆشدائەمێنێت. کەواتە شتێکی ئێستایی دەمێنێتەوەو دەست دەکەین بە نووسینی.. هەموو ئەمانەش جارێکی تر دەبنەوە بە ((خواستەکانی بیناکردن)) هەروەك تیناتۆف ناوی لێناوە.

*** کەواتە مەسەلەکە پەیوەندی بە گەڕانەوەی ساختومانی ڕابردووەوە نی‌یە؟**

– ئاه نەخێر.. هەتاوەکو بروستیش لە ((گەڕان بە دوای زەمەنی وون بوودا)) نەیدۆزیوەتەوە.. هۆکەشی زۆر ئاسانە.. چونکە ئەوە مەحاڵە، بەڵام لە بەرامبەری ئەوەدا بروست شتێکی کەی دۆزی‌یەوە

*** چۆن دەڕوانیتە ئەو لێکۆڵینەوانەی کە گروپی ((تیل کێل))[٤] ئێستا بۆ ڕۆمانی دەکەن؟**

– زۆر باشن بەڵام بە تێڕوانینی من تیئۆری‌یە.. واتە تا ڕادەیەك پشتیان بە تیئۆریزەکردن بەستووەو زۆر بایەخیان بە پراکتیك نەداوە ((ئەمە ڕایەکی ڕووتی منە)) ئەگەرچی تیاشیا سەرکەوتوو نەبن.. ئەمە لە هەندێ جۆری سەرکەوتن سەرنج ڕاکێشەرترە.

*** ئایا پەیوەندی‌یەك لە نێوان ڕۆمانی نوێ‌و لێکۆڵینەوەکانیاندا دەبینیتەوە؟**

– بەڵێ.. لەو ڕووەوە هەموو ئەو بایەخانەیان لەبەر چاو گرتووە کە زمان لە خۆی گرتووە..

*** بە بێ هودەیی هەوڵمدا ((ئوتێلە گەورەکە))و ((ڕێگای فلاندەر)) بە دەنگێکی بەرز بخوێنمەوە: هەندێك ڕستە هەبوون تەواو بوونیان بۆ نەبوو، لێرەوە چ ئامۆژگاری‌یەکت بۆ خوێنەری ڕۆمانەکانت هەیە؟**

– چی بڵێم ... زۆر بە سادەیی ئەڵێم با بیخوێننەوە. ئەوەی لێی دڵنیام ئەوەیە کە ناکرێ لاپەڕەکان هەڵبدەینەوە چونکە ڕۆمان بە گشتی بە شێوەیەکی باش دارێژراوە، ئەگەر پارچەیەکی ڕۆمانەکەشمان ون کرد ئەوە ناتوانین ڕوداوەکان یەك لە دوای یەك بە باشی بخوێنینەوە. سەرباری ئەوە ((هەروەکو فرانسوا گۆست ئاماژەی بۆ کردووە)) کاتێك باسی ڕۆمانەکانم دەکرێ لە (نەخشەوانی شارەکان) بۆ نموونە: بابەت لە لاپەڕە ٣٦دا هیچ دەنگدانەوە یەکیت یاوەخود پاڵنەرێکیت بەدەست ناکەوێ ئەگەر لە خوێندنەوەی بەردەوام نەبی.. واتە لە دوای ٨٠ یان ١٢٠ لاپەڕە ئەمجا دەگەیتە شتێك.. بەڵام کە خوێنەر لەبەردەم ڕەخنەیەکی خودی دا ڕائەوەستێت ئەوکاتە بە بڕوای من خوێندنەوەکە ئاسانتر دەبێ بەڵام – بە مەرجێ لەناو ڕۆمانەکەدا بە دوای شتێکی نەبوودا نەگەڕێت، مەبەستم گەڕانە لە دوای ڕۆمانی کۆن.

پەراوێزەکان:

١– لە ڕۆژنامەی (الجمهوریە) دا لە ١٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٦دا بە بۆنەی بەخشینی پاداشتی ((نۆبڵ)) هوە بە کلۆد سیمۆن دیمانەیەکی لەگەڵ سازکراوە.. بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ڕۆمانی نوێ‌و ناسینی کلۆد سیمۆن دەتوانیت بڕوانیتە ئەو ڕۆژنامەیە.

٢– قۆناغی زێڕینی ڕۆمانی نوێ دەکەوێتە نێوان ساڵانی (١٩٥٤–١٩٦٤) و پێنج نوێنەرە ناسراوەکەی بریتین لە ((میشێل بیتۆر – ڕۆبەرت بنجیە – ئالان ڕۆب گریێ– ناتالی ساروت – کلۆد سیمۆن)) دەربارەی ناتالی ساروت‌و ڕۆمانی نوێ بڕوانە ڕۆژنامەی ((ژیانەوە)) ژمارە ((٢٤))ی ١٩٩٨/٩/٥.

٣– بێ لە نوسەرانی ڕۆمانی نوێ ئەم ناوانەشیان دوا خراوە کە هەندێکیان زیاتر بۆ ناو زڕاندنیان بووە.. وەك ((نوسەرانی دژە ڕۆمان – ئەو نوسەرانەی بایەخ بە شتە بۆگەنەکان ئەدەن – ڕۆمان نوسەکانی قوتابخانەی بۆگەنی.. هتد)).

٤– تیل کێل – گۆڤارێکی ئەدەبی‌یە – بە عەرەبی مانای (کما هو) دەگەیەنێ.

سەرچاوەکان:

١– ((حوار فی الروایة الجدیدة)) نوسینی ((ریمون ئالاهو)) – وەرگێڕانی بۆ عەرەبی ((د. نزار صبری)) دار الشؤون الثقافیة العامة – بغداد ص٦١–٧٢.

٢– ((کلود سیمون)) گۆڤاری ((الثقافة الاجنبیة)) ژمارە ((٣)) ساڵی ١٩٨٧.

# قەیرانی سینەمای ئەوروپی

● و: کەریم عومەر

ئایا هونەری فیلمی ئەوروپی مردووە؟ سی ساڵ بەر لەئێستا بیر لەم پرسیارە نەدەکرایەوە. یانە هونەریە جەماوەریەکان بەئارامیەوە چاوەڕوانی فیلمی دەرهێنەرە مەزنەکانی وەك مایکلانجیلۆ ئەنتۆنیونیو ئینگمار بیرگمان و لویس بونێلو فیدریکو ڤیلینیو جین - لوگ گوداردو ئالین ڕێنساسو ئەندرێ تارکۆفسکیو فرانسوا ترافوتو لۆچینۆ ڤیسکۆنتیو ئەندرێز وادجاو چەندینی تریان دەکرد. لەئیتالیا سەردەمی زێرینی سینەما بوو. (شەپۆلە نوێکان) لەفەرەنساو ئینگلتەراو چیکۆسلۆڤاکیادا دەرکەوتبوونو لەئەڵمانیاش لەئاسۆدا بوو. بەرەنگاری گەشەسەندنی هونەری سینەما لەو کاتەدا پەیوەندی هەبوو بەو شۆکەی(صدمە) کەمۆدێرنیزم لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە لەهونەردا دروستی کردبوو..

بەهەمان شێوە دۆزینەوەی بیرۆکەی وەك: نامۆبوونی مەدەنیەتو داڕوخانی دەروونی لەشێوازێکدا کەخۆی لەگێڕانەوە دەدزیەوەو سیمبۆلیزمی هەڵبژاردو ئاڵۆزی بەباشتر دەزانی لەداخستن. بینەرێکی نوێی فیلم خوڵقابوو کەخۆشی لەتەقەللاو حاڵی بوون دەبینی زیاتر لە هەڵاتنێکی پاسیڤانە. سینەما لەم سەردەمەوە هەڵقوڵابوو.



ئینگمار بیرگمان



فرانسوا ترۆفۆ



تارکۆفسکی

بەڕاستی شێوە هونەرییەکەی سەدەی بیستەم بوو، جۆرێک کاری بەرهەم دەهێنا کەجۆرێک لەخوێندنەوەی چڕوپڕو بایەخی زۆری دەدایە شێوەو ناوەڕۆک وەک چۆن لەوەوبەر لەکارە مەزنەکانی ئەدەبدا ئەمە بەدی هاتبوو.

بەلگەی ئەم دەست نیشانکردنەش گەشەکردنی خۆیەخۆی بلاوکراوە ڕەخنەیە جدیەکان بوون لەبارەی فیلمەوەو لەگەڵ نەشونمای کۆرسەکانی فیلم لەهەموو ئاستەکانی خوێندنی دونیای سینەما.

## سەرەتای داڕوخان

((شەپۆلی تازەو هەمان زەریا)) ڕایموند دورگانتی ڕەخنەگر بەم چەند ووشە کەمە بۆچونی خۆی دەربڕی. لەگەڵ هەموو ئەو جموجولانەش، دەست هاتەکان(انجازات) نەیانتوانی بەردەوام بن‌و هۆکارەکانی ئەم داڕوخانەش زۆر و جۆراوجۆر بوون. زەحمەت بوو بەرانەت‌و ئایدیالیزمی(نەوەی نوێ)ی فەڕەنسی بەدەست بهێنرێتەوە چونکە دەرهێنەرەکان پیرترو بەئەزمونتر دەبوون، بێگومان ئەو بزوتنەوە سیاسیە توندوتیژەی پاریسی مانگی مایسی ١٩٦٨ شوێن دەستی خۆی جێهێشت، ئەو مێژگردە ڕەخنەییانەی لەبارەی فیلمەوە دەکران بابەتەکانیان گۆڕا لە ئیستاتیکاوە بۆ ئایدۆلۆژیا.

هەر لەهەمان ساڵدا داگیرکردنی چیکۆسلۆڤاکیا لەلایەن ڕوسیاوە بووە هۆی وەستانی(شەپۆلی نوێ)و مردنی لەجێی خۆیدا. لەکۆتایی ئەو گرێیەدا لەبەریتانیا پارەی ئەمریکی لەسینەما نیشتمانیەکانمان کێشرایەوەو قۆناغی شەستەکان بەرەو نقوم بوون دەچوو. ئەو گۆڕانی مودەش هەستی پێدەکرێت لەڕێی (ژیان گەرایی) فیلمەکانی ناوەڕاستی شەستەکانی(ریچارد لیستەر بێتڵس)و ئەو خەمۆکیە گەورەیەی(ژووری دانیشتن‌و نوستن)ی کۆتایی شەستەکانی هەمان هونەرمەنددا.

بەدەر لەچەند فاکتەرێکی سیاسی‌و بازرگانی تایبەت، ڕەنگە هۆکارێکی تری داڕمانی هونەری فیلمی ئەوروپی ئەو گۆڕانە بێت کەلەچێژو کەشی ڕۆشنبیریدا ڕوویدا. ئێستا ئێمە پۆست ـ مۆدێر نیستەکانین. لەم زەمەنی مودێرنەی کەئیدعای یەکسانی‌و دروستی دەکات لەڕووی سیاسیەوە خودی بیرۆکەی هونەرو شاکارو شەریعەت نەک تەنها کۆن دێتە بەرچاو بەلکو بۆنی دەست بژێری‌و تەنانەت ئیمپریالیزمی کولتوری‌یان لێدێت. ئەمە بەو مانایە نایەت کەدەبێتە ڕێگر لەبەردەم هونەرمەندێکی خۆتەرخان کردو بۆ فیلم‌و ناهێلێت بەردەوام بێت لەسەر ڕونیای خۆی بەلکو بەو مانایەی کە ئەو ئەتمۆسفیرەی ئەو هونەرمەندە کاری تێدا دەکات بەقەد جاران گونجاو نیە بۆ کارکردن. بەلام بێگومان فاکتەری گەورە دەتوانرێت لەیەک ووشەدا کورت بکرێتەوە: ئەمریکا.

## کاریگەری ئەمریکا

ئەمەی هەر ئێستا ووتمان لەیەکێک لەجموجۆلە گەورەکانی فیلم دا لەئەوروپای پاش جەنگدا پێشبینی کرا

ئەویش لەسینەمای حەفتاکانی ئەڵمانیادا کەلەلایەن فاێزنەر هێرتزۆگو ڤیمو ڤیدەرزو ڕەینەر ڤێرنێر فاسبیندەرەوە پێشڕەوی دەکرا. یەکێك لەبیرۆکە باوەکانیان کاریگەری بەربڵاوی ئەمریکابوو لەسەر کولتووری ئەورووپی. لەکارێکی وەك فیلمی(ترس ڕۆح دەخوات)ی فاسبیندەردا هەموو توانای خۆی ئاراستە دەکات بۆ مۆدێکی ملیۆدرامی ڕەخنەگرانە لە(دۆگلاس سێرك)ی دەرهێنەری هۆلیوۆد کەزۆر شەیدایەتی. لەفیلمێکی وەك(هاوڕێی ئەمریکی)دا کەلە ڕۆمانێکی(پاتریسیا هایسمان)ەوە وەرگێڕاوە، ڤیم ڤێندەرز تانوپۆ(حبکة) یەکی سەرسوڕهێنەری دەروونی دەگێڕێت بۆ چیرۆکێکی ڕەمزی بەئەمریکا کردنی ئەڵمانیای خۆرهەڵات. ئەمەریکا وەك (هاوڕێیەکی) پاش جەنگی ئەڵمانیا هاتووە لەڕووی ئابورییەوە ڕزگاری بکات بەڵام ڕۆحی لێ دەدزێتەوە. لەفیلمێکی تری ڤێندەرزدا لەهەمان ماوەدا بەناوی(پادشاکانی ڕێگا) یەکێك لەکارەکتەرەکان دەڵێت:

ئەمەریکییەکان هەستیان داگیرکردوین ڕەنگە لەنەوەدەکاندا بگەشتایە بەو دەرەنجامەی کە(هەست)یشیان داگیرکردووە.

ئەگەر هەموو هەفتەیەك بڕوانینە ئەو دەزگای ئاماری فیلمەی کەلە گۆڤاری Screen Internationalی بازرگانیەوە دەردەچێت، بێگومان بەلایەنی کەمەوە حەوت یا هەشت لەو فیلمانەی لەلوتکەدان ئەمریکین فیلمی ئەمریکی لەزۆربەی وڵاتە ئەورووپییەکاندا جەماوەری زۆرتری هەیە لەو فیلمانەی کەلە ناوخۆی ئەو وڵاتانەدا بەرهەم دەهێنرێت.

پێشتر فیلم بەرهەم هێنەرەکانی وەك(ڤێندەرز) دژایەتی خۆیان ڕاگەیاند لەدژی ئەو حاڵەتە: گومانێك کە هەندێك کات بە(کۆکار کۆلونیال کردن) ناودێر دەکرا. ئەمەشان بەشانی ئەو شەیداییە زۆرەی بەرامبەر دەرهێنەرە ئەمریکییەکانی لەجۆری(ئەنتۆنی مان)و(نیکۆلاس ڕەی) هەبوو. بەڵام ئێستا کاردانەوەکان دابەش بوون بەسەر دوولایەندا: لایەنگری کردن و دژایەتی کردن.

## کاردانەوە بۆ هەیمەنەی ئەمریکی

(دوسان ماکاڤیێف)ی دەرهێنەری گەورەی خۆرهەڵاتی ئەورووپا دەڵێت/ گەر بەرگەی گەرما ناگریت، لەچێشتخانەکە بچۆرە دەرەوە. ژیان لەسەدەی بیستەمدا واتە فێربوونی ئەوەی چۆن ئەمریکی بیت. ناوبراو بەرهەم هێنەری(W.R نهێنییەکانی ئۆرگانیزم)ە و پێیدەچێت لەناکامی کارەکانیدا لەئەمریکا هەر لە فێربووندا بێت. پەیامەکەی ئاشکرایە، پەنابەر هەوڵ دەدات کاری باشتر بکات یان هەوڵ دەدات پێشبڕکێ بکات گەر بەزاراوە بازرگانیەکان بدوێین. فەرەنسیەکان بەڕادەیەکی نسبی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە لە بەرهەم هێنانی فیلمی ئەمردا وەك: (جێرمینال)و (شازادە مارگۆت) کەلەهەمان کاتدا خۆشی بەخش بوون و مێژووی خۆیان نەفی دەکردەوە. سەرکەوتویەکی تر(جیراردا دیپاریو)یە کەتاکە ئەکتەری فیلمە ئەورووپاییەکانە کەدەتوانێت پێشبڕکێ بکات لەگەڵ هاوتاکانیدا لەهۆلیود. سەرباری ئەوەش چەند هەڵاوێردەیەك(استثناء)هەیە بۆ ئەم یاسایە، ئەویش وەك ئەو شەعبیەتە گەورە دەولیەی کەفیلمە ئاست مام ناوەندیەکان هەیانە کە زیاتر باس لەئایین و ڕۆمانسیەت دەکەن وەك(چوار ئاهەنگی زەواج)و (پرسەی) مایکڵ نیوێلو (پۆستەچی) مایکڵ ڕادفۆرد. ئەو فیلمانەی هەرچەندە گوێی نەداوە بەڕۆحی ئاسکی مرۆڤ بەڵام ئاسودەگی بەخشیوە بەو جەماوەرەی کەسەر مەستی ئەو دیمەنانەن کەتا ئەوپەڕی جێی سەرسامیەتی.

ڕێگەیەکی تری هەیمەنەی ئەمریکی لەلایەنگریدا خۆی نابینێتەوە بەڵکو لەبەرەنگاری کردنەوەیەکی توندا.(ئەگەر مافی هەڵبژاردنم بدرێتێ لەنێوان ئەوەی هۆلیوۆد هەڵبژێرم یاخود دەرزی ستیل بکەن بەچاومدا، ئەوە دووەمیان بەباشتر دەزانم). ئەمە قسەی(مایکڵ لەی)ی دەرهێنەری خەڵاتکراوی ڤیستڤاڵی(کان)ی ساڵی(١٩٩٦)ە کەلەسەر فیلمی(نهێنییەکان و درۆکان) خەڵاتکرا. ئەم دەرهێنەرە لەنەوەدەکاندا لەوڵاتەکەی خۆیدا دەرکەوت و لەبارەی بابەتی(شخصی)یدا کاری دەکرد.(بواری تایبەتمەندی لێکۆڵینەوەی تراژی - کۆمیدی پەیوەندییەکانی خێزانە) دیاریتر(کێن لۆچ)ە کە لە١٩٦٩دا فیلمێکی بەناوبانگی بەناوی(kes) دەرکرد کەبەهۆی ئەوەوە زۆر ڕێزی لێدەگیرێت. لەنەوەدەکاندا گەڕایەوەو خەڵاتی باشترین فیلمی ئەورووپی پێبەخشرا لەسەر فیلمی (rif ruff) لەساڵی ١٩٩٠داو فیلمی(زەوی و ئازادی) لەساڵی١٩٩٥دا. لەفیلمێکی وەك(بەرد بارین)دا نیشانیدا کە بەردەوامە لەسەر ڕەخنەگرتن لەبارەی بێبەش بونی باکوری ئینگلتەردا لەمەدەنیەت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕۆڵ گێڕانە دیاریکراوەی ئەو فیلمانە هەیانە لەوڵاتەکانی خۆیاندا(وەك ئەو مشتومڕە گەرمەی لەبارەی - زەوی و ئازادی - یەوە دروست بوو) ئەوە نیشان دەدات کەخودی بەرهەم هێنەران لەدژین.

## ڕەخنەکانی سیمنت

(مایکڵ سیمنت)ی ڕەخنەگری دیاری فەرەنسی لەموحازەرەیەکی بێ ئەملاولادا لەفیستیڤاڵی فیلمدا لەکامبرج لە١٩٩٦دا دەنگێکی بەرەنگارانەی دیاری هەبوو. سیمنت کەپاڵەوانێکی مەزنی سینەمای کلاسیکی هولیود بوو پێی وایە بەشێك لەو خەمەی هەیمەنەی شاشەی

ئێستای ئەمریکا ئەوەیە کەئەمریکا خراپترین فیلم لەمێژووی خۆیدا بەرهەم دەهێنێت. تەنانەت گۆڤارە بەناوبانگەکانی فیلم دەستیان هەیە لەم هەیمەنەیەداو ئەویش لەڕێی شەیدایی زۆریانەوە بۆ فیلمی ئەمریکی‌و ئەکتەرەکان. ئەمەش لەسەر حسابی ئەوەی لەووڵاتەکانی خۆیاندا ڕوودەدات. بەڵام بەرگریەکی لاتیرادی‌و لاوەکی لەو گۆڤارانە کرد چونکە وێنەیەکی خەمناکی حاڵەتی ئێستای سینەمای ئەورووپی دەکێشن. سینەمای ئیتاڵ تارمایی ئەوەکانی پیشویەتی‌و هیچ کەسێك نیە شان بدات لەشانی مەزنی هونەری باروکی فیلینی ڤیسکۆنتی.،(بێرتولوسی)ش سست بوو بوو. هەروەها ڕەوتی ڕیالیزمی نوێ تروسکایەکی کەمی ماوەتەوەو ئەویش بەهۆی(گیانی ئەمیلیۆ)و دوو خەلاتکراوی تری ئەورووپی کەفیلمەکانیان بیرخەرەوەیەك بوو بۆ مافی سروشتی سینەما کەپرسیاری کۆمەلایەتی(محرج) بکات لەبارەی سزادانی قورس‌و گەندەڵی مەدەنی‌و ڕەقی دادگاو شتی‌تری لەو بابەتە. لەئەڵمانیا تەنها(مایکل ڤێرهۆڤن) بەشێوەیەکی داهێنەرانە مامەڵەی بیرۆکەی وەك(تاوانی پاش جەنگ)ی کردووە ئەویش لەڕێی فیلمی(کچێکی هار) لەساڵی١٩٩٠دا کەخۆشیەکی ئەوتۆی پێبەخشین کەبیست ساڵ بەر لەئێستا بەبەردەوامی لەئەڵمانیا کاری لەو جۆرە دەکرا. ئیسپانیا چەند دەرهێنەرێکی لاوی بەتواناى هەیە بەڵام سادەو ڕووکەش دەکەونە بەرچاو ئەمە جگە لە بەدەستهاتەکانی بونێل‌و ساورا. سینەمای ئەسکەندەنافی مردووەو مردووش ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات. لەپاش هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم، سینەمای ئەورووپی هێشتا لەگەڕاندایە بەدوای بابەتدا. بەریتانیا هەندێ توانای باشی هەیە بەڵام هێندە کەم فیلم بەرهەم دەهێنن کە ناتوانرێت بەبەڕەنگاری کردنەوەیەکی جدی دابنرێت.

ڕەنگە کەسێك مشتومڕیکات لەبارەی ئەم ڕاگەیاندنە گشتگیرەی(سیمنت)ەوە بەڵام پرسیارە گەورەکە ئەوەیە ئایا ئەوە جێی بایەخە؟ ئەمەش پشت دەبەستێت بەوەی ئاخۆ سینەما وەك پیشەسازیەکی مەزنی خۆشی بەخش کەمەبەستە سەرەکی‌یەکەی بەدەستهێنانی قازانجە سەیر دەکرێت یان وەك ئامرازێك کەڕۆڵێکی گەورەی هەیە لەشوناسی کولتوری ووڵاتەکەیدا. ئەگەر وەڵامەکان یەکەم بوو ئەوە زۆر زەحمەتە قەناعەت بەحکومەت یا دەزگا بازرگانیەکان بکەین کەبەشێوەیەکی مادی پشتگیری لەپیشەسازی فیلمی ناوخۆ بکەن لەبەرامبەر پێشبڕکێی ئەمریکیدا. بازاڕ بڕیار دەداتو ئەگەر جەماوەر فیلمی ئەمریکی هەڵبژارد ئەوە مافی خۆیانەو داوایەکە دەبێت تێریکرێت.

(سیمنت) پێی وایە مشتومڕی پێچەوانەی ئەمە دەگوڕێت بۆ هەڵوێستێکی سەرەکی جیاواز: هەرچەندە ڕەنگە فیلم بخزێتە قوتووەوە بەڵام نابێت وەك پاقلەی برژاو سەیریکرێت‌و ئەوەی ئێمە باسی لێدەکەین بازاڕی بازرگانی نیە بەڵکو کەلەپوری ڕۆشنبیری‌یە.

## بەهرە ئەورووپیە نوێکان

بەپێچەوانەی زۆربەی ووڵاتانی ترەوە فەڕەنسا هەمیشە سینەمای بەجدی وەرگرتووەو وەك فۆرمێکی هونەری سەرەکی‌و تۆمارکەری سەردەمەکەی مامەڵەی کردووە. حکومەت پشتگیری خۆی نیشانداوە بۆ زیادکردنی بەرهەم‌و جێ‌و ڕێی تایبەتی لەو بارەیەوە گرتۆتەبەر وەك باجدانان لەسەر تیکتی سینەماو شێوازی خۆپاراستن لەڕێی باجەوەو پەیڕەوی‌کردنی سیستەمێکی تایبەت کەژمارەی ئەو فیلمە نێودەوڵەتیانە دیاری دەکات کەدەبێت لەشاشە ناوخۆیەکانەوە نمایش بکرێت. قازانجی ئەم جۆرە پشتگیری‌یە ئاشکرایە. ئێستا چالاکیەکی فراوان‌و هەمەلایەنی سینەمای زۆر هەیە لەفەڕەنسا. نەوەی نوێی دەرهێنەرەکان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا لەوانە(ماتیو کاسۆڤیتز) لەڕێی لێکۆڵینەوەی مولکیەتی نیشتەجێبوون لەپاریس لەفیلمی (ڕق)دا هەروەها·جۆسەین بالاسکۆ) لەڕێی ڕەنگینی‌و جۆراوجۆری ڕۆمانەکانی لەسەر سێگۆشەی خۆشەویستی(کەدەکاتە مێرد، ژن، دۆست).

نمونەیەکی خەمناکیش(کریستیان پاسکاڵ)ی ئەکتەر بوو کەپێش وەخت‌و لەتەمەنی چل‌و دوو ساڵیدا کۆچی دوایی‌کرد لەکاتێکدا کەلە گەشەکردندا بوو بۆ بوون بەنووسەرو دورهێنەرێکی گەورە. فیلمەکەی(شازادە بچکۆلەکە وای ووت) کەلە١٩٩٢دا بەرهەم هێنراوە دەربارەی کچێکی تەمەن دەساڵەیە کەبە نەخۆشی دەماغ دەمرێت یەکێکە لەفیلمە زۆر خەمگینەکان لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لەو فیلمانەی زۆر کەلایەنگری ژیان دەکات‌و مرۆڤ خوازیاری بینینیەتی. لەهەمان کاتدا ئەوانەی لە(نەوەی نوێ) مابوونەوە هەر چالاك بوون. ئێریك ڕۆهمەرو ئەلەین ڕێسنایس‌و جاك ڕێڤیت ناوبانگی خۆیان بەدەست هێنایەوە وەك باڵی ڕۆشنبیری هونەرمەندە کۆنە پارێزەکان.

ناشرینی بۆرژوایەکانیش هەر وەك خۆی مایەوە وەك چۆن(کلۆد چابرول) پیشانی دەدات لەڕێی(حوکمی بەردین)ەوە(کلود ستاوت)ی بەئەزمونیش هەوڵ دەدات خۆشی بەڕێگەیەکی نوێ بەدەست بهێنێتەوەو لەڕێی فیلمی(دڵێك لەزستاندا) پێشبڕکێی کارە دەولیەکان دەکات، هەوروەها لەڕێی فیلمە نوێکەی(نێلی‌و م.ئارنواد) کەگەڕانێکی وورد و نوێیە لەپەیوەندی‌یەکانی نێوان مرۆڤدا.

کەواتە لەئەوروپادا کەموکوڕی نیە لەبەهرەدا. مایکلّو وینتەبۆتم (ماچی پەپولە)ی لەئینگلتەراو دانیبۆل(سێبەری گۆڕ) لە سکۆتلەنداو لانس فۆن ترایەر لەدانیمارک(ئەوروپا، شکاندنی شەپۆلەکان)یان بەرهەم هێنا. ئەمانە چەند ناوێکی کەمن کەکارەکانی سەرەتایان توانای مەزنیان دەردەخات. هەروەها هەردوو دەرهێنەری فیمەنستی مەزن(مارلین گۆریس) لەهۆلەندا کە(هێلی ئەنتۆنیا)ی لەسالی ١٩٥٥دا بەرهەم هێناوەو (مارگریتافۆن ترۆتا) کە(پەیمان)ی لە١٩٩٤دا بەرهەم هێناوە بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە گەرانەوە گۆرەپانەکە. پرسیارەکە ئەوەیە چۆن ئەم بەهرە سروشتیو تواناییانە گەشە پێبدرێت لەکاتێکدا سینەمای نیشتمانی ململانێی مانەوە دەکات. باریۆ و باجو پەیروکردنی سیستەمێکی تایبەت کەژمارەی فیلمە بیانیەکان دیاریدەکاتو پشتگیری حکومەتو تەنانەت یانسیبی نیشتمانی رۆلی خۆیان هەیە. بەلام ئایا رێگایەك هەیە سینەمای ئەوروپی خۆی لێوەدەربازبکات؟

## ئامانجەکانی داهاتو

ستراتیژیەکیتر هەیە وەك ئەو فیلمە بەدبەختەی(ئیستڤان سنوابۆ)یە کەناوی(چاوپێکەوتنی ڤینۆس)ەو لە١٩٩١دا بەرهەم هێنراوە، ئەم ستراتیژیەتەش بریتیە لەوەی هونەرمەندانی دەولەتانی جیاواز پێکەوە کۆدەبنەوە بۆ کارکردن لەیەك فیلمدا بەلام ئەم ستراتیژەش شکستی هێنا. ئەکتەرەکان بەئینگلیزیەکی شەقوشڕ قسەدەکەن. دەنگە رۆشنبیریە جیاوازەکان زیاتر لەململانێدان وەك هاو ئاهەنگیوە دواجار فیلمەکەش تامێکی تایبەتی خۆی نیە. جۆرێکیتری هاریکاری سەرکەوتوانە بریتیە لەوەی چەند دەولەتێکی ئەوروپی جیاواز کۆمەکی فیلمێك دەکەن بەبێ سووربوون لەسەر کاریگەری کولتوری، لەو فیلمە نوێیانەی کەخەلات کراون وەك(Underground)ی ئیمیل کۆستاریکاو (نیگای یولیسیس)ی ثیو ئەنجیلۆ پۆلیوسو(Leconfessional)ی رۆبێرت لێپاج. لەم فیلمانەدا سەرچاوەی جۆراوجۆر کۆمەکی فیلمەکانی کردووە بەبێ ئەوەی هاوسەنگیەك هەبێت لەتایبەتمەندی ئەو کارانەدا.

جۆرێکیتری ئەم جۆرە کۆمەکە ئەوەیە کەدەولەتانی ئەوروپی جیاواز بەفیلمی کورت بەشداری دەکەن لەکارێکدا لەلایەن دەرهێنەر بەهرەمەندە نوێکانیانەوەو ئەو کارانەش لەرێی بیرۆکەیەکی هاوبەشەوە بەستراون بەیەکەوە.(خۆشەویستیو رق: چەند چیرۆکێکی



فدریکۆ فیللینی

خۆشەویستیە) بەرهەمی سالی ١٩٩٥ەو یەکێکە لەو نمونانەی کەئەنەرویچو پۆلەنداو دانیمارکو سوید بەشدارییان تێدا کردووە.

بەشێوەیەکی چاوەروان کراو تاریکترین دەنگ لەیوگسلاڤیای پێشووەوە هات لەرێی فیلمی(بەرازەکانو ئەلماسەکان)ەوە کەلێکۆلینەوەیەکە دەربارەی تەماعو توندوتیژیو فریودان.

لەهەموو ئەمانەش بەناوبانگتر(هەنگاوەکان)بوو کەلە پۆلەنداوە هات کەباس لەپەیوەندی نێوان سەماکەرێکی بالیەو بەرهەمهێنەرە عاشقەکەیو مامۆستایەکی پێشووی دەکات کە سەماکەی لێتێك دەدات کاتێك لەبارێکی هەرزان بەهادا سەما دەکات، ئەمەش گەشە دەکات بۆ چیرۆکێکی رەمزی لەبارەی بیرۆکەیەکەوە کەپەیوەندیەکی زۆری هەیە بەباری ئێستای سینەمای ئەوروپیەوە: ئەویش قەیرانی هونەرمەندێکی داهێنەرە لەبازاری ئازاددا.

کەیەکەم جار مامۆستا سەما لەقوتابیە کۆنەکەی تێك دەدات کەلەیانەیەکی شەوانەی هەرزان بەهادایە پێی دەلێت: ئەمە ئەوروپایە).

قەیرانی ئەم سەردەمە نوێیە بریتیە لەوەی پارە نەك ئایدۆلۆژیای سیاسی رۆلی هەیەو هەلومەرجەکە بەشێوەیەکە کەهونەرمەند یان دەبێت بەگوێرەی تۆنی بەرهەم هێنەرەکەی سەمابکات یان دەبێت شوێنێکی نوێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە لەم کەلتورەدا. ئەمە ئامانجەیەکی

بچوككراوەی ئەو بیرۆكەیەیە كە ناوەرۆكی یەكێك لەدەسهاتە هەرە مەزنەكانی سینەمای ئەورووپی نەوەدەكانە تا ئێستا، ئەویش سێینەی(سێ ڕەنگ)ی كوزیستۆف كیسلوسكی‌یە كە تیایدا لەچاوی تاراوگەنشینێكی پۆڵەندیەوە، دەرهێنەر هەوڵ دەدات وێنەیەكی ژیانی ئەورووپی ئەمرۆمان بخاتە بەردەست.

## دەسهاتەكەی كیسلوسكی

سێ ڕەنگەكە ڕەنگەكانی ئاڵای فەرەنسایین شین واتە ئازادی‌و سپی واتە یەكسانی‌و سور واتە برایەتی. فیلمەكە لەپەیوەندی نێوان ئەم چەمكانە دەكۆڵێتەوە لەژیانی خەلكداو دەپرسێت ئاخۆ هیچ كەسێك لەواقیعدا ئەم شتانەی دەوێت. لە شیندا بێوەژنی دانەرێكی مۆسیقی بەناوبانگ(جولیت بینوچی) هەوڵ دەدات خۆی لەهەموو ئەو كۆتە ئازاردەرانە ڕزگاربكات كە دەیبەستێتەوە بەژیانی ڕابردویەوە. ئەمەش وەك ڕێگەیەك بۆ زاڵ بوون بەسەر خەفەتدا بەلاّم ئەو كۆتو بەندانە لێی نابنەوە. لەسپی‌دا پۆڵەندیەك لەپاریس هاوسەرەكەی جێهێشتوەو بێ‌پارەو پول ماوەتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ پۆلەندا بۆ ئەوەی دووبارە دەست پێ‌بكاتەوە لەسەر بنەڕەتێكی یەكسان بەلاّم ئەو یەكسانی مەبەست نیە.

دەخوازێت لەوانی‌تر یەكسانتر بێت‌و بەخێرایی وەك بازرگانێكی هەلپەرست دەبوژێتەوە. لەسوردا، دادوەرێكی خانەنشین كراو كەناوی (جان لویس ترینتگەنت)ە پەیوەندی‌یەكانی بەجیهانی دەرەوە تەنها لەبەدزیەوە گوێگرتن لەتەلەفۆنی دراوسێكانی‌دا خۆی دەبینێتەوە. ئەم پیاوە ژیانی تەنیایەكەی هەژاوە بەهۆی دەركەوتنی قەدەریانەی(ئیرین جاكوب)ی مۆدیلێكی كچەوە كەسەگەكەی كردووە بەژێرەوە. ئەو هاوڕێیەتیەی لەئاكامی ئەمەدا دروست دەبێت پرۆسەی دووبارە هاتنەوە ناو ژیانی لێدەكەوێتەوە. بەڕێگەیەك لەڕێگەكان ئەو سێ فیلمە لەبارەی بیرۆكەی سێ‌یەم فیلمەوەن ئەویش بریتی‌یە لەوەی چۆن ژیان ڕێگا نادات ببێتە سۆفی. بەلاّم ئەو دەزوەی كەچیرۆكەكانی پێكەوە گرێداوە پەیوەندی بەخۆشەویستی‌یەوە هەیە، ئەو ئازارەی هەلاّتن لێی مەحالّەو یەكجار زۆر پێویستە.

(شین) بەئیقاعێكی جوانی مۆسیقی خەمناك كۆتایی دێت كەیەكدەگرێتەوە لەگەل ئیقاعی درودەكانی ئینجلی سەنیت پۆلس بۆ كۆرنشی‌نەكان.

(ئەگەر خۆشەویستی نەبێت من نیم). ئەمەش ئەو مۆسیقایەیە كە مێردی پالەوانەكە داینا‌وە لەسەر یەكگرتنەوە ئەورووپا بەر لەمردنی. هەر ئەو مۆسیقایەشە كەپالەوانە كچەكە تەواوی دەكات. كورتكردنەوەی تانوپۆی فیلمەكان(انطباع)ێكی ئەوتۆ جێ‌ناهێلێت لەبارەی شێوازی فیلمەكانەوە. شین تێڕامانێكی مەزاجیانەیە لەبارەی خەمەوەو هەندێ جاریش بەشێوەیەكی چاوەڕوان نەكراو كال دەبێتەوە بۆ ڕەش. خەم لەمۆسیقاكەوە هەلدەقولێت.

بەكارهێنانی ڕەنگ وەك بەشێك لەشێوازێكی(گۆتاریانە) لەپارچە پارچەكردندا وەك ئەوەی باس لەكەسێكی تووڕەبكات كەهەول دەدات‌و شكست دەهێنێت لەداخستنی دەرگاكانی ڕابردوو و بێ‌دەنگ كردنی ئەو دنیایەی قایل نابێت بێ‌دەنگ بێت. سپی كۆمیدیایەكی ڕەشە لەبارەی ئەو ڕێگا درێژەی كەپیاوێك دەیبڕێت بۆئەوەی خۆشەویستی ئەو ژنە بەدەست بهێنێتەوە كەخۆشی دەوێت‌و پڕە لەسەرنجی نائاسایی‌و درێژەپێدانێكی سەیر.

(پالەوانەكە بەشاراوەیی لەجانتایەكدا دەنێردرێتەوە بۆ پۆلەندا، كەدەیكەنەوە فڕێی دەدەنە ناو زبلدانێكەوەو پالەوانەكە دەلێت: نیشتمان، پاش ماوەیەكی زۆر). لێرەدا ڕەنگە موفارەقەیەك هەبێت لەبارەی ئەوەی كەپالەوانەكە بێ‌توانایە لەفەرەنساو لەنیشتمانەكەی خۆیدا توانایەكی نوێ دەدۆزێتەوە لەگەڕانەوەیدا. هەندێ لەڕەخنەگرەكان شتێكی هاوچەشنیان لەبارەی خودی كیسلوفسكی‌یەوە ڕاگەیاند كە مشتومڕە سیاسی‌یەكانی پێشووی پۆلەندای بەباشتر زانیوە لەچێژی جوانی تایبەتی ئەورووپی. سوركارێكی ئالۆزی بونیادگەرانە لەبارەی بیرۆكەی پەیوەندی كردنەوە كەشتێكی درێژ لەڕێی تەلەفۆنەوە دەست پێ‌دەكات بۆئەوەی پەیوەندیە مودێرنە جیهانیەكانمان ڕوون بكاتەوە(بەشێوەیەكی دەلالیانە ئەو كەسەی كەبانگ كراوە لەوێ‌نیە تاوەلاّم بداتەوە) بەلاّم دواتر بیر دەكاتەوە لەوەی ئاخۆ تەكنۆلۆژیای ئالۆزی گەشەسەندوی پەیوەندیكردن كارێگەریەكی خراپی نەكردۆتە سەر توانای مرۆڤ بۆ پەیوەندیكردن پێكەوە. دادوەرە تەنها كەبەخۆی‌و ئامێری گوێگرتنەكەیەوە پێ‌دەچێت ئەو بۆچوونە دووپات بكاتەوە. بەلاّم كامێراكەی كیسلوفسكی كەحەساساترین ئامێری پەیوەندیكردنە نكولّی خۆی رایدەگەیەنێت ئەم سێینەیە دەسهاتێكی كامل نیەو ڕەنگە بوترێت كەلاوازیە هاوبەشەكانی هونەری سینەمای ئەورووپی لەخۆدەگرێت:

ووردی لەگەشەی تانوپۆداو شێوازێكی شەخصی لەوێنەگرتن داو ئالۆزیەك كەتووشی بێزاریت دەكات وەك لەشادمانی. بەلاّم ئەمانە ناتوانن لەبەهێزی‌و ئەو ڕێگەیەی

گرنگ نیە!
من دڵ خۆشم کە شاعیرم
ئاکامێکی ترم ناوێ
وشەکانم متمانەی رازدارانی ئاوێنەو زەریان
من تەنیا لەبەر هۆگری بەئازادی مرۆڤەوەیە
کە رۆحی رووناکی ماچم
بەبەر ئاوازی تینووەکاندا کرد
لە ناڵەی نەی ...
هەر ئەوەندە بۆ منی تێشکاو بەسە!

((١٨))
هێشتا
لە خۆوە چاوەڕێی ئەو کۆچەریە بێ شوێنە
دیسانیش چیرۆکێکی هیوای مرۆڤ بۆ دیداری مرۆڤە ... باسی من.
من دەڵێم
ئێوە لە هەر رێیەکەوە کە بووە نەچوون تا بزانن
بە دڵ شکاوی لە شەوی گریان تێپەڕبوون... یانی چی!
یانی چی ئەم چرایە
هەر لە کۆلانێکی بێدەنگی بە هەراو هوریا دانەپۆشیوە!

ئێوە تا کۆتایی ئەم کۆڵانە نەچوون
تاببینن – با –
ئەو –با – یە بە بن بەست گەیوە چۆن
سەر لە هەر دیوارێکی بێ دەرگاو بێ رۆچنە دەکوتێ!

ئەدی ئەمەچ پرسیارێکە
کە بۆ کەویی ئەم خەوە قورسە نابم؟
من نوێژی نیوەڕۆ
دەست بەسراو و دڵ شکاو.. گریانم پێواوە

دەی بۆچی هێشتا

نوسینەوەی ئەو کارە بۆ شاشە کارێکی چەوتەو کەسێك هەر تێگەشتنێکی هەبێت، نازانێت چۆن گەورەیی دەلالەتی کارێکی ئەدەبی دەگوێزرێتەوە. کەس ناتوانێت خۆی لەبەرامبەر تووڕەیی ڕای گشتی دابگرێت) ئەگەرێکی دوورە کەغەزەبی ئەم بەو فیلمە دامرکابێتەوە، بۆ نموونە شیکردنەوەی ئازایانەی(ئۆلیڤەر رید) بۆ(گیرالد کریچ) بەرادەیەك دوورە لەتێگەشتن و بۆچوونی(لیڤن) کەخەیاڵ بۆی ناچێت.

ئەوەی سەیربوو لەتووڕەبونەکەی لیڤزدا ئەوەبوو کەبەهەموو شێوەیەك دژی بنەڕەتەکانی ئامادەکردنە، لەئاکامدا دەگەینە ئەوەی بڵێین کەلیڤز هەمان ڕەت کردنەوەی دەربارەی ئامادەکردنەکانی(فێردی) سەبارەت بەشکسپیرو ئامادەکردنەکانی(بنجامین بریتن) بۆ ئەو دەرهێنانە ئۆپێرانەی سەر شانۆی کارە ئەدەبیەکانی(هینری جەیمس)و(هێرمان مەلڤل)و(تۆماس مان) دەبوو.

یاخود هەر مەسەلەکە ئەوەیە کەخۆشی دەبینی لە(لەخۆبایی بوونی) کولتوری؟

ڕەخنەگری فیلمی فەرەنسی(ئەندریە بەیزن) بۆچوونێکی تەواو پێچەوانەی هەیە لەم بارەیەوە. دەپرسێت ئەدەب چی لەدەست دەدات لەپەیوەندیدا بەفیلمەوە؟ تەنانەت ئەگەر فیلمەکەش خراپ بێت زیان بەدەقە ئەسڵیەکە ناگات. خۆئەگەر فیلمەکە باش بێت ئەوە ڕەنگە هانی خەڵك بدات بۆ خوێندنەوەی کتێبەکەو ئەمەش لەقازانجی ئەدەبدایە. بەسەرهاتی مامۆستایەك هەیە کەخوێندکارەکانی بردووە بۆ سەیرکردنی فیلمەکەی (فرانکۆ زیفرلی) کە(ڕۆمێو جولێت)ە کاتێك پرسیاری لەخوێندکارەکانی کرد لەبارەی بۆچوونیان لەبارەی فیلمەکەوە، ووتیان: (زۆر مەزن بوو، مامۆستا بەهیچ جۆرێك لەوەی شکسپیر نەدەچو) ڕەنگە مامۆستاکە دڵخۆش نەبووبێت بەم وەڵامە، بەڵام دەتوانین لەمەبەستی خوێندکارەکان بگەین. فیلمەکە ورووژاندنی بۆئەوەی شکسپیر بەجۆرێکی نوێ ببینن. ڕەنگە جۆرێکی سادەو ساکار بێت؟ لێرەدا دەتوانین بەراوردێك لەمۆسیقا وەربگرین. زۆر کەس حەزیان بەسەمفۆنیا لادێیەکانی(بیتهۆڤن) بووە پێش ئەوەی(فەنتازیا)ی(وارت دیزنی) یان بیستبێت، بەڵام ئێستا کەگوێیان لێدەبێت ناتوانن ئەو حۆریە فریو و خواوەندانەی مەزراکان لەمێشکیان دەربکەن. زۆر ڕەخنەگری بەناوبانگی مۆسیقی هەیە کەڕایانگەیاندوە لەو کاتەوەی کە بۆ یەکەم جار(فانتازیا) یان بینیوە زۆر شەیدای مۆسیقای کلاسیکی.

## میتۆدی نووسەری شاشە

کەواتە پێویستە میتۆدی نوسەری شاشە چیبێت بۆ کاری ئامادەکردن؟(دانیال ئارداش) کەزۆر بەتوانا بوو لەگۆڕینی ڕۆمانە داستان ئامێزەکانەوە بۆسەر شاشە، وەك(لێرەوە بۆ ئەبەدیەت)و(هاواری)، میتۆدو فەلسەفەی تایبەتی خۆی هەیە. ئارداش دەڵێت/ من هەوڵ دەدەم بیرۆکەی سەرەکی بدۆزمەوە، ئەو بیرۆکە تایبەتەی کەلەپشت نوسینێکەوەیە. هەوڵ دەدەم ئەو بیرۆکەیە بکەمە جوڵەو بەبێ ئەوەی زۆر ڕوون و ئاشکرا بێت). لێرەدا باس لە بەوەفایی و گواستنەوەی هەموو شتێك و وەرگێڕانی وێنەیی تانوپۆ ناکات. لێرەدا جەخت لەسەر تەئویل دەکرێت نەك دووبارە بەرهەم هێنانەوە. لەهەندێك لەو ئامادەکردنانەدا یەك بیرۆکەی گرنگی دەقە ئەسڵیەکە سەرنجی نوسەر یا دەرهێنەر بۆلای خۆی ڕادەکێشێت کەئەمەش پەیوەندی هەیە بەوشتانەی کەئەو دەرهێنەرە خۆی شەیدایەتی. لەدرێژەی مشتومڕەکانماندا لەسەر(ئامادەکردنی) ئەدەب دەگەینە ئەوەی کەیەکێك یان هەر سێ تایبەتمەندیەکەی خوارەوەی تێدایە. گرنگی دەدرێت بەڕۆحی کارەکە زیاتر لە دێڕ بەدێڕی دەقەکە ... کامێرا بەمەبەستی شیکردنەوەی کارەکە بەکاردێت نەك ڕوونکردنەوەی... ئەو پەیوەندیە دەقۆزرێتەوە کەلەنێوان مەزاجی هونەری و بۆچوونەکانی ڕۆماننوسەکەو بەرهەم هێنەرانی فیلمەکەدا هەیە.

## نمونەی دەیڤید لین

فیلمی(ئاواتە مەزنەکان) دیکنز بەنمونە دێنینەوە کەلە١٩٤٦دا بەرهەم هێنراوەو لای زۆر کەس مەزنترین کاری وێنەیی سینەمایی(دیکنز)ە. لین تەرکیز دەکاتە سەر دوو کەسێتی کەئەوانیش(پیپ)و(خانم هاڤیشام)ن کەدوو ڕۆمانسی بێهیوان. خانم هاڤیشام بەناوبانگترین بوکی جێهێڵراوە لەئەدەبدا. لەلای ئەو کات وەستاوە پاش ئەوەی کەجێی دەهێڵن لەڕۆژی ئاهەنگەکەیدا.. ئێشتێلای کچە خنجیلانەکەی بەشێوەیەك بەخێوکردووە کەدڵی پیاوان بشکێنێت تاتۆڵەیان لێبکاتەوە پیپ دڵی شکێنراوە لەلایەن ئێشتێلاوە.

کاتێك خانم هاڤیشام دیمەنێکی نێوان ئەو دوانە دەبینێت لەئازارەکەی پیپ دا دڵ شکانەکەی خۆی

دەبینێتەوەو دەڤیژێنێ: چیم کرد؟ ئەمە دوا ووشەکانێتی لەفیلمەکەدا کەدوا ووشەی کولونێل نیکلسون(ئەلیل جینز)ی شێتە لەفیلمی(پردێك لەسەر ڕووباری کوای)دا کەساڵی١٩٥٧ بەهەم هێنراوەو لەدەرهێنانی(دەیڤید لین)ە. هەردوو کارەکتەرەکە بەوەهم فریودراون‌و لەکۆتایی ژیانیاندا هەست بەگەورەیی هەڵەکەیان دەکەن.

بێهیوایی ڕۆمانسیانە بەشێوەیەکی دیار لەفیلمێکی پێشوتری(لین)دا ئامادەیە کەئەویش(یەکتربینینێکی کورت)ە کەلە ساڵی ١٩٤٥دا بەرهەم هێنراوە کەمەزنترین چیرۆکی خۆشەویستی بەریتانییە کەتیایدا هیچ ڕوونادات، نەك تەنها پەیوەندیە سێکسیەکەی نێوان کەبیانوەکەی قەراغ شار (سێلیا جۆنسن) لەگەڵ پزیشکەکەدا(تریڤەر هاوارد) ناگاتە ترۆپك بەڵکو ڕەنگە هەمووی بەشێك بووبێت لەخەیاڵی کەبیانوەکە. ئەوە هەمووی خەون بوو؟ بیرۆکەی خەو کاریگەری هەیە لەسەر مامەڵەی لێهاتوانەی ـ لین ـ بۆ ئەو کۆتاییە خۆشنودیە ئیشکالیەی(ئاواتە مەزنەکان)ی دیکنز کە ـ لین ـ وەك فەنتازیایەکی زاتی درکی پێ‌دەکات. ئەمەش بەدی هاتنی حەزێکی پاڵەوانە لەفیلمەکەدا کەبەشێوەیەکی هێندەکارامە ڕوودەدات ڕەنگە ئێمە بەگومان بین لەباوەڕپێهێنانی. هەستی ئاڵۆزی کارەکتەر لەڕێی تێکەڵ کردنی واقعیەت‌و ڕۆمانسیەت‌و بەدیهاتن‌و بەدینەهاتن دێت لەفیلمەکەدا. بێگومان ئەمە هەموو دیکنز ناگرێتە خۆی بەڵکو لێکدانەوەیەکی خەیاڵی‌و پێشنیارکراوی لایەنێکی دیکنزەکە ڕەخنەگرەکان وەك پێویست بایەخیان پێ‌نەداوە.

بەهەمان شێوە، دەرهێنانەکەی ڕۆمانی(گەشتێك بۆ هند)ی ئی.ئێم. فۆستەر لەساڵی١٩٨٤دا سەرنج ڕاکێشترین لایەنی ئامادەکردنەکەی بریتیە لەتەرکیزکردنە سەر ئەدیلاکوستید(جودی دەیڤز)ی کچە پاڵەوان. بەپێچەوانەی ڕۆمانەکەوە فیلمەکە دەست پێ‌دەکات‌و کۆتایی دێت بەبوونی ئەدیلا لەئینگلتەراو زۆر بەووریایی داڕێژراوە بۆ تانوپۆی چی بەسەر دێت(یانایەت) لە مارابار کافاس. وەك پاڵەوانە کچەکەی(یەکتربینینێکی کورت) هەموو شتێکی بەسەر دێت‌و هیچیشی بەسەر نایەت. ژیانی دەگۆڕێت‌و تێك دەچێت بەهۆی خەونە ڕۆمانسیەکانیەوە بەمانایەکی‌تر بەهۆی هستریا سێکسیە چەپێنراوەکەی. ئەوەی کە مەیلی(لین)ی دەجولاند ئەو هەست‌و سۆزە بوو کەلەودیو حیشمەتی کارەکتەری ئینگلیزیەوە بوو، ئەو دڵە ناکاملانە، هۆکارەکانی پەروەردەو نەشونماو کارەکتەری نەتەوەیی کەوای لێکردن بگەنە حاڵەتی نەخۆشیەکی بێ‌دەنگو مات.

هەوڵدەدات کەلەئارامی ماڵ‌ دووریان بخاتەوە، ئەمەش چەمکێکی ناڕوونی(لین)ە کەهەوڵ دەدات والەپاڵەوانەکانی بکات هەست بەسەیری شوێنەکان بکەن‌و بیانداتە بەرخۆر.

(هەروەك چۆن نویل کاودی هاریکاری) سەرنجی داوە کەئەو دانە بەرخۆرە کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر سەگی شێت‌و ئینگلیزەکان. لین دەرهێنەری ئایدیالی(لۆرانسی عەرەبی) کە لە١٩٦٢دا بەهەم هێنراوە کەئەویش فیلمێکە لەبارەی ڕۆحی شوێن‌و وەهمو شڵەژان‌و تێکچونی ڕۆمانێکی سەرابەوە، هەروەها ئەو ئینگلیزیەی بەڕۆژ خەون دەبینێت. لێهاتویی ئامادەکردنەکانی لین هەوڵی مەزن لەڕێی فیلمەوە لەبارەی ئینگلیزێتیەوە( وەك حاڵەتێکی سۆزداری) کە نزیك دەبێتەوە لەدەقەکە لەڕێی گۆشەیەکی فەردیەوە بەلام بەووردی کاردەکات لەبەرئەوەی گوزارشت لەخوێندنەوەیەکی شەخصی‌و تایبەت دەکات. ڕووناکیەکی نوێش دەهاوێژێتە سەر دەقەکە ئەسلیەکە.

## سنورەکانی ئامادەکردن

ئایا ئەوەندە بەسە؟ ڕەنگە ئەوانە هەوڵی سەنج ڕاکێش بن لەڕێی فیلمەوە لەبارەی کەسێتی ئینگلیزی بەلام ئایا فیلم لەبەهای ڕەخنە کۆمەلایەتیەکانی دیکنزو دژە ئیمپریالیزمەکەی فۆستەرکەم دەکەنەوە؟ نابێت ئامادەکردن گشتگیرتر بێت؟ ئەو نوسەرەی(جون فاولز) بناسێت بە(نەءە) وەلام دەداتەوە.

جۆن فاولز دەلێت/ ئەو دەرهێنەرەی کە دەبێت لێی بترسێن ئەوەیە کەدەلێت شەیدای کتێبەکەتم، نیازمە ووشە بەووشەی بکەمە فیلم).

فاولز هەر لەسەرەتاوە بۆی دەرکەوت سیناریۆ نوسین چەندە قورسە، ئەوکاتەی کەڕۆمانەکەی خۆی(The Magus)ی ئامادەکرد. شکستێکی هونەری‌و کارەساتێکی بازرگانی بوو. پیتەر سیلەرس لەو بارەیەوە دەلێت/(گەر هەلی ئەوەم بدرێتێ جارێکی‌تر بژیمەوە. ئەوە هەموو شتێك وەك خۆی دەکەم جگە لەسەیرکردنی ئەو فیلمە). نوسینی سیناریۆ کارێکی ئاسان نیە.

ئەلدوکس هیکسلی‌و ولیەم فۆکنەر وسکۆت فیتزەر جرالدر کریستەفەر ئیشوودو ناثانیال وێست کەلە ڕۆماننوسە هەرە گەورەکانی ئەم سەدەیەن هەوڵی نوسینی

سیناریۆی فیلمیان داوە لەگەڵ ئەوەشدا بەهەموویان یەك سیناریۆی سەرکەوتویان بۆ جێ‌نەهێشتوین.



ژان لۆك گۆدار

## کارەکانی هارۆلد پنتەر

(هارۆلد پنتەر)ی شانۆ نوس زیاد لەهەر کەسێکیتر سەرکەوتوو بووە لەهونەری(ئامادەکردن)دا. ئامادەکردنی رۆمانی(پێوەند)ی ئێل.پی. هارولد کەلە ١٩٧١دا بەرهەم هێنراوەو رۆمانی((خانمی ئەفسەرە فەرەنسیەکە)ی جۆن فاولز کەلە١٩٨١دا بەرهەم هێنراوە نمونەی سەرکەوتوی سیناریۆ نوسین. یەکەمیان چیرۆکی خیانەتو بەرائەتی وون بووە لەئنگلتەرای سەرەتای ئەم سەدەیەداو دووەمیان چیرۆکێکی خۆشەویستی ڤیکتۆرییە لەدیدێکی مۆدێرنیانەو بگرە پۆست ـ مۆدێرنیستی‌یەوە. پنتەر تارادەیەك هەردوو چیرۆکەکەی ئاخنیوە بەو تایبەتمەندیانەی کەلەکارەکانی خۆیدا هەستی پێ‌دەکرێتو خۆشیمان دەداتێ وەك سیحری کاتو بیرۆکەی چێنو دەسەڵاتو ئەتمۆسفێرێکی تەماویو هەرەشە ئامێزە ئەمە بەبێ ئەوەی هیچ شێوەیەك رۆحی دەقەکە بشێوێنرێت. ئەگەر رۆمانەکە بەووردی بخوێنیتەوە سەرت ناسورمێت بەو لێکچونانە. توانای پنتەر مەزەندە دەکرێت کاتێك فیلمەکە دەبینیتو سەرت دەسورمێ بەو هەموو لێك چوونە. هەردووکیان کەشفی ئەو جیاوازیە دەکەن کەلەنێوان ژیانی شەخصیو گشتی کارەکتەرەکاندا هەیە. هەردووکیان سوود لە دوو زەمەنی هاوتەریب وەردەگرن. هەردووکیان بایەخیان بەلادەرەکان دەداو کەلکیان لەبیرۆکەی سیخوڕیکردن دەبینی وەك پەیامێکی پەنهان کەلەنێوان کەسانی سەر بەمەقامو پلەی کۆمەڵایەتی جیادان. کەمەسەلەیەکی لەو شێوەیە بەسە بۆئەوەی کۆمەڵگا لەبەریەك هەڵوەشێنێ.

لەتانوپۆی هەردووکیاندا چیرۆکێکی خۆشەویستی تێدایە کەلەڕووی کۆمەڵایەتیەوە ناپەسەندەو شوێنێکی چاوپێکەوتنی عاشقە(ناشەرعیەکانی)ی تێدایە کەتیایدا هەراسان دەکرێن. پنتەر پابەندی رووداوەکانی رۆمانەکە بووەو لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی هێندە تایبەت داڕشتۆتەوە کەچیرۆکەکانی جوانتر کردووەو تایبەتمەندیە جوانەکانی شانۆی خۆیمان دێتەوە یاد.

## ڕەوتە نوێکان

لەم ساڵانەی دواییدا تەقلیدی گۆڕینی کارەکانی ئێن، ئێمز فۆستەرو جەین ئۆستن بۆسەر شاشە کاردانەوەیەکی جیاوازی لێکەوتەوە.

ئەم کارانە پێشوازیان لێکرا بەهۆی دووبارەکردنەوەی ئەو تایبەتمەندیانەی رۆمان کەبەشێوەیەکی دیار وونن لەڕەوتی سینەمای مۆدێرن وەك: ناسکی هەستو سۆزەکانو دیالۆگی گوزارشتکەرو ڕەفتاری مەدەنیانە. لەبری ئەوە ئەو تایبەتمەندیانە بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە بە(کەلەپوری سینەما) ناودێر دەکران بەهۆی ئەو تایبەتمەندیانەوە کە بەشەیدایەکی موحافیزکارانە بۆ نوستالیژیاو نەریت ناودەبران.

لەڕاستیدا ڕەنگە هەردوو کاردانەوەکە لەزیانی فیلمدابن. خوێندنەوەیەکی مێرچێنت ئایڤری بۆ(کۆتایی هاوارد)ی فۆستەر کەلە١٩٩٢دا بەرهەم هێنراوەو دەرهێنانەکەی ئانگ لی بۆ(Sense and Sensibility)ی ئۆستن کەلە ١٩٩٥دا بەرهەم هێناوە زیاتر لەبارەی سرینەوەی کەلەپورەوەن وەك لەکەلەپوری خۆی ئەمەش بەپیشاندانی دەشتەکانی ئینگلیزو لایەنگری چینایەتی بەشێوەیەکی سەیر لەچاوی دەرهێنەرێکی بیانیەوە. فیلمی(مۆرسیس)ی فۆستەر کەلە دەرهێنانی(مێرچنت ئایڤری) یە کەشفی سێکسی سنور شکێن دەکات بەڕاشکاوانەترو ئازادانەتر لەوەی دەقە ئەسڵیەکە مۆدێرن

بێتو ئێدواردی یا کلاسیك نەبێت. هەمان شت ڕاستە بۆ ئامادەکردنە ئازایانەکەی (سالی پۆتەر) بۆ (ئۆرلاندوی) ڤێرجینیا ولف ـ لە سالّی ١٩٩٢دا. لەهەردوو حالّەتەکەدا پەردەی(کەلەپور) بیانویەکی بەخشیوەتە کەشف کردنی پەیوەندیە سێکسی‌یە ترسناکەکەی فیلمەکان.

ئەمە یەکێکە لەسودەکانی ئامادەکردنی کارە ئەدەبیە کلاسیکیەکان. ڕێگەدەدات بەرهەمهێنەری فیلمەکە بەشێوەیەکی شاراوەو لەڕێی بەراوردکردنەوە بدوێت زیاتر لەوەی ئەگەر میتۆدەکە باس لەهەنوکە بکات یان فێرگوزاری(تعلیمی)بێت(دۆوری خنجیلە) وێنەیەکی تاریکی دیکنزە بۆ ئینگلتەرای ڤیکتۆری کەنوقمی هەژاریو بیرۆکراسیەتی بازرگانە سەیرەکانو خاوەن خانووی زۆری گەڕەکە هەژارەکان، پاشایانو سەردارانی موڵكو ماڵ کەکاریان دزیو ڕاو ڕووتە، هەموو ئەمانە پێی دەوترا (ڕۆحی سەردەم) هەروەها جگە لەو ژنە شەیتانانەی کەهەموو تەماعێکیان وەدەست هێنانی هێزو دەسەلآت بوو.

فیلمەکەی(١٩٨٧)ی کریستینا ئیدزارد کابوسەکەی دیکنزی هێنایەوە سەردەمی تازەو بەشێوەیەکی هێمنانەو سەرکەوتوانە هاوچەرخەکانی خۆی ئاشکراکرد. هەر لەم دواییەدا مایکلّو نیتەریۆتم لە(Jude)دا لەسالّی ١٩٩٦دا توانی بیٚکێشەو کۆسپ خۆی لەجوانکاریەك بپارێزێ کەتەنها بۆ قۆناغێکە. ئەو توانی باس لەدەمارگیریو شێتی دونیای سێکسو بیٚبەشی لەخوێندەواریو فێربوون بکات. هەر هەموو ئەوەش بەڕەنگامەیەکی هاوچەرخانەو پەیوەندیدار.

لەمانەش زیاتر ئەوەی ئامادەکردن دەتوانێت ئەنجامی بدات بریتی‌یە لە تەرکیزکردنە سەر تایبەتمەندیە سەرمەدیەکانو لەهەمان کاتدا تامێکی مۆدێرنی پیٚدەبەخشێت لەوحالّەتانەدا ئەمیان باشترە لەویان، لەوە ناگۆڕێت کەهێشتا دوو شتی جیاوازن. ڕۆمان وەسف دەکاتو فیلم دەیکاتە وێنە. لەباشترین حالّەتدا ئامادەکردن لەیەکێکیانەوە بۆ ئەوی‌تر کۆپی کردنەوەیەکی خراپ نیە بەلکو وەرگێڕانە، ڕوون کردنەوەیەکی بچوککراوە نیە بەلکو دووبارە ووتنەوەیەکی بەهێزی مادە کلاسیکیەکانە بەشێوەیەکی نوێو بۆ جەماوەرێکی نوێ

## پەراوێز

١ ـ شەپۆل نوێ: ڕەوتێکی دیارو تایبەتی بواری ئەدەبو هونەرە لەئەوروپاداو بەتایبەت لەبواری سینەمادا.

٢ ـ ئالۆزی بەباشتر دەزانی لەداخستن: لێرەدا ئالۆزی بەو مانایەی کەدیمەنێك یاخود فیلمێك زیاد لەخوێندنەوەیەك قبولّ بکاتو بەئاسانی خۆی نەدات بەدەستەوەو داخستن بەو مانایەی کەفیلمەکە زیاد لەپێویست ڕوونو ئاشکرا بێت..

٣ ـ نەوەی نوێ: ئەم دەستەواژەیەم لەبەرامبەر(Nouvelle Vogue)ی فەڕەنسی داناوە کەمەبەست لیٚ ئەو نەوەیەیە کەلەسەرەتای ئەزمونەکانی دایەو زۆریەی کات بەئەزمونێکی جیاواز لەئەزمونەکانی پێش خۆیەوە دێتە ناو گۆرەپان.

٤ ـ ژیان ـ گەرایی:– de- Viure – ئەمە ووشە فەڕەنسیەکەیەو بەو مانایەی ئەو گروپەی یا فیکرەی باس لەجوانیو خۆشی ژیان دەکات. ڕەنگە بتوانین بڵێین لەبەرامبەر ووشەی(ئیرۆس) لەلای فرۆیدو پێچەوانەی (مردو پەرست)ی ئەریك فرۆمە.

٥ ـ کۆکار ـ کولونیال کردن: بەبۆچونی من ئەمەش ئاماژەیەکی‌تر ەبۆ هەیمەنەی ئەمریکی وەك چۆن پانتۆلّی جینزو هەمبەرگەر ئەو دەلالەتە دەبەخشن.

٦ ـ مۆدیلی کچ/ مەبەست لەم دەستەواژەیە ئەو کچەیە کەلەبەردەم نیگارکێشەکاندا دەوەستێت وێنەی بکێشن یاخود ئەو کچەیە کە لەپێشانگاکاندا جلوبەرگ لەبەردەکات تاوەکو هانی کڕیارەکان بدات ئەو جلوبەرگە پەسەندبکەنو بیکڕن..

٧ ـ ژان لوك گۆدار –Jean – Luc Godard: دەهێنەرێکی فەڕەنسی بەناوبانگی فەڕەنسی‌یە.

٨ ـ ئامادەکردن: ئەم ووشەیەم لەبەرامبەر ووشەی adaptationی ئینگلیزی بەکارهێناوە کەمەبەستم لیٚ کردنی ڕۆمانە بەفیلم بەهەموو ئەو گۆڕانانەشەوە کەڕەنگە دەقەکە تووشی ببێت.

٩ ـ پێوەند: بەوکەسە دەوترێت کەنامەو زانیاری نێوان دووعاشق دەگوێزێتەوە بۆ یەکتری.

سەرنج/ سوپاسو پێزانینی زۆرم بۆ مامۆستا شێرزاد حەسەن کەیارمەتیەکی زۆری دام لەوەرگێڕانی ئەم دەقەدا.

سەرچاوە/

Pears Cyclopedia

1997 – 98

Edited by: Christopher Cook

P.W 25 – W 28

The Crisis of European Cinema

# وێستگەکانی سەردەم



ساراماگۆ: پەیوەندی نێوان خەیاڵو واقع



ئۆکتاڤیۆباز



بەبۆنەی کۆچی دوایی (صادق چوبەک)ەوە



هەڵبژاردەی شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس بەئینگلیزی



وەک ئەوەی دواجاربێت (ئێریش ماریا ریمارک)




مەکتوب (پاولۆ کۆیلۆ)



چاپکراوی نوێ (پیکاسۆ)



# پەیوەندیی خەیاڵو مێژوو

## چاوگێڕانێك بەژیانو بەرهەمی (ژوزە ساراماگۆ)ی بەرندەی خەلاتی ئەدەبی نۆبڵدا

ساڵی پار کەناوی (ژوزە ساراماگۆ) بۆ خەلاتی ئەدەبی نۆبڵ هات زوربەمان ناوەکەمان ئاشنا نەهاتە بەرگوێو، وەك هەندێك جاری دی کەوتینە پرسیارو بەدوادا گەڕانی بەرهەمو ژیانی ئەم نووسەرە پرتوگالیە.

ئەم بێئاگابیە هەر تایبەت نەبوو بەئێمەی کوردەوە، بەڵکوو لەزۆر وڵاتی تریشدا ـ بەتایبەت وڵاتانی خۆرهەلات ـ هەر ناوێکی نەناسراو بوو. بۆ نموونە کاتێك ئاژانسەکانی هەواڵی جیهانی ناوی ساراماگۆیان وەك بەرندەی خەلاتی ئەدەبی نۆبڵ بلاوکردەوە سەرنووسەری یەکێك لەبلاوکراوە فەرهەنگیەکانی هیندستان پرسی: ((لەراست ڕێنووسی ناوەکەی چۆنە؟)) ئەمە لەکاتێکدایە کەهیندستان لەرێگای زمانی ئینگلیزیەوە پەیوەندی راستەوخۆی بەهەموو دنیاوە هەیە. هەروەها لەوڵاتێکی وەك ئێرانیشدا کەبزووتنەوەی وەرگێڕان لەزمانە بێگانەکانەوە بەردەوام لەگەشەسەندنابوەو تائێستاش هەروا ماوەتەوە تاقە بەرهەمیکی ئەم نووسەرە نەکراوەتە فارسیو ئەوانیش نائاشنایەتی خۆیان لەگەڵ ناوەکەدا بەسەر سامیەوە بلاوکردەوە.

ساراماگۆ لەشانزەی نوڤەمبەری ساڵی ١٩٢٢ لەناوچەی کرێکارنشینی (ئازنیهاگا)ی سەر بەشاری (لیسبون)ی پورتوگالداو لەخێزانێکی کارگەرا لەدایك بوە، لەبەر هەژاری نەیتوانی لەسەر تەواوکردنی خوێندن بەردەوام بێتو بەناچاری دەستی دایە ئاسنگەریو، هەر لەو رێگایەوە خەرجی خوێندنی خۆی بەدەست هێنا. یەکەمین رۆمانی ساراماگۆ کەلەتەمەنی بیستو پێنج ساڵیدا نووسی ناوی (سەر زەمینی گوناح)ە، بابەتی رۆمانەکە باسی لەو قەیرانە ئەخلاقیە تایبەتیە کەداوێن گیری گوندیەکان دێت، ساراماگۆ ئیلهامی ئەم بابەتی رۆمانەی راستەوخۆ لەژیانی دەوروبەری منداڵی خۆیەوە وەرگرتوە.

لەدوای ئەم بەرهەمەوە کەخوێنەرو رەخنەگران بایەخێکی شیاویان نەدایە، ساراماگۆ رووی لەچاپەمەنیەکان کردو پەیوەندی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی پورتوگالدا بەست، چەندین سەفەرنامە، کۆمەڵێك چیرۆکی کورت، دوو دیوانی شیعری بەناوی (شیعری مومکین) کەساڵی ١٩٦٦ چاپ کراو پاشان دیوانی (گومانی بەختەوەری) ساڵی ١٩٧٩ بلاوکردەوە.

ساڵی ١٩٧٧ دووەم رۆمانی بەناوی (بنەمای نیگارکێشیو خۆش نووسین) چاپ کرد کەدەورێکی تازەی دایە بەرهەمەکانی ئایندەی نووسەر، بابەتی رۆمانەکە دەربارەی هونەرمەندێکی بلیمەتە کەدەتوانێت نیگاریکێشێتو نووسەریش بێت. رای رەخنەگران وابوو کەئەم بەرهەمە تا ئەندازەیەکی زۆر تایبەتمەندی ژیان نامەی خۆیەتیو رووداوەکان لەژێر کاریگەری ژیانی تایبەتی ساراماگۆدا نووسراونەتەوە. کۆتایی رۆمانەکە وێنەی ئەو ئازادیەیە کەساڵی ١٩٧٤ لەکۆمەڵگای پورتوگالیداو بەروخانی سالازاری دیکتاتۆر هاتەدی.

ساڵی ١٩٨٢ رۆمانی (یاداشتەکانی پەرستگا)ی نووسی، ئەم رۆمانە لەوڵاتانیتردا بەناوی (پاڵتازاردو بلیموندا) وەرگێڕایە سەر زمانەکان، ساراماگۆ لەم رۆمانەدا باس لەدەورانی دادگاکانی پشکنینی ئەورووپاو شەڕی نێوان کەنیسەو جەماوەر دەکات. پوختەی رۆمانەکە چیرۆکی کچو کوڕێکە بەناوی پاڵتازاردو بلیموندا کەدەیانەوێت بەهۆی ئامێرێکی فڕینەوە لەزوڵمو زۆری کەنیسە هەڵبێن، ئەم رۆمانە ناوبانگی ساراماگۆی زیاترکردو

سالی ١٩٩٠ کورگی: ئاھەنگسازی ئیتالی هەر لەسەر ئەم رۆمانەوە ئوپرایەکی بەناوی بلیموندلوە ئەنجامدا. ئەمە خۆشەویستی رۆمانەکەی لای خەلکی پورتوگالو دەرەوەی ولاتەکە دوو بەرامبەر کرد. دوو رەگەزی سەرەکی لەرۆمانەکەدا کەفەزای خەیالٚ ئامێزو دژایەتی کردنی کەنیسەیە لەبەرهەمەکانی دوایی نووسەردا رەنگیان دایەوە. بەتایبەت لە(مێژووی گەمارۆدانی لیسبون)ی سالی ١٩٨٩و (ئینجیل وەك عیسای مەسیح گێراویەتەوە)ی سالی ١٩٩١دا.

ساراماگۆ سالی ١٩٨٤ رۆمانێکی بەناوی (سالی دوا کۆچی ریکارد دوریس) نووسی کەوەسفی چۆنیەتی هاتنە سەرکاری سالازاری سالی ١٩٣٦ە لەپورتوگالدا. لەم رۆمانەدا نووسەر گیانی شاعیری کۆچ کردوی پورتوگال (فرناندوپیسوا) بەردەوام بەدوای کەسایەتیەکی شیعرەکانیەوەیە کەجێگای پالەوانی چیرۆکەکەی گرتۆتەوە. گیانی پسوا لەگەلٚ ئەو کەسەدا دەربارەی جۆری ژیان دەدوێو پاشان بەجووتە لەسەر ئەوە رێدەکەون کەواز لەدنیا بێنن.

سالی ١٩٩٥ رۆمانی (کوێری) نووسی. ئەم رۆمانە لەپێرستی زۆر فرۆشترین رۆمانی سالی پاری ئەوروپاو ئەمریکادا تۆمارکرا. یەکێکە لەشاکارە ئەدەبیەکانی نووسەر کەلەشارو ولاتێکی بێناودا روودەدات. پیاوێك کەلەماشینەکەیدا دانیشتوەو چاوەرێی هەلبونی گلۆپی سەوزی ترافیك لایتە، لەپڕا هەست بەکوێربوون دەکات. بەلام لەباتی ئەوەی دنیا لەبەرچاویا تاریك بێت هەموو شتەکان سپی ئەبینێت، وەك ساراماگۆ دەلێت: (وەك ئەوەی لەتەمێکی خەستا یان لەدەریایەکی شیردا گیری خواردبێت) یەکێك دێتو پیاوەکە دەباتەوە مالەوە ((بەلام پاشان ماشینەکەی لێدەدزێت)) ژنەکەی بەتاکسی دەیبات بۆ نزیکترین نەخۆشخانە. دوای رۆژێك ژنەکەی، شۆفێری تاکسیەکە، پزیشكو نەخۆشەکانو دزی ئوتۆمبیلەکەیش هەموو کوێر دەبن. دەولەت بۆ دۆزینەوەی ئەم پەتایە هەموو تووش هاتوەکان کۆدەکاتەوەو دەیانباتە نەخۆشخانەیەکی دەرونیەوە کەکۆمەلێك سەرباز پاسەوانی لێدەکەن. لەو کۆبوونەوە بچووکەی نەخۆشەکان هێشتا چەند چاوێك هەن تەندروستی خۆیان لەدەست نەداوە، ژنی پزیشکەکە بۆ ئەوەی لەگەلٚ مێردەکەیدا بێت بەدرۆ خۆی کوێر کردوە. تادێت نەخۆشخانەکە پڕو جەنجالٚ تر دەبێتو رێكو پێکیەکەی لەدەست ئەدات. دەست شۆرەکان لەکاردەکەونو جێگای نان خواردن بێ کەلك دەبێت. ئیتر نەدەرمان بۆ نەخۆشەکان دەمێنێتو نەهۆیەك بۆ ناشتنی مردوەکان لەدەستایە. لەوکاتەدا گۆڕانێکی کۆمەلایەتی هەر لەناو ئەو کۆمەلە بچووکەدا روودەدات. کۆمەلێکیان کۆنترۆلی شوێنی نان خواردنەکە دەکەنو بەم هۆیەوە بۆ کاری قورس کردن بەوانیتر کەلك وەردەگرن. هاوسەری پزیشکەکە هەولٚ ئەدات گرۆیەکی بچووکی سەربەخۆیان رزگاربکاتو سەریش دەکەوێت. کوێرەکان لەنەخۆشخانەکە دەردەکات بەرەو دنیای دەرەوە کەدیمەنەکەی نوقمی جوانیەکی سەرسوڕهێنە! (کوێری) لەهەموو روویەکەوە رۆمانێکی سامناکە، ساراماگۆ لەم رۆمانەدا کەسەکانی دەباتە کەناری هەلدێری مرۆڤایەتیو پاشان بەرەو خوار پەتیان دەکات، ئەوانەی بەرجەستەیان دەکات شەڕ ئەنگێزن، کاری ئەمەندە لاسارانە دەکەن کەپێش ئەوەی لەو شوێنەدابن هەرگیز بیریان لەروودانی نەکردۆتەوە. بەلام لەنێو ئەو هەموو ترسیو وەحشەتەدا ساراماگۆ گەلێك دیمەنی جوانو دلکێش دەنەخشێنێت، بۆ نموونە لەنەخۆشخانەکەدا باس لەهەستی ژنی پزیشکەکە دەکات بەرانبەر دوو ژنی کوێر کەبەهۆی کوێریانەوە دەموچاوی ئەمیان نەبینیوە کەچی بە(رووجوان) ناوی دەبەنو ئەم دەیان پارێزێت، ساراماگۆ لەژنی پزیشکدا کەسایەتیەکی دنیا بینو پێشکەوتووی دروست کردوە کەتەواو وەك چاوو گوێی خوێنەر رەفتار دەکاتو کەمو زۆر دەوری ویژدانی کۆی نەژادی مرۆڤایەتی دەبینێت، کەدەتوانێت بەتەواوی مانا ناوی مرۆڤی لێ بنێین. دوا رۆمانی ساراماگۆ سالی ١٩٩٧ بەناوی (هەموو ناوەکان)ەوە بلاّویوەوە.

لەبەرهەمەکانی ساراماگۆدا خەیالٚ دەوری سەرەکی دەبینێت، خەیالٚو واقیعە مێژوییەکان شان بەشانی یەکتری بەرەو پێشەوە دەڕۆن، بۆیە هەندێك لەرەخنەگران بەرهەمی ساراماگۆ دەخەنە ریزی ئەو رۆمانانەی کەبەشێوەی ریالیزمی سیحری بەرهەم هێنراون. جیاوازی خەیالٚ لای ساراماگۆ لەگەلٚ نووسەرانی وەك مارکیزو فوئینتس دا لەوەدایە کەخەیالی ئەم رەگی لەزانستو پێشکەوتنە زانستیەکانی مرۆڤدایە. بۆ نموونە لەرۆمانی (یاداشتەکانی پەرستگا)دا دوو دلدار هەولی ئەوە دەدەن کەبەئامێری فڕین لەدەست زۆرو ستەمی کەنیسە دەربازبن، ئەمە ئەفسانە یونانیەکەی ئیکاروسمان دێنێتەبیر کەسەرەتاییترین خەیالاّتی زانستی مرۆڤە. یان جیابوونەوەی نیوەدوورگەی ئیبری لەخاکی ئەوروپاو سەرگەردانی لە ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا، کەبابەتی سەرەکی رۆمانی (قایەغی بەردین)ەکەیەتی.

ساراماگۆ لەسالاّنی پێشوتراو، لەگەلێك مەلبەندی روناکبیریو هونەریو زۆر ولاتەوە خەلاّتی ئەدەبی پێبەخشراوە. لەوانە خەلاّتی (کامۆ)یە کەگرنگترین خەلاّتی ئەدەبیە لەو وولاتانەدا کەبەزمانی پورتوگالی دەئاخافن.

بەخشینی خەلاّتی ئەدەبی نۆبلٚ بەساراماگۆ کەبەچەکی خەیالٚ دەچێتە شەڕی واقیعە تالەکەی ژیانی رۆژانەوە، رێزلێنانێکی درەنگ وەختە لەمرۆیەك کەجارێکیتر ئەدەبیاتی پورتوگالی بەدنیا ناساندەوە، ئێمەی کوردیش هیواداریـن لەنزیکترین کاتدا بەرهەمێکی ئەم نووسەرە گەورەیە بخرێتە سەر زمانەکەمانو بکەوێتە نێو کتێبخانە هەتیوەکەمانەوە.

# لە توناو توونی تەنیایی‌دا

## یادکرنەوەیەکی ئۆکتاڤیۆپاز



سەردەمانێک لە ئەورووپادا نووسەرانی وەکو ئۆکتاڤیۆ پازیان بە بۆرژوا لە قەلەم ئەدا، ئۆکتاڤیۆ پاز مەکسیکی بوو، بەلام لە هەمان کاتدا سەر بە چەند کەلتوورو زمانێکی جیاواز بوو، مامۆستای شیعرو لە هەمان کاتدا پیاوی سیاسەتیش بوو— سیاسەتمەدارێکی ئۆکمەو نوێنەرێکی دیاری شۆڕشی مەکسیک بوو. وەختێ کە دەوڵەتی مەکسیک لە سەرەتای دەستپێکردنی پاریە ئۆلۆمپییەکانی سالی ١٩٦٨دا خۆپیشاندانی قوتابییەکانی شەلالی خوێن کرد، پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتدا پچڕاند.

ئۆکتاڤیۆ پاز لە سالی ١٩١٤دا هاتە دونیاوەو وەکو زۆربەی زۆری ڕۆشنبیرانی تری مەکسیک تێکەڵەیەک بوو لە سوورپێستو ئەورووپییەکان. لە نێو زۆربەی نووسەرە هەڵکەوتووەکانی وڵاتەکەیدا، هەر لە خوان ڕۆلفۆوە تا کارلۆس فۆینتس، ئەم ڕوانینێکی فراوانو گشتگیرییەکی تایبەتی هەبوو کە بێگانەکان لە ڕێی ئەمەوە دەیانتوانی ئاگاداری مەکسیک ببن، هەر لە ڕێی ئەمیشەوە کۆمەڵێک دەروازەی ئەدەبیاتی مەکسیک بە رووی دەرەوەدا کرایەوە. ڕوانینی ئەم نووسەرە دنیادیدەیە چووە ئەودیو ڕۆخەکانی هزری بێگانەو، لە دەرەوەی مەکسیکەوە لە دیدگایەکی نوێو جیاوازەوە دەیڕوانیە نیشتمانەکەی.

ئەوەی هانیدا ((تووناوتوونەکانی تەنیایی)) بنووسێ؛ ژیانی ئەو مەکسیکیانە بوو کە نیشتەجێی ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا بوون، هەروەها پەیبردن بەوەی کە مەکسیکیە لاوە نیشتەجێبووەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە پشت بەستن بە خۆیان گیانی مەکسیکایەتیی خۆیان پاراستووە.

بۆ یەکەم جار لە پاریس کارەکانی شاعیرو ڕامیبی مەکسیکی خانم ((سورخوان دنیس دیلاکرۆز)) سەرنجی ئەمی بەلای خۆیدا

ڕاکێشاو، لە شاری کامبریج کارە فەلسەفیی و ئەدەبیەکەی خۆی (واتە((ئەو مەیموونەی فێری قسە بووە)) )تەواو کرد.

ئۆکتافیۆ پاز بە سوود وەرگرتن لە فەلسەفەی خۆرئاوا ڕوانینی خۆی دەوڵەمەند تر کرد. ئەو لە ((تووناوتونەکانی تەنیایە))دا دەگەڕێتەوە بۆ ((نیچە))و لە زمانی ئەوەوە دەنووسێ ((ئێمە بە خۆمان نامۆین چونکە لە خۆمان دەگەین)).

لەم کارەیدا بە ووردبینییەوە وێنەیەکی هەمەلایەنەی مرۆڤی مەکسیکیمان دەداتێ و بەر لە گارسیا مارکیز مەسەلەی تەنیایی ئەمریکای لاتین دەخاتە ڕوو. لە بارەی مەکسیکەوە دەڵێت:

((پاش یەك سەدە خەبات، خەڵك لە هەموو کاتێك زیاتر تەنها بوو)) ئەم ڕستەیەی کە سەبارەت بە سوورپێستەکانی کۆلۆمبیاش هەر ڕاستە.

لە کارە دیارەکەیدا کە سەبارەت بە ڕەخنەی ئەدەبیەو ناوی ((ئادەمیزاد خۆرە مرۆڤدۆستەکان)) (١٩٧٩-١٩٨١)ە خۆی لە قەرەی مێژوو و کەلتووری مەکسیکی داوە. بەڵام لە تووناوتوونەکانی تەنیاییدا دیسانەوە هەست بە خولیای پاز دەکەینەوە کە لە مەڕ کەسێتیی و کارەکانی (سورخوان)ەوە، کە بە ڕای پاز نموونەی تەنیایی و یەکەمین فیمینیستی مەکسیك بوو، ئافرەتێکی ڕۆشنبیرو شاعیر کە وێڕای گوشاری بیرتەسك پرکێشیی دەکردو گوزارشتی لە خەونەکانی دەکرد.

ئەو لێکۆڵینەوەیەی پاز دەربارەی ((سورخوان)) نووسی لە ساڵی ١٩٨٢داو بە قەوارەی شەش سەد لاپەڕە لە چاپ درا. ئەم کتێبە کارێکی شاعیرانەو ڕەخنەییانەو دۆکیۆمێنتانەی بێ هاوتایە سەبارە بە شیعرو مرۆڤ دۆستی. هەر بە خۆڕاییش پاز نەیووتوە:

((سورخوان منم))

پاز لە ڕێی شیعرەکانییەوە وەکو شاعیر لە مێژوودا مایەوە. گەرچی شیعرەکانی تەنها ڕەنگدانەوەی هەست و سۆزی مەکسیکییەکان نەبوو.

چونکە ڕەنگێکی ئەورووپایی و ڕۆشنبیرانەیان بەخۆوەگرتبوو. بەڵام سەرباری ئەمەش شیعرەکانی پاز نیشاندەری ڕۆحی قایمی مەکسیك بوون. ((بەردی هەتاو))، ((گۆرانی شەوانەی ئێڵد فۆنسۆ))و (لە ڕەشنووسەوە تا حەقیقەت) کۆمەڵە دیوانێکن کە ناوی ئەویان خستە ڕیزی شاعیرانی سیاسیەوە.

چالاکی سیاسی پاز هەر لە ساڵانی لاوێتییەوە دەستی پێکرد، وەختێ لە مەکسیکۆ سیتییەوە چوو بۆ شاری یۆکاتان و لەوێ لە قوتابخانەیەکی ناوەندی کرێکاراندا وانەی وتەوە. بەڵام پاز هەرگیز بەدوای ئایدۆلۆژیایەکەوە نەبوو. هەر لە سەرەتای ئەو کارەیەوە لەگەڵ کۆمۆنیستە توندڕەوەکانی مەکسیکدا کەوتە ناکۆکییەوە.

ئەم ناکۆکییە بۆ جارێکی دی لە جەنگی ناوخۆی ئیسپانیادا سەری هەڵدایەوە. کاتێ کە لە ساڵی ١٩٥١دا یاسای کاری بەزۆر لە یەکێتی سۆڤیەتدا ڕاگەیەندراو، هەروەها کاتێ کە فیدال کاسترۆ نموونەی سۆسیالیزمی دەوڵەتیی یەکێتیی سۆڤێتی لە کوبادا پیادەکرد.

ڕاشکاوییەکەی پاز بووە هۆی دوژمنایەتی و تانەی زۆر بۆی و تا ئەو ڕادەیەی کەکۆمەڵێك قوتابیی دەمارگیر لەمەکسیکۆسیتی پەیکەرێکیان بە ناوی پازەوە دروست کردو گڕیان تێ بەردا.

ئەمە هۆی ئەوە بوو کە پازی خستە ناو مەترسی ئاگری هەموو بەرەکانەوە، چونکە هەستی ئەو هەستی شاعیرێك بوو و دەیزانی کە بوونی پیاوی یاخیش پڕە لە ململانێی بێشومار نەك لە فەرمان و قاڵب و دۆگما، هەر ئەمەش بوو ببووە هۆی ئەوەی کە ئەم نووسەرە سەرباری ناوبانگی جیهانیشی هەمیشە لە تەنیاییدا دەژیا.

ئۆکتافیۆ پاز پێنجەمین نووسەری ئەمریکای لاتین بوو کە لە ساڵی (١٩٩٠)دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت. بە مەرگی ئەو پێدەچێ کە قۆناغی گەورەی ئەدەبی نوێی ئەم سەدەیە بە کۆتای گەیشتبێت، دەبێ نیگەرانی ئەوە بین کە ئەم قۆناغە قۆناغێکی تری وەك خۆی بەدوادا نەیەت.



# ساڵی پـــار (سادق چوبەك) دوا ماڵئاوایی کـــــرد

پاش ئەوەی لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٧)دا بوزورگ عەلەوی‌و دواتریش محەمەد عەلی جەمالزادە کە لە ڕابەرانی ئەدەب‌و چیرۆکی نوێی ئێرانی بوون بۆ دواجار ماڵئاواییان لە دونیای ئەدەب‌و لە ژیان کرد؛ سادق چوبەکیش بە دوایانداو دوای بەرهەمێکی زۆر لە بواری چیرۆکدا کۆچی دوایی کرد.

چوبەکیش وەکو بوزورگو جەمالزادە بە یەکێك لە پێشڕەوانی چیرۆکنووسین لە ئێراندا دەژمێردرێ، هەرچەند دوای ئەوان هاتە مەیدانەوە.

چوبەك هەر لە سەرەتاوە لەژێر کاریگەریی (سادق هیدایەت)دا ڕووی لە نوێکردنەوەی ئەدەبی ئێرانی کردو پێکەوە لەگەڵ (جەلال ئال ئەحمەد)و (ئیبراهیم گولستان)دا بزاڤێکیان پێکهێنا، ئەم سیانە دوا بەدوای جەمالزادەو هیدایەت‌و عەلەوی بەشێوەیەکی دیار پەرەیان بە کورتە چیرۆکدا.

چوبەك هەروەکو قوتابی‌یەك ڕێبازەکەی هیدایەت، کەسێتیەکانی چیرۆکەکانی لە چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ هەڵدەبژارد. وەکوئال ئەحمەدو گولستانیش، لەژێر کاریگەریی ئەدەبی ریالیستی‌ی ئەمریکادا بایەخی جیددی بە بونیادی چیرۆك دا.

چوبەك لە ساڵی ١٩١٦دا لە ((بوشهر)) هاتۆتە دنیاوەو دوای وەرگرتنی بڕوانامەیەکی ئەدەبی لە کۆلێژی ئەمریکایی لە تاران، لە وەزارەتی ڕۆشنبیری‌و پاشان لە کۆمپانیای نەوت دادەمەزرێ.

سەرەتای ژیانی ئەدەبیی خۆی بە وەرگێڕانی چەند کارێکی (یۆجین ئۆنێل و دی. ئێچ. لۆرانس)و هەروەها چەند چیرۆکێك دەست پێ دەکات کە لە گۆڤاری (سخن)دا بڵاویاندەکاتەوە. هەر لە هەمان ساڵدا یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی خۆی بە ناونیشانی (خیمە شب بازی) (یاری سێبەری بووکە شووشە) (١٩٤٥) لە چاپ دەدات. ئەوەندە نابات دووەم کۆمەڵە چیرۆکی خۆشی بڵاو دەکاتەوە کە بە ناوی ((انتری کە لوکیش مردە بود) (ئەو مەیمونەی کە لۆتی‌یەکی مردبوو) (١٩٤٩).

لەئەدگارەکانی هونەری چیرۆك لای چوبەك ئەوەیە کە:-

یەکەم: لەچیرۆکەکانیدا (گفتوگۆ) ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ‌و کەسێتی‌و ئوتمۆسفێرو ڕووداوەکان لەڕێی گفتوگۆوە خۆیان دەخەنەڕوو.

دووەم: دوورکەوتنەوە لە ((تاکردەگی)) کە تیایدا بە تەنها نووسەر ((ئاگاداری رەها))یەو مافی قسە کردنی هەیە.

لە کارەکانی تری ((سادق چوبەك)) ڕۆمانی ((سنگ صبور ١٩٦٦))، ڕۆمانی ((تنگسیر ١٩٦٢)) (چراغ اخر ١٩٥٦)، ((روز أول قبر ١٩٦٥)).

دوا کاری چوبەك کتێبی ((مهپارە)) (١٩٩١)یە کە هەڵبژاردەیەکە لە چیرۆکی خۆشەویستیی هیندی‌و وەرگێڕاونەتە سەر زمانی فارسی.

# هەڵبژاردەی شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس بە ئینگلیزی




لەم دواییانەدا هەڵبژاردەیەک لەم شیعری مامۆستا ((شێرکۆ بێکەس))ی شاعیر وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی ئینگلیزیو لە ژێر ناوی ((The Secret Diary Of A Rose))دا بڵاوکراونەتەوە. شیعرەکان لەلایەن ڕینگاردو شیروان میرزاو مامۆستا شێرزاد حەسەنی چیرۆکنووسەوە کراون بە ئینگلیزی. بەرگی پێشەوەو پشتەوەی کتێبەکە بە دوو تابلۆی ((ڕێبوار سعید))ی هونەرمەند ڕازێنراوەتەوە. کتێبەکە سەدو حەفتاو شەش لاپەڕەیە.

چاپی یەکەمی کتێبەکە لە ئوستراليا بە ئەنجام گەیاندراوەو ناوەندی چاپەمەنیو ڕاگەیاندنی خاک لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٨دا بۆ دووەم جار بڵاوی کردۆتەوە. لەم کتێبەدا سەرباری دەیان شیعری شاعیر، کورتەیەک لە بارەی ژیانی شاعیرو پێشەکیەکی سادە لە بارەی بزوتنەوەی ڕوانگە و ڕۆڵی شاعیر تیایداو چەند بۆچونێکی خوێنەری بێگانەی تێدایە لەسەر شیعرەکان. بەشی زۆری شیعرەکان لەلایەن ڕینگاردو (شیروان میرزا)وە و دە شیعری کۆتایی کتیبەکەش لە لایەن مامۆستا (شێرزاد حەسەن)ەوە کراون بە ئینگلیزی. بەشێکی دیاری شیعرە وەرگێڕدراوەکان دەچنە خانەی ئەو جۆرە شیعرانەوە کە شاعیر بە ((پۆستەرە شیعر)) ناوی دەبات، وەک: بەفر، پایز، پیانۆ، هێلانە، فارگۆن..هتد. لەم شیعرانەدا شاعیر هەوڵ دەدات بە جۆرێکی جیاواز لە دیاردە ئاساییو باوەکانی ژیان بڕوانێتو دووبارە پەیوەندی نێوان شتەکانو مرۆڤەکان دادەڕێژێتەوە.

پرۆسەی وەرگێڕانی شیعر لە خۆیدا ئەرکێکی قورسە بە تایبەت ئەگەر ئەو شیعرانە لەلایەن شاعیرێکەوە نوسرابێت کە ڕەهەندەکانی واتاو مۆسیقای زمانی بەم شێوە ئەفسوناوییە تێکەڵکردبێت. لەگەڵ ئەوەشدا بە خوێندنەوەی ئەم شیعران هەست دەکرێت بەوەی وەرگێرەکان چەندە هەوڵی بە شیعر کردنی زمانی دووەمیان داوە.

((لویس ڤۆن فلۆتاو)) کە هەلگری بڕوانامەی دکتۆرایەو پرۆفیسۆری وەرگێڕانە لە زانکۆی (ئۆتاوا) بە وەرگێڕانەکەدا چوەتەوە. ئەمەش دوو نموونەی شیعرە وەرگێردراوەکانن کە یەکەمیان لە وەرگێرانی (رینگارد)و (شیروان میرزا)یەو دووەمیان لە وەرگێڕانی (شێرزاد حەسەن)ە.

## *The moon and the sea*

**Earlier... earlier**
**this moon did not exist**
**but anothoer, more beautiful one,**
**whose face was much brighter.**

**The water was obsessed with her.**
**Longing for her,**
**Every night it walked up and down**
**The coast,**
**Waiting...**

**The moon did not return the affection.**
**The sea wanted to catch her with a trick.**
**But the waves,**
**Even though they rose up high,**
**Could not reach its cheeks.**

**On purpose, the moon was unapproachable,**
**She played hide-and-seek with**
**And vanished behind the clouds.**

**One day the moon went away for awhile**
**to the desert**
**and stayed ther a few nights.**

**When she returned her face was dusty**
**as were her hair and her silver cloak.**

**hurriedly took off her clothes**
**and approached the water.**
**The moon was agitated.**
**When she stepped onto a stone**
**She slipped .. and splashed..**

**The sea awakened, startled,**
**and searched for the moon**
**at the surface, at the bottom..**
**and searched with the hand**
**down to the ground.**
**Up and down**
**but there was no moon.**

**It was this night**
**that ebb and tide**
**were born.**

## مانگ‌و زەریا

**زووتر ..زووتر**
**ئەم ((مانگ)ە نا**
**مانگێکی تر هەبوو جوانتر**
**دەم‌و چاوی نێجگار گەشتر**
**ئاو شێتی بوو، ئاو شەیدای بوو**
**هەموو شەوێ لە کەناردا**
**ئەهات ئەچوو بەتەمای بوو**
**بەڵام مانگ لەو لووتە لا بوو**
**زەریا ویستی‌بە فێڵ بیگرێ**
**شەپۆل هەرچەند خۆی هەڵبڕی**
**دەمی نەگەشتە ڕوومەتی**
**مانگ بە ئەنقەست نازی ئەکرد**
**بۆ چاوشارکێ لەژێر چووخمەکانی هەوردا**
**خۆی ون ئەکرد**
**هەتا جارێ بە سەفەرێ**
**مانگ کۆچی کرد بۆ بیابان**
**تا چەن شەوێ نەهاتەوە**
**کە هاتەوە، تەپ‌وتۆزو خۆڵی قاقڕ**
**لە دەم‌و چاوی نیشتبوو**
**تریفەی قژی خۆڵاویی**
**پۆشاکی زیوینی بەری**
**گەردڵی نیشتوو**
**لەو کاتەی مانگ گەڕایەوە**
**ئاو نووستبوو**
**مانگ بڕیاری‌دا خۆی بشوا**
**بە پەلە پەل**
**جلەکانی بەری داکەند**
**ڕوەو زەریا هەنگاوی نا**
**شڵەژابوو**
**مانگ پێی لەسەر بەردێ دانا**
**بەرد زۆر لووس بوو**
**شڵپەیەك هات**
**مانگ خلیسکا**
**مانگ نقووم بوو**
**زەریا وەك شێت‌و هار هەستا**
**بۆ مانگ گەڕا**
**سەری کردو خواری کردو**
**دەست بەناو بنیا گێڕا**
**هەر چوە سەر**
**هەر هاتە خوار**
**مانگ هەر نەبوو**
**لەو شەوەوە هەڵچوون‌و داچوونی زەریا**
**لەدایك بوو**

## شەوانە دیدار

لە دوای هەموو دیدارێکی منو بادە
لە کەناری خەوێکی پیرۆزەییدا ڕائەوەستم
کە شیتە سەرخۆشەکەی (ڕامبۆ) ئەگاتە لام
بمەناو ڕووبارێکی مەستا ئەمبا:
سەرم ئەبێ بە پەڵەهەور،
شیعرم پڕ ئەبێ لە باران،
پەنجەکانم بە باڵندەو
لەشم ئەبێ بە دارستان!
لە دوای هەموو دیدارێکی منو بادە، بەڕێی (با)دا
بە دوو قۆڵی لەگەڵ تەنیاییدا ئەڕۆین.. ئەڕۆین
تا ئەگەینە پاردەکانی ئەودیو ژیان
سەرێك ئەدەین لە (مردن)و
چەند پرسیارێك ئەکەین لە خواو
دوو نهێنی ئەدزینو
چەند خەمێك جێ ئەهێڵینو
دیسانەوە ئەچینەوە سەر ڕێگەی (با).
لە دوای هەموو دیدارێکی منو بادە
بۆ سبەینێ، لەناو ژوورێکی نەخۆشدا
بوتڵێکی کۆکە کۆك کەرو
پەرداخێکی بێ تاقەتو
هەندێ لە توێکڵە خەیاڵو
قەسیدەیەکی ناتەواو بەجێدێڵم

ستۆکهۆڵم/ ۱۹۹۷

## *Night – paper*

## *(Shawnama)*

**After each meeting of wine and me**
**I stand the beach of a greenish dream**
**The drunken ship of Rambud casts anchor near me**
**And will take me through a drunken river**
**My head will change to a cloud**
**My pome will be saturated with rain**
**My hands are birds**
**And my body will be a forest**
**After each meeting of wine and me**
**We take the road of the wind**
**Together with lonliness we walk and walk**
**Till we reach the realms beyond life**
**We will visit Death**
**And ask God some question**
**We steal some secrets**
**And leave some sorrws**
**And again we go back the way of wind**
**After each meeting of wine and me for the following moring: Inside a sick room**
**Ther will be a coughing bottle**
**A weary glass**
**Some waste imagnation**
**And I leave uncompleted poem behind.**



# وەك ئەوەی دواجار بێت

لە ساڵی ١٩٢٩ دا ڕۆمانی "هەموو شتێك ئارامە لە بەرەی خۆرئاوا" لەلایەن ڕۆژنامە نووسێکی نەناسراوەوە بەناوی "ئەریش ماریا ریمارك" بلاوکرایەوە.. ئێستا ریمارك ناوبانگێکی جیهانی هەیە.. ئەم ساڵ لەیادی سەد ساڵەی لە دایك بوونیدا یادەوەرییەکی -مذکرات-ی نوێی بڵاوکرایەوە.

ریمارك ڤێلایەکی لە نزیك دەریاچەی مەجۆری کڕی بوو لە سویسراو زۆر کات لە گەشتو گەڕاندا بوو.. هەر چەندە لە پاریس هولیودو نیویۆرك ژیابوو بەڵام لەو ڤێلایەی سویسرای لەهەر شوێنێکی دی ئاسوودەتربوو.. ژیانی ریمارك ١٨٩٨-١٩٧٠ بابەتی سەرەکی کتێبەکەی "ڤیلهام ڤینشتا نیورگ"ە کەلە ژێرناوی "وەك ئەوەی دواجار بێت" دایە بیرەوەریەکی پڕ زانیاریە..

بەرنامەی bookmark ی کەناڵی DW ئەڵمانی چاوپێکەتنێکی لەگەڵ ڤیشتا نیویورگ سازدا:

ڕۆمانی "هەموو شتێك ئارامە لە بەرەی خۆرئاوا" تەواو ڕۆمانێکی سیاسییە هەرچەندە ریمارك خۆی کەسێکی سیاسی نەبو، رەنگە زیاتر کەسێکی ئەخلاقی بووبێت؟

بێگومان. بەڵام دەبێت بە وریاییەوە ئەم جۆرە وشانە لە وەسفی نوسەراندا بەکار بهێنین، مەسەلەی ئەوەی کە لە رەفتاری خۆیدا کەسێکی ئەخلاقی بووبێت ئەو شتێکی دییە. بیرکردنەوەیەکی زۆر مرۆڤ دۆستانەی هەبووە وەك لە ڕۆمانی "هەموو شتێك ئارامە لە خۆرئاوا"و هەموو ڕۆمانەکانی تریشیدا دەبینین..

کاتێك نازییە زۆردارەکان لە ساڵی ١٩٣٣ دا هاتنە سەر حوکم نەیانتوانی خۆی دەستگیر بکەن بەڵام دەستیان بەسەر کتێبەکانیدا گرتو سوتاندیان، هەروەها مافی هاوڵاتێتییان لێ سەندەوە.. ریمارك لەبەرامبەر ئەمەدا چۆن هەڵوێستی وەرگرت؟

هەرچەندە ئەم قسەیە کە دەیکەم سەیر دێتە بەرچاو بەڵام شادمان بوو بە سووتاندنی کتێبەکانی چونکە شتێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ نوسەرێکی وەك ریمارك کە نازییەکان رەتیان کردبۆوە کتێبەکانی بڵاوبکرێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا کتێبەکانی نوسەرانی وەك "تۆماسی مانو هانیریش مان" و چەندەها نوسەری ئەڵمانی تر دەسوتێنرا. بەڵام لێ سەندنەوەی مافی هاوڵاتێتی زۆر بێزاری کردو وەك زۆریەی تاراوگە نشینەکان نیشتمانپەروەر بوو. ئەڵمانیا بە زمانو کولتورەکەیەوە نیشتمانی ئەو بوو. لە ساڵی ١٩٣٢ دا بە هەندێ هۆی نا سیاسی ئەڵمانیای جێهێشتن تاراوگە زۆر کاری لێ کردبوو.. وەڕس بوو بوو.. ئەو دەوڵەمەند بوو، بەهۆ کتێبەکانیەو پارەیەکی باشی دەست دەکەوت. ڕاستە ئەو ئاوارە بوو. بەڵام ژیانێکی رەفاهیانە دەژیا. لە باشترین ئوتێل دەمایەوە بە ئارەزووی خۆی دەگەڕا. هەرگیز گرفتی دارایی نەبوو.

سەرباری هەموو ئەمانەش تەنیا بوو، لەهۆلیۆد دەیوت من رقم لەدرەختی سنەوبەرە حەز دەکەم




ـارێکی تـر دارسـەروە
انی‌یەکان ببینمەوە.
ریمارك بەخێرایی کرپارەکانی
بوون لەجیهانداو بەو شێوەیەش
وە بەڵام هاوڕێ نوسەرەکانی تری
بەرتولد برێشت تەنانەت لیۆن
ستڤانە کە ئێستا زۆر بەناوبانگن
گیز وەکو نوسەرێکی مەزن لێیان
رانیوە.

پێم وایە نارەوایی لە بەرابەر
ارکدا ئەنجام دراوە لەلایەن
رەزایانو رەخنەگرانو تەنانەت
ـەرەکانی هاوڕێشی‌یەوە.
ارك لە هەموو نوسەرە
انی‌یەکانی تری سەدەی
تەم خوێنەری زیاتری هەبوو لە
وو جیهاندا.. هیچ نوسەرێکی
ی لەنیوەی یەکەمی سەدەی
تەمدا ئەو ناوبانگەی ئەوی
و.

پ/ ریمارك باشترین نمونەی نوسەرە بەناوبانگەکانە. زۆر قۆز بوو. لەگەڵ ژنی جوانی وەك "مۆلینا دیتریش" دا سەمای کردووە. زۆر مەشروبی دەخواردەوە. لە نیویۆرکو پاریسو رۆماو نیس ژیانی برۆدتە سەر. تەنانەت لە نزیك دەریاچەی مەجۆری خانوو خۆی هەبووە. چۆن دەیتوانی بنوسێت بەوجۆرەش ژیانی بەسەر دەبرد؟

نوسین کارێکی زۆر بە ئازار بوو بۆ ئەو.. ئەگەر "یادەوەرییەکان"ی بخوێنیتەوە کە نزیکەی دوو هەزار لاپەڕە دەبێت درك بەوە دەکەیت چەند کەسێکی تەنیا بووە. لە پشت ئەو جیهانەوە چ کەسێك وەستاوە؟ چۆن هەستێکی خەمۆکانەی هەبوو لە هونەرەکەیدا؟ لە پشت هەر وشەیەکەوە ململانێیەکە گەورەی دەکرد.

لەم کتێبی یادەوەریانەیدا کە تۆ نوسیوتە وەك نوسەرێکی مەزن ناوی دەبەیتو تەنانەت لە ئاستی نوسەری وەك "توماس مان" دا دایدەنێیت. ئەم کتێبەی تۆ تەنها چیرۆکی ژیانی ریمارك نی‌یە بەڵکو هەوڵ دانە بۆ رزگارکردنی ریمارك لەو وێنەیەی کە تەنها نوسەرێکی خۆشی بەخش بێت.. لە ئەڵمانیا ئەم بۆچوونە زۆر باوە.. ئایا ئەمە راستە؟

بەڵێ. خەڵك لە ئەڵمانیا جیاکاریەکی دیار دەکەن لە نێوان مۆسیقای جددیو مۆسیقای خۆشی بەخش. هەمان جیاکاری لە ئەدەبیشدا ئەنجام دەدەن. بەڵام ئەم جیاکاری‌یە سەر لێشێوێنەرە. ریمارك نوسەرێکی زۆر خۆشی بەخشە. خوێنەریش چی زیاتر داوا دەکات لەنوسەر جگە لەوەی خۆشی بەخش بێت. زۆر بە سادەیی پرسیارەکە ئەوەیە: تاچ ئاستێك خۆشی بەخشە؟ ریمارك لەبارەی ژیانی زیندانی‌یەکانی کامپەکانی دەستگیرکردن (معسكرات الاعتقال) نوسیویەتی. لە رۆمانی "وادەیەك بۆ ژیانو وادەیەك بۆ مەرگ" دا پرسیاری ئەوە دەخاتە روو کە ئایا سەربازەکان دەتوانن وەیان دەبێت بەرەنگاری هیتلەر ببنەوە. هەروەها لەبارەی ئەزموونەکانی سەربازەوە لەبەرەکانی پێشەوە نوسیویەتی، ئایا ئەمانە بابەتێکن کە نوسەر تەنها بۆ خۆشی بەخشین نوسیونی؟ من پێم وانی‌یە..

سەرچاوە/
کەناڵی DW. بەشی ئینگلیزی.
و/ لە ئینگلیزی‌یەوە: کەریم عومەر

# مەکتوب




ئەم وشەیە کەلەبنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبیە ناوی کتێبێک لەکتێبەکانی ڕۆماننووسی ئەمریکای لاتین ((پاولۆ کۆیلۆ))یە. کۆیلۆ لەم ساڵانەی دواییدا ناوی چووە ریزی نووسەرە گەورەکانی ئەمریکای لاتینەوەو، هەندێك رایان وایە کەئێستا دوای مارکیز کتێبەکانی کۆیلۆ زۆرترین خوێنەرانیان بەلای خۆیاندا راکێشاوە.

((مەکتوب)) ناوی رۆمانێك نیيە، بەڵکو ناوی کتێبێکە کەلە دووتوێی خۆیدا کۆمەڵێك نووسینی پەراگەندەی گرتۆتە خۆ.

ئەو نووسینانە بریتین لەبەسەرهاتو رووداوو پەرەگرافی پەندئامێز کە یان نووسەر لەئەزموونی خۆیەوە هەڵیبژاردوونو یان لەئەزموونی کەسانی ترەوە.

لەراستیدا ئەم نووسینانە خەتێکی گشتی کۆی نەکردوونەتەوەو دەشێ هەر یەکێکیان باس لەمەسەلەیەکی سەربەخۆ بکات، ئەم شێوازەش لەنووسیندا رەنگە نموونەی لەئەدەبی کۆنی میللەتاندا ببینینەوە؛ بەڵام بەم تەرزە تازەیەی کەکۆیلۆ لەم کتێبەیدا دەیخاتەڕوو کەمتر لەئەدەبی نوێدا بەرچاومان دەکەوێت. جێی ئاماژەیە کەئەتمۆسفێرێکی شاعیری باڵی بەسەر نووسینەکاندا کێشاوەو هەریەکەو چێژێکی فیکری یان ئیستاتیکیی خۆی هەیە.

بەمەبەستی ئەوەی خوێنەری کورد وێنەیەکی ئەم شێوازە نووسینەی لەبەرچاوبێت، والێرەدا هەڵبژاردەیەك لەو نووسینانەی بۆ دەخەینەڕوو:

(١)

مورشیدێك بەقوتابیەکەی وت: ((کەبەم رێگایەدا ئەڕۆیت، دەگەیتە دەرگایەك کەعیبارەتێکی لەسەر نووسراوە. بگەڕێرەوەو پێم بڵێ ئەو عیبارەتە چی دەڵێت.))

مورید خۆی گورج کردەوەو کەوتە رێ تەیکردنو دواجار گەیشتە دەرگاکە. ئینجا هاتەوە لای مورشیدەکەیو وتی: ((عیبارەتی سەر دەرگاکە ئەمەبوو: ئەستەمە.))

مورشید پرسیی: ((ئەو عیبارەتە لەسەر دەرگاکە نووسرابوو یان لەسەر دیوارەکە؟))

مورید وەڵامی دایەوە: ((لەسەر دەرگاکە.))

مورشید وتی: ((زۆرچاکە. دەسکی دەرگاکە بابدەو دەرگاکە بکەرەوە.))

مورید ئەو فەرمایشەی بەجێهێنا. کاتێ دەرگاکەکەی بەتەواوەتی کرایەوە. ئیدی نووسینەکە لەبەرچاو ون بوو.

مورید لەسەر رۆیشتنەکەی بەردەوام بوو.

(٢)

دەمەو بەیانیەك بوودا لەنێو قوتابیەكانیدا بوو كەپیاوێك لێیان نزیك بۆوەو پرسی: ((ئایا خوا هەیە؟))

بوودا وەڵامی دایەوە: ((بەڵێ، خوا هەیە.))

پاشنیوەڕۆ پیاوێكی دیهاتو هەمان پرسیاری كردەوە.

بوودا وەڵامی دایەوە: ((نەء، خوا نییە.))

دەمەو ئێوارە پیاوێكی تر هاتو هەمدیسان هەمان پرسیاری دووبارەكردەوە.

ئەمجارەیان بوودا لەوەڵامدا وتی: ((تۆ ئەبێ خۆت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەیتەوە.))

یەكێك لەقوتابییەكان وتی: ((مامۆستا، ئەمە شتێكی بێمانایە. چۆن ئەبێ پرسیارێك سێ وەڵامی جیاوازی هەبێ؟))

ئەم پیاوە ویژدانڕوونە وەڵامی دایەوەو وتی: ((چونكە ئەو سیانە سێكەسی جیاواز بوون هەریەكەیان بەشێوەی خۆی لەخوا نزیك ئەبێتەوە؛ یەكێكیان بەباوەڕەوە، یەكێكیتریان بەبێباوەڕیەوەو سێیەمیشیان بەگومانەوە.))

(٣)

رامكەرانی گیانەوەران لەسێركدا بۆ رامكردنی فیل پەنادەبەنە بەر فێڵێكی سادە. وەختێ گیانەوەرەكە هێشتا بچووكە، قاچێكی بە قەدی درەختێكەوە ئەبەستنەوە. ئیدی فیلەكە چەند تەقەللا ئەدات خۆی رزگار بكات، ناتوانێت. بەمجۆرە وردە وردە فیلەكە دەگاتە ئەو باوەڕەی كەقەدی درەختەكە زۆر لەو بەهێزترە.

كاتێ گەورەو بەهێزیش دەبێ؛ ئەوەندە بەسە یەكێك پەتێكی باریك بەقاچی فیلەكەوە ببەستێتەوەو سەرەكەی تری پەتەكەش بەلقی درەختێكەوە گری بدات. فیلەكە تەقەللا نادات خۆی رزگاربكات.

ئێمەش وەكو ئەو فیلانە، قاچمان بەپەتی باریك بەستراوەتەوە، بەڵام چونكە لەمناڵیمانەوە باوەڕمان بەتواناو دەسەڵاتی قەدی درەختەكە پەیداكردووە، جەسارەت ناكەین تەقەللای خۆ رزگاركردن بدەین، خافڵین لەوەی بۆ وەدەستهێنانی ئازادی، هێندە بەسە كارێكی ئازایانە ئەنجام بدەین.

(٤)

فەیلەسوفی ئەڵمانی ((شۆپنهاوەر))، لەكاتێكا بەدوا وەڵامی ئەو پرسیارانەدا دەگەڕا كەمایەی ئازاری بوون، لەشەقامێكی ((درێسدن))دا پیاسەی دەكرد. كاتێ بەلای باخێكدا تێپەڕی، بڕیاری‌دا بچێت دابنیشێت و لەگوڵەكان رابمێنێت.

یەكێك كەخەڵكی ئەو ناوەبوو كەئەو رەفتارە سەیرەی ئەوی بینی، چوو پۆلیسی ئاگادار كردەوە. دوای چەند خولەكێك ئەفسەرێك لەشۆپنهاوەر نزیكبۆوەو بەشێوازێكی ناشرین لێی پرسی: ((تۆ كێیت؟))

شۆپنهاوەر تەماشایەكی پۆلیسەكەی كردو وتی: ((ئەگەر تۆ بتوانیت یارمەتیی من بدەیت تاوەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزمەوە، ئەوا بۆ هەتا هەتایە من سوپاسگوزاری تۆ دەبم.))

(٥)

گەلێ تاوانی دڕندانەی بەناوی ((حەقیقەت))ەوە ئەنجامداوە. ژمارەیەكی زۆر لەپیاوانو ئافرەتان بەمجۆرە سووتێنراون. كەلتووری هەندێ لەژیارەكان بەتەواوەتی وێرانكراون. ئەوانەی كەبەخواردنی گۆشت تاوانباركراون دوورخراونەتەوە.

ئەوانەی كەبیریان لەڕێگایەكی دی كردۆتەوە، تەواو لەمافە مەدەنیەكان بێبەش كراون.

مرۆڤێك بەناوی حەقیقەتەوە لەخاچدرا. بەڵام بەر لەمەرگی، پێناسێكی گشتیی بۆ حەقیقەت كرد. حەقیقەت شتێك نییە كە ((یەقین))مان پێببەخشێ. شتێك نییە كەوامان لێبكات لەخەڵكی تر خۆمان بەگەورەتر بزانین. شتێك نییە كەلەزیندانی بیروباوەڕی كۆنەخوازانەدا بەندمان بكات. حەقیقەت شتێكە كەدەمانگەیەنێتە ئازادی.

ئەو وتی: ((حەقیقەت بناسە. ئەوكات حەقیقەت ئازادت دەكات.))

# پیکاسۆ

## یەکەم کتێبی چاپکراوی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم




دەزگای چاپو پەخشی سەردەم بەکتێبێکی خنجیلانەی وەرگێڕدراو لەبارەی بەرهەمەکانی پیکاسۆو ژیانییەوە کارەکانی خۆی دەست پێ دەکات.

بزووتنەوەی وەرگێڕان لەزمانە بیانیەکانەوە بۆ سەر زمانی کوردی سستو پاشکەوتوو بووە، ئەو هەوڵانەش کە لەمەوپێش دراون.. هەوڵو خۆفیداکرنی تاکە کەسی بووە..

وەرگێڕان بۆ سەر زمانی کوردی مانای ئەوە نییە ئەگەر بەرهەمێك بەزمانی دراوسێکانمان هەبن (عەرەبی، فارسیو تورکی)، کە ئێمە لەگەڵ دووانەکەی یەکەمیاندا ئاشنایەتیمان هەیە ئیدی نابێ بۆ کوردی تەرجەمەی بکەین.. نەخێر، بزووتنەوەی وەرگێڕان مافی خۆیەتی کە هەمان بەرهەم یان باسو نووسراو چەند جارێكو لەلایەن چەند وەرگێڕێکی جیاوازەوە تەرجەمە بکرێ! هەرچەندە ئەم نامیلکەیە باسێکە تائێستا بەزمانی عەرەبیش کە ئێمە زۆر پێی ئاشناین وەرنەگێڕدراوە.

لەخوێندنەوەی پیکاسۆ زۆر چێژم بینی.. بەڵام ئەوەی سەرنجی راکێشام هەندێك هەڵەی چاپو هەڵەی تر بوون.. بەم ئەمانە ون دەبنو بایەخیان کەم نەبێتەوە کاتێك بۆمان دەرنەکەوێت نامیلکەکە چەند پێویستە بۆ خوێنەران، لەپێش هەموویانەوە بۆ پسپۆڕانی ئەو بوارە (هونەرمەندانو خوێندکارانی هونەری)و هەروەها خەڵکانی تریش.

نامیلکەکە دابەش کراوە بەسەر (دە) بەشدا، کە قۆناغی جیا جیای ژیانی هونەری پیکاسۆن.

لەوەپێش ئەم هونەرمەندەمان بە(بیکاسۆ) ناسیوە، واتە یەکەم پیتی ناوەکەی بە(ب) لەفزکراوە، کە لەراستیدا خۆی (پیکاسۆ)یە، واتە بە(پ).

چاپکردنەکەی نایابە، وێنەکان باش دەرچوونو باسەکان لەنزیك وێنەکانەوە چاپ کراون.. واتە لەرووی هونەرییەوە چاپ کردنەکە نمرەیەکی بەرزی دەدرێتێ.

زمانی وەرگێڕانەکە زۆرتر پابەندە بەدەقە ئەسڵیەکەوەو دەقە سویدیەکەی هەندێك بەشی تیایە لەکوردییەکەدا نین، لەوانە هەندێك لەوتەکانی پیکاسۆ خۆو بەشی کۆتایی کتێبەکە کە بایۆگرافیای هونەرمەندە. خراپیش نەئەبوو گەر فەرهەنگۆکێکی لەسەر زاراوە بیانیو تایبەتمەندەکان بۆ خوێنەری تر تیابوایە.

لەکۆتاییدا ئەڵێم (نمرەیەکی بەرز) بۆ چاپو پەخشی سەردەم، چاوەڕێی بەرهەمی تریانین. بەزمانەوانو شارەزایانی زمانانی بیانیش ئەڵێین: (وەرنە پێشەوە ئیتر رێگا خۆش بووە بۆ وەرگێڕانو وەرگێڕدراو بەچاپ گەیاندن!).

## ئاگادارییەك بۆ نووسەرانی گۆڤاری سەردەم

- لەگەڵ دەقە وەرگێڕاوەکەدا دەقە ئەسڵیەکەش بنێرن.
- ڕەچاوی ڕێزمانو خاڵبەندی بکەن.
- دەبێ بابەتەکە لەسەر دیوێکی کاغەزەکە بنووسرێ.
- بەپێی پێویست وێنە لەگەڵ بابەتەکەدا هەبێ.
- هەر بابەتێك بڵاوبکرێتەوەو نەکرێتەوە نادرێتەوە بەخاوەنەکەی.
- ئەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە مەرج نییە دەربڕی ڕاوبۆچوونی گۆڤارەکە بێت.
- (سەردەم) پاش بەراوردو پیاچوونەوە بەبابەتەکاندا، لەدەسکاریو داڕشتنەوەیاندا ئازادە.

## ئاگادارییەك بۆ وەرگێڕەکان

دەزگای چاپو پەخشی سەردەم بەنیازە لەزنجیرە کتێبە چاپکراوەکانیدا گرنگییەکی تایبەت بەوەرگێڕانی کتێبی هەڵبژاردە بدات لەزمانە زیندووەکانی جیهانەوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە:

یەکەم: بایەخی تایبەت بەلێکۆڵینەوە دەدرێ لەبوارەکانی: فیکر، فەلسەفە، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەقی جیهانی وەرگێڕاو، ڕەخنە، زانستە مرۆییەکان، مێژوو، لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسیەکان، تۆژینەوەی هونەری، ئەدەبی منداڵ، فەرهەنگسازی... دا.

دووەم: دەبێ دانەیەك لەکتێبە ئەسڵیەکە لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا هەبێ.

سێیەم: دوای ئەوەی بڕیاری چاپکردنی دەدرێ؛ نۆرەی خۆی بۆ چاپ دەگرێتو پاش چاپکردن، بەپێی قەوارەو لاپەڕەکانی کتێبەکە (جگە لەڕێژەیەك لەکتێبەکە) خەڵات بۆ وەرگێڕەکەی تەرخان دەکرێ.

